# صحيح البخاري

## بە کوردی

وەرگێڕاوی هەموو فەرموودە صەحیحەکانی ئیمامی بوخارییە کە ژمارەیان (٧٥٦٣) فەرموودەیە

**بەرگی هەشتەم**


نوسینی
أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاري

وەرگێرانی
محمد ملا صالح باموکی







صحيح البخاري

# صحيح البخاري

## بەکوردی

**بەرگی هەشتەم**

**پەڕاوەکانی.. هاوسەرگیری ، تەڵاق ، خەرجیەکان ، خواردەمەنیەکان ، حەوتەم ، سەربڕاوەکان و ڕاوکردن ، قوربانی ، خواردنەوەکان ، نەخۆشەکان ، پزیشکی ، جل و بەرگ و پۆشاك ، ئادابەکان**


**نوسینی**

**أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري**

**وەرگێڕانی**

**محمد ملا صالح بامۆكی**



# ( صحيح البخاري ) به كوردى


## بەرگی هەشتەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح باموکی

چاپی یەکەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

دیزاین .. ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشک





07719899402
07501122110

## ٣٤- بابُ عَرْضِ الرجل ابنتَهُ أَوْ أُخْتَهُ عَلَى أَهْلِ الخَيْرِ

٥١٢٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يُحَدِّثُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ حِينَ تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ - فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: أَتَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ، فَقَالَ: سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي. فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، ثُمَّ لَقِيَنِي فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي أَنْ لاَ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا. قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ زَوَّجْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ. فَصَمَتَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، وَكُنْتُ أَوْجَدَ عَلَيْهِ مِنِّي عَلَى عُثْمَانَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ شَيْئًا؟ قَالَ عُمَرُ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ عَلَيَّ إِلاَّ أَنِّي كُنْتُ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ ذَكَرَهَا، فَلَمْ أَكُنْ لأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَوْ تَرَكَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبِلْتُهَا[1].

## ٣٤- باسی پیاو کچ و خوشکی خۆی پێشنیار بکات بۆ خەڵکی چاک (مارەی کات)

**٥١٢٢- ئیبنو شیهاب دەڵێ: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕایەوە، کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کاتێ حەفصەی کچی عومەر ﷺ بێوەژن کەوت (بە مردنی) خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی مێردی ﷺ - کە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لە مەدینە مرد - عومەر ﷺ وتی: ڕۆشتم بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ پێشنیاری مارەکردنی حەفصەم بۆ کرد، عوسمان وتی: با بیرێ لە کاری خۆم**

(١) بڕوانە: ٤٠٠٥.

**بکەمەوە، ئیتر چەند شەوێك مامەوە (چاوەڕوان بووم) پاشان پێم گەیشت و وتی: بە ڕاستی بۆم ڕوون بۆتەوە لەم کات و ڕۆژەگارەدا ژن نەهێنم، عومەر ﷺ دەڵێ: ئەنجا بە ئەبو بەکری سیدیق ﷺ گەشتم و وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، ئەبو بەکر ﷺ بێدەنگ بوو و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، بۆیە منیش لە ئەبو بەکر زیاتر توڕە بووم تا عوسمان، ئەنجا چەند شەوێك مامەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی حەفصەی کرد و منیش لێم مارە کرد، ئەوسا ئەبو بەکر ﷺ بە من گەشت و وتی: لەوانەیە توڕە بوویی لێم کاتێ باسی حەفصەت بۆکردم (مارەی بکەم)، منیش وەڵامم نەدایتەوە؟ وتم: بەڵێ وایە، وتی: دەسا دڵنیابە من لەبەر ئەوە وەڵامم نەدایتەوە لەوەی پێشنیارت بۆ کردم، تەنها لەبەر ئەوە بوو بەڕاستی من زانیبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی حەفصەی کردبوو (داوای دەکات)، خۆ نەدەکرا منیش نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا بکەم، وە ئەگەر ئەو (پێغەمبەر ﷺ) نەیویستایە و وازی لێ بهێنایە من دەمویست (و مارەم دەکرد).**

٥١٢٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّكَ نَاكِحٌ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعَلَى أُمِّ سَلَمَةَ؟ لَوْ لَمْ أَنْكِحْ أُمَّ سَلَمَةَ مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّ أَبَاهَا أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ»[1].

**٥١٢٣-زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە دەگێڕێتەوە کە ئوممو حەبیبە ﷺ بە پێغەمبەری خوا ﷺ وت: ئێمە لە ناو خۆماندا دەڵێین تۆ دوڕڕەی کچی ئەبی سەلەم ﷺ مارە دەکەیت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەسەر ئوممو سەلەمەدا**

(١) بڕوانە: ٥١٠١.

(مارەی کەم)؟ ئەگەر ئوممو سەلەمەشم مارە نەکردایە ئەو (دوڕڕە) بۆ من حەڵاڵ نەبوو، بێگومان باوکی ئەو (دوڕڕە) برای شیری منە)).

## ٣٥- بَابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ ﴿٢٣٥﴾ ﴾ الآية إلى قوله: ﴿ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة. ﴿ أَكْنَنتُمْ ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة، أَضْمَرْتُمْ، وَكُلُّ شَيْءٍ صُنْتَهُ فَهُوَ مَكْنُونٌ.

وقال أبو عبد الله، وَقَالَ طَلْقٌ: ثَنَا زَائِدَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ ﵄: ﴿ فِيمَا عَرَّضْتُم ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة، يَقولُ: إِنِّي أُرِيدُ التَّزْوِيجَ، وَلَوَدِدْتُ أني يُسر لِي امْرَأَةٌ صَالِحَةٌ. وَقَالَ القَاسِمُ: يَقول: إِنَّكِ عَلَيَّ كَرِيمَةٌ، وَإِنِّي فِيكِ لَرَاغِبٌ، وَإِنَّ اللَّهَ لَسَائِقٌ إِلَيْكِ خَيْرًا. ونَحْوَ هذا. وَقَالَ عَطَاءٌ: يُعَرِّضُ وَلَا يَبُوحُ، يَقولُ: إِنَّ لِي حَاجَةً وَأَبْشِرِي، وَأَنْتِ بِحَمْدِ اللَّهِ نَافِقَةٌ. وَتَقُولُ هِيَ: قَدْ أَسْمَعُ مَا تَقولُ. وَلَا تَعِدُ شَيْئًا، وَلَا يُوَاعِدُ وَلِيُّهَا بِغَيْرِ عِلْمِهَا، وَإِنْ وَاعَدَتْ رَجُلاً فِي عِدَّتِهَا ثُمَّ نَكَحَهَا بَعْدُ لَمْ يُفَرَّقْ بَيْنَهُمَا. وَقَالَ الحَسَنُ: ﴿ لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة. الزِّنَا. وَيُذْكَرُ عَنِ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة. قَالَ: أن تَنْقَضِي العِدَّةُ.

## ٣٤- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە گوناهتان نەگات لە خوازبێنی ژنانی (مێر مردوو) بە ناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن یان لە دڵی خۆتاندا (بڕیار بدەن) دەیان خوازن خوا زانیویەتی)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (لێ خۆشبووی لەسەرخۆیە) ﴿ أَكْنَنتُمْ ﴿٢٣٥﴾ ﴾: (لە دڵی خۆتاندا) شاردبێتانەوە، هەر شتێک بیپارێزی ئەوە ناوی (مَكْنُون)ـە.

٥١٢٤- ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: تەڵق پێی وتم: زائیدە بۆی گێڕاینەوە لە مەنصورەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە

دەربارەی: ﴿ فِيمَا عَرَّضۡتُم ﴿٢٣٥﴾ ﴾ دەڵێ: بڵێ من دەمەوێ ژن بێنم، ئاواتە خوازم (خوا) ئافرەتێکی چاکم بۆ ڕێك بخات.

-قاسیم دەڵێ: بڵێ: (بە ئافرەتەکە) تۆ لای من بەڕێزی، بەڕاستی من حەزم لە تۆیە، بێگومان خوا چاکە دێنێت بە پیرییەوە، یا وێنەی ئەم وتانە.

-عەتادە دەڵێ: بە ناراستەوخۆ بڵێ بە ئاشکرا (خوازبێنی نەکات)، بڵێ: من پێویستیەکم هەیە، تۆ مژدەت لێ بێ، سوپاس بۆ خوا تۆ نامێنیتەوە، دەبێ ئافرەتەکەش ئەم وشانە بڵێ: بێگومان ئەوەی دەیڵێیت گوێم لێیە، نابێ ئافرەتەکە هیچ بەڵێنێك بدات، وە نابێ سەرپەرشتیاری ژنەکە بەڵێن بە کەس بدات بێ ئاگاداری ژنەکە، وە ئەگەر ژنەکە بەڵێنی بە پیاوێك دا لە ماوەی چاوەڕوانیدا لە پاشان دواتر ئافرەتەکەی مارەکرد، جیاناکرێنەوە لە یەکتری.

-حەسەن (ی بەصری) دەڵێ: ﴿ لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا ﴿٢٣٥﴾ ﴾[1] واتە: زینا کردن (لەگەڵیاندا).

-لە ئیبنو عەبباسەوە رضي الله عنهما گێڕدراوتەوە ﴿ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴿٢٣٥﴾ ﴾ واتە: ماوەی چاوەڕوانی تەواو بێت.

## ٣٦- بابُ النَّظرِ إلى المَرْأةِ قبْلَ التَّزوِيجِ

٥١٢٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَأَيْتُكِ فِي الْمَنَامِ يَجِيءُ بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ فَقَالَ لِي هَذِهِ امْرَأَتُكَ. فَكَشَفْتُ عَنْ وَجْهِكِ الثَّوْبَ فَإِذَا أَنْتِ هِيَ، فَقُلْتُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ»[2].

---

(١) واتە: بە نهێنی بەڵێنیان پێ مەدەن.

(٢) بڕوانە: ٣٨٩٥.

# ٣٦- باسی تەماشاکردنی ئافرەت پێش مارەکردن

**٥١٢٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((لە خەومدا تۆم بینی فریشتەیەك هێنایتی لە ناو پارچە ئاوریشمێكی چاكدا بوویت، پێی وتم ئەمە هاوسەری تۆیە، منیش پۆشاكە ئاوریشمەكەم لادا لەسەر ڕووخسارت، دەبینم تۆیت (لەناویدا) جا وتم: ئەگەر ئەمە لە لایەن خواوە بێت بەجێی دێنێ)).**

٥١٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ لأَهَبَ لَكَ نَفْسِي. فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟». قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. قَالَ: «انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي -قَالَ سَهْلٌ مَا لَهُ رِدَاءٌ- فَلَهَا نِصْفُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ». فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلَسُهُ ثُمَّ قَامَ فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُوَلِّيًا فَأَمَرَ بِهِ، فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ: مَعِي سُورَةَ كَذَا وَسُورَةَ كَذَا وَسُورَةَ كَذَا -عَدَّدَهَا- قَالَ: «أَتَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

**٥١٢٦- سەهلی كوڕی سەعد ﵁ دەگێڕێتەوە كە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم خۆمت پێشكەش بكەم، پێغەمبەریش ﷺ سەیری كرد ئینجا لە سەرەوە بۆ خوارەوە تەماشای كرد، لە**

(١) بروانە: ٢٣١٠.

پاشان سەری داخست، جا کە ئافرەتەکە زانی پێغەمبەر ﷺ هیچ بڕیارێکی لە بارەوە نەدا دانیشت، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵانی هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ پێویستت پێی نییە، بۆ منی مارە بکە، فەرمووی: ((ئایا هیچت هەیە (بیکەیت بە مارەیی بۆی؟) )) وتی: نەوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بڕۆ بۆ ماڵەوەتان بزانە هیچ شتێك پەیدا دەکەیت؟)) ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: نە بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچم دەست نەکەوت، فەرمووی: ((سەرنج بدە ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەوسا ڕۆشت لە پاشان گەڕایەوە و وتی: نە بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەموستیلەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەم پۆشاکەم [1] هەیە - سەهل دەڵێ: پیاوەکە پشتەماڵەی نەبوو- نیوەی بۆ ئەو ئافرەتە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((چی لە ئیزارەکەت بکات؟ ئەگەر تۆ بی پۆشی ئەو هیچی لە بەردا نابێ، وە ئەگەر ئەو (ئافرەتەکە) بی پۆشێ تۆ هیچت لە بەردا نابێ)). ئیتر پیاوەکە دانیشت و دانیشتنەکەی درێژەی کێشا، پاشان هەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ کابرا بینی پشتی هەڵکرد و ڕۆشت، فەرمانی کرد و بانگ کرایەوە، ئینجا کە هات فەرمووی: ((چیت لەبەرە لە قورئان؟)) وتی: فلانە سورەت و فلانە سورەت و فلانە سورەتم لەبەرە، ژماردنی، فەرمووی: ((هەموویان لەبەر دەخوێنی؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((بڕۆ ئەوە بەڕاستی ئەو (ئافرەتەم) لێ مارە کردیت بەو (سورەتانەی) قورئان کە لەبەرتە)).

---

(١) (إزار): پۆشاکێکە بۆ نێوان ناوک و ئەژنۆ.

# ٣٧- بابُ مَنْ قَالَ: لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ

لقوله ﷻ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ ﴿٢٣٢﴾ ﴾ البقرة. فَدَخَلَ فِيهِ الثَّيِّبُ وَالْبِكْرُ. وَقَالَ تعالى: ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ ﴿٢٢١﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ تعالى: ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾ النور.

٥١٢٧- قَالَ يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ: حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ النِّكَاحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ كَانَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ: فَنِكَاحٌ مِنْهَا نِكَاحُ النَّاسِ الْيَوْمَ، يَخْطُبُ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ أَوِ ابْنَتَهُ، فَيُصْدِقُهَا ثُمَّ يَنْكِحُهَا، وَنِكَاحٌ آخَرُ كَانَ الرَّجُلُ يَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ إِذَا طَهُرَتْ مِنْ طَمْثِهَا: أَرْسِلِي إِلَى فُلاَنٍ فَاسْتَبْضِعِي مِنْهُ. وَيَعْتَزِلُهَا زَوْجُهَا، وَلاَ يَمَسُّهَا أَبَدًا، حَتَّى يَتَبَيَّنَ حَمْلُهَا مِنْ ذَلِكَ الرَّجُلِ الَّذِي تَسْتَبْضِعُ مِنْهُ، فَإِذَا تَبَيَّنَ حَمْلُهَا أَصَابَهَا زَوْجُهَا إِذَا أَحَبَّ، وَإِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ رَغْبَةً فِي نَجَابَةِ الْوَلَدِ، فَكَانَ هَذَا النِّكَاحُ نِكَاحَ الاسْتِبْضَاعِ، وَنِكَاحٌ آخَرُ يَجْتَمِعُ الرَّهْطُ مَا دُونَ الْعَشَرَةِ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ كُلُّهُمْ يُصِيبُهَا. فَإِذَا حَمَلَتْ وَوَضَعَتْ، وَمَرَّ عَلَيْهَا لَيَالِيَ بَعْدَ أَنْ تَضَعَ حَمْلَهَا، أَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْ يَمْتَنِعَ حَتَّى يَجْتَمِعُوا عِنْدَهَا، تَقُولُ لَهُمْ: قَدْ عَرَفْتُمُ الَّذِي كَانَ مِنْ أَمْرِكُمْ، وَقَدْ وَلَدْتُ، فَهُوَ ابْنُكَ يَا فُلاَنُ. تُسَمِّي مَنْ أَحَبَّتْ بِاسْمِهِ، فَيَلْحَقُ بِهِ وَلَدُهَا، لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَمْتَنِعَ بِهِ الرَّجُلُ. وَنِكَاحُ الرَّابِعِ يَجْتَمِعُ النَّاسُ الْكَثِيرُ فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ لاَ تَمْتَنِعُ مِمَّنْ جَاءَهَا، وَهُنَّ الْبَغَايَا كُنَّ يَنْصِبْنَ عَلَى أَبْوَابِهِنَّ رَايَاتٍ تَكُونُ عَلَمًا فَمَنْ أَرَادَهُنَّ دَخَلَ عَلَيْهِنَّ، فَإِذَا حَمَلَتْ إِحْدَاهُنَّ وَوَضَعَتْ حَمْلَهَا جُمِعُوا لَهَا وَدَعَوْا لَهُمُ الْقَافَةَ ثُمَّ أَلْحَقُوا وَلَدَهَا بِالَّذِى يَرَوْنَ، فَالْتَاطَ بِهِ، وَدُعِيَ ابْنَهُ لاَ يَمْتَنِعُ مِنْ ذَلِكَ، فَلَمَّا بُعِثَ مُحَمَّدٌ ﷺ بِالْحَقِّ هَدَمَ نِكَاحَ الْجَاهِلِيَّةِ كُلَّهُ، إِلاَّ نِكَاحَ النَّاسِ الْيَوْمَ.

# ٣٧- باسی ئەوەی دەڵێ: مارەکردن دروست نییە بە بێ سەرپەرشتیار[1]

بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ( (سەرپەرەشتیاران ئافرەتان) قەدەغەی شوو کردنیان لێ مەکەن)، ئەم ئایەتە بێوەژنیش دەگرێتەوە هەروەها کچیش، وە خوا دەفەرموێ: (وە ژنانی مسوڵمان مارە مەکەن لە هاوبەش پەیداکەران تا بڕوا دەهێنن)، وە دەفەرموێ: (وە پیاوانی بێ ژن و ژنانی بێ مێرد بدەن بە شوو (مێرد) ).

٥١٢٧- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە، کە بێگومان ژن مارەکردن لە سەردەمی نەفامیدا چوار جۆر بوو: جا مارەکردنیەکیان ئەم مارەکردنەی ئەمڕۆی خەڵك بوو، کە پیاو خوازبێنی خوشك و ئامۆزا و برازا و کچی پیاوێکی تر دەکات و مارەی دەداتێ پاشان مارەی دەکات.

ژن مارەکردنێکی تر: کاتێ ژن لە حەیز پاك بۆوە پیاوەکەی پێی دەوت بنێرە لای فلانە کەس بێت لەگەڵیدا دروست ببێ (جووت بێ)، مێردەکەی خۆی نزیکی نابێتەوە جووت نابێ لەگەڵیدا، تا دەردەکەوێ لەو پیاوە سکی بووە کە ئافرەتەکە لەگەڵیدا جووت بووە، ئینجا کە دەرکەوت سکی هەیە، ئەگەر مێردەکەی حەزی کرد لەگەڵی جووت دەبێت، بێگومان ئەم کارە بۆیە دەکات حەز دەکات ژنەکەی منداڵێکی نەجیبی ببێت! بەم نیکاحە دەڵێن: نیکاحی: (إسْتِبْضَاعِ).

ژن مارەکردنێکی تر: چەند پیاوێ لە دە کەس کەمتربن لەسەر ژنێ کۆ دەبنەوە، هەموویان (بەشوێن یەکدا) سواری ئەو ژنە دەبن، جا کەسکی پڕ بوو (لەوانە و) منداڵەکەی بوو، چەند شەوێکی بەسەردا ڕابورد دەنێرێت بۆ لای ئەوانە (کە

(١) سەرپەرشتیاری باوک و باپیر و مام و ئامۆزای کچە و ژن کە بە شوی دەدەن.

**سواری بوون)، جا هیچ پیاوێکیان ناتوانێ خۆی بگرێت نەڕوات تا هەموویان لای ژنەکە کۆدەبنەوە، پێیان دەڵێ: بێگومان خۆتان دەزانن کارەکەی ڕابردووتان چی بووە، ئەوە ئێستا منداڵەکەم بووە، ژنەکە حەز لە کامیان بکات دەڵێ فلان کەس ئەم منداڵە منداڵی تۆیە، ئیتر منداڵەکە دەبێ بە منداڵی ئەو کەسە ! ئەو پیاوە (ژنەکە دیاری کرد) ناتوانێ منداڵەکە قەبوڵ نەکات.**

**ژن مارەکردنی چوارەم: پیاوانێکی زۆر کۆدەبنەوە و هەموویان دەچنە لای ژنەکە[1] هەرکەسێ بچێتە لای ژنەکە ڕێگری لێ ناکات، ئەو ژنانە لەش فرۆشن[2]، ئەو ژنانە لەسەر دەرگا (ی ماڵە) کانیانەوە پەیداخیان داناوە تا نیشانە (ی بەدڕەوشتی) بێت، جا هەر کەسێ بیەوێ زینایان لەگەڵدا بکات دەڕوات بۆ لایان، ئینجا ژنێك لەوانە کەسکی پڕ بوو منداڵەکەی بوو، هەموو ئەو پیاوانەی (سواری بوون) کۆدەکرێنەوە لای ژنەکە، قائیفێکیان بۆ بانگ دەکەن، پاشان (قائیفەکە) منداڵی ژنەکە دەداتە پاڵ ئەو کەسەیان ڕای وایە هی ئەوە، ئیتر دەنوسێت پێیەوە و بە منداڵی ئەو کەسە بانگ دەکرێ، ئەو پیاوە ناتوانێ ڕازی نەبێ بەو کارە (باوکێتی منداڵەکە)، ئینجا کە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بە (ئاینی) هەق نێردرا، جگە لەم ژن مارە کردنەی ئێستا خەڵکی هەموو ژن مارەکردنەکانی سەردەمی نەفامی نەهێشت و لە ناوی برد.**

٥١٢٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ: ﴿وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ فِى يَتَـٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّـٰتِى لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾﴾ النساء. قَالَتْ هَذَا فِي الْيَتِيمَةِ الَّتِي تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ -لَعَلَّهَا أَنْ تَكُونَ شَرِيكَتَهُ فِي مَالِهِ،

---

(١) سەر جێی لەگەڵدا دەکەن.

(٢) کاریان زیناکردن و بەد ڕەوشتییە.

وَهْوَ أَوْلَى بِهَا- فَيَرْغَبُ أَنْ يَنْكِحَهَا، فَيَعْضُلَهَا لِمَالِهَا، وَلاَ يُنْكِحَهَا غَيْرَهُ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَشْرَكَهُ أَحَدٌ فِي مَالِهَا[1].

**٥١٢٨-عوروه له باوكیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەربارەی ئەم ئایەتە: (وە ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئاندا (وەڵامێکە) لە بارەی کچانی هەتیوەوە، ئەوانەی ئەوەی نووسراوە بۆ یان (لە میراتی باوکیان) پێیان نادەن، وە حەز ناکەن مارەیان بکەن (لەبەر میراتەکەشیان ناهێڵن شوو بکەن)، عائیشە ﵂ وتی: ئەمە لە بارەی کچی هەتیوەوەیە کە لای پیاوێکە (خزمێتی)، لەوانەیە کچە هەتیوەکە هاوبەشی پیاوەکە بێت لە سامانی پیاوەکەدا[2]، جا پیاوەکە لە هەموو کەس لە پێشتر و نزیکترە بەو کچە هەتیوە، حەزیش ناکات مارەی بکات و ڕێگەشی نادات شوو بکات، لەبەر سامانی کچەکە و مارەشی ناکات بۆکەسێکی تر، لەبەر ئەوە حەز ناکات کەسێك ببێتە هاوبەشی لە ماڵ و سامانی کچەکەدا.**

٥١٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ أَنَّ عُمَرَ حِينَ تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنِ ابْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ تُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ- فَقَالَ عُمَرُ: لَقِيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ. فَقَالَ: سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي. فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، ثُمَّ لَقِيَنِي فَقَالَ: بَدَا لِي أَنْ لاَ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا. قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ[3].

**٥١٢٩-سالیم دەڵێ: ئیبنو عومەر ﵄ بۆی گێڕایەوە کەعومەر کاتێ حەفصەی کچی عومەر بێوەژن کەوت (بەمردنی مێردەکەی)، کە ئیبنو حوزافەی سەهمی -**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

(٢) کە بە میرات بۆ هەردووکیان بەجێ ماوە.

(٣) بڕوانە: ٤٠٠٥.

**کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە لە بەشداربووانی غەزای بەدر بوو لە مەدینە مرد - عومەر دەڵێ بەعوسمانی کوڕی عەففان ﷺ گەشتم، پێشنیارم کرد بۆی وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەکەم، ئەویش وتی بیرێك لە کارم دەکەمەوە. ئینجا چەند شەوێك مامەوە (چاوەڕوان بووم) پاشان پێم گەیشت و وتی: بۆم ڕوون بۆتەوە لەم کات و ڕۆژگارەمدا ژن نەهێنم، عومەر دەڵێ: ئینجا بە ئەبو بەکر ﷺ گەشتم و وتم ئەگەر دەتەوێ حەفصەت لێ مارە دەکەم.**

٥١٣٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي عَمْرٍو قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ عَنْ يُونُسَ عَنِ الْحَسَنِ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴿٢٣٢﴾﴾ البقرة. قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ، قَالَ: زَوَّجْتُ أُخْتًا لِي مِنْ رَجُلٍ فَطَلَّقَهَا، حَتَّى إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا جَاءَ يَخْطُبُهَا، فَقُلْتُ لَهُ: زَوَّجْتُكَ وَفَرَشْتُكَ وَأَكْرَمْتُكَ، فَطَلَّقْتَهَا، ثُمَّ جِئْتَ تَخْطُبُهَا، لاَ وَاللَّهِ لاَ تَعُودُ إِلَيْكَ أَبَدًا، وَكَانَ رَجُلاً لاَ بَأْسَ بِهِ وَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴿٢٣٢﴾﴾ البقرة. فَقُلْتُ الآنَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَزَوَّجَهَا إِيَّاهُ[1].

**٥١٣٠-حەسەن دەربارەی: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴿٢٣٢﴾﴾[2] دەڵێ: مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ بۆی گێڕامەوە ئەو ئایەتە دەربارەی ئەو دابەزی، (مەعقیل) دەڵێ: خوشکێکی خۆم مارە کرد لە پیاوێك و تەڵاقیدا (وازی لێ هێنا)، هەتا ماوەی چاوەڕوانیەکەی بەسەر چوو هات خوازبێنی کردەوە، منیش پێم وت: کردمە هاوسەرت و کردم بەنوێن و ژێر خەرت و ڕێزم گرتیت کەچی تۆ تەڵاقتدا، پاشان هاتووی خوازبێنی دەکەیتەوە؟ نا بەخوا هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ لات، پیاوەکەش خراپ نەبوو ژنەکەش دەیویست بگەڕێتەوە بۆ لای، بەو هۆیەوە**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٣٩.

(٢) واتە: سەرپەرەشتیارانی ئافرەتان ڕێگری لە ئافرەتەکانیان مەکەن شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان کە تەڵاقیان داون.

خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴿٢٣٢﴾ ﴾ واتە: رێگری لە ئافرەتان مەکەن بگەرێنەوە (بۆ لای مێردەکانیان شوویان پێ بکەنەوە)، (مەعقیل) دەڵێ: منیش وتم: هەر ئێستا (ئەو کارە) دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، دەڵێ: ئیتر مارەی کردەوە بۆ پیاوەکە.

## ٣٨- بابٌ: إِذَا كَانَ الوَلِيُّ هُوَ الخَاطِبَ

وَخَطَبَ المُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ امْرَأَةً هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِهَا، فَأَمَرَ رَجُلًا فَزَوَّجَهُ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ لِأُمِّ حَكِيمٍ بِنْتِ قَارِظٍ أَتَجْعَلِينَ أَمْرَكِ إِلَيَّ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقَالَ: قَدْ تَزَوَّجْتُكِ. وَقَالَ عَطَاءٌ: لِيُشْهِدْ أَنِّي قَدْ نَكَحْتُكِ أَوْ لِيَأْمُرْ رَجُلًا مِنْ عَشِيرَتِهَا. وَقَالَ سَهْلٌ: قَالَتِ امْرَأَةٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَهَبُ لَكَ نَفْسِي. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا.

## ٣٨- باسێک: ئەگەر سەرپەرەشتیاری ئافرەتەکە خۆی خوازبێنی کەری ئافرەتەکە بوو

موغەیەرەی کوڕی شوعبە ﷺ خوازبێنی ئافرەتێکی کرد، موغیرە خۆی لە هەموو کەس نزیك تر بوو لە ئافرەتەکە ، بۆیە فەرمانی کرد بە پیاوێك لێی مارە بکات[1].

-عبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ بە ئوممو حەکیمی کچی قاریزی وت: کاری خۆت دەدەیتە دەستم؟ وتی: بەڵێ، عبدوڕەرحمان وتی: ئەوە مارەم کردیت لە خۆم.

-عەتا وتی: [1] با شایەت بگرێ لەسەری و بڵێ بە ئافرەتەکە بێگومان من تۆم مارەکرد، یان با فەرمان بکات بە کەسێك لە هۆزی ئافرەتەکە (لێی مارە بکات).

(١) واتە موغیرە خۆی وەلی ئافرەتەکە بوو، پیاوێکی کرد بە وەکیلی خۆی مارەی کرد لە موغیرە.

-سەهل ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ كرد وتی: خۆمت پێشكەش دەكەم، پیاوێكیش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر تۆ پێویستت بەو ئافرەتە نییە، ئەوا مارەی بكە بۆ من.

٥١٣١- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ، النساء. قَالَتْ: هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ الرَّجُلِ، قَدْ شَرِكَتْهُ فِي مَالِهِ، فَيَرْغَبُ عَنْهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، وَيَكْرَهُ أَنْ يُزَوِّجَهَا غَيْرَهُ، فَيَدْخُلَ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، فَيَحْبِسُهَا، فَنَهَاهُمُ اللَّهُ عَنْ ذَلِكَ[٢].

**٥١٣١-هیشام لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەربارەی ئەم فەرمایشتە: (وە (ئەی موحەممەد ﷺ) دەربارەی ئافرەتان پرسیارت لێ دەكەن، بڵێ خودا وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان) تا كۆتای ئایەتەكە، عائیشە دەڵێ: ئەوە كچێكی هەتیوە لای پیاوێكە، كە بەڕاستی كچەكە بۆتە هاوبەشی لە سامانەكەیدا و پیاوەكە حەز ناكات مارەی بكات، وە پێی ناخۆشە مارەشی بكات بۆ كەسێكی تر جگە لە خۆی و ببێتە هاوبەشی لە ماڵ و سامانەكەیدا [٣]، بۆیە دەیهێڵێتەوە (ڕێگە نادات شوو بكات)، ئیتر خوا ئەو ڕێگرییەی لێ قەدەغە كردن.**

٥١٣٢- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ، حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جُلُوسًا، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ تَعْرِضُ نَفْسَهَا عَلَيْهِ، فَخَفَّضَ فِيهَا النَّظَرَ وَرَفَعَهُ فَلَمْ يُرِدْهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ زَوِّجْنِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «أَعِنْدَكَ مِنْ

---

(١) ئبنو جورەیج دەڵێ: بە عەتام وت ئافرەتێک کوڕێکی ئامۆزای خوازبێنی دەکات، کەسی نییە جگە لەو ئامۆزایەی.

(٢) بڕوانە: ٢٤٩٤.

(٣) واتە: مێردی کچەکە دەبێتە هاوبەشی سەرپەرەشتیارەکە بەهۆی ژنەکەیەوە، ئەویش ئەوەی پێ خۆش نییە بۆیە ناهێڵێت شوو بکات.

شَيْءٍ؟». قَالَ: مَا عِنْدِي مِنْ شَيْءٍ. قَالَ: «وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ؟». قَالَ: وَلاَ خَاتَمًا مِنَ حَدِيدٍ وَلَكِنْ أَشُقُّ بُرْدَتِي هَذِهِ فَأُعْطِيهَا النِّصْفَ، وَآخُذُ النِّصْفَ. قَالَ: «لاَ، هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «اذْهَبْ فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

**٥١٣٢-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، ئافرەتێك هات خۆی پێشنیار کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ (کە مارەی بکات)، پێغەمبەریش ﷺ سەرنجی دا لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەڵام نەیویست، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵانی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا مارەی بکە بۆ من، فەرمووی: ((هیچت هەیە؟)) وتی: هیچم نییە، فەرمووی: ((ئەموستیلەیەکی ئاسنیشت نییە؟)) وتی: ئەموستیلەیەکی ئاسنیشم نییە، بەڵام ئەم بوردەم (پۆشاکەکەم) دەکەم بە دوو لەتەوە، لەتێکی دەدەم بەو ژنە لەتەکەی تری بۆ خۆم، فەرمووی: ((نەخێر، ئایا هیچ قورئانت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((بڕۆ بە دڵنیاییەوە ئەوا بۆتم مارەکرد بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە)).**

## ٣٩- بابُ إِنْكَاحِ الرَّجُلِ وَلَدَهُ الصِّغَارَ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ ۝٤﴾ الطلاق. فَجَعَلَ عِدَّتَهَا ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ قَبْلَ البُلُوغِ.

٥١٣٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَهَا وَهْيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، وَأُدْخِلَتْ عَلَيْهِ وَهْيَ بِنْتُ تِسْعٍ، وَمَكَثَتْ عِنْدَهُ تِسْعًا[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

(٢) بڕوانە: ٣٨٩٤.

## ٣٩- باسی پیاو منداڵی نابالغ بەشوو بدات (و ژنی بۆ بێنێ)

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەو کچانەش (لەبەر منداڵی) هێشتا حەزیان پیا نەهاتووە) جا خوا ماوەی چاوەڕوانی پێش باڵغ بوونیانی بەسێ مانگ داناوە.**

**٥١٣٣- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد تەمەنی شەش ساڵ بوو کاتێکیش گوێزرایەوە بۆی تەمەنی نۆ ساڵ بوو نۆ ساڵیش لای مایەوە (خێزانی بوو).**

## ٤٠- بابُ تَزْوِيجِ الأَبِ ابْنَتَهُ مِنَ الإِمَامِ

وَقَالَ عُمَرُ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيَّ حَفْصَةَ فَأَنْكَحْتُهُ[١].

٥١٣٤- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَهَا وَهْيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، وَبَنَى بِهَا وَهْيَ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. قَالَ هِشَامٌ: وَأُنْبِئْتُ أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَهُ تِسْعَ سِنِينَ[٢].

## ٤٠- باسی باوک کچەکەی مارە بکات لە پێشەوا

**-عومەر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی حەفصەی لێ کردم منیش مارەم کرد بۆی.**

**٥١٣٤- هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد تەمەنی شەش ساڵ بوو، کاتێکیش گوێزایەوە تەمەنی نۆ ساڵ بوو.**

**هیشام دەڵێ: گێڕدراوەتەوە بۆم کە عائیشە ﵂ نۆ ساڵ لای پێغەمبەر ﷺ بووە (هاوسەری بووە).**

---

(١) بڕوانە: ٤٠٠٥.

(٢) بڕوانە: ٣٨١٤.

# ٤١- بابٌ: السُّلْطَانُ وَلِيٌّ

بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: "زَوَّجْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ"

٥١٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي وَهَبْتُ مِنْ نَفْسِي. فَقَامَتْ طَوِيلاً، فَقَالَ رَجُلٌ: زَوِّجْنِيهَا، إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ. قَالَ: «هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا؟». قَالَ: مَا عِنْدِي إِلاَّ إِزَارِي. فَقَالَ: «إِنْ أَعْطَيْتَهَا إِيَّاهُ جَلَسْتَ لاَ إِزَارَ لَكَ، فَالْتَمِسْ شَيْئًا». فَقَالَ: مَا أَجِدُ شَيْئًا. فَقَالَ: «الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَلَمْ يَجِدْ، فَقَالَ: «أَمَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟». قَالَ: نَعَمْ سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا لِسُوَرٍ سَمَّاهَا. فَقَالَ: «زَوَّجْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

## ٤١- باسێک: سوڵتان و دەسەڵات دار سەرپەرەشتیارە [2]

**بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ: ((مارەمان کرد بۆت بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە)).**

**٥١٣٥-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ وتی: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من خۆم بەخشی پێت. ئینجا ئافرەتەکە ماوەیەکی زۆر وەستا، ئەوسا پیاوێك وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) مارەی بکە بۆ من ئەگەر تۆ خۆت پێویستت پێی نییە، فەرمووی: ((ئایا شتێکت هەیە بیکەیتە مارەیی بۆی؟)) وتی: هیچم نییە جگە لەم پۆشاکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەو پۆشاکەی پێ بدەی خۆت دادەنیشیت پۆشاکت نییە، بۆیە هەوڵی شتێکی تر بدە))، پیاوەکە وتی: هیچ شتێکم نییە، ئینجا فەرمووی: ((بگەڕێ با ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، بەڵام پیاوەکە هیچی دەست نەکەوت، ئەوسا**

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

(٢) ئەو ئافرەتەی سەرپەرەشتیاری نییە.

فەرمووی: ((ئایا هیچ قورئانت لەبەرە؟)) وتی: بەڵێ ئەو سورەتە و ئەو سورەتە چەند سورەتێکی ناو هێنا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مارەمان کرد بۆت بەو سورەتانەی لەبەرتە لە قورئان)).

## ٤٢- بَابٌ: لَا يُنْكِحُ الأَبُ وَغَيْرُهُ البِكْرَ وَالثَّيِّبَ إِلَّا بِرِضَاهَا

٥١٣٦- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ»[1].

## ٤٢- باسێک: باوک و غەیری باوک نە کچ نە بێوەژن نادات بە شوو، مەگەر بە ڕەزامەندی هەردووکیان

٥١٣٦-ئەبو سەلەمە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕانەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێوەژن مارە ناکرێ و نادرێ بە شوو تا ڕای وەر نەگیرێت، وە کچ نادرێ بە شوو تا مۆڵەتی (ڕازی بوونی) لێ وەر نەگیرێت))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خودا مۆڵەتی کچ چۆنە؟ فەرمووی: ((ئەوەیە کە (وتت ڕازیت) بێدەنگ بێت)).

٥١٣٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ الرَّبِيعِ بْنِ طَارِقٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ أَبِي عَمْرٍو - مَوْلَى عَائِشَةَ- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي. قَالَ: «رِضَاهَا صَمْتُهَا»[2].

٥١٣٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان کچ شەرم دەکات (کە قسە بکات) [1]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕازی بوونی کچ (بە شوو کردن) بێدەنگ بوونیەتی)).

---

(١) بڕوانە: ٦٩٦٨، ٦٩٧٠.

(٢) بڕوانە: ٦٩٤٦، ٦٩٧١.

## ٤٣- بابٌ: إِذَا زَوَّجَ ابنتَهُ وَهْيَ كَارِهَةٌ، فَنِكَاحُهُ مَرْدُودٌ

٥١٣٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَمُجَمِّعٍ ابْنَيْ يَزِيدَ بْنِ جَارِيَةَ، عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ، أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهُ[٢].

## ٤٣- باسێک: ئەگەر پیاوێک کچەکەی دا بەشوو کچەکە ڕازی نەبوو، ئەوە مارەکردنەکەی دانەمەزراوە

**٥١٣٨-عەبدوڕەحمان و موجەممعی کوڕانی یەزیدی کوڕی جارییە دەگێڕنەوە لە خەنسای کچی خیزامی ئەنصاریەوە ﵂ کە ئەو بێوەژن بوو باوکی دای بە شوو، بەڵام ئەو (خەنسا) ڕازی نەبوو بەو بەشوودانە و ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش مارە کردنەکەی پوچەڵ کردەوە[٣].**

٥١٣٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ وَمُجَمِّعَ بْنَ يَزِيدَ حَدَّثَاهُ أَنَّ رَجُلاً يُدْعَى خِذَامًا أَنْكَحَ ابْنَةً لَهُ.نحوَهُ[٤].

**٥١٣٩-قاسیمی کوڕی موحەممەد گێڕایەوە کە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید و موجەممیعی کوڕی یەزید هەردووکیان بۆ قاسیمیان گێڕایەوە، کە پیاوێك پێی دەوترا خیزام کچێکی خۆی دا بەشوو. ئیتر بەوێنەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە**

---

(١) کاتێک پرسی پێ دەکرێت ڕازی بێت بدرێت بە شوو یان نا.

(٢) بڕوانە: ٥١٣٩. ٦١٤٥، ٦٩٦٩.

(٣) بە دانەمەزراوی لە قەڵەمدا.

(٤) بڕوانە: ٥١٣٨.

# ٤٤- بابُ تَزْوِيجِ الْيَتِيمَةِ

لِقَوْلِهِ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. وإِذَا قَالَ للوَلِيِّ للخاطب: زَوِّجْنِي فُلَانَة. فسكت سَاعَةً أَوْ قَالَ: مَا مَعَكَ؟ قَالَ: مَعِي كَذَا وَكَذَا. أَوْ لَبِثَا ثُمَّ قَالَ: زَوَّجْتُكَهَا. فَهْوَ جَائِزٌ. فِيهِ سَهْلٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥١٤٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂ قَالَ لَهَا يَا أُمَّتَاهْ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ﴿٣﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا ابْنَ أُخْتِي، هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، فَيَرْغَبُ فِي جَمَالِهَا وَمَالِهَا، وَيُرِيدُ أَنْ يَنْتَقِصَ مِنْ صَدَاقِهَا، فَنُهُوا عَنْ نِكَاحِهِنَّ. إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ فِي إِكْمَالِ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا بِنِكَاحِ مَنْ سِوَاهُنَّ مِنَ النِّسَاءِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: اسْتَفْتَى النَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴿١٢٧﴾ ﴾ إلى ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ لَهُمْ فِي هَذِهِ الآيَةِ أَنَّ الْيَتِيمَةَ إِذَا كَانَتْ ذَاتَ مَالٍ وَجَمَالٍ، رَغِبُوا فِي نِكَاحِهَا وَنَسَبِهَا وَالصَّدَاقِ، وَإِذَا كَانَتْ مَرْغُوبًا عَنْهَا فِي قِلَّةِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، تَرَكُوهَا وَأَخَذُوا غَيْرَهَا مِنَ النِّسَاءِ. قَالَتْ: فَكَمَا يَتْرُكُونَهَا حِينَ يَرْغَبُونَ عَنْهَا، فَلَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَنْكِحُوهَا إِذَا رَغِبُوا فِيهَا، إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهَا وَيُعْطُوهَا حَقَّهَا الأَوْفَى مِنَ الصَّدَاقِ[1].

# ٤٤- باسی بەشوودانی کچی هەتیوو

**بە بەڵگەی فەرمایشتی خوای گەورە: (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتانەی بێ باوکن (مارەیان مەکەن)، ئەو (ئافرەتانە) مارەکەن).**

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

ئەگەر پیاوێ بڵێ: بەسەرپەرشتیار: فلآنە کچم لێ مارە بکە، ئینجا ماوەیەك مایەوە یان وتی: چیت هەیە (بیدەیت وەك مارەیی)؟ ئەویش وتی: ئەوە و ئەوەم هەیە، یان هەردووکیان ماوەیەك مانەوە پاشان سەرپەرشتیار وتی: مارەم کرد بۆت، ئەو دروستە.

-لەبارەی ئەم باسەوە فەرموودەکەی سەهل کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە هەیە[1].

٥١٤٠- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عورووەی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە کە ئەو پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد (لەبارەی ئەم ئایەتەوە)، (وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانە (مارەیان مەکەن)، وە لەو ئافرەتانە مارە بکەن حەڵاڵن بۆتان، دوو دوو یان سێ سێ یان چوار چوار، جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن ئەوە یەك ئافرەت (مارە بکەن لەوانەی ئازادن )، عائیشە ﵂ وتی: ئەی برازای خۆم ئەوەی (کە ئایەتەکە دەیفەرموێ) کچێکی هەتیوە لە لای سەرپەرەشتی کارەکەیەتی وحەزی لەجوانی و سامانەکەیەتی، وە دەیەوێت کەمتر لە مارەی خۆی بداتێ (و مارەی کات)، بۆیە ئەو سەرپەرەشتیارانە ڕێگری کران لە مارەکردن ئەو کچە هەتیوانە، مەگەر دادگەر بن لە پێدانی مارەییەکەیان بە تەواوی، وە پیاوان فەرمانیان پێ کرا بە مارەکردنی ئافرەتانی تر جگە لەوان، (عائیشە ﵂) دەڵێ: خەڵکی لە پاش ئەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( (ئەی موحەممەد ﷺ ) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتان)، تا دەگاتە (وە حەز ناکن مارەیان بکەن) جا خوا لەم ئایەتی بۆ دابەزاندن: کچی هەتیو ئەگەر جوان بوو سامانی هەبوو حەزیان لە مارە کردن و ڕەچەڵەکێتی

(١) بوخاری گێراویەتیەوە بە ژمارە (٢٣١٠) لە صەحیحی بوخاریدا.

مارەییەكەی بۆ تەواو دەكەن [١]، وە ئەگەر حەزی لێ نەكرا لەبەر كەم ماڵی و كەم جوانی وازی لێ دێنن و جگە لەو ئافرەتانی تر مارە دەكەن، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا هەر چۆنێ ئەگەر حەزیان لێ نەكرد وازی لێ دێنن، بە هەمان شێوە بۆیان نییە مارەی بكەن ئەگەر حەزیان لێی بوو، مەگەر دادگەر بن لەگەڵی دا و مافی خۆی پێ بدەن لە مارەییەكەی بە تەواوی و تێر و تەسەلی)).

## ٤٥- بابٌ: إِذَا قَالَ الخَاطِبُ لِلْوَلِيِّ: زَوِّجْنِي فُلاَنَةَ. فَقَالَ: قَدْ زَوَّجْتُكَ بِكَذَا وَكَذَا. جَازَ النِّكَاحُ، وَإِنْ لَمْ يَقُلْ لِلزَّوْجِ: أَرَضِيتَ أَوْ قَبِلْتَ؟

٥١٤١- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، فَقَالَ: «مَا لِي الْيَوْمَ فِي النِّسَاءِ مِنْ حَاجَةٍ». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَوِّجْنِيهَا. قَالَ: «مَا عِنْدَكَ؟». قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ. قَالَ: «أَعْطِهَا وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ. قَالَ: «فَمَا عِنْدَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ: عِنْدِي كَذَا وَكَذَا. قَالَ: «فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[٢].

## ٤٥- باسێك: ئەگەر خوازبێنیكەر وتی بەسەرپەرشتیار فڵانە ئافرەتم لێ مارە بكە ئەویش وتی: بێگومان بۆم مارە كردی بەم شتە و بەو شتە[٣] مارە كردنەكە دروستە، با نەشڵێ بە مێردەكە: ئایا ڕازیت یان قەبوڵی دەكەیت؟

٥١٤١-سەهل ﵁ دەگێڕێتەوە كە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و جا خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ پێشنیار كرد (مارەی كات)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

(١) وەک هاوشێوەکانی.
(٢) بڕوانە: ٢٣١٩.
(٣) مارەیی ژنەكە بێت تۆ بیدەیت.

((من لەم ڕۆژگارەدا پێویستم بە ژن نییە))، ئینجا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی بکە بۆ من، فەرمووی: ((چیت هەیە؟[1])) وتی: هیچم نییە، فەرمووی: ((شتێکی پێ بدە با ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، پیاوەکە وتی: هیچم نییە، فەرمووی (ئەی لە قورئان چیت پێیە و لەبەرە؟)) وتی: ئەوە و ئەوەم لەبەرە، فەرمووی: ((بێگومان ئەوە کردمە هاوسەرت بەو ئەندازە قورئانەی پێتە و لەبەرتە)).

## ٤٦- بابُ لَا يَخْطُبُ على خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَدَعَ

٥١٤٢- حَدَّثَنَا مَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ نَافِعًا يُحَدِّثُ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ على بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ يَخْطُبَ الرَّجُلُ على خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ[2].

## ٤٦- باسی نابێ خوازبێنی بکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا، هەتا مارەی دەکات یان وازی لێ دێنێت

٥١٤٢-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کەسێکتان سەودا و مامەڵە بکات بەسەر سەودا و مامەڵەی کەسێکی ترتاندا، هەروەها کەسێك خوازبێنی بکات بەسەر خوازبێنی براکەیدا تا خوازبێنی کەرەکەی پێش ئەو وازی لێ دێنێ، یان خوازبێنیکەر مۆڵەتی دەدات.

(١) وەک مارەیی پێی بدەیت.

(٢) بڕوانە: ٢١٣٩.

٥١٤٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنِ الأَعْرَجِ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَأْثُرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَكُونُوا إِخْوَانًا»[1].

**٥١٤٣-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ، چونکە بەڕاستی بەدگومانی درۆترین وتە و قسەیە، بەدوای ناتەواوی یەکتردا مەگەڕێن[2]، سیخوڕی و جاسوسی مەکەن[3] ڕقتان لەیەکتر نەبێت[4]، برای یەکتری بن)).**

٥١٤٤- «وَلاَ يَخْطُبُ الرَّجُلُ على خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَنْكِحَ، أَوْ يَتْرُكَ»[5].

**٥١٤٤- ((با پیاو خوازبێنی بەسەر خوازبێنی براکەیدا نەکات تا مارەی دەکات یان وازی لێ دێنێ)).**

## ٤٧- بابُ تَفسيرِ تَرْكِ الخِطْبَةِ

٥١٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يُحَدِّثُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ حِينَ تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ قَالَ عُمَرُ: لَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ. فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ إِلاَّ أَنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ ذَكَرَهَا، فَلَمْ أَكُنْ لأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا. تَابَعَهُ يُونُسُ وَمُوسَى بْنُ عُقْبَةَ وَابْنُ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[6].

---

(١) بڕوانە: ٦٠٦٤، ٦٠٦٦، ٦٧٢٤.
(٢) یان هەست هەڵ مەگرن بە نیازی خراپ.
(٣) یان گوێ مەگرن بۆقسەی خەڵک.
(٤) یەکتری مەبوغزێنن.
(٥) بڕوانە: ٢١٤٠.
(٦) بڕوانە: ٤٠٠٥.

## ٤٧- باسی ڕاڤه و مانای واز هێنان له خوازبێنی

٥١٤٥-عبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کەعومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کاتێ حەفصە ﷺ بێوەژن کەوت، عومەر دەڵێ: بە ئەبو بەکر ﷺ گەشتم و وتم: ئەگەر دەتەوێ حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم. ئینجا چەند شەوێك مامەوە چاوەڕوان بووم)، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خوازبێنی کرد، جا ئەبو بەکر گەیشت پێم و وتی: بەڕاستی هیچ شتێك ڕێگرم نەبوو وەڵامت بدەمەوە دەربارەی ئەوەی پێشنیارت کرد بۆم، تەنها ئەوە بوو بە دڵنیاییەوە من زانیبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی حەفصەی کردوە، جا بۆ من ڕەوا نەبوو نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا بکەم، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وازی لێ بهێنایە بێگومان من قبوڵم دەرکرد.

-یونس و مووسای کوڕی عوقبە و ئیبنو ئەبی عەتیق لە زوهریەوە دەگێڕنەوە و پاڵپشتی شوعەیبی کوڕی ئەبی حەمزە دەکەن لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا.

## ٤٨- بابُ الخُطْبَةِ

٥١٤٦- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ جَاءَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا»[1].

## ٤٨- باسی وتاردان (پێش خوازبێنی سوننەتە)

٥١٤٦-زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: لە ئیبنو عومەرم ﷺ بیست دەیوت: دوو پیاو لە ڕۆژهەڵات (ی مەدینە) وە هاتن وتاریان دا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی هەندێ لە ڕەوان بێژی وەك جادوو و سیحر وایە)) [1].

---

(١) بڕوانە: ٥٧٦٧.

## ٤٩- بَابُ ضَرْبِ الدُّفِّ فِي النِّكَاحِ وَالْوَلِيمَةِ

٥١٤٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ ذَكْوَانَ قَالَ: قَالَتِ الرُّبَيِّعُ بِنْتُ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ: جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَدَخَلَ حِينَ بُنِيَ عَلَيَّ، فَجَلَسَ على فِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ مِنِّي، فَجَعَلَتْ جُوَيْرِيَاتٌ لَنَا يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ وَيَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ آبَائِي يَوْمَ بَدْرٍ، إِذْ قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ. فَقَالَ: «دَعِي هَذِهِ، وَقُولِي بِالَّذِي كُنْتِ تَقُولِينَ»[٢].

## ٤٩- باسی دەف لێدان لە کاتی ژن هێنان و زەماوەنددا (دروستە)

**٥١٤٧-خالیدی کوڕی زەکوان وتی: ڕوبەییعی کچی موعەوویزی کوڕی عەفرا وتی: ئەو کاتەی برابووم بە بوکێنی، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام و لەسەر ئەو نوێنەی من دانیشت کە تۆ لەسەری دانیشتووی لە نزیکمەوە، چەند کچۆڵەیەك کەهی خۆمان بوون دەستیان کرد بە دەف لێدان، ئەوانەیان دەلاواندەوە لە باوانی من کە لە غەزای ئوحوددا کوژرابوون (بەردەوام بوون)، لەپڕ کچۆڵەیەکیان وتی: ئێمە پێغەمبەرێکمان تیایە دەزانێ سبەینێ چی دەبێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کچێ وا مەڵێ لە پێشدا چیت دەوت هەر لەو بابەتە بڵێ[١])).**

## ٥٠- بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ﴿٤﴾ ﴾ النساء وَكَثْرَةِ المَهْرِ، وَأَدْنَى مَا يَجُوزُ مِنَ الصَّدَاقِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ﴿٢٠﴾ ﴾ النساء. وَقَوْلِهِ: ﴿ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ ﴿٢٣٦﴾ ﴾ البقرة. - وَقَالَ سهلٌ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ"[٣].

---

(١) یان هەندێ لە ڕەوانبێژی سیحر و جادووی تیایە، سەرنجی گوێگر ڕادەکێشن و سەرسام دەبێت پێی.
(٢) بڕوانە: ٤٠٠١.
(٣) بڕوانە: ٢٣١٠.

٥١٤٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً على وَزْنِ نَوَاةٍ، فَرَأَى النَّبِيُّ ﷺ بَشَاشَةَ العُرْسِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً على وَزْنِ نَوَاةٍ[1].

## ٥٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بیدەن بە ئافرەتان (نەک کەس و کاریان) مارەییەکانیان وەک بەخشین (نەک وەک کرێ))، وە زۆری مارەیی و کەمترینی مارەیی کە دروستە لە مارەییدا (چەندە)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ماڵێکی زۆرتان (بەمارەیی) دابێت بەیەکێ لە ژنەکانتان ئەوە هیچ شتێکی لێی مەسەننەوە)، لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (یا مارەییتان بۆ دانابن).

**-سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت)).**

**٥١٤٨-ئەنەس ﷺ دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ ئافرەتێکی مارەکرد لەسەر کێشی دەنکی خورمایەك[2] ئاڵتون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ شادی و خۆشی ژن گواستنەوەی پێوە بینی، بۆیە پرسیاری لێ کرد، عەبدوڕەحمانیش وتی: بێگومان ئافرەتێکم مارە کردوە لەسەر کێشی دەنکە خورمایەك ئاڵتوون.**

٥١٤٨م- وَعَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ.

**٥١٤٨م- ئەنەس[3] ﷺ دەگێڕێتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عوفەوە ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکی مارە کرد لەسەر کێشی دەنکە خورمایەك ئاڵتون.**

(١) بڕوانە: ٢٠٤٩.

(٢) کە نرخی لەوکاتدا پێنج درهەم بووە. **بڕوانە : إرشاد الساری: ٤٢٨/١١.**

(٣) ڕێگەی دووهەم بۆ فەرموودەکەی پێشوو.

## ٥١- بابُ التَّزْوِيجِ عَلَى الْقُرْآنِ وَبِغَيْرِ صَدَاقٍ

٥١٤٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، سَمِعْتُ أَبَا حَازِمٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ يَقُولُ: إِنِّي لَفِي الْقَوْمِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِذْ قَامَتِ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لَكَ، فَرَ فِيهَا رَأْيَكَ، فَلَمْ يُجِبْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لَكَ، فَرَ فِيهَا رَأْيَكَ: فَلَمْ يُجِبْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتِ الثَّالِثَةَ فَقَالَتْ: إِنَّهَا قَدْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لَكَ، فَرَ فِيهَا رَأْيَكَ: فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْكِحْنِيهَا. قَالَ: «هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «اذْهَبْ فَاطْلُبْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ فَطَلَبَ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: مَا وَجَدْتُ شَيْئًا وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ. فَقَالَ: «هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟». قَالَ مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا. قَالَ: «اذْهَبْ فَقَدْ أَنْكَحْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[1].

## ٥١- باسی مارە بڕینی ئافرەت لەسەر (فێرکردنی) قورئان، بەبێ (ناو هێنانی) مارەیی

**٥١٤٩-سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: من لە ناو کۆمەڵێك خەڵكدا بووم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، لە ناکاو ئافرەتێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو (ئافرەتەکە) خۆی بەخشی بەتۆ، تۆش ڕات لە باریەوە بفەرموو، هیچ وەڵامیکی نەدایەوە، پاشان هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو خۆی بەخشی بەتۆ، تۆش ڕات لە بارەیەوە بفەرموو، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، پاشان بۆ سێیەم جار هەستایەوە و وتی: ئەو خۆی بەخشی بەتۆ، تۆش ڕات لەبارەیەوە بفەرموو، ئینجا پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مارەی بکە بۆ من، فەرمووی: ((هیچ شتێکت هەیە؟)) وتی: نەخێر،**

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

فەرمووی: ((بڕۆ بگەڕێ با موستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەویش ڕۆشت و گەڕا پاشان هاتەوە و وتی: هیچم دەست نەکەوت هەتا موستیلەیەکی ئاسنیش، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا هیچ قورئانت لەبەرە؟)) وتی: ئەو سورەتە و ئەو سورەتەم لەبەرە، فەرمووی: ((بڕۆ ئەوا کردمە هاوسەرت بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە)).

## ٥٢- بَابُ المَهْرِ بِالْعُرُوضِ وَخَاتَمٍ مِنْ حَدِيدٍ

٥١٥٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: «تَزَوَّجْ وَلَوْ بِخَاتَمٍ مِنْ حَدِيدٍ»[1].

## ٥٢- باسی مارەی بە کاڵاو ئەموستیلەی ئاسن

٥١٥٠-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ((ژن بێنە با بە ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت)).

## ٥٣- بَابُ الشُّرُوطِ فِي النِّكَاحِ

وَقَالَ عُمَرُ: مَقَاطِعُ الحُقُوقِ عِنْدَ الشُّرُوطِ. وَقَالَ المِسْوَرُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ ذَكَرَ صِهْرًا لَهُ فَأَثْنَى عَلَيْهِ فِي مُصاهَرَتِهِ فَأَحْسَنَ، قَالَ: "حَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وَوَعَدَنِي فَوَفَى لِي".

٥١٥١- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَقُّ مَا أَوْفَيْتُمْ مِنَ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٠.

## ٥٣- باسی ئەو مەرجانەی لە ژن هێناندا (دروستە)

-عومەر ﷺ وتی: مەرجەكان یەكلا كەرەوەی مافەكانە[٢].

-میسومر دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست باسی زاوایەكی دەكرد و ستایشی كرد لە زاوایەتی كردنەكەیدا جوان هەڵسوكەوتی كردوە، وە فەرمووی: ((قسەی لەگەڵ كردم و ڕاستی كرد، وە بەڵێنی پێدام بەڵێنەكەی بۆ بەجێ هێنام)).

٥١٥١-عوقبە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ڕەواترینی مەرجەكان كە داواتان لێ كراوە وەفای پێ بكەن، ئەو مەرجانەیە داوێنی هاوسەرەكانتان پێ حەڵاڵ كردوە)).

## ٥٤- بابُ الشُّرُوطِ التي لَا تَحِلُّ فِي النِّكَاحِ

وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ: لَا تَشْتَرِطِ المَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا.

٥١٥٢- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ زَكَرِيَّاءَ -هُوَ ابْنُ أَبِي زَائِدَةَ- عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا، فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا»[٣].

## ٥٤- باسی ئەو مەرجانەی كە لە ژن هێناندا دروست نییە

-ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: ژن دروست نییە (بۆ شووكردنی بەكەسێك) مەرجی تەڵاقدانی خوشكەكەی[٤] بكاتە مەرج.

---

(١) بڕوانە: ٢٧٢١.

(٢) واتە: هەر مەرجێک لە نێوان پیاو و ئافرەتدا دانرابێ دەبێ پێوەی پابەند بن، وە مەرجەكان و مافەكان هەر لایەكیان دەچەسپێنێ، بەڵام نابێ مەرجەكان ناشەرعی بن.

(٣) بڕوانە: ٢١٤٠.

(٤) واتە: ئەو ژنەی دەبێتە هەوێی و ژنی ئەو پیاوەیەی ئەم دەیەوێت شووی پێ بكات.

**٥١٥٢-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە كە فەرموویەتی: ((بۆ ئافرەت ڕەوا نییە[1] داوای تەڵاقی خوشكەكەی (هەویەكەی) بكات دەفرەكەی خاڵی بكات[2]، چونكە بێگومان ئەوەی بۆی بڕیار دراوە بۆی دەبێت)).**

## ٥٥- بابُ الصُّفْرَةِ لِلْمُتَزَوِّجِ

وَرَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥١٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: «كَمْ سُقْتَ إِلَيْهَا؟». قَالَ زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[3].

## ٥٥- باسی (حوكمی بەكارهێنانی) بۆنی خۆش زەعفەران بۆ ژن هێنەر

**- (ئەو فەرموودە لەو بارەیەوە هاتووە) عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٥١٥٣-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە كە عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاسەواری زەعفەران و زەردی پێوە بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ كرد، ئەویش هەواڵی پێدا كە ئافرەتێكی ئەنصاری مارە كردوە، فەرمووی: ((چەند مارەیت پێ داوە؟)) وتی: كێشی دەنكە خورمایەك ئاڵتون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خواردنی زەماوەند دروستكە، با بە مەڕێكیش بێت)).**

---

(١) كاتێ پیاوێكی خێزاندار خوازبێنی دەكات.

(٢) واتە پیاوەكە بۆ خۆی یەكلا بكاتەوە و ژنەكەی تر تەڵاق بدات.

(٣) بڕوانە: ٢٠٤٩.

## ٥٦- بابٌ

٥١٥٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ أَوْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ بِزَيْنَبَ فَأَوْسَعَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرا، فَخَرَجَ -كَمَا يَصْنَعُ إِذَا تَزَوَّجَ - فَأَتَى حُجَرَ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ يَدْعُو وَيَدْعُونَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَرَأَى رَجُلَيْنِ فَرَجَعَ، لاَ أَدْرِي آخْبَرْتُهُ أَوْ أُخْبِرَ بِخُرُوجِهِمَا[١].

## ٥٦- باسێک

**٥١٥٤-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەهۆی (گواستنەوەی) زەینەبەوە خواردنی زەماوەندی ساز کرد و خواردنی زۆری دایە مسوڵمانان، ئینجا ڕۆشتە دەرەوە لە ماڵ -بەو جۆرەی کە ژنی بهێنایە وای دەکرد- ئەوسا هاتە بۆ ماڵەکانی دایکانی باوەڕداران (گشت خێزانەکانی)، پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد (بۆ خێزانەکانی) و ئەوانیش دوعایان دەکرد (بۆ ئەو)، لە پاشان گەڕایەوە (لە ماڵی ئەو خێزانانە) و دوو پیاوی بینی و گەڕایەوە، ئینجا نازانم من هەواڵم دایە یان هەواڵی پێ درا بە ڕۆشتنی ئەو دوو پیاوە.**

## ٥٧- بابٌ: كَيْفَ يُدْعَى لِلْمُتَزَوِّجِ

٥١٥٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -هُوَ ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ، قَالَ: «مَا هَذَا؟». قَالَ إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[٢].

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

(٢) بڕوانە: ٢٠٤٩.

## ٥٧- باسێک: چۆن دوعا دەکرێت بۆ کەسێک ژنی هێنابێ

**٥١٥٥-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ئاسەواری زەعفەرانی بینی فەرمووی: ((ئەمە چی یە؟)) وتی: ژنێکم هێناوە لەسەر کێشی دەنکە خورمایەك ئاڵتوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا فەڕ و بەرەکەتت بەسەردا بڕژێ، خواردنی زەماوەند ساز بکە با بە مەڕێکیش بێت)).**

## ٥٨- بابُ الدُّعَاءِ لِلنِّسَاءِ اللَّاتِي يَهْدِينَ العَرُوسَ، وَلِلْعَرُوسِ

٥١٥٦- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَأَتَتْنِي أُمِّي فَأَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ فَقُلْنَ: على الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ[1].

## ٥٨- باسی دوعا کردن بۆ ئەو ژنانەی بووکەکە دەبەن وە بۆ بووکەکەش

**٥١٥٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مارەی کردم، ئینجا دایکم هات بۆلام و بردمیە ژوورەوە بۆ ماڵەوە، جا بینیم کۆمەڵێ ئافرەتی ئەنصاری لە ماڵماندان، جا ئافرەتەکان وتیان: (بە ئوممو ڕۆمان و ئەو ژنانەی لەوێ بوون) لەسەر خێر و بەرەکەت (هاتوون) خوا پیرۆزی کات بە بەختی باش[2].**

---

(١) بڕوانە: ٣٨٩٤.

(٢) واتە: بووکەکە تووشی فەڕو بەرەکەت و خۆشی ببێت.

## ٥٩- بابُ مَنْ أَحَبَّ البِنَاءَ قَبْلَ الغَزْوِ

٥١٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «غَزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَقَالَ لِقَوْمِهِ: لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهْوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا وَلَمْ يَبْنِ بِهَا»[١].

## ٥٩- باسی ئەو کەسەی حەز بکات پێش چوون بۆ غەزا ژن بگوێزێتەوە [٢]

**٥١٥٧-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((پێغەمبەرێك[٣] لە پێغەمبەران غەزای کرد ئینجا بە گەلەکەی [٤] وت: پیاوێك لەگەڵمدا نەیەت و شوێنم نەکەوێت کە ئافرەتێکی مارە کردوە و دەیەوێت بچێتە لای و هێشتا نەچۆتە لای (لەگەڵی دا جووت نەبووە) )).**

## ٦٠- بابُ مَنْ بَنَى بِامْرَأَةٍ وَهْيَ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ

٥١٥٨- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ: عَنْ عُرْوَةَ تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ عَائِشَةَ وَهْيَ ابْنَةُ سِتٍّ وَبَنَى بِهَا وَهْيَ ابْنَةُ تِسْعٍ وَمَكَثَتْ عِنْدَهُ تِسْعًا[٥].

---

(١) بروانە: ٣١٢٤.
(٢) بروانە لای و ببێتە زاوا.
(٣) کە یوشع یان داوود بوو.
(٤) بەنی ئیسرائیل بوو.
(٥) بروانە: ٣٨٩٤.

## ٦٠- باسی کەسێک چووبێتە پەردەی بووکێنی ئافرەتێک کە کچێکی تەمەن نۆ ساڵانە

**٥١٥٨-عوروە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عائیشە ﵂ مارە کرد کە تەمەنی شەش ساڵ بوو وە گواستێوە[١] کەتەمەنی نۆ ساڵ بوو، نۆساڵیش لای پێغەمبەر ﷺ مایەوە[٢].**

## ٦١- بابُ البِنَاءِ فِي السَّفَرِ

٥١٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثَلاَثًا يُبْنَى عَلَيْهِ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ، فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ، فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلاَ لَحْمٍ، أَمَرَ بِالأَنْطَاعِ فَأُلْقِيَ فِيهَا مِنَ التَّمْرِ وَالأَقِطِ وَالسَّمْنِ، فَكَانَتْ وَلِيمَتَهُ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ أَوْ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ؟ فَقَالُوا: إِنْ حَجَبَهَا فَهْيَ مِنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، وَإِنْ لَمْ يَحْجُبْهَا فَهْيَ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ فَلَمَّا ارْتَحَلَ وَطَّى لَهَا خَلْفَهُ، وَمَدَّ الْحِجَابَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ[٣].

## ٦١- باسی بوون بە زاوا لە سەفەردا [٤]

**٥١٥٩- ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان خەیبەرو مەدینەدا سێ ڕۆژ مایەوە صەفییەی کچی حوییەی بۆ گوێزرایەوە (چووە پەردەی زاوایەتی)، جا مسوڵمانانم بانگ کرد بۆ خواردنی زەماوەندەکەی (پێغەمبەر ﷺ)، وە ئەو**

---

(١) لەگەڵی جووت بوو، سەرجێی لەگەڵ کرد.

(٢) هاوسەری بوو تا وەفاتی کرد.

(٣) بڕوانە: ٣٧١.

(٤) لە سەفەردا گواستنەوەی هاوسەر و چوونە لای و بوون بەزاوا لە سەفەردا.

خواردنە نە نان نەگۆشتی تیا نەبوو، فەرمانی کرد پارچە چەرمێك دانرا و جا خورما و کەشك و ڕۆنی کرایە سەر، ئەوە خواردنی زەماوەندەکەی بوو، مسوڵمانان وتیان: (ئەم هاوسەرە) یەکێکە لە دایکی باوەڕداران، یا لەو کەنیزەکانەیە کە بۆتە خاوەنی؟ ئینجا وتیان: ئەگەر حیجابی بۆ کرد (شاردیەوە) ئەو یەکێکە لە دایکی باوەڕداران، بەڵام ئەگەر حیجابی بۆ نەکرد ئەوە لەو کەنیزەکانەیە کە بووەتە خاوەنی، جا کاتێ (ویستی بەرێکەوێ و) بڕوات، لە پاشکۆی خۆیەوە جێگایەکی بۆ (صەفییە) ئامادەکرد و پەردەیەکی لە نێوان صەفییە و خەڵکەکەدا گێڕایەوە.

## ٦٢- بابُ البِنَاءِ بِالنَّهَارِ بِغَيرِ مَرْكَبٍ وَلَا نِيرَانٍ

٥١٦٠- حَدَّثَنِي فَرْوَةُ بْنُ أَبِي المَغْرَاءِ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ ﷺ، فَأَتَتْنِي أُمِّي فَأَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ضُحًى[1].

## ٦٢- باسی (گواستنەوەی بووک) و بوون بەزاوا بە ڕۆژ دا بە بێ وڵاخی سواری و بە بێ ئاگر[2]

٥١٦٠-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مارەی کردم، ئینجا دایکم هات بۆ لام و بردمێ ژوورەوە بۆماڵەوە ئیتر (ئاگام لێ نەبوو (لە پڕ لە چێشتەنگاودا پێغەمبەری خوا (هاتە ژوورەوە بۆ لام) )).

---

(١) بڕوانە: ٣٨٩٤.

(٢) واتە: نە وڵاخی سوار تیا بێ نە ئاگر کردنەوە، داگیرساندنی مۆم و شتی وا، بەڵکو بووکەکە بە پیادە ببرێ بۆ ماڵی زاوا.

## ٦٣- بَابُ الأَنْمَاطِ وَنَحْوِهَا لِلنِّسَاءِ

٥١٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلِ اتَّخَذْتُمْ أَنْمَاطًا؟». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: «إِنَّهَا سَتَكُونُ»[1].

## ٦٣- باسی هەبوونی ڕاخەری نەرم و نۆڵ و شتی لەو جۆرە بۆ ئافرەتان (دروستە)

**٥١٦١-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا ڕاخەری نەرم و نۆڵتان هەیە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ڕاخەری نەرم و نۆڵمان لەکوێ بوو؟ فەرمووی: ((بێگومان لە داهاتوودا پەیدا دەبێت)).**

## ٦٤- بَابُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي يَهْدِينَ الْمَرْأَةَ إِلَى زَوْجِهَا

٥١٦٢- حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ يَعْقُوبَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا زَفَّتِ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ «يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمُ اللَّهْوُ»

## ٦٤- باسی ئەو ژنانەی بووک دەبەن بۆ مێردەکەی (وە دوعای فەڕ و بەرەکەت کردنیان بۆیان) [2]

**٥١٦٢-عوروە لە باوکیەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ ئەو (عائیشە) بوکێکی گواستەوە بۆ پیاوێکی ئەنصاری، پێغەمبەری خواش ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٩٤.

(٢) ئەم زیادەیە لە یەکێک لە نوسخەکانی بوخاریدا هەیە. **بڕوانە : إرشاد الساری: ١١/٤٤٠.**

**فەرمووی: ((ئەی عائیشە هۆی دڵخۆشکەرتان لەگەڵ بوو، چونکە بێگومان ئەنصارییەکان حەزیان لە شتی دڵخۆشکەرە))** [١].

## ٦٥- بابُ الهَدِيَّةِ لِلْعَرُوسِ

٥١٦٣- وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: عَنْ أَبِي عُثْمَانَ -وَاسْمُهُ الْجَعْدُ- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: مَرَّ بِنَا فِي مَسْجِدِ بَنِي رِفَاعَةَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا مَرَّ بِجَنَبَاتِ أُمِّ سُلَيْمٍ دَخَلَ عَلَيْهَا فَسَلَّمَ عَلَيْهَا. ثُمَّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ عَرُوسًا بِزَيْنَبَ، فَقَالَتْ لِي أُمُّ سُلَيْمٍ: لَوْ أَهْدَيْنَا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ هَدِيَّةً فَقُلْتُ لَهَا: افْعَلِي. فَعَمَدَتْ إِلَى تَمْرٍ وَسَمْنٍ وَأَقِطٍ، فَاتَّخَذَتْ حَيْسَةً فِي بُرْمَةٍ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا مَعِي إِلَيْهِ، فَانْطَلَقْتُ بِهَا إِلَيْهِ، فَقَالَ لِي: «ضَعْهَا». ثُمَّ أَمَرَنِي فَقَالَ: «ادْعُ لِي رِجَالاً -سَمَّاهُمْ- وَادْعُ لِي مَنْ لَقِيتَ». قَالَ: فَفَعَلْتُ الَّذِي أَمَرَنِي، فَرَجَعْتُ فَإِذَا الْبَيْتُ غَاصٌّ بِأَهْلِهِ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَضَعَ يَدَيْهِ على تِلْكَ الْحَيْسَةِ، وَتَكَلَّمَ بِهَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ جَعَلَ يَدْعُو عَشَرَةً عَشَرَةً، يَأْكُلُونَ مِنْهُ، وَيَقُولُ لَهُمْ: «اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلْيَأْكُلْ كُلُّ رَجُلٍ مِمَّا يَلِيهِ». قَالَ: حَتَّى تَصَدَّعُوا كُلُّهُمْ عَنْهَا، فَخَرَجَ مِنْهُمْ مَنْ خَرَجَ، وَبَقِيَ نَفَرٌ يَتَحَدَّثُونَ قَالَ وَجَعَلْتُ أَغْتَمُّ، ثُمَّ خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ نَحْوَ الْحُجُرَاتِ، وَخَرَجْتُ فِي إِثْرِهِ فَقُلْتُ: إِنَّهُمْ قَدْ ذَهَبُوا. فَرَجَعَ فَدَخَلَ الْبَيْتَ، وَأَرْخَى السِّتْرَ، وَإِنِّي لَفِي الْحُجْرَةِ، وَهْوَ يَقُولُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُواْ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْيِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب. قَالَ أَبُو عُثْمَانَ قَالَ أَنَسٌ إِنَّهُ خَدَمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ [٢].

---

(١) وەک دەف لێدان و سروود وتن کە حەڵاڵ بێت و شتی حەرامی تیا نەبێت.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩١.

## ٦٥- باسی دیاری بردن بۆ زاوا

٥١٦٣-ئەبو عوسمان - کە ناوی جەعدە - گێڕایەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ (ئەبو عوسمان) وتی: لە ناو مزگەوتی بەنو ڕیفاعەدا ئەنەس تێپەڕی بەلامدا گوێم لێ بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێ بەلای ماڵی ئوممو سولەیمدا تێپەڕیایە دەڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای و سەلامی لێ دەکرد، پاشان ئەنەس وتی: پێغەمبەر ﷺ تازە زاوا بوو بە (گواستنەوەی) زەینەب ﷺ، جا ئوممو سولەیم وتی: خۆزگە دیاریەکمان ببردایە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش پێم وت: ئەو کارە بکە، جا ڕۆشت خورما و ڕۆن و کەشکی هێنا و خورما و ڕۆنێکی دروست کرد لە قازانێکدا، وە بە مندا ناردی بۆی، منیش خێرا بردم بۆی فەرمووی پێم: ((قازانەکە دانێ))، پاشان فەرمانی پێکردم و فەرمووی: ((چەند پیاوێکم بۆ بانگ بکە - کە ناوی هێنان - وە بە هەر کەسیش گەشتی بۆم بانگ بکە))، ئەنەس دەڵێ: منیش ئەوەی فەرمانی پێکردم جێبەجێم کرد، ئەوسا گەڕامەوە دەبینم ماڵ پڕە لە خەڵك پێغەمبەریشم ﷺ دی دەستی خستبوویە سەر خورما و ڕۆنەکە و قسەی کرد و (دوعای خوێند پێیا) ئەوەندەی خوا حەزکات، لە پاشان دەستی کرد بە بانگ کردن دە کەس دە کەس بانگی دەکردن لە خواردنەکەیان دەخوارد و دەیفەرموو پێیان: ((ناوی خوای لێ بێنن و هەر کەس لە بەردەمی خۆیەوە بخوات)).

- (ئەنەس) دەڵێ: هەتا هەموویان بڵاوەیان کرد لە خواردنەکە، جا ئەوەیان ڕۆشتە دەرەوە ڕۆشت، چەند کەسێکی مانەوە قسەیان دەکرد لە نێوان خۆیاندا، دەڵێ من دلگران بووم (بە مانەوەیان)، پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە دەرەوە بۆ لای ماڵی خێزانەکانی، منیش بە دوایدا چوومە دەرەوە وتم (بە پێغەمبەر ﷺ): ئەو کەسانە ڕۆشتن ئیتر پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە و چووە ژوورەوە پەردەکەی

دادایەوە، هێشتا من لە ژوورەكەیدا بووم، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ، مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بكەن، بەڵام ئەگەر بانگ كران (بۆ نان خواردن) ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە، ئینجا ئەگەر خواردنەكەتان خوارد بڵاوەی لێ بكەن وە مەمێننەوە بۆ قسەكردن، چونكە بەڕاستی ئەو (مانەوەتان) ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات، ئەویش شەرم دەكات لێتان (كە بێ دەنگە) بەڵام خوا لە (وتنی) هەق شەرم ناكات).

ئەبو عوسمان دەڵێ: ئەنەس ﷺ وتی: كە ئەو دە ساڵ خزمەتكاری پێغەمبەری خوای ﷺ كردوە.

## ٦٦- بابُ اسْتِعَارَةِ الثِّيَابِ لِلْعَرُوسِ وَغَيْرِهَا

٥١٦٤- حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ قِلاَدَةً، فَهَلَكَتْ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي طَلَبِهَا، فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلاَةُ فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضُوءٍ، فَلَمَّا أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ شَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ، فَنَزَلَتْ آيَةُ التَّيَمُّمِ. فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ جَزَاكِ اللَّهُ خَيْرًا، فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمْرٌ قَطُّ، إِلاَّ جَعَلَ لَكِ مِنْهُ مَخْرَجًا، وَجُعِلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةٌ[1].

## ٦٦- باسی خواستنی جل و بەرگ و شتی تر بۆ بووك

٥١٦٤- هیشام لە (عوروەی) باوكیەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ گێڕایەوە كە ئەو (عائیشە) ملوانكەیەكی لە ئەسما خواست و ون بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ كەسێكی لە هاوەڵانی نارد بگەڕێت بەدوایدا، ئەنجا كاتی نوێژ هات و بەبێ

(١) بڕوانە: ٣٣٤.

دەست نوێژ نوێژیان کرد، ئەنجا کە هاتنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ سکاڵای ئەوەیان لا کرد، ئیتر ئایەتی تەیەمموم دابەزی، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر ﷺ وتی: (بە عائیشە) خواپاداشتی چاکەت باتەوە، جا سوێند بەخوا هەرگیز شتێکت بەسەردا نەهاتووە ئیللا خودا ئەو شتەی کردۆتە دەرتانێك بۆ تۆ، وە کردوویەتیە فەرڕ و بەرەکەت بۆ مسوڵمانان.

## ٦٧- بابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ

٥١٦٥- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَقُولُ حِينَ يَأْتِي أَهْلَهُ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ بَيْنَهُمَا فِي ذَلِكَ، أَوْ قُضِيَ وَلَدٌ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا»[1].

## ٦٧- باسی پیاو کاتێ لەگەڵ هاوسەریدا دروست بوو چ دوعایەک بڵێ

٥١٦٥-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکیان کاتێ لەگەڵ هاوسەری دا دروست دەبێت بڵێ: بەناوی خواوە خوایە شەیتانم لێ دوور خەرەوە، هەروەها شەیتان لەو (منداڵ)ەی پێمان دەبەخشی دووری بخەرەوە، پاشان لەو جووت بوونەی نێوانیاندا منداڵێك نوسرابێ - یا بڕیار درابێ - ئەوە هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت )).

(١) بڕوانە: ١٤١.

## ٦٨- بابٌ: الوَلِيمَةُ حَقٌّ

وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ"(١).

٥١٦٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ كَانَ ابْنَ عَشْرِ سِنِينَ مَقْدَمَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَكَانَ أُمَّهَاتِي يُوَاظِبْنَنِي على خِدْمَةِ النَّبِيِّ ﷺ فَخَدَمْتُهُ عَشْرَ سِنِينَ، وَتُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا ابْنُ عِشْرِينَ سَنَةً، فَكُنْتُ أَعْلَمَ النَّاسِ بِشَأْنِ الْحِجَابِ حِينَ أُنْزِلَ، وَكَانَ أَوَّلَ مَا أُنْزِلَ فِي مُبْتَنَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ، أَصْبَحَ النَّبِيُّ ﷺ بِهَا عَرُوسًا، فَدَعَا الْقَوْمَ فَأَصَابُوا مِنَ الطَّعَامِ، ثُمَّ خَرَجُوا وَبَقِيَ رَهْطٌ مِنْهُمْ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَطَالُوا الْمُكْثَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَخَرَجَ وَخَرَجْتُ مَعَهُ لِكَيْ يَخْرُجُوا، فَمَشَى النَّبِيُّ ﷺ وَمَشَيْتُ، حَتَّى جَاءَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ على زَيْنَبَ فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ لَمْ يَقُومُوا، فَرَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، وَظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ قَدْ خَرَجُوا فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنِي وَبَيْنَهُ بِالسِّتْرِ، وَأُنْزِلَ الْحِجَابُ(٢).

## ٦٨- باسێک: نانی شایی و زەماوەند ڕاستە (و لە شەرعدا هەیە)

**-عەبدوڕەحمان کوڕی عەوف ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((خواردنی شایی ساز بکە با بەمەڕێکیش بێت)).**

**٥١٦٦-ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە تەمەنی دە ساڵ بوو، جا دایکم و خوشکەکانم داوایان دەکرد و هانیان دەدام بەردەوام بم لە خزمەتکاری پێغەمبەردا ﷺ، منیش دە ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەرم ﷺ کرد، وەکە پێغەمبەر**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٤٨.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩١.

ﷺ وەفاتی کرد من تەمەنم بیست ساڵ بوو، بۆیە من شارەزاترین کەسم بە بابەتی حیجاب کاتێ (قورئان لەسەری) دابەزێنرا، وە یەکەم دابەزین لە بارمیەوە دابەزی کاتێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستبوویەوە پێغەمبەر ﷺ پێی بوو بەزاوا، جا خەڵکی بانگ کرد و نانیان خوارد پاشان خەڵکەکە ڕۆشتن سێ کەسیان لای پێغەمبەر ﷺ مانەوە و درێژەیان بەمانەوەکەیان دا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و ڕۆشتە دەرەوە منیش لەگەڵیدا ڕۆشتمە دەرەوە تا ئەو کەسانە بڕۆن، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم هەتا چووە بەردەم ژوورەکەی عائیشە ﵂، پاشان وای زانی ئەو کەسانە ڕۆشتوون بۆیە گەڕایەوە، منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە هەتا چوویە ژوورەوە بۆ لای زەینەب دەبینێ هەر دانیشتوون و هەڵنەساون، ئیتر پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە هەتا گەیشتە بەردەم ژوورەکەی عائیشە ﵂ وای زانی ئەوان ڕۆشتون، ئینجا گەڕایەوە منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، جا دەبینم دەرچوون و ڕۆشتوون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پەردەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە و (ئایەتی) حیجاب دابەزی.

## ٦٩- بابُ الوَلِيمَةِ وَلَوْ بِشَاةٍ

٥١٦٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا ﵁ قَالَ: سَأَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ -وَتَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ-: «كَمْ أَصْدَقْتَهَا؟». قَالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. وَعَنْ حُمَيْدٍ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: لَمَّا قَدِمُوا الْمَدِينَةَ نَزَلَ الْمُهَاجِرُونَ على الأَنْصَارِ، فَنَزَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ على سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، فَقَالَ: أُقَاسِمُكَ مَالِي، وَأَنْزِلُ

لَكَ عَنْ إِحْدَى امْرَأَتَيَّ. قَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ. فَخَرَجَ إِلَى السُّوقِ فَبَاعَ وَاشْتَرَى، فَأَصَابَ شَيْئًا مِنْ أَقِطٍ وَسَمْنٍ، فَتَزَوَّجَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[1].

## ٦٩- باسی نانی زەماوەند دروست کردن با بەمەڕێکیش بێت (سوننەتە)

**٥١٦٧-حومەید دەگێڕێتەوە کە لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیار لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کرد ﷺ لە کاتێکدا ئافرەتێکی ئەنصاری مارە کردبوو ((چەند مارەییت پێ داوە؟)) وتی: کێشی دەنکە خورمایەك ئاڵتوون.**

**وە هەر حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم بیست وتی: کاتێ کۆچەران هاتن بۆ مەدینە، کۆچەران لای ئەنصارییەکان دابەزین، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیش ﷺ لای سەعدی کوڕی ڕەبیع دابەزی (لە ماڵی ئەودا بوو)، سەعد وتی: ماڵەکەمت لەگەڵدا ئەکەم بە دوو بەشەوە وە واز دێنم لە یەکێك لە ژنەکانم بۆ تۆ، (عەبدوڕەحمان) وتی: خوا بەرەکت و فەڕ بخاتە ماڵ و خێزانتەوە، جا عەبدوڕەحمان ڕۆشت بۆ بازاڕ، کرین و فرۆشتنی کرد و هەندێ کەشك و ڕۆنی قازانج کرد، ئینجا ژنی هێنا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نانی شایی ساز بکە با بە مکەڕێکیش بێت)).**

٥١٦٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَا أَوْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ على شَيْءٍ مِنْ نِسَائِهِ، مَا أَوْلَمَ على زَيْنَبَ، أَوْلَمَ بِشَاةٍ[2].

**٥١٦٨ - سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: ئەو نانی زەماوەندەی پێغەمبەر بۆ زەینەب دروستی کردبوو بۆ هیچ کام لە هاوسەرەکانی دروستی نەکردبوو، مەڕێکی کردبوویە خواردنی زەماوەندەکەی.**

(١) بڕوانە: ٢٠٤٩.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩١.

٥١٦٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ، عَنْ شُعَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ، وَتَزَوَّجَهَا، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا، وَأَوْلَمَ عَلَيْهَا بِحَيْسٍ[1].

**٥١٦٩-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی ئازاد کرد و مارەی کرد، ئازاد کردنەکەی کردە مارەیی بۆی، وە بە خورما و ڕۆن و کەشك نانی زەماوەنەکەی صەفییەی ساز کرد.**

٥١٧٠- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ بَيَانٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: بَنَى النَّبِيُّ ﷺ بِامْرَأَةٍ، فَأَرْسَلَنِي فَدَعَوْتُ رِجَالاً إِلَى الطَّعَامِ[2].

**٥١٧٠-بەیان دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی گواستەوە، منیشی نارد چەند پیاوێکم بانگ کرد بۆ نان خوارن (ی زەماوەندەکە).**

## ٧٠- بابُ مَنْ أَوْلَمَ عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ أَكْثَرَ مِنْ بَعْضٍ

٥١٧١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: ذُكِرَ تَزْوِيجُ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ عِنْدَ أَنَسٍ، فَقَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺأَوْلَمَ على أَحَدٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْلَمَ عَلَيْهَا أَوْلَمَ بِشَاةٍ[3].

## ٧٠- باسی کەسێ خواردنی زەماوەندی هاوسەرێکی زۆرتر بکات لە هی هاوسەرێکی تری

**٥١٧١-سابیت دەڵێ: باسی مارەکردن و شووکردنی زەینەبی کچی جەحش کرا لای ئەنەسدا ﷺ ئەنەسیش وتی: بەچاوی خۆم دیم پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکێ لە هاوسەرەکانی خواردنێکی زەماوەندی دروست کردبوو، ئای چ خواردنێکی گەورە و چاك بوو، مەڕێکی کردبوویە خواردی زەماوەندەکە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩١.

(٣) بڕوانە: ٤٧٩١.

## ٧١- بابُ مَنْ أَوْلَمَ بِأَقَلَّ مِنْ شَاةٍ

٥١٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورِ ابْنِ صَفِيَّةَ، عَنْ أُمِّهِ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ قَالَتْ: أَوْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ بِمُدَّيْنِ مِنْ شَعِيرٍ.

## ٧١- باسی کەسێک بەکەمتر لە مەڕێک نانی شایی دروست کات

**٥١٧٢-مەنصوری کوڕی صەفییە لە دایکیەوە صەفییەی کچی شەیبە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دوو مشت جۆ خواردنی زەماوەندی هەندێك لە هاوسەرەکانی کردوە.**

## ٧٢- بابُ حَقِّ إِجَابَةِ الْوَلِيمَةِ وَالدَّعْوَةِ وَمَنْ أَوْلَمَ سَبْعَةَ أَيَّامٍ وَنَحْوَهُ

وَلَمْ يُوَقِّتِ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا وَلاَ يَوْمَيْنِ.

٥١٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا»[١].

## ٧٢- باسی بەدەمەوە چوونی نانی شایی و دەعوەتکردن (بۆ نان خواردن) پێویستەوە باسی کەسێک حەوت ڕۆژ نانی شایی سازکات و شتی لەم جۆرە[٢]

**- (ئیمامی بوخاری دەڵێ): پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك و دوو ڕۆژی دیاری نەکردوە (بۆ نانی شایی).**

**٥١٧٣- عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان بانگ کرا بۆ نانی شایی با بڕوات)).**

---

(١) بڕوانە: ٥١٧٩.

(٢) واتە: وەک حەوت ڕۆژ یا کەمتر لە حەوت ڕۆژ.

٥١٧٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ»[1].

**٥١٧٤- ئەبو مووسا ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((دیل ئازاد بکەن، بڕۆن بەدەم داوەتەوە، سەردانی نەخۆش بکەن)).**

٥١٧٥- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَشْعَثِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدٍ، قَالَ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ﷻ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجِنَازَةِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِفْشَاءِ السَّلاَمِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَالْقَسِّيَّةِ، وَالإِسْتَبْرَقِ وَالدِّيبَاجِ. تَابَعَهُ أَبُو عَوَانَةَ وَالشَّيْبَانِيُّ، عَنْ أَشْعَثَ فِي إِفْشَاءِ السَّلاَمِ[2].

**٥١٧٥- بەرائی کوڕی عازیب ﷻ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی حەوت شتی پێ کردین و ڕێگری حەوت شتی لێ کردین: فەرمانی پێ کردین بە سەردانی کردنی نەخۆش و بەشوێن کەوتنی تەرم و، وتنی** (يَرحمُكَ الله) **بەکەسێ دەپژمێ و دەڵێ:** (الحَمدُ لله) **و نەخستنی سوێند، و یارمەتی دانی ستەم لێکراو، زۆر سەلام کردن وبلاوکردنەوەی و، وەڵامدانەوەی دەعوەتکەر.**

**وە ڕێگری لێ کردین لە ئەموستیلەی ئاڵتوون و بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی زیو و سەر زینی ئاوریشم و قەسی [3] و ئاوریشمی ئەستوور و دیباج[4].**

**-ئەبو عەوان و شەیبان (هەردووکیان) لە ئەشعەسەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەبو ئەحوەصیان کردوە، لە بڕگەی** (إِفْشَاءِ السَّلاَمِ)**ـدا واتە: زۆر سەلام کردن و بلاوکردنەوەی.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٦.

(٢) بڕوانە: ١٢٣٩.

(٣) قەسی: قوماشێکی کەتانە ئاوریشمی تێکەڵە.

(٤) دیباج: جۆرێکە لە ئاوریشم.

٥١٧٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: دَعَا أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي عُرْسِهِ، وَكَانَتِ امْرَأَتُهُ يَوْمَئِذٍ خَادِمَهُمْ وَهْيَ الْعَرُوسُ، قَالَ سَهْلٌ: تَدْرُونَ مَا سَقَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ أَنْقَعَتْ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا أَكَلَ سَقَتْهُ إِيَّاهُ[1].

**٥١٧٦- ئەبو حازیم گێڕاویەتیەوە سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ لە شاییەکەیدا (ژنی هێنابوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کردبوو هاوسەرەکەی ئوسەید لەو ڕۆژەدا خزمەتی دەکردن کە خۆی بوك بوو لەو کاتەدا. سەهل وتی: دەزانن ئەو بووکە چی دایە پێغەمبەر خوا ﷺ بیخوات؟ بەشەو چەند دەنکە خورمایەکی کردبوویە ناو ئاوەوە، جا کاتێ (پێغەمبەر ﷺ) نانی خوارد ئەوەی دایە بیخواتەوە.**

## ٧٣- بابُ مَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ

٥١٧٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﷺ.

## ٧٣- باسی هەر کەس بانگ کرا بۆ نان خواردن نەڕوات[2] ئەوە بێگومان سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە.

**٥١٧٧-ئەبو هورەیرە ﷺ هەمیشە دەیوت: خراپترین خواردن خواردنی شاییەکە دەوڵەمەندەکانی بۆ بانگ بکرێت و هەژارەکانی بۆ بانگ نەکرێت، وە هەرکەس**

(١) بڕوانە: ٥١٨٢، ٥١٨٣، ٥٥١٩، ٥٥٩٧، ٦٦٨٥.

(٢) بە بێ هۆیەکی شەرعی.

نەڕوات بەدەم بانگ کردنی نان خواردنەوە، ئەوە بەڕاستی سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە.

## ٧٤- بابُ مَنْ أَجَابَ إِلَى كُرَاعٍ

٥١٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ دُعِيتُ إِلَى كُرَاعٍ لأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ لَقَبِلْتُ»[١].

## ٧٤- باسی کەسێک بەدەم میوانداری سەر و پێوە بچێت

٥١٧٨-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئەگەر میوانداری بکرێم بۆ (خواردنی) سەر و پێ بەدەمیەوە دەچم، وە ئەگەر دەستی ئاژەڵێکم بەدیاری بۆ بهێنرێت بە دڵنیاییەوە وەری دەگرم)).

## ٧٥- بابُ إِجَابَةِ الدَّاعِي فِي الْعُرْسِ وَغَيْرِهَا

٥١٧٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا الْحَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَجِيبُوا هَذِهِ الدَّعْوَةَ إِذَا دُعِيتُمْ لَهَا». قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَأْتِي الدَّعْوَةَ فِي الْعُرْسِ وَغَيْرِ الْعُرْسِ وَهْوَ صَائِمٌ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٦٨.

(٢) بڕوانە: ٥١٧٣.

## ٧٥- باسی بەدەمەوە چوونی کەسێک بانگ دەکات بۆ نانی شایی و بانگ کردن بۆ نان خواردنی تریش

**٥١٧٩-نافیع دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەدەم بانگ کردنی نان خواردنی شاییەوە بچن ئەگەر بانگ کران بۆی))، (نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ دەرۆیشت بەدەم بانگ کردنی نانی شایی و نانی غەیری شایی، لە کاتێکدا بەرۆژوو (ی سوونەت) یش بوو.**

## ٧٦- بَابُ ذَهَابِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ إِلَى الْعُرْسِ

٥١٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْمُبَارَكِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَبْصَرَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءً وَصِبْيَانًا مُقْبِلِينَ مِنْ عُرْسٍ، فَقَامَ مُمْتَنًّا فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ»[1].

## ٧٦- باسی چوونی ئافرەتان و منداڵان بۆ (نان خواردنی) شایی و زەماوەند

**٥١٨٠-ئەنەس کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێ ئافرەت و منداڵی بینی لە (نان خواردنی) شاییەك دەگەڕانەوە، پێغەمبەر ﷺ خێرا هەستایەوە بەدەمیانەوە (لە خۆشیدا) و فەرمووی: ((خوایە گیان، ئێوە خۆشەویسترین کەسی لای منن)).**

(١) بڕوانە: ٣٧٨٥.

## ٧٧- بابٌ: هَلْ يَرْجِعُ إِذَا رَأَى مُنْكَرًا فِي الدَّعْوَةِ؟

وَرَأَى ابْنُ مَسْعُودٍ صُورَةً فِي الْبَيْتِ، فَرَجَعَ. وَدَعَا ابْنُ عُمَرَ أَبَا أَيُّوبَ - ﷺ -، فَرَأَى فِي الْبَيْتِ سِتْرًا عَلَى الْجِدَارِ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: غَلَبَنَا عَلَيْهِ النِّسَاءُ، فَقَالَ: مَنْ كُنْتُ أَخْشَى عَلَيْهِ فَلَمْ أَكُنْ أَخْشَى عَلَيْكَ، وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُ لَكُمْ طَعَامًا، فَرَجَعَ.

## ٧٧- باسێک: ئایە کەسێک ئەگەر ناشەرعییەکی بینی لە میواندارێکەدا دەگەڕێتەوە؟

**-ئیبنو مەسعوود ﷺ لەوماڵەدا (میوانداری کرابوو بۆی) وێنەیەکی بینی گەڕایەوە.**

**-ئیبنو عومەر ئەبو ئەیوبی ﷺ بانگ کرد (بۆ شایی سالیمی کوڕی)، ئەبو ئەیوب پەردەیەکی دی بە دیوارێکەوە (ڕەخنەی لێ گرت)، ئیبنو عومەریش ﷺ وتی: لەو کارەدا ژنان زاڵبوون بەسەرماندا، (ئەبو ئەیوب) وتی: من لە هەرکەس بترسامایە ئەمە (لە ماڵیدا بێ) هەرگیز لە تۆ نەدەترسام (لەم بارەیەوە)، وەڵڵاهی خواردنتان ناخۆم جا گەڕایەوە.**

٥١٨١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَامَ عَلَى الْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْ، فَعَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، مَاذَا أَذْنَبْتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرِقَةِ؟». قَالَتْ: فَقُلْتُ اشْتَرَيْتُهَا لَكَ لِتَقْعُدَ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدَهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ». وَقَالَ: «إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ لاَ تَدْخُلُهُ الْمَلاَئِكَةُ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢١٠٥.

**٥١٨١- قاسیمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە عائیشە بۆی گێڕاوەتەوە وتی: کە ئەو قاڵیچەیەکی کڕی وێنەی تێدابوو، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قاڵیچەکەی بینی لە بەردەم دەرگاکەدا وەستا و نەهاتە ژوورەوە، منیش بەدەم و چاویدا زانیم پێی ناخۆشە، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەشیمانم و دەگەڕێمەوە بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ چ گوناهێکم کردوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەم قاڵیچەیە چیە؟)) وتم: کڕیومە بۆ تۆ تا لە سەری دانیشیت و لە سەری بخەویت[١]، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن و پێیان دەوترێت ئەوەی دروستان کردوە زیندووی کەنەوە))، وە فەرمووی: ((بەڕاستی ئەوماڵەی کە وێنەی تێدایە فریشتە ناڕواتە ئەو ماڵەوە)).**

## ٧٨- بابُ قِيَامِ الْمَرْأَةِ عَلَى الرِّجَالِ فِي الْعُرْسِ وَخِدْمَتِهِمْ بِالنَّفْسِ

٥١٨٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: لَمَّا عَرَّسَ أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ دَعَا النَّبِيَّ ﷺ وَأَصْحَابَهُ، فَمَا صَنَعَ لَهُمْ طَعَامًا وَلاَ قَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ إِلاَّ امْرَأَتُهُ أُمُّ أُسَيْدٍ، بَلَّتْ تَمَرَاتٍ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الطَّعَامِ أَمَاثَتْهُ لَهُ فَسَقَتْهُ؛ تُتْحِفُهُ بِذَلِكَ[٢].

(١) (تَوَسَّدَهَا) بە مانای: شانی لەسەر دادەیت دێت بەڵام لە فەرموودەکەدا ناگونجێت.
(٢) بڕوانە: ٥١٧٦.

## ٧٨- باسی لەنانی شایی دا ئافرەت ئامادەی کات بۆ پیاوان هەر خۆشی خزمەتیان بکات [1]

**٥١٨٢-سەهل ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ژنی هێنا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بانگ کرد و میوانداری کردن، هەر هاوسەرەکەی ئوممو ئوسەید خواردنەکەی بۆ دروست کردن و بۆشی بردن، چەند دەنکە خورمایەکی لە شەودا کردبوویە ئاوەوە لە قاپێکی بەردیندا، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە نان خواردنەکەی بوویەوە، جا خورماکەی لە ئاوەکە دا توانەوە بۆ پێغەمبەر و ﷺ پێیدا و خواردییەوە، ئەمەی وەك دیارییەك پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ کرد.**

## ٧٩- بابُ النَّقِيعِ وَالشَّرَابِ الَّذِي لاَ يُسْكِرُ فِي الْعُرْسِ

٥١٨٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْقَارِيُّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ أَنَّ أَبَا أُسَيْدٍ السَّاعِدِيَّ دَعَا النَّبِيَّ ﷺ لِعُرْسِهِ، فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَهْيَ الْعَرُوسُ فَقَالَتْ- أَوْقَالَ-: أَتَدْرُونَ مَا أَنْقَعَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ أَنْقَعَتْ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ[2].

## ٧٩- باسی خۆشاوی خورما و خواردنەوەیەک سەرخۆشکەر نەبێت لە نان خواردنی شاییدا

**٥١٨٣-سەهلی کوڕی سەعدی ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ پێغەمبەری ﷺ دەعوەت کرد بۆ زەماوەندەکەی، ئینجا هاوسەرەکەی لەو ڕۆژەدا خزمەتکاریان بوو کە لەو کاتەدا بووك بوو، جا بووکەکە -یان سەهل وتی- :**

(١) لەکاتێکدا ئافرەتەکە تازە بووکە.

(٢) بڕوانە: ٥١٧٦.

دەزانن چ خۆشاوێکی بۆ پێغەمەری خوا ﷺ ئامادە کردبوو؟ لە شەودا چەند دەنکە خورمایەکی کردبوویە ئاو لە دەفرێکی مس دا.

## ٨٠- بابُ الْمُدَارَاةِ مَعَ النِّسَاءِ. وَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «إِنَّمَا الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ»

٥١٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ»[1].

## ٨٠- باسی هەڵکردن لە گەڵ ئافرەتاندا وە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ((بێگومان ئافرەت وەک پەراسوو وایە))

٥١٨٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ژن وەك پەراسوو وایە، ئەگەر (بتەوێ) ڕاستی کەیتەوە دەیشکێنیت، وە ئەگەر بتەوێ بەهرە و خۆشی لێ ببینی بەهرە و خۆشی لێ دەبەن و لاری و خواریشی تێدایە)).

## ٨١- بابُ الْوَصَاةِ بِالنِّسَاءِ

٥١٨٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ الْجُعْفِيُّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ مَيْسَرَةَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِي جَارَهُ»[2].

## ٨١- باسی ئامۆژگاری دەربارەی ئافرەتان

٥١٨٥-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هەر کەس باوەڕی هەیە بە خوا و بەرۆژی دوایی، ئەوە با ئازاری دراوسێکەی نەدات)).

---

(١) بڕوانە: ٣٣٣١.

(٢) بڕوانە: ٦٠١٨، ٦١٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥.

٥١٨٦ - «وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا»[1].

**٥١٨٦-((وە ئامۆژگاریتان دەکەم زۆر چاك بن بەرامبەر بە ئافرەتان[2] چونکە بێگومان ئەوان (ئافرەتان) لە پەراسویەك دروست کراون، وە بێگومان لارترین بەشێك لە پەراسوودا سەرەوەیەتی، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، وە ئەگەر بتەوێ وازی لێ بێنیت هەر بە لاری دەمێنێتەوە، کەواتە ئامۆژگاریتان دەکەم زۆر باش بن بۆ ئافرەتان)).**

٥١٨٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ كُنَّا نَتَّقِي الْكَلاَمَ وَالاِنْبِسَاطَ إِلَى نِسَائِنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ هَيْبَةَ أَنْ يُنْزَلَ فِينَا شَيْءٌ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ تَكَلَّمْنَا وَانْبَسَطْنَا.

**٥١٨٧- ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆمان دەپاراست کە قسە و گاڵتە و یاری لەگەڵ ژنەکانماندا (بکەین)، لە ترسی دابەزینی قورئان دەربارەمان، جا کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد دەستمان کرد بە گاڵتە و یاری و قسەی خۆش لەگەڵیاندا.**

## ٨٢- بابٌ: ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴿٦﴾ ﴾ التحريم

٥١٨٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ، فَالإِمَامُ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِهِ

---

(١) بڕوانە: ٣٣٣١.

(٢) بە چەند جۆرێ تریش مانا کراوە، سەیری پەراوێزی فەرموودەی (٣٣٣١) بکە.

وَهْوَ مَسْئُولٌ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ زَوْجِهَا وَهْيَ مَسْئُولَةٌ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ»[1].

## ٨٢- باسێک: (خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێک)

**٥١٨٨- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەمووتان شوانن وە هەمووتان بەرپرسیارن، جا پێشەوا شوانە و بەرپرسیارە، پیاویش شوانە بەسەر خێزانەکەیەوە و بەرپرسیارە لێیان، ژنیش شوانە بەسەر ماڵی مێردەکەیەوە و بەرپرسیارە (لێی)، کۆیلەش شوانە بەسەر ماڵی گەورە و خاوەنەکەیەوە بەرپرسیارە (لێی)، ئاگادار بن هەمووتان شوان و هەمووشتان بەرپرسیارن (لەوەی لە ژێر دەستتان دایە) )).**

## ٨٣- بَابُ حُسْنِ الْمُعَاشَرَةِ مَعَ الأَهْلِ

٥١٨٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ قَالاَ: أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً، فَتَعَاهَدْنَ وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لاَ يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئًا. قَالَتِ الأُولَى: زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ، غَثٌّ عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ، لاَ سَهْلٍ فَيُرْتَقَي، وَلاَ سَمِينٍ فَيُنْتَقَلُ. قَالَتِ الثَّانِيَةُ: زَوْجِي لاَ أَبُثُّ خَبَرَهُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ لاَ أَذَرَهُ، إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وَبُجَرَهُ. قَالَتِ الثَّالِثَةُ زَوْجِي الْعَشَنَّقُ، إِنْ أَنْطِقْ أُطَلَّقْ، وَإِنْ أَسْكُتْ أُعَلَّقْ. قَالَتِ الرَّابِعَةُ: زَوْجِي كَلَيْلِ تِهَامَةَ، لاَ حَرٌّ، وَلاَ قُرٌّ، وَلاَ مَخَافَةَ، وَلاَ سَآمَةَ. قَالَتِ الْخَامِسَةُ: زَوْجِي إِنْ دَخَلَ فَهِدَ، وَإِنْ خَرَجَ أَسِدَ، وَلاَ يَسْأَلُ عَمَّا عَهِدَ. قَالَتِ السَّادِسَةُ: زَوْجِي إِنْ أَكَلَ لَفَّ، وَإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ، وَإِنِ اضْطَجَعَ الْتَفَّ، وَلاَ يُولِجُ الْكَفَّ لِيَعْلَمَ الْبَثَّ، قَالَتِ السَّابِعَةُ: زَوْجِي غَيَايَاءُ -أَوْ عَيَايَاءُ- طَبَاقَاءُ، كُلُّ

---

(١) بڕوانە: ٨٩٣.

دَاءٍ لَهُ دَاءٌ، شَجَّكِ أَوْ فَلَّكِ أَوْ جَمَعَ كُلاًّ لَكِ. قَالَتِ الثَّامِنَةُ: زَوْجِي الْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ. قَالَتِ التَّاسِعَةُ: زَوْجِي رَفِيعُ الْعِمَادِ، طَوِيلُ النِّجَادِ، عَظِيمُ الرَّمَادِ، قَرِيبُ الْبَيْتِ مِنَ النَّادِ. قَالَتِ الْعَاشِرَةُ: زَوْجِي مَالِكٌ وَمَا مَالِكٌ؟ مَالِكٌ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكِ، لَهُ إِبِلٌ كَثِيرَاتُ الْمَبَارِكِ قَلِيلاَتُ الْمَسَارِحِ، وَإِذَا سَمِعْنَ صَوْتَ الْمِزْهَرِ أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هَوَالِكُ. قَالَتِ الْحَادِيَةَ عَشْرَةَ: زَوْجِي أَبُو زَرْعٍ فَمَا أَبُو زَرْعٍ؟ أَنَاسَ مِنْ حُلِيٍّ أُذُنَيَّ، وَمَلأَ مِنْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ، وَبَجَّحَنِي فَبَجِحَتْ إِلَيَّ نَفْسِي، وَجَدَنِي فِي أَهْلِ غُنَيْمَةٍ بِشِقٍّ، فَجَعَلَنِي فِي أَهْلِ صَهِيلٍ وَأَطِيطٍ وَدَائِسٍ وَمُنَقٍّ، فَعِنْدَهُ أَقُولُ فَلاَ أُقَبَّحُ، وَأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ، وَأَشْرَبُ فَأَتَقَنَّحُ، أُمُّ أَبِي زَرْعٍ فَمَا أُمُّ أَبِي زَرْعٍ؟ عُكُومُهَا رَدَاحٌ، وَبَيْتُهَا فَسَاحٌ، ابْنُ أَبِي زَرْعٍ؟، فَمَا ابْنُ أَبِي زَرْعٍ؟ مَضْجِعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ، وَيُشْبِعُهُ ذِرَاعُ الْجَفْرَةِ، بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ؟ طَوْعُ أَبِيهَا، وَطَوْعُ أُمِّهَا، وَمِلْءُ كِسَائِهَا، وَغَيْظُ جَارَتِهَا، جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ؟ لاَ تَبُثُّ حَدِيثَنَا تَبْثِيثًا، وَلاَ تُنَقِّثُ مِيرَتَنَا تَنْقِيثًا، وَلاَ تَمْلأُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا، قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ وَالأَوْطَابُ تُمْخَضُ، فَلَقِيَ امْرَأَةً مَعَهَا وَلَدَانِ لَهَا كَالْفَهْدَيْنِ يَلْعَبَانِ مِنْ تَحْتِ خَصْرِهَابِرُمَّانَتَيْنِ، فَطَلَّقَنِي وَنَكَحَهَا، فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلاً سَرِيًّا، رَكِبَ شَرِيًّا وَأَخَذَ خَطِّيًّا وَأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَمًا ثَرِيًّا، وَأَعْطَانِي مِنْ كُلِّ رَائِحَةٍ زَوْجًا وَقَالَ: كُلِي أُمَّ زَرْعٍ، وَمِيرِي أَهْلَكِ. قَالَتْ: فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شَيْءٍ أَعْطَانِيهِ مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنِيَةِ أَبِي زَرْعٍ. قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُنْتُ لَكِ كَأَبِي زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَعِيدُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ هِشَامٍ: وَلاَ تُعَشِّشُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ بَعْضُهُمْ: فَأَتَقَمَّحُ. بِالْمِيمِ، وَهَذَا أَصَحُّ.

# ٨٣- باسی بە جوانی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هاوسەردا

٥١٨٩- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە وتی: یازدە ژن دانیشتن، ئینجا پەیمان و بەڵێنیان بە یەکتری دا کە هیچ شتێك لە دەنگ و باسی مێردەکانیان نەشارنەوە.

ژنی یەکەم وتی: مێردی من گۆشتی وشترێکی لەڕە ئەوەتا بەسەر چیایەکەوە[١] نەئاسانە تاپپایدا سەرکەوی نە قەڵەوە تا بهێنرێت[٢]. ژنی دووەمیان وتی: هەواڵی مێردەکەم بڵاو ناکەمەوە (لەبەر دوور و درێژی)، بە ڕاستی من دەترسم هیچی لێ بەجێ نەهێڵم[٣]، ئەگەر باسی بکەم باسی هەموو ناتەواوی و خراپەکانی دەکەم.

ژنی سێیەم وتی: مێردەکەم درێژێکی نەگریسە، ئەگەر قسە بکەم (پێی ئەگاتەوە) تەڵاق دەدرێم، وە ئەگەر بێدەنگ بم هەڵپەسێراو دەکرێم (نە بێوەژنم نەمێرد دارم).

ژنی چوارەم وتی: مێردەکەم وەك شەوی حیجاز وایە نە زۆر گەرمە نە زۆر ساردە، وە نەترسم لێی هەیە نە لێی بێزارم.

ژنی پێنجەم وتی: مێردەکەی من کە هاتەماڵەوە دەڵێی وێزە[٤]، کە ڕۆشتە دەرەوە دەبێ بە شێر، وە پرسیار ناکات لە شت و مەك و ماڵ، کە پێشتر لام بەجێ هێشتووە.

ژنی شەشەم وتی: مێردەکەم گەر خواردی لولی ئەدا، کە خواردیشیەوە هیچی تیا ناهێڵێتەوە چۆڕی لێ نەبڕێ، کە پاڵیش کەوت خۆی لە لێفەکەیەوە ئەپێچێتەوە[٥]، وە دەست ناخاتە ناو جلەکانمەوە تا بە خەفەت و غەمەکانم بزانێ.

---

(١) سەخی بەرزی بەردەڵان.
(٢) واتە: گۆشتەکە لەڕە و قەڵەو نییە لەبەر چاکی کەسێک بڕوات بیهێنێ.
(٣) یان لە مێردەکەم دەترسم هەواڵەکەی پێ بگاتەوە و تەڵاقم بدات.
(٤) زوو خەوی لێ ئەکەوێ لە ناتەواوی ماڵ بێ ئاگا دەبێ، یان وەک وێزە پەلاماری ژنەکەی ئەدا و سواری دەبێ ئەوەندەی خۆش ئەوێ، خۆی بۆ ناگیرێ یەکسەر پەلامار دەدات.
(٥) یان پۆشاکەکەی دەپێچێت بە خۆیەوە لە سوچێکدا کەنار دەگرێ.

ژنی حەوتەم وتی: مێردەکەم نەفام و بێ خێرە ئەحمەقە هیچی پێ ناکرێ، هەڵسوکەوتی ژن و مێردی نازانێ هەموو دەردێکی تیا کۆبۆتەوە، یا سەرت دەشکێنێ یا لاشەت بریندار دەکات یان هەردووکیانت پێکەوە بۆ کۆ دەکاتەوە[١].

ژنی هەشتەم وتی: مێردەکەم دەست لێدانی وەك دەست لە کەروێشکدانە، بۆنیشی وەك بۆنی زەرنەب[٢] خۆشە.

ژنی نۆیەم وتی: مێردەکەم کۆڵەکەی خانوەکەی بەرزە[٣]، قایشی شمشێرەکەی درێژە[٤]، خۆڵەمێشی زۆرە[٥]، ماڵەکەی لە یانەی هۆزەکەیەوە نزیکە[٦].

ژنی دەیەم وتی: مێردەکەم ساماندارە بەڵام چ ساماندارێك؟ ساماندارێکە لەوە چاکتر کە من بۆتان باس دەکەم، خاوەنی وشتری زۆرە و جێ مۆڵیان زۆرە[٧]، جێ لەوەڕیان کەمە[٨]، وە کاتێ وشترەکان گوێیان لە عود و کەمان بوو دڵنیا دەبن کە ئەوان (سەر دەبڕێن) و لە ناو دەچن.

ژنی یازدەیەم وتی: مێردی من ئەبو زەرعە، بەڵام چ ئەبو زەرعێکە؟ گوێی پڕ کردووم لە گوارە، قۆڵی پڕ کردووم لە بەز و گۆشت، لە ناو خەڵکدا گەورەی کردووم،خۆمم لا گەورە بووە (دڵخۆشی کردووم بۆ خۆم دڵخۆش بووم)، منی دەست کەوت لە ناو خێزانێکی مەڕدار کە چەند مەڕێکیان هەبوو لە ژیان و گوزەرانێکی سەختدا بوون، هێنامیە ناو خێزانێکی (دەوڵەمەندی) خاوەن ئەسپ و ماینی چاك و وشتری بەیار، (کە لەبەر قورسی بارەکانیان) جیڕەی داری

(١) واتە سەرت دەشكێنێ و لاشەت بریندار دەكات.
(٢) زەرنەب جۆرە بۆنێکی خۆشە وەک عەتر.
(٣) لە دوورەوە دەبینرێ تا میوان بێت بۆ ماڵی.
(٤) واتە: باڵای بەرز.
(٥) واتە: چێشت زۆر لێ دەنێن بۆ میوان.
(٦) واتە: ماڵەکەی هەمیشە جێگای ڕاوێژی کەسەکانیەتی.
(٧) واتە: وشترەکانی زۆرن بۆیە جێی مۆڵیان زۆرە.
(٨) واتە: کەم دەبرێن بۆ لەوەڕگا، لە ماڵەوە ئامادەن بۆ سەربڕینیان بۆ میوان.

کۆپانەکانیان دەهات (بۆ ناو خێزانێکی) خاوەن زەراعەت و خەرمان (خێزانێکی) خۆراك پاك و پوختە، ئینجا کە قسەی لەلا ئەکەم کەس نالێ خراپت وت (بەرپەرچ نادرێمەوە)، دوای نوێژی بەیانی ڕائەکشام و دەخەوتمەوە [١]، ئاو و خواردنەوەم دەخواردەوە تا پاراو دەبووم[٢]، دایکی ئەبوزەرع چ دایکێ؟ خورج و جەواڵەکانی پڕە (لە خۆراك) خانوەکەی فراوان و گەورەیە، کوڕی ئەبو زەرع چ کوڕێکە؟ جێگای خەوەکەی وەك پەلی دار خورمای سەوزی لە گەلا ڕوونکراو[٣] دەستی کارژەڵەیە تێری دەکات[٤]، کچی ئەبو زەرع چ کچێکە؟ گوێڕایەڵی باوك و گوێڕایەڵی دایکێتی (قەڵەو و خرپن) پڕ بە کراسەکەیەتی، ڕەقەهەڵسێنەری هەوێکەیەتی، کەنیزەکی ئەبوزەرع چ کەنیزەکێ؟ قسەی ئێمە بەهیچ جۆرێك ناباتە دەرەوە، خواردن و دانەوێڵەکان بە فیڕۆ نادات و دزی لێ نەدەکرد، ماڵمان پڕ ناکات لە خەوش و خاڵ (ئوممو زەرع) وتی: ڕۆژی ئەبو زەرع لە ماڵ دەرچوو ئەوەندە زوو بوو مەشکەکان دەژەنران، ئەنجا بە ژنێك گەیشت دوو منداڵی خۆی پێ بوو وەك دوو وێز وابوون لە ژێر کەلەکەیدا، منداڵەکان یاریان دەرکرد بە دوو هەنار (مەمکەکانی)، ئیتر منی تەڵاقدا و ئەو ژنەی مارە کرد، منیش لە دوا ئەوە شووم کرد بەپیاوێکی گەورەی خانەدان [٥]، سواری ئەسپی ڕەسەن دەبوو، ڕمی چاکی خەتی[٦] بەدەستەوە دەگرت، وە

(١) خەبەر نەدەکرامەوە چونکە خزمەتکاری هەبوو کارەکانی بۆ دەکردم.
(٢) یان ئەوەندەم دەخواردەوە نقەم لێ دەبڕا ئیتر شوێن نەبوو تێی بکەم، بە ئارەزووی خۆم لە هەموو خواردنەوەیەکم دەخواردەوە.
(٣) یان وەک کێلانی شمشێر وایە.
(٤) ئەوەندە کەم خۆرە.
(٥) یان پیاوێکی سەخی بە ئابڕوو.
(٦) خەتی: گوندە یان شارێکە لە بەحرەین ڕمی لێ دەهێنرێ.

ئێوارەیەك ئاژەڵ و ماڵاتێكی زۆری هێنایەوە بۆم لە هەموو جۆرێ جوتێكی پێدام، پێی وتم ئەی ئوممو زەرع بخۆ و بە دیاریش بۆ كەس و كارت بنێرە، (ئوممو زەرع) وتی: جا هەموو ئەو شتانەی كە ئەو پێدام هەمووی كۆی بكەیتەوە ناگاتە جامۆڵكە بچكۆلەیەكی ئەبو زەرع. عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( من بۆ تۆ وەكو ئەبو زەرع وام بۆ ئوممو زەرع )).

ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: سەعیدی كوڕی سەلەمە لە هیشامەوە دەگێڕێتەوە: (وَلاَ تُعَشِّشُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا) واتە: ماڵەكەمانی پڕ نەدەكرد لە خیانەت و ناپاكی، وە هیچ جۆرە خیانەتێكی نەدەكرد لە ماڵەكەماندا.

وە ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: هەندێك لە ڕاویەكان گێڕاویانەتەوە وتوویانە: (فَأَتَقَمَّحُ) پیتی میم بێت نەك نون[1] ڕاسترە، واتە: ئەوەندە دەخۆمەوە ئیتر حەزم لە خواردنەوە نییە.

٥١٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ الْحَبَشُ يَلْعَبُونَ بِحِرَابِهِمْ، فَسَتَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَنْظُرُ، فَمَا زِلْتُ أَنْظُرُ حَتَّى كُنْتُ أَنَا أَنْصَرِفُ، فَاقْدُرُوا قَدْرَ الْجَارِيَةِ الْحَدِيثَةِ السِّنِّ تَسْمَعُ اللَّهْوَ[2].

٥١٩٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: حەبەشیەكان بە قەڵغان و شمشێرەكانیان یاریان دەكرد،، پێغەمبەری خواش (پشتە ماڵەكەی ) كردبوویە پەردە بۆم منیش سەیرم دەكرد، جا ئەوەندە سەیرم كردن هەتا من بۆ خۆم گەڕامەوە و ڕۆشتم، بۆیە وەك پێویست ڕێز لە كچۆڵەی كەم تەمەن بگرن گوێبیستی گاڵتە و یاری بێت..

---

(١) لە هەندێ نوسخەی بوخاریدا (فَأَتَقَنَّحُ)ـە یە.

(٢) بروانە: ٤٥٤.

## ٨٤- بابُ مَوْعِظَةِ الرَّجُلِ ابْنَتَهُ لِحَالِ زَوْجِهَا

٥١٩١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ أَزَلْ حَرِيصًا أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اللَّتَيْنِ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾﴾ التحريم. حَتَّى حَجَّ وَحَجَجْتُ مَعَهُ، وَعَدَلَ وَعَدَلْتُ مَعَهُ بِإِدَاوَةٍ، فَتَبَرَّزَ، ثُمَّ جَاءَ فَسَكَبْتُ عَلَى يَدَيْهِ مِنْهَا فَتَوَضَّأَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ الْمَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اللَّتَانِ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾﴾ التحريم. قَالَ وَاعَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، هُمَا عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ.

ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الْحَدِيثَ يَسُوقُهُ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ، وَهُمْ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَيَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِمَا حَدَثَ مِنْ خَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْيِ أَوْ غَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الأَنْصَارِ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الأَنْصَارِ، فَصَخِبْتُ عَلَى امْرَأَتِي فَرَاجَعَتْنِي، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي، قَالَتْ: وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ، فَوَاللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ لَيُرَاجِعْنَهُ، وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ. فَأَفْزَعَنِي ذَلِكَ وَقُلْتُ لَهَا: وَقَدْ خَابَ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ مِنْهُنَّ. ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي فَنَزَلْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ حَفْصَةُ أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ النَّبِيَّ ﷺ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقُلْتُ: قَدْ خِبْتِ وَخَسِرْتِ، أَفَتَأْمَنِينَ أَنْ يَغْضَبَ اللَّهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ ﷺ فَتَهْلِكِي؟! لاَ تَسْتَكْثِرِي النَّبِيَّ ﷺ وَلاَ تُرَاجِعِيهِ فِي شَيْءٍ، وَلاَ تَهْجُرِيهِ، وَسَلِينِي مَا بَدَا لَكِ، وَلاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ، وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُرِيدُ عَائِشَةَ -.

قَالَ عُمَرُ: وَكُنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ الْخَيْلَ لِغَزْوِنَا، فَنَزَلَ صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْنَا عِشَاءً فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا وَقَالَ: أَثَمَّ هُوَ؟فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ حَدَثَ الْيَوْمَ أَمْرٌ عَظِيمٌ. قُلْتُ: مَا هُوَ؟ أَجَاءَ غَسَّانُ؟ قَالَ: لاَ، بَلْ أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ وَأَهْوَلُ، طَلَّقَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءَهُ. فَقُلْتُ: خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ، قَدْ كُنْتُ أَظُنُّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ، فَجَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَصَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا، وَدَخَلْتُ على حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، فَقُلْتُ: مَا يُبْكِيكِ؟ أَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ هَذَا، أَطَلَّقَكُنَّ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَتْ: لاَ أَدْرِي، هَا هُوَ ذَا مُعْتَزِلٌ فِي الْمَشْرُبَةِ. فَخَرَجْتُ فَجِئْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِي بَعْضُهُمْ، فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ، فَجِئْتُ الْمَشْرُبَةَ الَّتِي فِيهَا النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ لِغُلاَمٍ لَهُ أَسْوَدَ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ.

فَدَخَلَ الْغُلاَمُ فَكَلَّمَ النَّبِيَّ ﷺ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: كَلَّمْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَذَكَرْتُكَ لَهُ، فَصَمَتَ. فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ، فَجِئْتُ فَقُلْتُ لِلْغُلاَمِ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ. فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ، فَصَمَتَ. فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ، فَجِئْتُ الْغُلاَمَ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ. فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ. فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفًا -قَالَ:- إِذَا الْغُلاَمُ يَدْعُونِي فَقَالَ: قَدْ أَذِنَ لَكَ النَّبِيُّ ﷺ. فَدَخَلْتُ على رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ على رِمَالِ حَصِيرٍ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ، مُتَّكِئًا على وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَرَفَعَ إِلَيَّ بَصَرَهُ فَقَالَ: «لاَ». فَقُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ رَأَيْتَنِي وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ رَأَيْتَنِي وَدَخَلْتُ على حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: لاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺيُرِيدُ عَائِشَةَ- فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ تَبَسُّمَةً أُخْرَى، فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فِي بَيْتِهِ، فَوَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا يَرُدُّ

الْبَصَرَ غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلاَثَةٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ، فَإِنَّ فَارِسًا وَالرُّومَ قَدْ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ، وَأُعْطُوا الدُّنْيَا وَهُمْ لاَ يَعْبُدُونَ اللَّهَ. فَجَلَسَ النَّبِيُّ ﷺوَكَانَ مُتَّكِئًا. فَقَالَ: «أَوَفِي هَذَا أَنْتَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟ إِنَّ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلُوا طَيِّبَاتِهِمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَغْفِرْ لِي.

فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءَهُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الْحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عَائِشَةَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ قَالَ: «مَا أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْرًا». مِنْ شِدَّةِ مَوْجِدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عَاتَبَهُ اللَّهُ، فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً دَخَلَ على عَائِشَةَ فَبَدَأَ بِهَا، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ كُنْتَ قَدْ أَقْسَمْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا، وَإِنَّمَا أَصْبَحْتَ مِنْ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَعُدُّهَا عَدًّا. فَقَالَ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ». فَكَانَ ذَلِكَ الشَّهْرُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً.

قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى آيَةَ التَّخَيُّرِ فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ فَاخْتَرْتُهُ، ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ كُلَّهُنَّ فَقُلْنَ مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ[1].

## ٨٤- باسی پیاو ئامۆژگاری کچەکەی بکات لەبەر مێردەکەی

**٥١٩١- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: بەردەوام سوور بووم لەسەر ئەوەی پرسیار لە عومەر (ﷺ) بکەم دەربارەی ئەو دوو ئافرەتە لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە خوای گەورە بە هەردووکیانی فەرموو: ( ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بەگەڕێنەوە بۆلای خوا (جێی خۆیەتی)، چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) )، هەتا (عومەر) حەجی کرد منیش حەجم کرد لەگەڵیدا، ئەنجا لە ڕێگاکە لایدا منیش بە مەسینەیەکەوە لامدا، جا ڕۆشت بۆ چۆڵەوانیەك بۆ دەست بەئاو گەیاندن، پاشان هاتەوە ئەنجا لە مەسینەکە ئاوم**

(١) بڕوانە: ٨٩.

کرد به دەستەکانیدا و دەست نوێژی گرت، ئەوسا وتم: ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەو دوو ئافرەتە کێ بوون لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بە هەردووکیان وترا: (ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بەگەڕێنەوە بۆ لای خوا (جێی خۆیەتی)، چونکە بەڕاستی دڵتان لایدا (لە حەق و ڕاستی) ) عومەریش وتی: سەرم لێت سوڕ دەمێنێ ئیبنو عەبباس (چۆن ئەو شاراوە بووە لە تۆ)، عائیشە و حەفصە بوون.

پاشان عومەر دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە و وتی: من و دراوسێیەکی ئەنصاریم هەبوو کە لە تایفەی ئومەییەی کوڕی زەید بوو کە لە عەوالی مەدینە بوون، هەردووکمان بەنۆرە دەڕۆشتنیە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ڕۆژێك ئەو دەڕۆشت و ڕۆژێك من دەڕۆشتم، جا ئەگەر من بڕۆشتمایە هەرچی ببوایە لە نیگا و یا شتێکی تر بۆم دەهێنایەوە، وە ئەگەر ئەو بڕۆشتایە هەمان شتی دەکرد، وە ئێمە تاقمی قوڕەیش زاڵ بووین بەسەر ئافرەتاندا، بەڵام کە هاتینە (مەدینە) بۆ لای ئەنصاریەکان ئەوان گەلێك بوون ئافرەتانیان زاڵ بوون، جا بۆیە ئافرەتانی ئێمە دەستیان کرد بە وەرگرتنی خوو و نەریتی ئافرەتانی ئەنصاری، جا من جارێك قیڕاندم بەسەر خێزانەکەمدا ئەویش وەڵامی دامەوە، منیش وەڵامدانەوەکەیم پێ کارێکی خراپ بوو، خێزانم وتی: بۆ لات خراپە وەڵامت بدەمەوە؟ دەی سوێند بەخوا هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ وەڵامی پێغەمبەر ﷺ دەدەنەوە، وە بێگومان هاوسەری هەیە لە سەرەتای ڕۆژەوە تا شەو دەنگ لە پێغەمبەر ﷺ دادەبڕێ، جا ئەم هەواڵە ترساندمی بۆیە وتم: هەر کامیان ئەمە هەڵە گەورەیە بکات خەسارەتمەند بووە، پاشان جلوبەرگەکەم لەبەرکرد و ڕۆشتم بۆ ماڵی حەفصەو پێم وت: ئەی حەفصە ئایا یەکێك لە ئێوەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ تورە دەکەن هەموو ڕۆژەکە تا

شەو دادێ؟ حەفصە وتی: بەڵێ، عومەر دەڵێ: منیش وتم: بێگومان (ئەگەر وا بکەیت) خەسارەتمەند و ماڵ وێران بوویت، ئایا ناترسیت بەهۆی توڕەیی پێغەمبەرەوە ﷺ خوا لێت توڕە ببێت و لە ناو بچیت؟ حەفصە تۆ داوای شتی زۆر مەکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و وەڵام و بەرپەرچی مەدەرەوە لە هیچ شتێکدا (کە دەیفەرمووی) و دەنگی لێ دامەبڕە، وە هەر شتێکت بۆ دەرکەوت پرسیار لە من بکە با دراوسێ و هەوێکەت کە لە تۆ جوانتر و خۆشەویستترە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ - مەبەستی عائیشە بوو - نەتخەڵەتێنێت و بەهەڵەتا نەبات. عومەر ﷺ وتی: ئێمەی هاوەڵان لە ناو خۆماندا باسی ئەوەمان دەکرد کە غەسسان وڵاخەکانیان ناڵ دەکەن (وەك خۆ ئامادەکردن) بۆ هێرشکردنە سەرمان، جا هاوڕێ ئەنصاریەکەم لەسەرەی خۆیدا ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و کاتی عیشا گەڕایە و زۆر بە توندی لە دەرگاکەمی دا و وتی: عومەر لە ماڵەوەیە؟ منیش زۆر ترسام ڕۆشتمە دەرەوە بۆ لای وتی: ئەمڕۆ ڕووداوێکی گەورە ڕوویداوە، وتم: چیە غەسسان(ڕۆم) هاتووە ( و هێرشی هێناوە)؟ وتی: نەخێر بەڵکو لەوەش گەورەتر و ترسناکتر، پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانی تەڵاق داوە، عومەر دەڵێ: وتم: حەفصە زەرەمەند و ماڵ وێران بوو، من گومانم وابوو ئەم تەڵاق دانە نزیکە ڕووبدات و ببێت، ئەنجا جل و بەرگەکەم لەبەرکردو نوێژی بەیانیم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کرد، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەکەی خۆی بەتەنها لەوێدا بوو، منیش چووم بۆلای حەفصە دەبینم دەگری، وتم: بۆچی دەگریت؟ ئایا من ئاگادارم نەکردیت لەم مەترسییە؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی داون؟ حەفصە وتی: نازانم، پێغەمبەر ﷺ ئا ئەوەتا لەو ژوورە دایە بە تەنها، ئەنجا هاتمە دەرەوە (لە ماڵی حەفصە) ڕۆشتمە لای دوانەگەکە دەبینم کۆمەڵێك بەدەوریدان هەندێکیان دەگرین، منیش کەمێك لە گەڵیاندا دانیشتم، پاشان دڵم ناڕەحەت بوو بۆیە

ڕۆشتم بۆ لای ئەو ژووورەی کە پێغەمبەری ﷺ تێدایە، بە خزمەتکارێکی ڕەشت پێستی پێغەمبەرم ﷺ وت: داوای مۆڵەت بکە بۆ عومەر، خزمەتکارەکەش چووە ژوورەوە و قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد، پاشان هاتەدەرەوە و وتی: قسەم لە گەڵدا کرد و باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، (عومەر دەڵێ:) منیش گەڕامەوە هەتا دانیشتم لە لای ئەو کۆمەڵەی لای دوانگەکە بوون، پاشان ئەوەی لە دڵمدا بوو نارەحەتی کردم جارێکی تر هاتمەوە، وتم بە خزمەتکارەکە: داوای مۆڵەت بکە بۆ عومەر، ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، منیش گەڕامەوە هەتا دانیشتم لە لای ئەو کۆمەڵەی لای دوانگەکە بوون، پاشان ئەوەی لە دڵمدا بوو نارەحەتی کردم جارێکی تر هاتمەوە و وتم بە خزمەتکارەکە: داوای مۆڵەت بکە بۆ عومەر، ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، کە پشتم هەڵکرد و گەڕامەوە لە پڕ خزمەتکارەکە بانگی کردم و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دایت، منیش ڕۆشتمە خزمەتی و دیم لەسەر حەسیرێکی تەنراو ڕاکشابوو کە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و حەسیرەکدا هیچ فەرش و نوێنێك نەبوو، ئاسەواری قامیشی حەسیرەکە لە لاتەنیشتیدا دەرچوو بوو، پاڵی دابوویەوە بە پشتیەکی چەرمەوە ناو ئاخنەی پەلی دار خورما بوو، منیش سەلامم لێکرد و پاشان هەر بەپێوە بووم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکانت تەڵاق داوە؟ ئەویش چاوی بەرزکردەوە سەیری کردم و فەرمووی: ((نەخێر)) منیش وتم: ئەڵڵاهو ئەکبەر، پاشان هەر بە پێوە لەدڵی خۆمدا وتم دڵی خۆش دەکەم و بێتاقەتی لادەبەم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە ئێمەی قوڕەیشیت دەبینی زاڵ دەبووین بەسەر ئافرەتانماندا، بەڵام کاتێك هاتینە مەدینە بینیمان کەسانێك ئافرەتەکانیان زاڵ بوون بەسەریاندا، پێغەمبەریش ﷺ زەردە خەنەیەکی کرد، پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگە منت دەدی کاتێ ڕۆشتمە ماڵی حەفصە و پێم وت:

لەبەر ئەوەی هەوێکەت-مەبەستی عائیشە بوو- لە تۆ جوانتر و خۆشەویستترە لای پێغەمبەر ﷺ - با نەتخەڵەتێنێ جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، کە بینیم زەردە خەنەی کرد منیش دانیشتم، پاشان چاوم بەرزکردەوە و گێڕام بە ماڵەکەیدا سوێند بەخوا شتێکم بەرچاو نەکەوت سێ پێستە نەبێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە خوا بکە دەروو لە ئوممەتەکەت بکاتەوە، بێگومان فارس و ڕۆم دەروویان لێکراوەتەوە و دونیایان پێدراوە لە کاتێکدا ئەوان خوا ناپەرستن، جا پێغەمبەر ﷺ دانیشت کە پێشتر پاڵی دابۆوە و فەرمووی: ((ئایا ئیبنو لخەتتاب تۆ گومانت هەیە؟ ئەوانە کەسانێکن خۆشیەکانیان بۆ پێشخراوە بۆ ژیانی دونیا))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە ، پێغەمبەریش ﷺ لەبەر ئەو قسەی حەفصە بە عائیشەی گەیاندبوو بیست و نۆ شەو لە خێزانەکانی دوور کەوتەوە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویوی: ((من یەك مانگ ناڕۆمە ماڵی خێزانەکانم، (ئەمەش) بەهۆی توڕەبوونی زۆریەوە بوو لێیان کە خوا سەرزەنشتی کرد، جا کاتێ بیست و نۆ شەو تێپەڕی پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای عائیشە و لەوەوە دەستی پێکرد، عائیشەش عەرزی کرد: تۆ سوێندت خوارد کە یەك مانگ نەیەیتە لامان، وە بێگومان ئێمە ئێستا لە بیست و نۆیەم داین خۆم بە ژماردن (ڕۆژەکانم) ژماردووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مانگ بیست و نۆ ڕۆژە))، چونکە ئەو مانگە بیست و نۆ ڕۆژ بوو، عائیشە وتی: بەو هۆیەوە خوا ئایەتی سەرپشك کردنمانی دابەزاند، جا پێغەمبەر ﷺ لە منەوە یەکەم ئافرەت دەستی کرد (بە سەرپشك کردنەکە)، منیش خوا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دواییم هەڵبژارد، پاشان هەموو خێزانەکانی تریشی سەرپشك کرد، ئەوانیش هەموو هەمان ووتەی عائیشەیان دووبارە کردوە.

## ٨٥- بابُ صَوْمِ الْمَرْأَةِ بِإِذْنِ زَوْجِهَا تَطَوُّعًا

٥١٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «لاَ تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ»[1].

## ٨٥- باسی ڕۆژوو (ی سوننەت) گرتنی ئافرەت بە مۆڵەتی مێردەکەی

**٥١٩٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئافرەت ڕۆژوو (ی سونەت) نەگرێت لە کاتێکدا مێردەکەی ئامادە بێ[2]، مەگەر بە مۆڵەتی ئەو (مێردەکەی) )).**

## ٨٦- بابٌ: إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا

٥١٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ»[3].

## ٨٦- باسێک: ئەگەر ئافرەت شەو تا بەیانی لەگەڵ مێردەکەی نەخەوێ

**٥١٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر پیاو داوا سەرجێی لە ژنەکەی بکات ژنەکەش ملی نەدات بێت، هەتارۆژ دەبێتەوە فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٦٦.

(٢) لە ماڵەوە بێت لە سەفەر نەبێت.

(٣) بڕوانە: ٣٢٣٧.

٥١٩٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ زُرَارَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ»[1].

**٥١٩٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ژن شەو لەو جێگەی مێردەکەی بتۆرێ، تا بەیانی فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن تا دەگەڕێتەوە[2])).**

## ٨٧- بابٌ: لاَ تَأْذَنُ الْمَرْأَةُ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا لأَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِه

٥١٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَلاَ تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ». وَرَوَاهُ أَبُو الزِّنَادِ أَيْضًا عَنْ مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي الصَّوْمِ[3].

## ٨٧- باسێک: ئافرەت بۆ هامۆشۆی ماڵی مێردی نابێ ڕێگە بە کەس بدات، مەگەر بەمۆڵەتی مێردەکەی

**٥١٩٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نابێ ئافرەت ڕۆژوو (ی سونەت) بگرێت مێردەکەشی ئامادە بێت، مەگەر بە مۆڵەتی مێردەکەی، وە نابێ ڕێگە بە کەس بدات بێتە ماڵی مێردەکەی بە مۆڵەتی ئەو نەبێ، هەر شتێکیش ببەخشێت بەبێ فەرمان و مۆڵەتی ئەو، ئەوە بێگومان نیوەی (پاداشتەکەی) دەدرێت بە ئەو (مێردەکەی) )).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٣٧.

(٢) پەشیمان دەبێتەوە دەڕوات بۆ لای مێردەکەی و لەگەڵیدا دەخەوێت.

(٣) بڕوانە: ٢٠٦٦.

هەروەها ئەم فەرموودەیە ئەبو زەینادیش گێڕاویەتیەوە لە مووساوە ئەویش لە باوکیەوە لە ئەبی هوڕەیرە ﷺ لە باسی ڕۆژوودا گێڕاویەتیەوە

## ٨٨- بابٌ

٥١٩٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، أَخْبَرَنَا التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَكَانَ عَامَّةَ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ، وَأَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ»[1].

## ٨٨- باسێک

**٥١٩٦- ئوسامە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((لەبەر دەرگای بەهەشتدا وەستام، سەرنجم دا زۆربەی ئەوانەی ڕۆشتوونەتە ناو بەهەشتەوە هەژار و نەدارەکان بوون، بەڵام خاوەن ماڵ و سامانداره‌کان ڕاگیرابوون[2]، دۆزەخییەکان نەبێ کە بێگومان فەرمان درابوو کە ببرێن بۆ دۆزەخ، وە لەبەر دەرگای دۆزەخدا وەستام و سەرنجم دا زۆربەی ئەوانەی ڕۆشتبوونە ناو دۆزەخەوە ژنان بوون)).**

## ٨٩- بابُ كُفْرَانِ الْعَشِيرِ وَهُوَ الزَّوْجُ، وَهُوَ الْخَلِيطُ مِنَ الْمُعَاشَرَةِ

فِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥١٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ،: عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ

(١) بڕوانە: ٦٥٤٧.

(٢) بۆ لێپرسینەوەی ماڵ و سامانەکەیان.

اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً نَحْوًا مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهْوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ هَذَا، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ. فَقَالَ: «إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ -أَوْ أُرِيتُ الْجَنَّةَ- فَتَنَاوَلْتُ مِنْهَا عُنْقُودًا، وَلَوْ أَخَذْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَرَأَيْتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ مَنْظَرًا قَطُّ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ». قَالُوا: لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «بِكُفْرِهِنَّ». قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟! قَالَ: «يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، وَلَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ»[1].

## ٨٩- باسی سپڵەیی بەرانبەر بە مێرد (الْعَشِيرِ): مێرد و هاوسەرە، وە بە مانای تێکەڵاویش دێ کە لە (الْمُعَاشَرَةِ) وە وەرگیراوە

**دەربارەی ئەم باسە لە ئەبی سەعیدەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە[2].**

**٥١٩٧- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا پێغەمبەری خوا و ﷺ خەڵکیش لەگەڵیدا نوێژی خۆرگیرانیان کرد (نوێژی دابەست)، بەپێوە زۆر وەستا بەئەندازە خوێندنی سوڕەتی بەقەرە،**

---

(١) بڕوانە: ٢٩.

(٢) کە بوخاری بە ژمارە: ٣٠٤ لەم صەحیحەدا هێناویەتی.

پاشان کوڕنووشی برد و زۆر لە کوڕنووشدا مایەوە، پاشان بەرز بوویەوە جا زۆر بە ڕاوەستاوی مایەوە (قورئانی خوێند)، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کوڕنووشی بردەوە زۆریش مایەوە لە کوڕنووشدا، بەڵام لە کوڕنووشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سوژدەی برد، پاشان هەستایەوە زۆر بەڕاوەستاوی مایەوە، بەڵام لە ڕاوەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کوڕنووشی برد و زۆر لە کوڕنووشدا مایەوە بەڵام لە کوڕنووشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان بەرز بوویەوە و زۆر بە ڕاوەستاوی مایەوە، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کوڕنووشی برد زۆر لە کوڕنووشدا مایەوە، بەڵام لە کوڕنووشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان بەرز بوویەوە زۆر بەپێوە وەستا، بەڵام لە وەستانی یەکەم کەمتر بوو، پاشان کوڕنووشی برد زۆر لە کوڕنووشدا مایەوە، بەڵام لە کوڕنووشی یەکەم کەمتر بوو، پاشان سوژدەی برد، پاشان کۆتایی پێ هێنا، وە لەو کاتەدا خۆر بەر بوو گیرانەکەی کۆتایی هات، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، لەبەر مردن یان ژیان و لەدایك بوونی هیچ کەسێك ناگیرێن، جا هەر کات ئەو گیرانەتان بینی ئەوە یادی خوا بکەن))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چاومان لێت بوو لەو شوێنەی خۆت دا وەك دەست بۆ شتێك ببەیت، پاشان چاومان لێت بوو هاتیتە دواوە؟ فەرمووی: ((بێگومان بەهەشتم بینی - یان بەهەشتم نیشان درا - دەستم برد بۆ بۆشکێك ترێ، ئەگەر بمگرتایە هەتا دونیا مابوو لێتان دەخوارد (و تەواو نەدەبوو)، دۆزەخیشم بینی هیچ کات دیمەنی ناشرین و ترسناکی وەك ئەمڕۆی نەبووە، وە بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە ئافرەتانە))، وتیان: لەبەر چی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((لەبەر پێنەزانینیان))، ووترا: بەخوا بێ باوەڕن؟ فەرمووی: ((دان بەچاکەی مێردیاندا نانێن و دان بەچاکەدانانێن کە لەگەڵیاندا کراوە،

**ئەگەر بەدرێژای ساڵ لەگەڵ ئافرەتێکیان دا چاکە بکەیت، ئەنجا خراپەیەکت لێ ببینێ دەڵێ: هەرگیز چاکەم لێ نەبینیویت)).**

٥١٩٨- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ، حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنْ عِمْرَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ، فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ». تَابَعَهُ أَيُّوبُ وَسَلْمُ بْنُ زَرِيرٍ[1].

**٥١٩٨- عیمران ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((چاوم بە بەهەشت کەوت[2] جا بینیم زۆرتری خەڵکەکەی هەژارانن. وە چاوم بەدۆزەخ کەوت و بینیم زۆرتری خەڵکەکەی ئافرەتانن)).**

**ئەیوب وسەلی کوڕی زەریر (ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە) و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەوف دەکەن.**

## ٩٠- بابٌ: لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقٌّ

قَالَهُ أَبُو جُحَيْفَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥١٩٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ، أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ؟». قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا»[3].

---

(١) بڕوانە: ٣٢٤١.

(٢) لە شەوی میعراجدا یان خەودا.

(٣) بڕوانە: ١١٣١.

## ٩٠- باسێک: بێگومان ژنەکەت مافی هەیە بەسەرتەوە

ئەم وتەی ئەبو جوحەیفە ﷺ وتوویەتی و لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.

٥١٩٩- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەی عەبدوڵڵا ئەو هەواڵەی بە من دراوە ڕاستە، کە تۆ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت و شەو هەمووی شەونوێژ دەکەیت؟ وتم: بەڵێ ڕاستە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((دەی وا مەکە بەڕۆژوو بە و بەڕۆژووش مەبە، شەونوێژ بکە و بشخەوە، چونکە بێگومان لاشەت مافی هەیە لەسەرت و چاوت مافی هەیە لەسەرت و خێزانت مافی هەیە لەسەرت)).

## ٩١- بَابٌ الْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا

٥٢٠٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالأَمِيرُ رَاعٍ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ، فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»[١].

## ٩١- باسێک: ژن شوان و بەرپرسیارە لە ماڵی مێردەکەیدا

٥٢٠٠- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((هەمووتان شوانن و هەمووشتان بەرپرسیارن لە ژێر دەستەکانتان، پێشەوا شوان و بەرپرسە، پیاو شوان و بەرپرسیارە بەسەر ئەندامانی خێزانەکەیەوە،

---

(١) بڕوانە: ٨٩٣.

**ژن شوان و بەرپرسیارە بە سەر ماڵی مێرد و منداڵەکانیەوە، کەواتە هەمووتان شوان و بەرپرسیارن، وە هەمووشتان بەرپرسیارن لە ژێر دەستەکەتان)).**

**٩٢- بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى:** ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٣٤﴾﴾ النساء. **إِلَى قَوْلِهِ:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾ النساء

## ٩٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (پیاوان سەرپەرشتیارن[١] بەسەر ئافرەتانەوە بە هۆی ئەوەوە خوا باوی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا) ،تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (بە ڕاستی خوا هەمیشە بەرز و بڵند و گەورەیە)

٥٢٠١- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: آلَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، وَقَعَدَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، فَنَزَلَ لِتِسْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ آلَيْتَ عَلَى شَهْرٍ. قَالَ: «إِنَّ الشَّهْرَ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[٢].

**٥٢٠١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مانگێك سوێندی لە هاوسەرەکانی خوارد سەرجێی یان لەگەڵ نەکات، وە لە ژوورەکەی[٣] خۆیدا دانیشت، جا دوای بیست و نۆ ڕۆژ دابەزی (لە ژوورەکەی)[٤] پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان تۆ سوێندت بۆ مانگێك خوارد[٥]، فەرمووی: ((بێگومان ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە)).**

---

(١) واتە: کار بەدەستن.

(٢) بڕوانە: ٣٧٨.

(٣) ژوورێکی بەرزە وەک شوێنی ئاو خواردنەوە و چێشت لێنانە.

(٤) ڕۆشت بۆ لای عائیشە ﷺ.

(٥) تێکەڵاوی و سەرجێی لەگەڵ خێزانەکاندا نەکەیت.

## ٩٣- بابُ هِجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ نِسَاءَهُ فِي غَيْرِ بُيُوتِهِنَّ

وَيُذْكَرُ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حَيْدَةَ رَفْعُهُ: «غَيْرَ أَنْ لاَ تُهْجَرَ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ». وَالأَوَّلُ أَصَحُّ.

٥٢٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَيْفِيٍّ، أَنَّ عِكْرِمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا عَلَيْهِنَّ -أَوْ رَاحَ- فَقِيلَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، حَلَفْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ شَهْرًا. قَالَ: «إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا»[١].

## ٩٣- باسی هاموشۆ نەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ لای خێزانەکانی و مانەوەی لە غەیری ماڵی خێزانەکانیدا

**لە موعاوییەی کوڕی حەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە و بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی و بردوویەتیەوە سەر ئەو (کە فەرموویەتی): ((بەڵام دەبێ لەگەڵ پەیوەندی نەبونەکەدا هەر لە ماڵی خۆیدا بێت))[٢]، بەڵام (فەرموودەکەی) یەکەم ڕاسترە لەمەی موعاویە[٣].**

**٥٢٠٢- یەحیای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی صەیفیی دەڵێ: کە عیکریمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریس بۆی گێڕاوەتەوە کە ئوممو سەلەمە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد لە خێزانەکانی ﷺ کەیەك مانگ نەچێتە لایان، ئەنجا کە بیست و نۆ ڕۆژ تێپەڕی، بەیانییەك یا ئێوارەیەك (چووە لایان) پێی وترا: تۆ سوێندت خواردبوو یەك مانگ نەچیتە لایان؟! فەرمووی: ((بێگومان مانگ بیست و نۆ ڕۆژیش دەبێ))[٤].**

---

(١) بڕوانە: ١٩١٠.

(٢) واتە: پیاوێک سوێند دەخوات سەرجێی لەگەڵ خێزانی نەکات یان قسەی لەگەڵ نەکات بۆ ماوەیەک، دەبێت پیاوەکە ماڵ بەجێ نەهێڵێ و نەڕوات بۆ جێگایەکی تر.

(٣) کە ئەنەس گێرایەوە بە ژمارە ( ٥٢٠١) بەهێزتر و سەحیح ترە لە فەرموودەکەی موعاویە گێراویەتیەوە، کەواتە دروستە لە ماڵی خۆشیدا نەبێت.

(٤) هەمیشە سی ڕۆژ نییە بەڵکو زۆربەی مانگە عەرەبیەکان بیست و نۆ ڕۆژە.

٥٢٠٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو يَعْفُورٍ قَالَ: تَذَاكَرْنَا عِنْدَ أَبِي الضُّحَى فَقَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ: أَصْبَحْنَا يَوْمًا وَنِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ يَبْكِينَ، عِنْدَ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ أَهْلُهَا، فَخَرَجْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَإِذَا هُوَ مَلآنُ مِنَ النَّاسِ، فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَصَعِدَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ فِي غُرْفَةٍ لَهُ، فَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَنَادَاهُ، فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَقَالَ: «لاَ وَلَكِنْ آلَيْتُ مِنْهُنَّ شَهْرًا». فَمَكَثَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ.

**٥٢٠٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ ڕۆژێکیان کە ڕۆژمان لێ بوویەوە، هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگریان، هەر ئافرەتێك کەس و کاری لای بوون، منیش ڕۆشتم بۆ مزگەوت دەبینم پڕە لە خەڵك، ئەنجا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هات ڕۆشتە سەرەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، کە لە ژوورێکی خۆیدا بوو عومەر سەلامی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سەلامی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، جارێکی تر سەلامی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، جا بیلال بانگی کرد و چووە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد: خێزانەکانت تەڵاق داوە؟ ئەویش فەرمووی: ((نەخێر بەڵام سوێندم لێ خواردوون تامانگێك نەچمە لایان))، ئینجا بیست ونۆ ڕۆژ مایەوە پاشان چووە لای خێزانەکانی (و سەرجێی لەگەڵ کردن).**

## ٩٤- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ ضَرْبِ النِّسَاءِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ وَٱضْرِبُوهُنَّ ﴿٣٤﴾ ﴾ النساء. ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ.

٥٢٠٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ»[1].

(١) بڕوانە: ٣٧٨.

## ٩٤- باسی ئەوە کە ناپەسەندە لە لێدانی ژنان

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە لێیان بدەن) بە لێدانێك كە توند نەبێ و لەشی عەیب دار نەكات).

٥٢٠٤- عەبدوڵڵای كوڕی زەمعە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((با كەسێكتان داركاری ژنەكەی نەكات وەك داركاری بەندە بكات، پاشان لە كۆتایی ڕۆژدا سەرجێی لەگەڵدا بكات)).

## ٩٥- بَابٌ: لاَ تُطِيعُ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا فِي مَعْصِيَةٍ

٥٢٠٥- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ، عَنِ الْحَسَنِ -هُوَ ابْنُ مُسْلِمٍ- عَنْ صَفِيَّةَ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ زَوَّجَتِ ابْنَتَهَا فَتَمَعَّطَ شَعَرُ رَأْسِهَا، فَجَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَتْ: إِنَّ زَوْجَهَا أَمَرَنِي أَنْ أَصِلَ فِي شَعَرِهَا. فَقَالَ: «لاَ إِنَّهُ قَدْ لُعِنَ الْمُوصِلاَتُ»[١].

## ٩٥- باسێک: ئافرەت گوێڕایەڵی مێردی ناکات لە تاوان و گوناهدا

٥٢٠٥- صەفیە لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە ژنێكی ئەنصاری كچێكی دا بە شوو قژی سەری وەری بوو، ئەنجا ژنەكە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ گێڕایەوە وتی: بە ڕاستی مێردەكەی فەرمانی پێ كردووم كە قژ ببەستم بە قژیەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ بێگومان ئەو ژنانەی قژ پەیوەست دەكەن بە قژی ئافرەتانەوە نەفرینیان لێ كراوە)).

---

(١) بڕوانە: ٥٩٣٤.

**٩٦- بابٌ:** ﴿ وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا ﴿١٢٨﴾ ﴾ النساء

٥٢٠٦- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ ﴿ وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا ﴿١٢٨﴾ ﴾ النساء. قَالَتْ: هِيَ الْمَرْأَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ، لاَ يَسْتَكْثِرُ مِنْهَا فَيُرِيدُ طَلاَقَهَا، وَيَتَزَوَّجُ غَيْرَهَا، تَقُولُ لَهُ: أَمْسِكْنِي وَلاَ تُطَلِّقْنِي، ثُمَّ تَزَوَّجْ غَيْرِي، فَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنَ النَّفَقَةِ عَلَيَّ وَالْقِسْمَةِ لِي، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النساء[1].

## ٩٦- باسێک (وە ئەگەر ئافرەتێک ترسا لە گوێ پێ نەدان یان پشت هەڵکردنی مێردەکەی)

**٥٢٠٦- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەربارەی ئەم ئایەتە (وە ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە گوێ پێ نەدان یان پشت هەڵکردنی مێردەکەی)، (عائیشە) وتی: ئەو ژنەیە هاوسەری پیاوێکە کە نایەوێت درێژە بە ژیانی هاوسەری بدات لەگەڵ ئەو ژنەدا و دەیەوێ تەڵاقی بدات و ژنێکی تر مارە بکات، هاوسەرەکەشی بە پیاوەکە دەڵێ بمهێڵەوە تەڵاقم مەدە، پاشان ژنێکی تر مارەکە و تۆ گەردنت ئازاد بێت لەخەرجی کێشانم و شەو مانەوە لام، ئەوەش مەبەستی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: (ئەوە هەردووکیان[2] هیچ گوناهێکیان لەسەر نییە کە ئاشتەواییەکی چاك بکەن لە نێوان خۆیاندا، هەر ئاشتەوایی و یەك کەوتن چاکترە).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٥٠.

(٢) واتە: ژن و مێردەکەی.

# ٩٧- بابُ العَزْلِ

٥٢٠٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

# ٩٧- باسی (حوكمی) عەزل[٢]

**٥٢٠٧- جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا عەزڵمان دەكرد.**

٥٢٠٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، سَمِعَ جَابِرًا ﷺ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ[٣].

**٥٢٠٨- جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران عەزڵمان دەكرد و قورئانیش دادەبەزی.**

٥٢٠٩- وَعَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ[٤].

**٥٢٠٩- جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ عەزڵمان دەكرد و قورئانیش دادەبەزی.**

٥٢١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَسْمَاءَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: أَصَبْنَا سَبْيًا، فَكُنَّا نَعْزِلُ، فَسَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَوَإِنَّكُمْ لَتَفْعَلُونَ؟ -قَالَهَا ثَلاَثًا- مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِلاَّ هِيَ كَائِنَةٌ»[٥].

---

(١) بڕوانە: ٥٢٠٨، ٥٢٠٩.
(٢) عەزەل: گرتنەوە مەنی پیاوە لە كاتی جووت بوندا لەگەڵ هاوسەریدا بۆ ئەوەی مەنیەكە نەڕژێتە منداڵ دانیەوە و سكی پڕنەبێ.
(٣) بڕوانە: ٥٠٢٧.
(٤) بڕوانە: ٥٢٠٧.
(٥) بڕوانە: ٣٢٢٩.

**٥٢١٠- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: كۆمەڵێ ئافرەتمان بەدیل گرت (لە كافران) ئێمە سەرجێیمان لەگەڵ ئافرەتە دیلەكان دەكرد و عەزلمان دەكرد، بۆیە پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەویش فەرمووی: ((ئایا بەڕاست ئێوە ئەو كارە دەكەن؟)) -سێ جار ئەمەی فەرموو- (هیچ منداڵێك نییە تا ڕۆژی قیامەت (خوا نوسیبێتی) پەیدا بێت، ئیللا پەیدا دەبێت)).**

## ٩٨- باب الْقُرْعَةِ بَيْنَ النِّسَاءِ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا

٥٢١١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَطَارَتِ الْقُرْعَةُ لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ بِاللَّيْلِ سَارَ مَعَ عَائِشَةَ يَتَحَدَّثُ، فَقَالَتْ حَفْصَةُ: أَلاَ تَرْكَبِينَ اللَّيْلَةَ بَعِيرِي وَأَرْكَبُ بَعِيرَكِ، تَنْظُرِينَ وَأَنْظُرُ؟ فَقَالَتْ: بَلَى. فَرَكِبَتْ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جَمَلِ عَائِشَةَ وَعَلَيْهِ حَفْصَةُ فَسَلَّمَ عَلَيْهَا، ثُمَّ سَارَ حَتَّى نَزَلُوا وَافْتَقَدَتْهُ عَائِشَةُ، فَلَمَّا نَزَلُوا جَعَلَتْ رِجْلَيْهَا بَيْنَ الإِذْخِرِ وَتَقُولُ: يَا رَبِّ، سَلِّطْ عَلَيَّ عَقْرَبًا أَوْ حَيَّةً تَلْدَغُنِي، وَلاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقُولَ لَهُ شَيْئًا.

## ٩٨- باسی تیر و پشک ڕاكێشانی (پیاو) لە نێوان هاوسەرەكانیدا ئەگەر بیەوێ سەفەر بكات

**٥٢١١- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ هەركات سەفەری بكردایە تیر و پشكی دەكرد لە نێوان خێزانەكانیدا، جارێك تیر و پشكەكە بۆ عائیشە و حفصە ﷺ دەرچوو، جا پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بە شەودا ڕێگای بكردایە لەگەڵ عائیشە ﷺ دەڕۆشت و قسەی لەگەڵ دەكرد، ئینجا حەفصە بە عائیشەی وت: ئایا ئەمشەو تۆ سواری وشترەكەی من دەبیت، منیش سواری وشترەكەی تۆ ببم**

تۆ بڕوانە و منیش دەڕوانم؟ عائیشەش وتی: بەڵێ باشە، جا هەریەکەیان سواری وشتری ئەوی تریان بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای وشترەکەی عائیشە ﵂ حەفصە بە سواریەوە بوو سەلامی لێکرد، پاشان لەگەڵی ڕۆشت هەتا دابەزین عائیشە ﵂ پێغەمبەری ﷺ لێ وون بوو، جا کاتێ دابەزین عائیشە پێیەکانی دەخستە ناو ئیزخیرەوە[1] و دەیوت: ئەی پەروەردگار دوپشکێ مارێکم بۆ بنێرە بمگەزێت ناتوانم هیچ بە پێغەمبەر ﷺ بڵێم.

## ٩٩- بابُ الْمَرْأَةِ تَهَبُ يَوْمَهَا مِنْ زَوْجِهَا لِضَرَّتِهَا، وَكَيْفَ يُقْسِمُ ذَلِكَ؟

٥٢١٢- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ بِيَوْمِهَا وَيَوْمِ سَوْدَةَ[2].

## ٩٩- باسی ژنێک ئەو ڕۆژەی مێردەکەی لای دەبێت بیبەخشێت بە هەوێیەکەی، وە چۆن شەو مانەوەی خێزانەکانی دابەش دەکات؟

٥٢١٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: سودەی کچی زەمعە ﵂ ڕۆژە سەرەکەی خۆی بەخشی بە عائیشە ﵂ ، ینجا پێغەمبەر ﷺ لای عائیشە ﵂ ڕۆژەکەی خۆی لای دەمایەوە لەگەڵ ڕۆژەکەی سەودەش[3].

---

(١) الاذخر: گیایەکی بۆن خۆشە بە زۆری مار و مێرووی تیایە.

(٢) بڕوانە: ٢٥٩٣.

(٣) مەبەست شەو و ڕۆژە نەک شەو بە تەنها.

### ١٠٠- بابُ العَدْلِ بَيْنَ النِّسَاءِ ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿١٢٩﴾﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾﴾ النساء

## ١٠٠- باسی دادپەروەری لە نێوان هاوسەرانی ژندا (پێویستە)، (ئێوە هەرگیز ناتوانن دادپەروەر بن لە نێوان ژنەکانتان دا)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە (بەهرە فراوان و کار دروستە)

### ١٠١- بابٌ: إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ

٥٢١٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ وَلَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، وَلَكِنْ قَالَ:- السُّنَّةُ إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا[1].

## ١٠١- باسێک: ئەگەر (پیاو) کچی مارە کرد و هێنابەسەر بێوەژندا[2]

**٥٢١٣- ئەبو قیلابە دەڵێ:ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەگەر بمەوێ دەڵێم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی[3]: بەڵام ئەنەس وتی: سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی مارە کرد و هێنای حەوت شەو لای بمێنێتەوە، وە ئەگەر بێوەژنی مارە کرد و هێنای سێ شەو لای بمێنێتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٢١٤.
(٢) چۆن بکات لەو کاتەدا.
(٣) وتەکەم ڕاستە کەوا دەڵێم.

## ١٠٢- بابٌ: إِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ

٥٢١٤- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ رَاشِدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ وَخَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا وَقَسَمَ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا ثُمَّ قَسَمَ. قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَلَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ: إِنَّ أَنَسًا رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، وَخَالِدٍ، قَالَ خَالِدٌ: وَلَوْ شِئْتُ قُلْتُ: رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ[١].

## ١٠٢- باسێک: ئەگەر (پیاو) بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا

**٥٢١٤- ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە سوننەتە[٢] ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژندا حەوت شەو لای دەمێنێتەوە، جا شەو مانەوە دادەنێ لە نێوانیاندا، وە ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا سێ شەو لای دەمێنێتەوە، پاشان شەو مانەوە دادەنێ لە نێوانیاندا.**

**ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەگەر بمویستایە دەموت: بێگومان ئەنەس ئەم فەرموودەی بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە و داوێتیە پاڵ ئەو.**

**عەبدوڕەزاق دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە ئەیوب و خالیدەوە، وە خالید وتی: ئەگەر بمویستایە دەمووت بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە و داوێتیە پاڵ ئەو.**

## ١٠٣- بابٌ: مَنْ طَافَ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ

٥٢١٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ، وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٥٢١٣.

(٢) لە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٢٦٨.

## ١٠٣- باسێک: کەسێک بەسەر هەموو خێزانەکانیدا بگەڕێ و (سەرجێی یان لەگەڵدا بکات) بەیەک خۆشۆردن

**٥٢١٥- قەتادە دەگێڕێتەوە کەئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەسوڕایەوە بەسەر هەموو ژنەکانیدا (و لەگەڵیان دروست دەبوو) لە یەك شەودا، وە لەو ڕۆژگارەدا نۆ ژنی هەبوو.**

## ١٠٤- بابُ دُخُولِ الرَّجُلِ عَلَى نِسَائِهِ فِي الْيَوْمِ

٥٢١٦- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الْعَصْرِ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ، فَيَدْنُو مِنْ إِحْدَاهُنَّ، فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ، فَاحْتَبَسَ أَكْثَرَ مَا كَانَ يَحْتَبِسُ[١].

## ١٠٤- باسی چوونە ژوورەوەی پیاو بە ڕۆژدا بۆ لای خێزانەکانی

**٥٢١٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: هەمیشە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەگەڕایەوە لە نوێژی عەسر دەچوویە ژوورەوە بۆ لای ژنەکانی و لە یەکێکیان نزیك دەبوویەوە[٢]، ئینجا چووە ژوورەوە بۆ لای حەفصە و مایەوە زیاد لەوەی کە جاران دەمایەوە.**

## ١٠٥- بابٌ: إِذَا اسْتَأْذَنَ الرَّجُلُ نِسَاءَهُ فِي أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِ بَعْضِهِنَّ، فَأَذِنَّ لَهُ

٥٢١٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، قَالَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْأَلُ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ «أَيْنَ أَنَا غَدًا؟ أَيْنَ

---

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٢) بێ ئەوەی لەگەڵی دروست بێ و سەرجێی لەگەڵدا بکات.

أَنَا غَدًا؟». يُرِيدُ يَوْمَ عَائِشَةَ، فَأَذِنَ لَهُ أَزْوَاجُهُ يَكُونُ حَيْثُ شَاءَ، فَكَانَ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ حَتَّى مَاتَ عِنْدَهَا. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَاتَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي كَانَ يَدُورُ عَلَيَّ فِيهِ فِي بَيْتِي، فَقَبَضَهُ اللَّهُ، وَإِنَّ رَأْسَهُ لَبَيْنَ نَحْرِي وَسَحْرِي، وَخَالَطَ رِيقُهُ رِيقِي[١].

## ١٠٥- باسێک: ئەگەر پیاو مۆڵەت بخوازێ لە هاوسەرەکانی کە لە ماڵی هاوسەرێکیان چارەسەر بکرێت، ئەوانیش هەموویان مۆڵەتی بدەن

**٥٢١٧- هیشامی کوڕی عوروە دەڵێ: باوکم هەواڵی دامێ لە عائیشەوە ﵂ ئەویش گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەیدا کەوەفاتی کرد، تێیدا پرسیاری دەکرد و دەیفەرموو: ((من سبەینێ لە کوێم من سبەینێ لەکوێم؟)) مەبەستی ئەو ڕۆژە بوو نۆبەی عائیشەیە ﵂، جا هەموو هاوسەرەکانی مۆڵەتیان دا لە هەرکوێ بێت خۆی پێی خۆشە، ئیتر لە ماڵی عائیشە بوو هەتا لای عائیشە وەفاتی کرد، عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد دەگەڕا (بەسەر هاوسەرەکانیدا)، هاتبوویە لای من لە ماڵی من بوو، خوای گەورە بردییەوە بۆ لای خۆی لەو کاتەدا سەری لە نێوان ژێرچەناگە و سنگمدا بوو، وە تفی ئەو تێکەڵ بە تفی من بوو[٢].**

## ١٠٦- بابُ حُبِّ الرَّجُلِ بَعْضَ نِسَائِهِ أَفْضَلَ مِنْ بَعْضٍ

٥٢١٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ ﵁ دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَقَالَ: يَا بُنَيَّةِ، لاَ يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا حُبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِيَّاهَا -يُرِيدُ عَائِشَةَ- فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَبَسَّمَ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٨٩٠.

(٢) کاتێ سیواکەکەی نەرم کرد بە تفی دەمی و دایە ئەویش سیواکی پێ کرد بەو شێوەیە تفیان تێکەڵ بوو.

(٣) بڕوانە: ٨٩.

## ١٠٦- باسی (دروستە) پیاو هەندێ لە ژنەکانی خۆشتر بوێ لە هەندێکی تریان

٥٢١٨- ئیبنو عەبباس لە عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە چووە ژوورەوە بۆلای حەفصە ﷺ وتی: کچی خۆم، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئا ئەو هاوسەرەی جوانی ئەو سەرنجی پێغەمبەری خوای ﷺ ڕاکێشاوە -مەبەستی عائیشە بوو- هەڵت نەخەڵەتێنێ، (عومەر دەڵێ:) جا ئەو قسەیەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد.

## ١٠٧- بابُ الْمُتَشَبِّعِ بِمَا لَمْ يَنَلْ، وَمَا يُنْهَى مِنِ افْتِخَارِ الضَّرَّةِ

٥٢١٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ، حَدَّثَتْنِي فَاطِمَةُ، عَنْ أَسْمَاءَ أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ مِنْ زَوْجِي غَيْرَ الَّذِي يُعْطِينِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلاَبِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ».

## ١٠٧- باسی (خراپی) خۆهەڵکێشان بە شتێکەوە نەیدراوەتێ، وە ئەوەش کە ڕێگری لێکراوە لە خۆ هەڵکێشان و شانازی بەسەر هەوێدا[1]

٥٢١٩- ئەسما ﷺ دەگێڕێتەوە کەژنێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هەوێیەکەم هەیە، دەی ئایا گوناهم دەگات وا نیشان بدەم مێردەکەم شتانێکی

---

(١) بەسەر هەوێکەیدا کەوا نیشان بدات مێردەکەی خۆشتری دەوێت لەهەوێکەی.

**پێداوم جگە لەوەی پێی داوم[١]؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی خۆی هەڵبکێشێ بە شتێکەوە کە نەیدرابێتێ، وەك ئەو کەسە وایە دوو پۆشاکی درۆینەی پۆشیبێت[٢])).**

## ١٠٨- بَابُ الغَيْرَةِ

وَقَالَ وَرَّادٌ عَنِ الْمُغِيرَةِ قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفِحٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ؟ لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي».

٥٢٢٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ، وَمَا أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّهِ»[٣].

## ١٠٨- باسی غیرە و ڕق لێبوونەوە

**وەڕاد لە موغیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ وتی: ئەگەر پیاوێك ببینم لەگەڵ ژنەکەمدا بێگومان بە شمشێر لێی دەدەم بەبارە تیژەکەیدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا ڕق هەستان و غیرەی سەعدتان بەلاوە سەیرە؟ بەڕاستی من لەو غیرە[٤]و ڕق لێبوونەوەم زیاترە، خواش لە من غیرەی زیاترە)).**

**٥٢٢٠- عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( کەس نییە غیرەی لە خوا زیاتر بێت، هەر لەبەر ئەوەشە تاوانە زۆر ناشرینەکانی حەرام کردوە، وە کەسیش نییە بە قەدەر خوا وەسف و سەنای لای خۆشەویستر بێت)).**

---

(١) واتە: بڵێم ئەوەی پێداوم ئەوەی بۆ کردووم کە ڕاست نەبێ و درۆ بێ، تەنها لە ڕقی هەوێکەم بیڵێم.

(٢) دوو پۆشاکی بە خواستن لە کەسێک خواستبووە لەبەری کردوە، بەڵام هی خۆی نییە و درۆ دەکات.

(٣) بڕوانە: ٤٦٣٤.

(٤) غیرە واتە: بەتەنگ شەرەف و ئابڕ و ناموسەوە بوون، هەروەها غیرە بە واتای: ڕقبوونەوەیە لەسەر بەشدار بوونی خەڵکی تر لەو کار و بارانەی تایبەتە بە خۆی، وە بە مانای پێ ناخۆش بوونیش دێ.

٥٢٢١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، مَا أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَرَى عَبْدَهُ أَوْ أَمَتَهُ تَزْنِي، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[١].

**٥٢٢١- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئوممەتی موحەممەد هیچ کەس بەقەدەر خوا پێی ناخۆش نییە[٢] کە ببینێت بەندەکەی یان کەنیزەکەکەی زینا بکات، ئەی ئوممەتی موحەممەد ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە، بێگومان کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان)).**

٥٢٢٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ حَدَّثَهُ، عَنْ أُمِّهِ أَسْمَاءَ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ شَيْءَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ».

**٥٢٢٢-ئەسما ﵂ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هیچ شتێك غیرەی لە خوا زیاتر نییە)).**

٥٢٢٣ - وَعَنْ يَحْيَى، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ. حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ».

**٥٢٢٣- وە (هەممام) لە یەحیاوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبو سەلەمە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەبو هورەیرە ﵁ بۆی گێڕاوەتەوە کە خۆی ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە.**

(١) بڕوانە: ١٠٤٤.
(٢) بە ڕق هەستانیش مانا دەکرێ.

**وه (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەبو نوعەیم بۆی گێڕاینەوە وتی: شەیبان بۆی گێڕاینەوە له یەحیاوە له ئەبی سەلەمەوە گێڕایەوە، که له ئەبو هوڕەیرەی ﷺ بیست له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە که فەرموویەتی: ((بێگومان خوا پێی ناخۆش بوونی دەبێ، وه پێ ناخۆشبوون و غیرەی خواش ئەوەیه باوەڕدار ئەوەی خوا حەرامی کردوه ئەنجامی بدات)).**

٥٢٢٤- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلاَ مَمْلُوكٍ وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ نَاضِحٍ وَغَيْرَ فَرَسِهِ، فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ، وَأَسْتَقِي الْمَاءَ،وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، وَكَانَ يَخْبِزُ جَارَاتٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَأْسِي، وَهْيَ مِنِّي عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ، فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: «إِخْ إِخْ». لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسِيرَ مَعَ الرِّجَالِ، وَذَكَرْتُ الزُّبَيْرَ وَغَيْرَتَهُ -وَكَانَ أَغْيَرَ النَّاسِ- فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنِّي قَدِ اسْتَحْيَيْتُ فَمَضَى، فَجِئْتُ الزُّبَيْرَ فَقُلْتُ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلَى رَأْسِي النَّوَى، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَأَنَاخَ لأَرْكَبَ، فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ. فَقَالَ: وَاللَّهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى كَانَ أَشَدَّ عَلَيَّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ. قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ يَكْفِينِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَنِي[1].

**٥٢٢٤- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: زوبەیر ﷺ مارەی کردم، وه لەسەر زەویدا ماڵ و سامان و کۆیله و هیچ شتێکی نەبوو، جگه له وشترێك ئاوی پێ دەهێنا و ئەسپەکەی، منیش ئاڵفم به ئەسپەکه دەدا و ئاوم دەهێنا و**

---

(١) بڕوانه: ٣١٥١.

**دۆڵچەکەم[١] دەدوریەوە و هەویرم دەشێلا، بەڵام نەمدەزانی بە جوانی نان بکەم، چەند ژنێکی دراوسێی ئەنصاریمان هەبوون نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ئەوان ژنانێکی چاك بوون، وە لە زەوییەکەی زوبەیرەوە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دابوو ناوکە خورمام بە سەر سەر دەگواستەوە (بۆ ماڵەوە)، کە زەوی و (باخە) کەی لە ماڵەکەی منەوە دوسێیەکی فەرسەخێ[٢] دوور بوو، ئینجا ڕۆژێك هاتمەوە و ناوکە خورماکەم بەسەر سەرەوە بوو، گەشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە چەند پیاوێکی ئەنصار لەگەڵ بوو، بانگی کردم، پاشان فەرمووی: ((ئیخ ئیخ[٣])) بۆ ئەوەی لە پاشکۆی خۆیەوە سوارم بکات، منیش شەرمم کرد لەگەڵ پیاواندا بڕۆم بە ڕێگادا، وە بیرم کردەوە لە زوبەیر و پێ ناخۆش بوونی[٤] (لە شتی وا) - چونکە لە هەموو کەس زیاتر بەتەنگ ناموسەوە بوو -، پێغەمبەری خواش ﷺ زانی من سەرناکەوم بۆیە ڕۆشت، منیش هاتمەوە بۆلای زوبەیر ﷺ وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشت پێم و ناوکە خورماکەم بەسەر سەرەوە بوو، چەند پیاوێکی لە هاوەڵان لەگەڵ بوو، وشترەکەی یەخ دا تا من (لە پاشکۆیەوە) سورا ببم، بەڵام من شەرمم کرد لێی و غیرەی تۆم دەزانی، زوبەیر وتی: وڵڵاهی ناوکە خورما هەڵگرتنەکەتم لە لا گرانتر بوو لەوەی لەگەڵیدا سوار بویتایە، ئەسما وتی: (ئەمە حاڵم بوو) هەتا دوای ئەوە ئەبو بەکر ﷺ خزمەتکارێکی بۆ ناردم خزمەتی ئەسپەکەی لەکۆڵ کردمەوە، وەك ئەوە وابوو لە کۆیلەیەتی ئازادی کردبم[٥].**

---

(١) دۆڵچە: پێستەیەکە ئاوی پێ هەڵدەگۆزن لە بیر، لە پێستەی ئاژەڵ دروست دەکرێ.

(٢) فەرسەخێ نزیکەی (٥٥٠٠) مەترە، دوو سێ یەکی فەرسەخەکە دەکاتە نزیکەی ( ٣٥٠٠) مەتر.

(٣) بۆ یەخدانی وشترەکەی تا ئەسما لە پاشکۆی خۆیدا سوار بکات.

(٤) واتە دەمزانی ڕقی هەڵدەستا و زۆر پێی ناخۆش بوو من کارێکی وا بکەم.

(٥) واتە: بەو خزمەتکارە بۆی ناردم و ئەرکی خزمەت کردنی ئەسپەکەی لەسەرم لا برد، ئەوەندەم پێ خۆش بوو وەک ئەوە وابوو کۆیلە بوبم و ئەبو بەکر ئازادی کردبم وا بوو لام.

٥٢٢٥- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِصَحْفَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتِ الَّتِي النَّبِيُّ ﷺ فِي بَيْتِهَا يَدَ الْخَادِمِ، فَسَقَطَتِ الصَّحْفَةُ فَانْفَلَقَتْ، فَجَمَعَ النَّبِيُّ ﷺ فِلَقَ الصَّحْفَةِ، ثُمَّ جَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ الَّذِى كَانَ فِي الصَّحْفَةِ وَيَقُولُ: «غَارَتْ أُمُّكُمْ»، ثُمَّ حَبَسَ الْخَادِمَ حَتَّى أُتِيَ بِصَحْفَةٍ مِنْ عِنْدِ الَّتِى هُوَ فِي بَيْتِهَا، فَدَفَعَ الصَّحْفَةَ الصَّحِيحَةَ إِلَى الَّتِي كُسِرَتْ صَحْفَتُهَا، وَأَمْسَكَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْ[1].

**٥٢٢٥- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لای یەکێك لە خێزانەکانی بوو، ئینجا یەکێك لە دایکانی باوەڕداران (بە خزمەتکارێکدا) قاپێکی نارد کە خۆراکی تێدا بوو، جا ئەو خێزانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی بوو کێشای بە دەستی خزمەتکارەکەدا و قاپەکە کەوت و قڵیشی برد (لەت بوو)، پێغەمبەریش ﷺ پارچەکانی لکاندەوە بە یەکەوە و ئەو خۆراکەی پێشتر تێدا بوو کۆیکردەوە و کردیەوە ناوی و دەیفەرموو: ((دایکتان غیرە گرتوویەتی و ڕقی هەڵساوە))، پاشان خزمەتکارەکەی هێشتەوە هەتا قاپێك هێنرا لە لایەن ئەو خێزانەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی بوو، ئەوسا قاپە ساغەکەی دا بەو کچە (خزمەتکارە)ی قاپەکەی شکێنرا، وە قاپە شکاوەکەشی هێشتەوە لە ماڵی ئەو خێزانەی قاپەکەی شکاند.**

٥٢٢٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «دَخَلْتُ الْجَنَّةَ - أَوْ: أَتَيْتُ الْجَنَّةَ - فَأَبْصَرْتُ قَصْرًا فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا؟ قَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. فَأَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَهُ فَلَمْ يَمْنَعْنِي إِلاَّ عِلْمِي بِغَيْرَتِكَ». قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَوَعَلَيْكَ أَغَارُ؟![2].

(١) بڕوانە: ٢٤٨١.

(٢) بڕوانە: ٣٦٧٩.

٥٢٢٦- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( (لە خەودا خۆم دی[١] چوومە بەهەشتەوە - یان هاتمە بەهەشتەوە - وە کۆشکێکم دی، وتم: ئەمە هی کێیە؟ وتیان: کۆشکی عومەری کوڕی خەتتابە ﷺ ئینجا ویستم بڕۆمە ناویەوە، جا هیچ شتێك ڕێگرم نەبوو جگە لەوەی دەمزانی تۆ (عومەر) غیرە دەتگرێ و پێت ناخۆشە))، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایك و باوکمەوە بە فیدات بم، بۆ تۆ پێم ناخۆش بێت و غیرە بکەم؟!.

## ١٠٩- بابُ غَيْرَةِ النِّسَاءِ وَوَجْدِهِنَّ

٥٢٢٨- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى». قَالَتْ: فَقُلْتُ: مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: «أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لاَ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ: لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ». قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ[٢].

## ١٠٩- باسی (حوکمی) غیرە کردن و توڕ بوونی ئافرەتان[٣]

٥٢٢٨- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((بێگومان من دەزانم کەی تۆ لێم ڕازیت و کەی لێم توڕە بیت؟)) عائیشە ﷺ وتی: لە کوێوە ئەوە ئەزانیت؟ فەرمووی: (( (بەوە دەزانم)

---

(١) لە فەرموودەی:(٣٦٧٩) ی بوخاریدا ئەم زیادەی لەگەڵە.

(٢) بڕوانە: ٦٠٧٨.

(٣) لە مێردەکانیان.

**كاتێ لێم ڕازی بیت ئەوە دەڵێیت: نا بە پەروەردگاری موحەممەد، وە كاتێ لێم تووڕە دەبیت دەڵێیت: نا بە پەروەردگاری ئیبراهیم ﷺ))، عائیشەش ؓ وتی: منیش وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وایە، بەس ناوت ناهێنم.**

٥٢٢٩- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَمَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، لِكَثْرَةِ ذِكْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِيَّاهَا وَثَنَائِهِ عَلَيْهَا، وَقَدْ أُوحِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ لَهَا فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ[1].

**٥٢٢٩- عائیشە ؓ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەوەندە غیرەم بەرانبەر بە خەدیجە ؓ هەبوو بەرانبەر هیچ ژنێكی پێغەمبەری خوا ﷺ غیرەم نەبوو، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ناوی دەهێنا و ستایشی دەكرد، وە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نیگای بۆ كرابوو، كە مژدەی پێ بدات كە كۆشكێكی هەیە لە بەهەشتدا لە مرواری ناو بۆش.**

## ١١٠- بابُ ذَبِّ الرَّجُلِ عَنِ ابْنَتِهِ فِي الْغَيْرَةِ وَالإِنْصَافِ

٥٢٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: «إِنَّ بَنِي هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُوا فِي أَنْ يُنْكِحُوا ابْنَتَهُمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَلاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ ابْنُ أَبِي طَالِبٍ أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ، فَإِنَّمَا هِيَ بَضْعَةٌ مِنِّي، يُرِيبُنِي مَا أَرَابَهَا وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا». هَكَذَا قَالَ[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٨١٦.

(٢) بڕوانە: ٩٢٦.

# ١١٠- باسی پیاو لەسەر کچەکەی بکاتەوە لە (دوور خستنەوەی) ڕق هەستان لێی و دادپەروەری بەرانبەری

**٥٢٣٠- مەیسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر دوانگە دەیفەرموو: ((بەڕاستی نەوەی هیشامی کوڕی موغیرە مۆڵەتیان لە من خواستووە، دەربارەی ئەوەی کچەکەیان مارە بکەن لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ﷺ ئەوا من ڕێگە نادەم، پاشان من ڕێگە نادەم، پاشان من ڕێگە نادەم (پێیان)، مەگەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب بیەوێ کچەکەی من (فاتیمە) تەڵاق بدات وکچەکەی ئەوان مارە بکات، چونکە بێگومان فاتیمە پارچەیەکە لە من، ئەوەی ئەو پێی ناخۆش بێت منیش پێم ناخۆشە و ئەوەی ئازاری ئەو بدات ئازاری منیش دەدات)).**

## ١١١- بَابٌ: يَقِلُّ الرِّجَالُ وَيَكْثُرُ النِّسَاءُ

وَقَالَ أَبُو مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَتَرَى الرَّجُلَ الْوَاحِدَ يَتْبَعُهُ أَرْبَعُونَ امْرَأَةً، يَلُذْنَ بِهِ مِنْ قِلَّةِ الرِّجَالِ وَكَثْرَةِ النِّسَاءِ».

٥٢٣١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ الْحَوْضِيُّ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لاَ يُحَدِّثُكُمْ بِهِ أَحَدٌ غَيْرِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَكْثُرَ الْجَهْلُ، وَيَكْثُرَ الزِّنَا، وَيَكْثُرَ شُرْبُ الْخَمْرِ، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً الْقَيِّمُ الْوَاحِدُ»[١].

## ١١١- باسێک: (لە ئاخر زەماندا) پیاوان کەم دەبن و ژنان زۆر دەبن

**ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەفەرموویَ: ((وە دەبینی یەك پیاو چل ژن شوێنی دەکەون هانای بۆ دەبەن، لەبەر کەمی پیاو و زۆری ئافرەتان)).**

---

(١) بڕوانە: ٨٠.

**٥٢٣١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: فەرموودەیەكتان بۆ دەگێڕمەوە كە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە جگە لە من هیچ كەسێك ئەو فەرموودەیەتان بۆ ناگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان لە نیشانەكانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە: زانست و زانیاری هەڵدەگیرێ و نامێنێ، نەزانیش بڵاو دەبێتەوە، و داوێن پیسی زۆر دەبێت، وە عارەق خواردنەوە زۆر دەبێت، پیاوان كەم دەبنەوە ئافرەتان زۆر دەبن، هەتا پەنجا ئافرەت یەك سەرپەرشتیار پیاویان دەبێت)).**

## ١١٢- بابٌ: لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ ذُو مَحْرَمٍ، وَالدُّخُولُ عَلَى الْمُغِيبَةِ

٥٢٣٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: «الْحَمْوُ الْمَوْتُ».

## ١١٢- باسێک: پیاو بە تەنها لەگەڵ ئافرەتێكدا نەبێت مەگەر مەحرەمی بێت، وە نابێ بچنە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتێ مێردی لە ماڵ نەبێت

**٥٢٣٢- عوقبەی كوڕی عامیر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: ((خۆتان بپارێزن لە چوونە ژوورەوە بۆ لای ژنان (بەتەنها بوون لەگەڵیان) ))، ئینجا پیاوێكی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان بەرێ سەبارەت بە (حَمْوُ)[1]؟ فەرمووی: (حَمْوُ) مردنە[2].**

(١) الحمو: واتە: برای مێرد یا مامی و برازای و كەسی نزیكی مێردی ژنەكە پیاو بێت.

(٢) واتە: كەسێک بمرێت لەوە باشترە كە بە تەنیا لەگەڵ ئافرەتێكی نامەحرمدا بمێنێتەوە.

٥٢٣٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ أَبِي مَعْبَدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ امْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً وَاكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: «ارْجِعْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ»[١].

**٥٢٣٣- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە کە فەرمووی: ((با پیاوێك تەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا نەبێت (نامەحرەمە پێی)، مەگەر (ئافرەتەکە) لەگەڵ مەحرەمێکیدا بێت))، ئینجا پیاوێك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەم چووە بۆ حەج منیش لەو غەزا و لەو غەزا ناوم نوسراوە (بڕۆم)، فەرمووی: ((بگەڕێرەوە لەگەڵ ژنەکەتدا حەج بکە)).**

## ١١٣- بابُ مَا يَجُوزُ أَنْ يَخْلُوَ الرَّجُلُ بِالْمَرْأَةِ عِنْدَ النَّاسِ

٥٢٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَخَلاَ بِهَا، فَقَالَ: «وَاللَّهِ إِنَّكُنَّ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ»[٢].

## ١١٣- باسی ئەوەی کە دروستە پیاوێک[٣] لەگەڵ ئافرەتێک تەنیا بێت بەلای خەڵکەوە[٤]

**٥٢٣٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئافرەتێکی ئەنصاری هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا لەگەڵ ئافرەتەکەدا بە تەنیا بوویەوە و فەرمووی: ((وەڵڵاهی بەدڵنیاییەوە ئێوەی ئەنصاری لە هەموو کەس خۆشەویسترن لام)).**

---

(١) بڕوانە: ١٨٦٢.

(٢) بڕوانە: ٣٧٨٦.

(٣) کە ئەمین و جێی متمانە بێت.

(٤) واتە: پیاو و ئافرەتەکە کەمێک جیا ببنەوە لە خەڵکەکە بەڵام چاویان لێیانە و زۆر دوور نین لە خەڵکەکەوە بۆ پرسیار و شتانێکی پێویست و تایبەت جیا ببنەوە.

## ١١٤- بَابُ مَا يُنْهَى مِنْ دُخُولِ الْمُتَشَبِّهِينَ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْمَرْأَةِ

٥٢٣٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا وَفِي الْبَيْتِ مُخَنَّثٌ، فَقَالَ الْمُخَنَّثُ لأَخِي أُمِّ سَلَمَةَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ: إِنْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الطَّائِفَ غَدًا أَدُلُّكَ عَلَى ابْنَةِ غَيْلاَنَ، فَإِنَّهَا تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَدْخُلَنَّ هَذَا عَلَيْكُنَّ»[1].

## ١١٤- باسی ئەوەی ڕێگری کراوە چوونی پیاوانی ژنانی[2] بۆ نا ئافرەتان

**٥٢٣٥- زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە وتی: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری ﷺ لابوو پیاوێکی ژنانیش لە ماڵدا بوو، ئینجا پیاوە ژنانیەکە وتی: بە برای ئوممو سەلەمە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئومەییەیە ﵁ ئەگەر سبەینی پشت بە خوا تائیفتان بۆ ئازاد کرا، کچەکەی غەیلانت نیشان دەدەم، چونکە بێگومان ئەو کچە کە بەرەو ڕووت دێت چوار لۆیە[3] کە پشتیش هەڵدەکات هەشت لۆیە[4]، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕێگە مەدەن ئەم کابرا بێتە لاتان)).**

## ١١٥- بَابُ نَظَرِ الْمَرْأَةِ إِلَى الْحَبَشِ وَنَحْوِهِمْ مِنْ غَيْرِ رِيبَةٍ

٥٢٣٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْحَنْظَلِيُّ، عَنْ عِيسَى، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الْحَبَشَةِ

---

(١) بڕوانە: ٤٣٢٤.

(٢) پیاوێ خۆی بە ژنانی بچوێنێ.

(٣) مەبەستی ئەوەیە کە کچێکی شۆخ و شەنگ و گەرم و نەرمە، لە پێشەوە نەرم و نوڵە لۆچی سکی لە پێشەوە چوارن لە پشتەوە هەر لۆچێکی دەبێ بە دوان کە دەکاتە هەشت لۆچ.

(٤) مەبەستی ئەوەیە کە کچێکی شۆخ و شەنگ و گەرم و نەرمە، لە پێشەوە نەرم و نوڵە و لۆچی سکی لە پێشەوە چوارن، لە پشتەوە هەر لۆچێکی دەبێ بە دووان کە دەکاتە هەشت لۆچ.

يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ، حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّذِي أَسْأَمُ، فَاقْدُرُوا قَدْرَ الْجَارِيَةِ الْحَدِيثَةِ السِّنِّ الْحَرِيصَةِ عَلَى اللَّهْوِ[١].

## ١١٥- باسی ئافرەت سەیری حەبەشی ڕەش پێست و شتی لەو جۆرە بکات بەبێ گومانی خراپ پێ بردن

**٥٢٣٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ دی پشتەماڵەکەی کردبووە پەردە بۆم، منیش سەیری حەبەشیەکانم دەکرد لە مزگەوتدا یاریان دەکرد بە شیرو قەڵغانەکانیان، ئەوەندە سەیرم کردن هەتا بۆ خۆم تاقەتم نەما لە سەیرکردنیان، بۆیە پێویست ڕێز بگرن لە کچێکی تازە پێگەشتووی منالکار کە حەز لە گاڵتە و یارییە.**

## ١١٦- بابُ خُرُوجِ النِّسَاءِ لِحَوَائِجِهِنَّ

٥٢٣٧- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ لَيْلاً فَرَآهَا عُمَرُ فَعَرَفَهَا فَقَالَ: إِنَّكِ وَاللَّهِ يَا سَوْدَةُ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا، فَرَجَعَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، وَهْوَ فِي حُجْرَتِي يَتَعَشَّي، وَإِنَّ فِي يَدِهِ لَعَرْقًا، فَأُنْزِلَ عَلَيْهِ فَرُفِعَ عَنْهُ وَهُوَ يَقُولُ: «قَدْ أَذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَوَائِجِكُنَّ»[٢].

## ١١٦- باسی ئافرەتان بۆ پێداویستی خۆیان لە ماڵ بڕۆنە دەرەوە[٣]

**٥٢٣٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: سەودەی کچی زەمعە ﵂ بە شەو لەماڵ ڕۆشتە دەرەوە، جا عومەر ﵁ بینی و ناسیەوە و پێی وت: ئەی سەودە وەڵاهی**

(١) بڕوانە: ٤٥٤.
(٢) بڕوانە: ١٤٦.
(٣) دروستە و ڕێگەیان پێدراوە.

بەدڵنیاییەوە تۆ شاراوە و نەناسراو نیت لامان، ئەویش گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر و ﷺ ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە لە ژوورەکەی مندا بوو نانی ئێوارەی دەخوارد و ئێسقانێکی بە دەستەوە بوو، جا نیگای بۆ هات کە نیگای بۆ هاتنەکەی کۆتایی هات لەو کاتەدا دەیفەرموو: ((بێگومان و بە دڵنیاییەوە ڕێگەتان پێ دراوە کە لە ماڵ بڕۆنە دەرەوە بۆ پێویستی خۆتان)).

## ١١٧- بابُ اسْتِئْذَانِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا فِي الْخُرُوجِ إِلَى الْمَسْجِدِ وَغَيْرِهِ

٥٢٣٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا اسْتَأْذَنَتِ امْرَأَةُ أَحَدِكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلاَ يَمْنَعْهَا»[1].

## ١١٧- باسی مۆڵەت خواستنی ژن لە مێردەکەی بۆ دەرچوون لە ماڵ بۆ مزگەوت و شتی تر (ی پێویست)

٥٢٣٨- سالیم لە باوکیەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر خێزانی کەسێکتان موڵەتی خواست (بۆ ڕۆشتن) بۆ مزگەوت ئەوە با ڕێگری لێ نەکات)).

## ١١٨- بابُ مَا يَحِلُّ مِنَ الدُّخُولِ وَالنَّظَرِ إِلَى النِّسَاءِ فِي الرَّضَاعِ

٥٢٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ جَاءَ عَمِّى مِنَ الرَّضَاعَةِ فَاسْتَأْذَنَ عَلَيَّ فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: «إِنَّهُ عَمُّكِ فَأْذَنِي لَهُ» قَالَتْ

---

(١) بڕوانە: ٨٦٥.

فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ. قَالَتْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ». قَالَتْ عَائِشَةُ وَذَلِكَ بَعْدَ أَنْ ضُرِبَ عَلَيْنَا الْحِجَابُ. قَالَتْ عَائِشَةُ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ[١].

## ١١٨- باسی چوونە ژوورەوە بۆ ماڵی ئافرەتان و سەیر کردنیان دروستە لە کاتی (بوونی) شیر خواردندا[٢]

**٥٢٣٩- عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو دەڵێ: مامەم لە ڕێگەی شیر خواردنەوە هات و مۆڵەتی خواست بێت بۆ ژوورەوە بۆ لام، منیش ڕازی نەبووم کە مۆڵەتی بدەم هەتا پرسیار نەکەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و پرسیاری ئەوەم لێ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەوە مامتە بۆیە مۆڵەتی بدە))، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ژنەکەی شیری بە من داوە و پیاوەکە شیری بەمن نەداوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دڵنیابە ئەو مامی تۆیە، کەواتە با بێتە ژوورەوە بۆماڵت))، عائیشە وتی: ئەمەش پاش ئەوە بوو حیجاب لەسەرمان پێویست کرابوو، هەر عائیشە دەڵێ: ئەوەی بە لە دایك بوون حەرام دەبێت (دەبێتە مەحرەم) بە شیر خواردنیش حەرام دەبێت (و دەبێتە مەحرەم).**

## ١١٩- بابٌ: لاَ تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا

٥٢٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا، كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا»[١].

---

(١) بڕوانە: ٢٦٤٤.

(٢) واتە: دروستە بۆ پیاوێک بڕواتە ژوورەوە بۆ ماڵی ئافرەتێک کە شیری داوە پێی واتە دایکی شیرییەتی.

## ١١٩- باسێک: ژن نابێ دەست بدات لە ژنێکی تر (و سەیری بکات)، جا بە وردی باسی شێوەی لەش و لاری ئافرەتەکە بکات بۆ مێردەکەی

**٥٢٤٠- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با ژن دەست نەدات لە ژنێکی تر (و سەیری نەکات)، ئینجا باسی بکات بۆ مێردەکەی وەك ئەوەی (مێردەکەی) ژنەکە لە پێش چاوی بێت و سەیری بکات)).**

٥٢٤١- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا»[٢].

**٥٢٤١- شەقیق دەڵێ: لە عەبدوڵڵام ﷛ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با ژن دەست نەدات لە ژنێکی تر (و سەیری نەکات)، ئینجا باسی بکات بۆ مێردەکەی وەك ئەوەی (مێردەکەی) ژنەکە لە پێش چاوی بێت و سەیری بکات)).**

## ١٢٠- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى نِسَائِي

٥٢٤٢- حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: «قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ ﷺ لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ بِمِائَةِ امْرَأَةٍ، تَلِدُ كُلُّ امْرَأَةٍ غُلاَمًا، يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلَكُ: قُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَلَمْ يَقُلْ وَنَسِيَ، فَأَطَافَ بِهِنَّ، وَلَمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ نِصْفَ إِنْسَانٍ». قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَانَ أَرْجَى لِحَاجَتِهِ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٥٢٤١.
(٢) بڕوانە: ٥٢٤٠.
(٣) بڕوانە: ٣٤٢٤.

## ١٢٠- باسی وتەی ئەو پیاوەی بڵێ سوێند بە خوا ئەم شەو بەسەر هەموو ژنەکانمدا دەسوڕێمەوە (سەرجێییان لەگەڵ دەکەم)

٥٢٤٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سولەیمانی کوڕی داوود ﷺ فەرمووی: سوێند بێ ئەمشەو بەدڵنیاییەوە دەسوڕێمەوە بەسەر سەد ژندا (سەرجێییان لەگەڵ دەکەم) هەر یەکەیان کوڕێکی ببێت لە ڕێی خوادا بجەنگێت، ئەنجا فریشتەکە پێی فەرموو: بڵێ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، بەڵام ئەو نەیوت و لەبیری چوو، ئینجا بەسەر هەموویاندا سوڕایەوە (سەرجێیی لەگەڵ کردن)، هیچ ژنێکیان منداڵی نەبوو جگە لە ژنێکیان لەتە منداڵێکی بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بیوتایە: (إِنْ شَاءَ اللَّهُ) ئەگەر خوا بیەوێ، سوێندەکەی نەدەکەوت، زۆرتر جێی ئومێد بوو بۆ پێویستیەکەی)) [1].

## ١٢١- بابٌ: لَا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً إِذَا أَطَالَ الْغَيْبَةَ، مَخَافَةَ أَنْ يُخَوِّنَهُمْ أَوْ يَلْتَمِسَ عَثَرَاتِهِمْ

٥٢٤٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَارِبُ بْنُ دِثَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَكْرَهُ أَنْ يَأْتِيَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ طُرُوقًا[2].

---

(١) کە بێتەجێ و خوا بۆی بکردایە.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

# ١٢١- باسێک: لە ناکاودا شەو خۆی نەکات بەماڵدا بۆلای هاوسەری، ئەگەر لە ماڵ نەبوونی درێژەی کێشابوو لە ترسی ئەوەی بەخیانتکارییان بزانێ یان بە شوێن ناتەواوی هەڵەکانیدا بگەڕێت

**٥٢٤٣- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لای ناپەسەند بوو کە پیاو شەو لە ناکاودا خۆی بکات بە ماڵدا بۆ لای هاوسەری[١].**

٥٢٤٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عَاصِمُ بْنُ سُلَيْمَانَ عَنِ الشَّعْبِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ فَلاَ يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً».

**٥٢٤٤- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان لە ماڵەوە نەبوونی درێژەی کێشا، ئەوە با شەو لە ناکاودا خۆی نەکات بەماڵدا بۆ لای ژنەکەی)).**

# ١٢٢- بابُ طَلَبِ الْوَلَدِ

٥٢٤٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ هُشَيْمٍ، عَنْ سَيَّارٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَلَمَّا قَفَلْنَا تَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ قَطُوفٍ فَلَحِقَنِي رَاكِبٌ مِنْ خَلْفِي، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا يُعْجِلُكَ». قُلْتُ إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ. قَالَ: «فَبِكْرًا تَزَوَّجْتَ أَمْ ثَيِّبًا». قُلْتُ بَلْ ثَيِّبًا. قَالَ: «فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ». قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ فَقَالَ: «أَمْهِلُوا حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلاً -أَيْ عِشَاءً- لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ». قَالَ: وَحَدَّثَنِي الثِّقَةُ أَنَّهُ قَالَ فِي هَذَا الْحَدِيثِ «الْكَيْسَ الْكَيْسَ يَا جَابِرُ».يَعْنِي الْوَلَدَ[٢].

---

(١) بەبێ ئاگاداری و خۆی ئامادە کردنی ژنەکە بۆ مێردەکەی ئەگەر پیاوەکە ماوەیەکی زۆر لە ماڵ نەبوو بوو.
(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

## ١٢٢- باسی (پیاو) مەبەستی منداڵبوون بێت[١]

٥٢٤٥- جابير دەڵێ: ﷺ من لە غەزايەكدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، ئینجا كاتێ كە گەڕاینەوە من بە سوار وشترێكی تەمەڵەوە بووم پەلەم دەكرد، جا سوارێك لە دوامەوە پێم گەیشت منیش لام كردەوە دەبینم پێغەمبەری خوایە ﷺ فەرمووی: ((پەلەی چیتە؟)) وتم: من تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: ((كچت هێناوە یان بێوەژن؟)) وتم: (كچم نەهێناوە) بەڵكو بێوەژنم هێناوە، فەرمووی: ((ئەی بۆ كچێكت نەهێناوە یاری لەگەڵ بكەیت و یاریت لەگەڵ بكات))، وتی: جا كاتێ گەیشتین (نزیك بوینەوە) ویستمان بڕۆینە ناو شار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پەلە مەكەن تا بە شەو - واتە عیشا - بڕۆنە ناو مەدینە، تا ئەو ئافرەتەی قژی بژو ئاڵۆسكاوە قژی دابێنێ، ئەو ئافرەتەش مێردی لە ماڵ نەبوو بەری بتاشێ (و خۆی ڕێك و پێك بكات) )).

(هوشەیم) وتی: كەسێكی متمانە پێكراو بۆی گێڕامەوە كە لەم فەرموودەدا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئەی جابیر سەرجێی بكە سەرجێی بكە[٢]))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) مەبەستی بە (الْكَيْسَ) داوای منداڵە.

٥٢٤٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْوَلِيدِ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَيَّارٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلْتَ لَيْلاً فَلاَ تَدْخُلْ عَلَى أَهْلِكَ حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ وَتَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ». قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَعَلَيْكَ بِالْكَيْسِ الْكَيْسِ». تَابَعَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ وَهْبٍ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْكَيْسِ[٣].

---

(١) بەسەر جێی لەگەڵ هاوسەریدا.

(٢) یان: ئاگادار بە لە نەتوانینی سەرجێی.

(٣) بڕوانە: ٤٤٣.

٥٢٤٦- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بە شەو ڕۆشتیتەوە مەڕۆ بۆ لای خێزانت، هەتا ژنی مێرد لەماڵەوە نەبوو بەری نەتاشێ و قژی بژ و ئاڵۆسکاوی شانە نەکات (و خۆی ڕێك وپێك و جوان نەکات) ))، جابیر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دەی مەبەستت منداڵ بێت (بەسەرجێت)، جا مەبەستت منداڵ بێت)).

عەبدوڵڵا لەوهبەوە ئەویش لە جابیرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە: (الکیس)دا پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شەعبی دەکات.

## ١٢٣- بابٌ: تَسْتَحِدُّ الْمُغِيبَةُ وَتَمْتَشِطُ الشَّعِثَةُ

٥٢٤٧- حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ أَخْبَرَنَا سَيَّارٌ عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَلَمَّا قَفَلْنَا كُنَّا قَرِيبًا مِنَ الْمَدِينَةِ تَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ لِي قَطُوفٍ، فَلَحِقَنِي رَاكِبٌ مِنْ خَلْفِي فَنَخَسَ بَعِيرِي بِعَنَزَةٍ كَانَتْ مَعَهُ، فَسَارَ بَعِيرِي كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ الإِبِلِ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ. قَالَ: «أَتَزَوَّجْتَ». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا». قَالَ قُلْتُ بَلْ ثَيِّبًا. قَالَ: «فَهَلاَّ بِكْرًا تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ». قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ، فَقَالَ: «أَمْهِلُوا حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلاً -أَيْ عِشَاءً- لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ، وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ»[1].

## ١٢٣- باسێک: ئەو ژنەی مێردی لە ماڵەوە نەبوو مووی لەشی لابات قژی بژ و ئاڵۆسکاویشی شانە بکات و دایبێنێ[2]

٥٢٤٧- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، جا کاتێ گەڕاینەوە ئێمە نزیکی مەدینە بووینەوە،

(١) بڕوانە: ٤٤٣.
(٢) خۆی جوان و ڕازاوە بکات بۆ مێردەکەی دەست بێنی بە خۆیدا.

من پەلەم دەکرد بە سوار وشترێکی تەمەڵەوە کە هی خۆم بوو، جا سوارێك بە دوامەوە بوو پێم گەیشت بە دارێکی درێژ کە بە دەستیەوە بوو ژندیٚ وشترەکەم، ئیتر وشترەکەم بە جوانترین ڕۆشتنێك کە وشترت بینیبێ بڕوات دەستی بە ڕۆشتن کرد، منیش لام کردەوە دەبینم پێغەمبەری خوایە ﷺ، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: ((ئایا ژنت هێناوە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((کچە یان بێوەژنە؟ )) دەڵێ: وتم (کچ نییە) بەڵکو بێوەژنە، فەرمووی: (( ئەی بۆ کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵ بکات))، دەڵێ: جا کاتێ گەشتینە (نزیك مەدینە) ویستمان بچینە ناویەوە فەرمووی: ((پەلە مەکەن هەتا بە شەو- واتەعیشا - بچینە ناویەوە، تا قژ و بژو ئاڵۆسکاو قژی دابێنێ، ئەو ژنەش مێردی لە ماڵەوە نەبووە مووی لەشی لاببات)).

## ١٢٤- بابٌ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ إلى قوله ﴿لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ﴿٣١﴾﴾ النور

٥٢٤٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ اخْتَلَفَ النَّاسُ بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جُرْحُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، فَسَأَلُوا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَكَانَ مِنْ آخِرِ مَنْ بَقِيَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالَ وَمَا بَقِيَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، كَانَتْ فَاطِمَةُ عليها السلام تَغْسِلُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَعَلِيٌّ يَأْتِي بِالْمَاءِ عَلَى تُرْسِهِ، فَأُخِذَ حَصِيرٌ، فَحُرِّقَ فَحُشِيَ بِهِ جُرْحُهُ[١].

---

(١) بڕوانە: ٢٤٣.

## ١٢٤- باسێک: (وه جوانی خۆیان دەرنەخەن[1] بۆ مێردەکانیان نەبێت )، تا ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە ((ئەو منداڵانەی کە ئاگایان لە لەش و عەورەتی ئافرەتان نەبێت) [2]

٥٢٤٨- ئەبو حازیم دەڵێ: خەڵکی ڕایان جیاواز بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای ئوحوددا (کە بریندار بوو) بە چ شتێك چارەسەر کرا؟ بۆیە پرسیاریان لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ کرد - کە کۆتا کەس بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە لە ژیاندا مابوو- سەهل وتی: لە ناو خەڵکیدا کەسێك نامەوە لەم زاناتر بێت پێی، فاتیمە ﷺ خوێنەکەی دەشۆری کە بە ڕووخساریەوە بوو، عەلیش ﷺ لە قەڵغانەکەیدا ئاوی دەهێنا، ئینجا حەسیرێك هێنرا و سوتێنرا و خرایە ناو برینەکەیەوە.

### ١٢٥- بابٌ: ﴿ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ ﴿٥٨﴾ ﴾ النور

٥٢٤٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ سَأَلَهُ رَجُلٌ شَهِدْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعِيدَ أَضْحًى أَوْ فِطْرًا قَالَ: نَعَمْ لَوْلاَ مَكَانِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ -يَعْنِي مِنْ صِغَرِهِ- قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَذَانًا وَلاَ إِقَامَةً، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَرَأَيْتُهُنَّ يَهْوِينَ إِلَى آذَانِهِنَّ وَحُلُوقِهِنَّ يَدْفَعْنَ إِلَى بِلاَلٍ، ثُمَّ ارْتَفَعَ هُوَ وَبِلاَلٌ إِلَى بَيْتِهِ[3].

---

(١) زیاد لەوەی کە دەر دەکەوێت.

(٢) باڵغ نەبووبن.

(٣) بروانە: ٩٨.

## ١٢٥- باسێک: (وە منداڵەکانتان کە هێشتا باڵغ نەبوون)

٥٢٤٩- عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس دەڵێ: گوێم لێ بوو پیاوێك پرسیاری لە ئیبنو عەبباس ﷺ کرد وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان یان ڕەمەزان بوویت؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر لەبەر پلەم نەبوایە لای پێغەمبەر ﷺ ئامادەی نەدەبووم - واتە لەبەر منداڵی - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە (لە مەدینە) جا نوێژی کرد پاشان وتاریدا، باسی بانگ و قامەتی نەکرد، لە پاشان ڕۆشت بۆ لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن و پەندی دادان و فەرمانی پێکردن بە ماڵ بەخشین، جا ئافرەتانم بینی دەستیان دەبرد بۆ گوێیەکانیان و مل و گەردنیان (گوارە و ملوانکەکانیان) فڕێ دەدا بۆ بیلال ﷺ، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ و بیلال گەڕانەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ.

## ١٢٦- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لِصَاحِبِهِ هَلْ أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ؟ وَطَعْنِ الرَّجُلِ ابْنَتَهُ فِي الْخَاصِرَةِ عِنْدَ الْعِتَابِ

٥٢٥٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ عَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي[١].

(١) بڕوانە: ٣٣٤.

# ١٢٦- باسی پیاو بە هاوڕێکەی بڵێ: ئەم شەو سەرجێی تان کرد [١]؟ لە کاتی سەرزەنشتدا پیاو توند بکوتێتە کەمەری کچەکەی

٥٢٥٠- عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: ئەبو بەکر ﵁ سەرزەنشتی کردم زوو زووش دەستی دەیکوتایە کەلەکەم، جا تەنیا ڕێگرم لە جوڵان لەبەر ڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، کە سەری لەسەر ڕانم بوو.

(١) پرسیار لە پیاوەکە دەکات کە لەگەڵ ژنەکەیدا پێکەوە خەوتوون سەرجێیان کردوە لەگەڵ یەکتری.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٦٨- كِتَابُ الطلاق

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٨- پەڕاوی تەڵاق[1]

## ١- باب قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ ﴿١﴾﴾ الطلاق

﴿أَحْصَيْنَٰهُ ﴿١٢﴾﴾ يس، حَفِظْنَاهُ وَعَدَدْنَاهُ، وَطَلَاقُ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِرًا مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، وَيُشْهِدُ شَاهِدَيْنِ

٥٢٥١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ»[2].

---

(١) تەڵاق: واتە بەرەڵا کردنی ژن لە لایەن پیاوەکەیەوە.

(٢) بڕوانە: ٤٩٠٨.

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی پێغەمبەر ﷺ (بە ئوممەتەکەت بڵێ) هەر کاتێ ویستان ژنانتان تەڵاق بدەن با لە کاتی عیددەیاندا[١] تەڵاقیان بدەن، وەعیددە (ی ژنەکانتان) بە وردی بژمێرن)

﴿أَحْصَيْنَٰهُ ﴿١٢﴾﴾: لەبەرمان کردوە و ژماردوومانە، تەڵاقی سوننەت: ئەوەیە پیاو ژنەکەی لە کاتی پاکێتیدا کە سەرجێی لەگەڵدا نەکردبێ تەڵاق بدات، وە دوو شایەتی کردبێ بە شایەت لەسەر تەڵاق دانەکە.

٥٢٥١- نافیع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ کە عەبدوڵڵا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ژنەکەی خۆی تەڵاقدا لە کاتێکدا لەحەیزدا بوو، ئینجا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ لەو بارەیەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((فەرمانی پێ بکە با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، پاشان لای خۆی ڕایگرێ و بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە پاشان پاك دەبێـەوە، ئینجا پاش ئەوە ئەگەر ویستی با ڕایگرێ، یان ئەگەر ویستی با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی سەرجێی لەگەڵ بکات، ئەوە ئەو عیدەیەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە کە ژنی پێ تەڵاق بدرێ)).

## ٢- بابٌ: إِذَا طُلِّقَتِ الْحَائِضُ يُعْتَدُّ بِذَلِكَ الطَّلَاقِ

٥٢٥٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، قَالَ: طَلَّقَ ابْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «لِيُرَاجِعْهَا».

---

(١) ئەو کاتەی لە حەیز پاک بوونەتەوە و لەگەڵیان دروست نەبوون.

قُلْتُ: تُحْتَسَبُ؟ قَالَ: «فَمَهْ». وَعَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا». قُلْتُ: تُحْتَسَبُ؟ قَالَ: "أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ؟ "[1].

## ٢- باسێک: ئەگەر ئافرەتی حەیزدار تەڵاق درا ئەو تەڵاقە بە تەڵاق دادەنرێت

**٥٢٥٢- ئینوسیرین دەڵێ: لە ئیبنو عومەرم ﷻ بیست وتی: ئیبنو عومەر ژنەکەی تەلاق دا لە حەیزدا بوو، ئینجا عومەر بۆ پێغەمبەری ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((با بیگێڕێتەوە)) (ئینو سیرین دەڵێ): وتم: ئەو تەلاقە بە تەلاق دانرا؟ (ئیبنو عومەر) وتی: ئەی چییە ئەگەر بە تەلاق دانەنراوە؟**[2].

**وەقەتادە دەگێڕێتەوە لە یونسی کوڕی جوبەیرەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە ﷻ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ( فەرمانی پێ بکە با بگێڕێتەوە بۆلای خۆی))، وتم: ئەو تەلاقە بە تەلاق دادەنرێت؟ وتی: پێم بڵێ ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ فەرزێ بەجێ بێنێ و کەرێتی بکات بەجێی نەهێنێ؟ (بۆ ئەوە ئەبێ بە بیانوو بۆی؟ ).**

٥٢٥٣ - وَقَالَ أَبُو مَعْمَرٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: حُسِبَتْ عَلَيَّ بِتَطْلِيقَةٍ[3].

**٥٢٥٣- سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عومەرەوە ﷻ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە تەلاقێك دانرا لەسەرم.**

---

(١) بڕوانە: ٤٩٠٨.

(٢) یان واز بێنە گومانی تێدا نییە تەلاقەکەی کەوتووە.

(٣) بڕوانە: ٤٩٠٨.

## ٣- بَابُ مَنْ طَلَّقَ، وَهَلْ يُوَاجِهُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ بِالطَّلَاقِ؟

٥٢٥٤- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ أَيَّ: أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اسْتَعَاذَتْ مِنْهُ؟ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ ابْنَةَ الْجَوْنِ لَمَّا أُدْخِلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَدَنَا مِنْهَا، قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ. فَقَالَ لَهَا «لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: رَوَاهُ حَجَّاجُ بْنُ أَبِي مَنِيعٍ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ عُرْوَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ.

## ٣- باسی کەسێک ژنەکەی تەڵاق بدات (دروستە)، وە ئایا پیاو ڕوو لە خێزانەکەی بکات بۆ تەڵاق دانی[1]؟

**٥٢٥٤- ئەوزاعی دەڵێ: پرسیارم لە زوهری کرد کام لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پەنای بە خوا گرت لە پێغەمبەر ﷺ؟ وتی: عوروە لە عائیشەوە رضي الله عنها بۆی گێڕامەوە کە کچەکەی جەون برایە ژوورەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لێی نزیك بویەوە و ئافرەتەکە وتی: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((بەڕاستی پەنات بە زاتێکی گەورە گرتووە، بگەڕێرەوە بۆلای کەس و کارت)).**

**ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ:حەجاجی کوڕی ئەبی مەنیع لە باپیریەوە و لە زوهرییەوە گێڕاویەتیەوە کە عوروە بۆی گێڕایەوە کە عائیشە رضي الله عنها وتی: (ئیتر فەرموودەکە دێنێ).**

٥٢٥٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَسِيلٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ، عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى انْطَلَقْنَا إِلَى حَائِطٍ يُقَالُ لَهُ: الشَّوْطُ، حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى

(١) واتە نابێ بە بیانوو بۆی کە تەڵاقەکەی بەتەڵاق بۆ دانەنرێت، واتە پێویستە یا نا بۆ ئەوەی تەڵاقەکە بکەوێ.

حَائِطَيْنِ، فَجَلَسْنَا بَيْنَهُمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «اجْلِسُوا هَا هُنَا». وَدَخَلَ وَقَدْ أُتِيَ بِالْجَوْنِيَّةِ، فَأُنْزِلَتْ فِي بَيْتٍ فِي نَخْلٍ فِي بَيْتِ أُمَيْمَةُ بِنْتُ النُّعْمَانِ بْنِ شَرَاحِيلَ وَمَعَهَا دَايَتُهَا حَاضِنَةٌ لَهَا، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «هَبِي نَفْسَكِ لِي». قَالَتْ: وَهَلْ تَهَبُ الْمَلِكَةُ نَفْسَهَا لِلسُّوقَةِ. قَالَ: فَأَهْوَى بِيَدِهِ يَضَعُ يَدَهُ عَلَيْهَا لِتَسْكُنَ، فَقَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ. فَقَالَ: «قَدْ عُذْتِ بِمَعَاذٍ». ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: «يَا أَبَا أُسَيْدٍ، اكْسُهَا رَازِقِيَّتَيْنِ، وَأَلْحِقْهَا بِأَهْلِهَا»[1].

**٥٢٥٥- ئەبو ئوسەيد ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەرچووین بەرەو لای باخێك[2] پێی دەوترا (الشَّوْطُ)، (ڕۆشتن) تا گەیشتنە لای دوو باخ لە نێوانیاندا دانیشتین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئا لێرەدا دانیشن))، پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە (بۆ ناو باخەكە)، بێگومان كچە جەونیەكە هێنرابوو لەماڵێك لە ناو باخە خورماكە دانرابوو كەماڵی ئومەیمەی كچی نوعمانی كوڕی شەراحیل بوو، مامانەكەشی[3] لەگەڵدا بوو- مامانی خۆی- جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای فەرمووی: ((خۆتم پێ ببخشە))، وتی: چۆن شازادە خۆی دەبەخشێتە پیاوێكی بازاڕی؟ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی برد تا دەست بخاتە سەر شانی تا هێور بێتەوە، ئافرەتەكە وتی: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((پەنات بە زاتێ گرت كە شایەنی پەنا بۆ بردنە))، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان و فەرمووی: ((ئەی ئەبو ئوسەید دوو كراسی ڕازقییەی بۆ بكە و بیبەرەوە بۆ كەس و كاری)).**

**٥٢٥٦- ٥٢٥٧-** وَقَالَ الْحُسَيْنُ بْنُ الْوَلِيدِ النَّيْسَابُورِيُّ: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ أَبِيهِ وَأَبِي أُسَيْدٍ قَالاَ: تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ أُمَيْمَةَ بِنْتَ شَرَاحِيلَ، فَلَمَّا أُدْخِلَتْ عَلَيْهِ

---

(١) بڕوانە: ٥٢٥٧.

(٢) حائط: بە باخێک دەڵێن چوار دەوری بە دیوار بۆ کرا بێت.

(٣) ئیبنو حەجەر بە دایەن مانای کردوە ( فیح الباری: ٤٤٨/١٢ ).

بَسَطَ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَكَأَنَّهَا كَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ أَنْ يُجَهِّزَهَا وَيَكْسُوَهَا ثَوْبَيْنِ رَازِقِيَّيْنِ[١].

**٥٢٥٦- ٥٢٥٧- عەبباسی کوڕی سەهل لە باوکی و ئەبی ئوسەیدەوە دەگێڕێتەوە هەردووکیان وتیان: پێغەمبەر ﷺ ئومەیمەی کچی شەراحیلی مارە کرد، جا کاتێ هێنایانە ژوورەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەستی بۆ برد، وەك ئافرەتەکە پێی ناخۆش بێت وا بوو، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی بەئەبو ئوسەید کرد کە ئامادەی بکات بیباتەوە بۆ کەس و کاری، وە دوو کراسی ڕازقیەی بۆ بکات.**

٥٢٥٧/م- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي الْوَزِيرِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَمْزَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَعَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ بِهَذَا[٢].

**٥٢٥٧- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:)عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبراهیمی کوڕی ئەبولوەزیر بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڕەحامی کوڕی حەمزە بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە، وە لەعەبباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدەوە کە لە باوکیەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

٥٢٥٨- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي غَلاَّبٍ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عُمَرَ: رَجُلٌ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ. فَقَالَ: تَعْرِفُ ابْنَ عُمَرَ؟ إِنَّ ابْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَإِذَا طَهُرَتْ فَأَرَادَ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا. قُلْتُ: فَهَلْ عَدَّ ذَلِكَ طَلاَقًا؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ[٣].

(١) بڕوانە: ٥٢٥٥.
(٢) بڕوانە: ٥٦٣٧.
(٣) بڕوانە: ٤٩٠٨.

**٥٢٥٨- ئەبوغەللاب کە یونسی کوڕی جوبەیرە وتی: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت: پیاوێك ژنەكەی تەڵاق بدات لە حەیزدا بێت؟ وتی: ئیبنو عومەر دەناسی؟ بێگومان ئیبنو عومەر ژنەكەی تەڵاقدا لە حەیزدا بوو، ئینجا عومەر ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆباس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد بوو کە ژنەکەی بگێڕێتەوە، جا کە پاك بوویەوە ویستی تەڵاقی بدات با تەڵاقی بدات، وتم: ئایا ئەوەی بەتەڵاق دانا لە سەرت؟ وتی: پێم بڵێ: ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ فەرز بەجێ بهێنێ و کەرێتی بکات؟ (ئەوە نابێ بە بیانوو بۆی؟).**

## ٤- بَابُ مَنْ أَجَازَ طَلاَقَ الثَّلاَثِ

لقوله تَعَالَى ﴿ اَلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فِي مَرِيضٍ طَلَّقَ: لاَ أَرَى أَنْ تَرِثَ مَبْتُوتَتُهُ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: تَرِثُهُ. وَقَالَ ابْنُ شُبْرُمَةَ: تَزَوَّجُ إِذَا انْقَضَتِ العِدَّةُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ مَاتَ الزَّوْجُ الآخَرُ؟ فَرَجَعَ عَنْ ذَلِكَ.

## ٤- باسی ئەو کەسەی تەڵاقی سێ بە سێی بەلاوە دروستە

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (تەڵاقێك (کە بردنەوەی لە دواوە بێت) دوو جارە، دوای ئەوە ڕاگرتنە بە خۆشی یا بە بەرەڵا کردن بە باشی).**

**ئیبنو زوبەیر ﷺ دەربارەی نەخۆشێك ژنەکەی تەڵاق بدات دەڵێ: ڕام وا نییە ژنە بەیەکجاری تەڵاق دراوەکەی [1] میرات ببات. شەعبی دەڵێ: میراتی لێ دەبات. ئیبنو شوبرومە دەڵێ: ئەو ژنە بەو جۆرەی باس کرا تەڵاق درابێ، ئەگەر ماوەی چاوەڕوانی تەواو بوو دەتوانێ شوو بکات؟ (شەعبی دەڵێ): بەڵێ، ئیبنو**

(١) کە تەڵاقی سێ بە سێی دابێت یان وتبێتی: (أنتِ الطالق البتة) واتە: تۆ بە یەکجاری تەڵاقت کەوتبێ.

**شوبرومە دەڵێ: پێم بڵێ[1] ئەگەر مێردەکەی تری مرد؟ ئیتر شەعبی لە ڕاکەی خۆی گەڕایەوە و پەشیمان بوویەوە.**

٥٢٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُوَيْمِرًا الْعَجْلاَنِيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلَ عَاصِمٌ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عَاصِمٌ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا. قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَسَطَ النَّاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا». قَالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا فَرَغَا قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ تِلْكَ سُنَّةُ الْمُتَلاَعِنَيْنِ[2].

**٥٢٥٩- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە سەعلی کوڕی سەعد ساعیدی ﷺ بۆی گێڕایەوە، کە عومیمری عەجلانی ﷺ هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدیی ئەنصاری ﷺ و پێی وت: ئەی عاصیم، پێم بڵێ پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێت[3] بیکوژێت، ئێوە دەیکوژنەوە یان چی بکات؟ ئەی عاصیم پرسیاری**

---

(١) کاتێ مێردە نەخۆشەکەی تەڵاقیدا تەلاقەکەی کەوت، ئەی ئەگەر ژنەکە شوو و مێردە پێشووە نەخۆشەکەی مرد ئایا ژنەکە میراتی لێ دەبات.

(٢) بڕوانە: ٤٢٣.

(٣) زینا بکات لەگەڵ ژنەکەیدا

**ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بکە، عاصیمیش ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جۆرە باسانەی پێ ناخۆش بوو بە ناشیرینی دانا بوو، (بە جۆرێ) هەتا عاصیم ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبوو بە لایەوە قورس و ناخۆش بوو، جا کاتێ عاصیم گەڕایەوە بۆ لای کەس و کاری عوەیمیر هات وتی: ئەی عاصیم پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ وتیت؟ عاصیمیش وتی: شتێکی چاکی پێ نەوتم، بە ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بابەتی من پرسیارم لە بارەیەوە کرد لای ناپەسەند بوو، عوەیمیر وتی: سوێند بەخوا وازی لێ ناهێنم تا لەبارەیەوە پرسیاری لێ نەکەم، ئینجا عوەیمیر هات هەتا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێ بیکوژێت، دەیکوژنەوە یان چی و چۆن بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خودا دەربارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاندووە، دەی بڕۆ (هاوسەرەکەت) بهێنە))، سەهل دەڵێ: جا من لەگەڵ خەڵکەکەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین کە هەردووکیان[1] نەفرەتکاریان کرد (بەرانبەر بەیەکتری)، جا کە لێ بوونەوە عوەیمیر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ درۆم بۆهەڵبەستووە ئەگەر بیهێڵمەوە لای خۆم[2]، بۆیە سێ تەڵاقەی دا پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ فەرمانی پێ کات)، ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیتر ئەوە بوویە باو و نەریتی نەفرەتکاری ژن و مێرد.**

٥٢٦٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ

---

(١) خۆی و ژنەکەی.

(٢) ئەگەر بە ژنی خۆمی بزانم لەگەڵیدا بژیم لام بمێنێتەوە.

اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلاَقِي، وَإِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ الْقُرَظِيَّ، وَإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»(١).

**٥٢٦٠- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە کە عائیشە ﵄ بۆی گێڕایەوە کە ژنەکەی ڕیفاعەی قوڕەزی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ڕیفاعە تەڵاقی دام بەیەکجاریش تەڵاقی دام، منیش لە پاش ئەو شووم کرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی زوبەیری قوڕەزی، بێگومان زەکەری ئەو (عەبدوڕەحمان) وەك ڕیشاڵی قوماش وایە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((وا دیارە دەتەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای ڕیفاعە؟ نابێ هەتا ئەو (عەبدوڕەحمان) شیرینی و لەزەتی تۆ نەچەژێ و تۆش شیرینی و لەزەتی ئەو نەچێژی)).**

٥٢٦١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَجُلاً طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا، فَتَزَوَّجَتْ، فَطَلَّقَ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَتَحِلُّ لِلأَوَّلِ؟ قَالَ: «لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا كَمَا ذَاقَ الأَوَّلُ»(٢).

**٥٢٦١- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پیاوێ سێ بە سێ ژنەکەی تەڵاقدا، پاشان شووی کرد جا (مێردەکەی) تەڵاقی دا، ئینجا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا ئایا بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ دەبێت؟ فەرمووی: ((نەخێر تا مێردەکەی شیرینی و لەزەتی ژنەکە نەچەژێ، وەك چۆن مێردی یەکەمی چەشتوویەتی)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٣٩.

(٢) بڕوانە: ٢٦٣٩.

## ٥- بَابُ مَنْ خَيَّرَ نِسَاءَهُ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب.

٥٢٦٢- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاخْتَرْنَا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَلَمْ يَعُدَّ ذَلِكَ عَلَيْنَا شَيْئًا[١].

## ٥- باسی کەسێک (پێغەمبەر ﷺ) کە ژنەکانی سەرپشک کردوە[٢]

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ( (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بە خێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێ، دەی هەمووتان وەرن موتعەتان[٣] پێ بدەم، وە تەڵاقتان بدەم بە تەڵاقدانێکی چاك و بێ زیان).**

**٥٢٦٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کردین ئێمەش خوا و پێغەمبەرەکەیمان هەڵبژارد، ئەو هەڵبژاردنە بە هیچ لەسەرمان حساب نەکرا[٤].**

٥٢٦٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَامِرٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْخِيَرَةِ، فَقَالَتْ: خَيَّرَنَا النَّبِيُّ ﷺ، أَفَكَانَ طَلاَقًا؟ قَالَ مَسْرُوقٌ: لاَ أُبَالِي أَخَيَّرْتُهَا وَاحِدَةً أَوْ مِائَةً بَعْدَ أَنْ تَخْتَارَنِي[٥].

---

(١) بڕوانە: ٥٢٦٣.

(٢) لە نێوان هەڵبژاردنی ژیانی دنیا یان هەڵبژاردنی خودا و پیغەمبەرکەیدا ﷺ .

(٣) موتعە پارە و شت و مەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاقدراو.

(٤) واتە: بە تەڵاق دانەنرا لەسەرمان.

(٥) بڕوانە: ٢٥٦٣.

٥٢٦٣- مەسروقی دەڵێ: دەربارەی سەرپشك كردن پرسیارم لە عائیشە ﵂ كرد ئەویش وتی: پێغەمبەر ﷺ سەرپشكی كردین دەی ئایا ئەوە تەڵاق دان بوو[1]؟ مەسروق وتی: گرنگ نیە بەلامەوە جارێك یان سەد جار ژنەكەم سەرپشك كەم، دوا ئەوە منی هەڵبژارد.

## ٦- بَابٌ: إِذَا قَالَ: فَارَقْتُكِ أَوْ سَرَّحْتُكِ أَوِ الْخَلِيَّةُ أَوِ الْبَرِيَّةُ أَوْ مَا عُنِيَ بِهِ الطَّلاَقُ، فَهُوَ عَلَى نِيَّتِهِ

وَقَوْلُ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الأحزاب. وَقَالَ: ﴿ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب، وَقَالَ: ﴿ الطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ: ﴿ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق. وَقَالَتْ عَائِشَةُ قَدْ عَلِمَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ.

## ٦- باسێک[2]: ئەگەر (پیاو بە ژنەکەی) بڵێ: جیام کردیتەوە، بەرەڵام کردیت، یان مێردت نییە، ژنی لێ جیابۆوە، یان هەر وشەیەک مەبەست پێی تەڵاق بێت[3] ئەوە لەسەر نیەت و نیازەکەیەتی[4] وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە بەرەڵایان کەن بە

(١) واتە: تەڵاق دان نییە، بە تەڵاق دانانرێت.

(٢) كە ناڕاستەخۆ وشەی تەڵاقن دەگونجێ تەڵاق بێ و دەشگونجێ تەلاق نەبێ نیازی دڵ دەیكاتە تەلاق یان پێچەوانەكەی.

(٣) ڕاستەوخۆ تەڵاق نەگەیەنێت.

(٤) واتە: ئەگەر مەبەستی بەو وشەیە تەلاق بوو، ئەوە تەڵاقەكەی دەكەوێ ئەگەر مەبەستی تەڵاق نەبوو ناكەوێ.

**بەرەڵاکردنێکی[1] جوان و باش)، وە فەرمووی: (وە تەڵاقتان بدەم بە تەڵاق دانێکی چاک و بێ زیان)، وە دەفەرمووی: (دوا ئەوە دوو جار تەڵاقدان ڕاگرتنە بە خۆشی یان بەرڵاکردنە بە باشی)، وە دەفەرمووێ: (یان لێیان جیا ببنەوە بە باشی)**

**عائیشە ﷺ دەڵێ: بەدڵنیاییەوە پێغەمبەر ﷺ دەیزانی کەباوك و دایکم هەرگیز فەرمانم پێ ناکەن بە جیا بوونەوە لەو (پێغەمبەر ﷺ).**

## ٧- بابُ مَنْ قَالَ لِامْرَأَتِهِ أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ

وَقَالَ الْحَسَنُ: نِيَّتُهُ. وَقَالَ أَهْلُ الْعِلْمِ: إِذَا طَلَّقَ ثَلاَثًا فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْهِ. فَسَمَّوْهُ حَرَامًا بِالطَّلاَقِ وَالْفِرَاقِ، وَلَيْسَ هَذَا كَالَّذِى يُحَرِّمُ الطَّعَامَ؛ لأَنَّهُ لاَ يُقَالُ لِطَعَامِ الْحِلِّ حَرَامٌ، وَيُقَالُ لِلْمُطَلَّقَةِ حَرَامٌ، وَقَالَ فِي الطَّلاَقِ ثَلاَثًا: لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ.

## ٧- باسی کەسێک بە ژنەکەی بڵێ: تۆ لە من حەرام بی

**حەسەن (ی بەصری) دەڵێ: بە گوێرەی نیەتەکەیەتی، وە زانایان دەڵێن: ئەگەر پیاو ژنەکەی سێ تەڵاقەی بدات ئەوە بێگومان ژنەکەی لێ حەرام دەبێت، بە حەرام ناویان بردووە، ئەگەر بە وشە (الطَّلاَق) یان (الْفِرَاق) تەڵاقی بدات، ئەمە وەك ئەوە نییە خواردن لەخۆی قەدەغە بکات، چونکە خواردنی حەڵاڵ پێی ناوترێ حەرام، بەڵام بە ژنی تەڵاق دراو دەوترێ حەرام، وە (خوا) لە تەڵاقی سێ بە سێدا دەفەرمووێ: بۆ مێردەکەی حەڵاڵ نابێ تا شوو نەکات بە پیاوێکی تر جگە لەو.**

---

(١) واتە: تەلاقیان بدەن بە تەلاقدانێکی جوان و باش.

٥٢٦٤- وَقَالَ اللَّيْثُ عَنْ نَافِعٍ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سُئِلَ عَمَّنْ طَلَّقَ ثَلاَثًا، قَالَ: لَوْ طَلَّقْتَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَنِي بِهَذَا، فَإِنْ طَلَّقْتَهَا ثَلاَثًا حَرُمَتْ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَكَ[1].

**٥٢٦٤- لەیس لە نافیعەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ هەمیشە ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی کەسێك سێ تەڵاقەی ژنەکەی دابێت دەیوت: ئەگەر جارێ یا دوو جار ژنەکەی تەڵاق دابێت ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەوە پێکردم (ژنەکەم بهێنمەوە بۆلای خۆم)، بەڵام ئەگەر سێهەم تەڵاقی بدەیت[2] لێت حەرام دەبێت، هەتا شوو نەکات بە مێردێکی تر کە جگە لە تۆ (بۆت حەڵاڵ نابێت).**

٥٢٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: طَلَّقَ رَجُلٌ امْرَأَتَهُ، فَتَزَوَّجَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ فَطَلَّقَهَا، وَكَانَتْ مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ فَلَمْ تَصِلْ مِنْهُ إِلَى شَيْءٍ تُرِيدُهُ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ طَلَّقَهَا، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ زَوْجِي طَلَّقَنِي، وَإِنِّي تَزَوَّجْتُ زَوْجًا غَيْرَهُ فَدَخَلَ بِي، وَلَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ مِثْلُ الْهُدْبَةِ فَلَمْ يَقْرَبْنِي إِلاَّ هَنَةً وَاحِدَةً، لَمْ يَصِلْ مِنِّي إِلَى شَيْءٍ، فَأَحِلُّ لِزَوْجِي الأَوَّلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَحِلِّينَ لِزَوْجِكِ الأَوَّلِ حَتَّى يَذُوقَ الآخَرُ عُسَيْلَتَكِ، وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ»[3].

**٥٢٦٥- عائیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێك ژنەکەی تەڵاقدا، ئینجا شووی کرد بەپیاوێکی تر جگەلە ئەوە (ی پێشوو)، ئەویش تەڵاقیدا، چووکی وەك ڕیشاڵی قوماش وابوو، بۆیە بەوە نەگەشت لە مێردەکەی دەیویست، ئیتر زۆری نەخایاند تەڵاقی دا، جا ژنەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر و ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان مێردەکەم تەڵاقی دام، منیش شووم کرد بە پیاوێکی تر، جا هاتە لام**

(١) بڕوانە: ٤٩٠٨.

(٢) یان بە جارێ هەر سێ تەڵاقەکەی بدەیت.

(٣) بڕوانە: ٢٦٣٩.

ئەوەی پێی بوو وەك ڕیشاڵی پۆشاك بوو، بۆیە تەنها یەك جار لەگەڵم دروست بووە، ئیتر هیچی پێ نەكرا لەگەڵ من، ئایا بۆ مێردە یەكەمەكەم حەڵاڵ دەبم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((حەڵاڵ نابیت بۆ مێردی یەكەمت هەتا ئەو مێردەی تریش هەنگوین و لە زەتی تۆ نەچەژێت و تۆش هەنگوین و لەزەتی ئەو نەچەژیت)).

٨- **بابٌ:** ﴿ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ ﴿١﴾ ﴾ التحريم

٥٢٦٦- حَدَّثَنِي الْحَسَنُ بْنُ صَبَّاحٍ، سَمِعَ الرَّبِيعَ بْنَ نَافِعٍ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ يَعْلَى بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِذَا حَرَّمَ امْرَأَتَهُ لَيْسَ بِشَيْءٍ. وَقَالَ: ﴿ لَّكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب[1].

## ٨- باسێک: ((ئەی پێغەمبەر ﷺ) بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت)

**٥٢٦٦- یەعلای كوڕی حەكیم لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە دەگێڕێتەوە كە بۆی گێڕاوەتەوە كە ئەو لە ئیبنو عەبباسی ﷺ بیستووە وتوویەتی: ئەگەر پیاو ژنەكەی لە خۆی حەرام بكات هیچ نییە. وە وتی: (لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرمەشق و پێشەوایەتی بۆ ئێوە هەیە).**

٥٢٦٧- حَدَّثَنِي الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: زَعَمَ عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ

(١) بڕوانە: ٤٩١١.

جَحْشٍ، وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: «لاَ، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَلَنْ أَعُودَ لَهُ». فَنَزَلَتْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۝١ ﴾ التحريم، إِلَى ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ۝٤ ﴾ التحريم، لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ ۝٣ ﴾ التحريم. لِقَوْلِهِ «بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً»[١].

**٥٢٦٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لای زەینەبی کچی جەحش دەمایەوە، لای ئەو شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، بۆیە من و حەفصە ڕێککەوتین کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەرکامیمان پێی بڵێ: من بۆنی مەغافیر[٢] لە تۆ هەست پێ دەکەم، مەغافیرت خواردووە؟ ئینجا پێغەمبەر ﷺ چووە لای یەکێکیان ئەو قسەی پێ وت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نەم خواردووە، لای زینەبی کچی جەحش شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە، ئیتر هەرگیز بۆی ناگەڕێمەوە (نایخۆمەوە) ))، بەوهۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت)، تا ئەم جێگایە (ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا (جێی خۆیەتی) )، بە عائیشە و حەفصە دەفەرمووێ، (وە کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند) مەبەستی ئەم فەرموودەیە بوو: ((بەڵکو شەربەتی هەنگوینم خواردووە)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٢) کەتیرە یا جەوییەکی شیری بۆن ناخۆشە.

٥٢٦٨- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ الْعَسَلَ وَالْحَلْوَاءَ، وَكَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الْعَصْرِ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ، فَيَدْنُو مِنْ إِحْدَاهُنَّ، فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ، فَاحْتَبَسَ أَكْثَرَ مَا كَانَ يَحْتَبِسُ، فَغِرْتُ فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ، فَقِيلَ لِي: أَهْدَتْ لَهَا امْرَأَةٌ مِنْ قَوْمِهَا عُكَّةً مِنْ عَسَلٍ، فَسَقَتِ النَّبِيَّ ﷺ مِنْهُ شَرْبَةً، فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَنَحْتَالَنَّ لَهُ. فَقُلْتُ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ: إِنَّهُ سَيَدْنُو مِنْكِ، فَإِذَا دَنَا مِنْكِ فَقُولِي: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ لاَ. فَقُولِي لَهُ: مَا هَذِهِ الرِّيحُ الَّتِي أَجِدُ مِنْكَ؟ فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ، فَقُولِي لَهُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ. وَسَأَقُولُ ذَلِكِ، وَقُولِي أَنْتِ يَا صَفِيَّةُ ذَاكِ. قَالَتْ تَقُولُ سَوْدَةُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ قَامَ عَلَى الْبَابِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أُبَادِيَهُ بِمَا أَمَرْتِنِي بِهِ فَرَقًا مِنْكِ، فَلَمَّا دَنَا مِنْهَا قَالَتْ لَهُ سَوْدَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ قَالَ: «لاَ». قَالَتْ: فَمَا هَذِهِ الرِّيحُ الَّتِي أَجِدُ مِنْكَ. قَالَ: «سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ». فَقَالَتْ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ فَلَمَّا دَارَ إِلَيَّ قُلْتُ لَهُ نَحْوَ ذَلِكَ، فَلَمَّا دَارَ إِلَى صَفِيَّةَ قَالَتْ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا دَارَ إِلَى حَفْصَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ أَسْقِيكَ مِنْهُ؟ قَالَ: «لاَ حَاجَةَ لِي فِيهِ». قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ، وَاللَّهِ لَقَدْ حَرَمْنَاهُ. قُلْتُ لَهَا: اسْكُتِي[1].

**٥٢٦٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە هەنگوین و حەڵوا دەکرد، هەمیشە کە لە نوێژی عەسر دەگەڕایەوە دەڕۆشت بۆ لای ژنەکانی لە یەکێکیان نزیك دەبوویەوە[2]، ئینجا ڕۆشتە لای حەفصەی کچی عومەر ﵄ زیاتر لای مایەوە لەوەی کە لای دەمایەوە، پێم ناخۆش بوو[3]، منیش لەو بارەیەوە پرسیارم کرد، پێم وترا ژنێکی خزمی خۆی هیزەیەك هەنگوینی بە دیاری بۆ هێنابوو، حەفصەش شەربەتی هەنگوینی دا بە پێغەمبەر ﷺ، منیش**

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٢) ماچی دەکرد یا یاری لەگەڵ دەکرد.

(٣) ڕقم هەستا.

وتم: وەڵڵاهی دەبێ فێڵێکی لێ بکەین، بە سودەی کچی زەمعەم وت: بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر ﷺ لێت نزیك دەبێتەوە[١]، جا ئەگەر لێت نیزك بوویەوە پێی بڵێ: مەغافیرت خواردووە؟ جا بێگومان ئەویش بە تۆ دەڵێ: نەخێر (نەم خواردووە) ئینجا پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە چییە من هەستی پێ دەکەم لێت؟ جا بەدڵنیاییەوە ئەویش دەفەرمووێ پێت: حەفصە هەندێ شەربەتی هەنگوینی دامێ خواردمەوە، ئەوسا پێی بڵێ: هەنگەکەی بەداری عورفوتەوە نیشتۆتەوە[٢] منیش وا ئەڵێم پێی، ئەی صەفیە تۆش وا بڵێ. عائیشە ﵂ وتی[٣]: سودە دەڵێ: جا سوێند بە خوا کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە دەرگاکەم لە ترسی تۆ ویستم هەر لەوێدا ئەوی کە تۆ پێت وتم عەرزی بکەم، جا کاتێ لێی نزیك بوویەوە سودە عەرزی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: ((نەخێر))، وتی: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە من هەستی پێ دەکەم لە تۆ؟ فەرمووی: ((حەفصە شەربەتی هەنگوینی داومێ (خواردوومەتەوە) ))، سودە وتی: هەنگەکەی بەداری عورفوتەوە نیشتۆتەوە، ئینجا کە گەڕایەوە بۆ لای منیش وەك قسەکەی ئەوم پێ وت، ئەنجا کە گەڕایەوە بۆ لای صەفیەش هەمان شتی پێ وتبوو، ئینجا کاتێ گەڕایەوە بۆ لای حەفصە وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منیش لەو هەنگوینەت بدەمێ؟ فەرمووی: ((نەخێر پێویستم پێی نییە))، سەودە وتی: وەڵڵاهی بە دڵنیاییەوە لێمان حەرام کرد، (عائیشە دەڵێ:) وتم کچێ بێ دەنگ بە.

---

(١) یاری و دەستبازیت لەگەڵ بکات.
(٢) گەڵا و گوڵی ئەو دارەی مژیوە کە مەغافیر دەردەدات وەك کەتیرە.
(٣) دوا ئەوەی وامان کرد.

## ٩- بابٌ: لَا طَلَاقَ قَبْلَ النِّكَاحِ

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٤٩﴾ ﴾ الأحزاب.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ جَعَلَ اللَّهُ الطَّلَاقَ بَعْدَ النِّكَاحِ. وَيُرْوَى فِي ذَلِكَ عَنْ عَلِيٍّ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَعُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، وَعَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، وَشُرَيْحٍ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَالْقَاسِمِ، وَسَالِمٍ، وَطَاوُسٍ، وَالْحَسَنِ، وَعِكْرِمَةَ، وَعَطَاءٍ، وَعَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، وَجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، وَنَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَمُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، وَمُجَاهِدٍ، وَالْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَعَمْرِو بْنِ هَرِمٍ، وَالشَّعْبِيِّ أَنَّهَا لاَ تَطْلُقُ.

## ٩- باسێک: پێش مارە کردنی ژن تەڵاقی نییە[(١)]

**بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، کاتێ ئافرەتانی ئیماندارنتان مارە کرد لە پاشان لە پێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاقتان دان، ئەوە لەسەریان نییە بۆ ئێوە هیچ عیددەیەك هەڵ ژمێرن، کەواتە موتعەیان[(٢)] بدەنێ، وە تەڵاقیان بدەن بە تەڵاقدانێکی جوان و پیاوانە).**

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: خوای گەورە تەڵاقی پاش ژن مارە کردن داناوە، وە لەو بارەیەوە (کە تەڵاق پاش ژن مارە کردنە) لە عەلییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وە لە سەعیدی کوڕی موسەییەب و عوروەی کوڕی زوبەیر و ئەبی بەکری کوڕی عەبدوڕەحمان و عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە و ئەبانی کوڕی عوسمان و عەلی کوڕی حوسەین و سورەیج و سەعیدی کوڕی جوبەیر و قاسیم**

(١) وە تەڵاق ناکەوێ، چونکە تەڵاقدانی ئافرەتی بێگانە هیچ نییە و هیچ حوکمێکی لەسەر دانامەزرێ.

(٢) پۆشاک و نۆین بۆ دڵخۆشیان.

و سالیم و تاووس و حەسەن و عیکریمە و عەتاو و عامیری کوڕی سەعد و جابیری کوڕی زەید و نافیع کوڕی جوبەیر و موحەممەدی کوڕی کەعب و سولەیمانی کوڕی یەسار و موجاهید و قاسیمی کوڕی عەبدوڕەحمان و عەمری کوڕی هەریم و شەعبی، هەموویان دەڵێن: ژن تەڵاق نادرێ (پێش مارە کردنی).

## ١٠- بابٌ: إِذَا قَالَ لِامْرَأَتِهِ وَهُوَ مُكْرَهٌ: هَذِهِ أُخْتِي. فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ

قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِسَارَةَ: هَذِهِ أُخْتِي وَذَلِكَ فِي ذَاتِ اللَّهِ ﷻ».

## ١٠- باسێک: ئەگەر پیاو لە کاتێکدا ناچار بێ بەژنەکەی بڵێ ئەمە خوشکمە ئەوە هیچی لەسەر نییە[١]

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ بە سارەی فەرموو ئەمە خوشکمە، ئەوە لە بارەی خوا ﷻـەومیە[٢])).**

## ١١- بَابُ الطَّلاَقِ فِي الإِغْلاَقِ

وَالْكُرْهِ وَالسَّكْرَانِ وَالْمَجْنُونِ وَأَمْرِهِمَا، وَالْغَلَطِ وَالنِّسْيَانِ فِي الطَّلاَقِ وَالشِّرْكِ وَغَيْرِهِ، لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى». وَتَلاَ الشَّعْبِيُّ ﴿لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة، وَمَا لاَ يَجُوزُ مَنْ إِقْرَارِ الْمُوَسْوِسِ. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلَّذِي أَقَرَّ عَلَى نَفْسِهِ: «أَبِكَ جُنُونٌ؟». وَقَالَ عَلِيٌّ ﷺ: بَقَرَ حَمْزَةُ خَوَاصِرَ شَارِفَيَّ، فَطَفِقَ النَّبِيُّ ﷺ يَلُومُ

---

(١) نە تەڵاقی دەکەوێ نە بە (ظهار) دادەنرێت.

(٢) واتە: لە ئاینی خوا سارە خوشکی ئیبراهیمە ﷺ، چونکە هەر ئەو دووانە لەو کاتەدا موسوڵمان بوون.

حَمْزَةَ، فَإِذَا حَمْزَةُ قَدْ ثَمِلَ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، ثُمَّ قَالَ حَمْزَةُ: هَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لأَبِي؟ فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُ قَدْ ثَمِلَ، فَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ، وَقَالَ عُثْمَانُ: لَيْسَ لِمَجْنُونٍ وَلاَ لِسَكْرَانَ طَلاَقٌ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: طَلاَقُ السَّكْرَانِ وَالْمُسْتَكْرَهِ لَيْسَ بِجَائِزٍ. وَقَالَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ: لاَ يَجُوزُ طَلاَقُ الْمُوَسْوِسِ. وَقَالَ عَطَاءٌ: إِذَا بَدَا بِالطَّلاَقِ فَلَهُ شَرْطُهُ. وَقَالَ نَافِعٌ: طَلَّقَ رَجُلٌ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ إِنْ خَرَجَتْ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنْ خَرَجَتْ فَقَدْ بُتَّتْ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ تَخْرُجْ فَلَيْسَ بِشَيْءٍ.وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِيمَنْ قَالَ لامرأته: إِنْ لَمْ أَفْعَلْ كَذَا وَكَذَا فَامْرَأَتِي طَالِقٌ ثَلاَثًا يُسْئَلُ عَمَّا قَالَ، وَعَقَدَ عَلَيْهِ قَلْبُهُ، حِينَ حَلَفَ بِتِلْكَ الْيَمِينِ، فَإِنْ سَمَّى أَجَلاً أَرَادَهُ وَعَقَدَ عَلَيْهِ قَلْبُهُ حِينَ حَلَفَ، جُعِلَ ذَلِكَ فِي دِينِهِ وَأَمَانَتِهِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: إِنْ قَالَ لاَ حَاجَةَ لِي فِيكِ. نِيَّتُهُ، وَطَلاَقُ كُلِّ قَوْمٍ بِلِسَانِهِمْ. وَقَالَ قَتَادَةُ: إِذَا قَالَ: إِذَا حَمَلْتِ فَأَنْتِ طَالِقٌ. ثَلاَثًا، يَغْشَاهَا عِنْدَ كُلِّ طُهْرٍ مَرَّةً، فَإِنِ اسْتَبَانَ حَمْلُهَا فَقَدْ بَانَتْ. وَقَالَ الْحَسَنُ: إِذَا قَالَ لَهَا: الْحَقِي بِأَهْلِكِ. نِيَّتُهُ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ الطَّلاَقُ عَنْ وَطَرٍ، وَالْعَتَاقُ مَا أُرِيدَ بِهِ وَجْهُ اللَّهِ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِنْ قَالَ: مَا أَنْتِ بِامْرَأَتِي. نِيَّتُهُ، وَإِنْ نَوَى طَلاَقًا فَهْوَ مَا نَوَى. وَقَالَ عَلِيٌّ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ الْقَلَمَ رُفِعَ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يُدْرِكَ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ؟ وَقَالَ عَلِيٌّ ﷺ: وَكُلُّ الطَّلاَقِ جَائِزٌ إِلاَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ وقال قتادة: إذا طلق في نفسه فليس بشيء

## ١١- باسی تەڵاقدان لە کاتی زۆر لێکردندا[١]

**وە (حوکمی) زۆر لێکراو (وە حوکمی) سەرخۆش و شێت و کار هەردووکیان[٢]، (وە حوکمی) هەڵە و لە بیرچوون لە تەڵاقدان و هاوبەش داناندا[٣] وە جگە لە**

(١) حوکمی تەڵاقەکە دەکەوێ یا نا؟.

(٢) وەک یەک وان یان جیاوازن.

(٣) واتە: حوکمی هاوبەش دانان یان بە هەڵە لە بیر چوون.

هاوبەش دانان، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((هەموو کردەوەکان پەیوەستن بە نیەت و نیازی دڵەوە، هەرکەسیش چ نیەتێکی هەبێ ئەوەی بۆ دەنوسرێت)).

شەعبی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾ واتە: (پەروەردگار) لێمان مەگرە ئەگەر (کردەوەیەکی پێویستمان) لە بیر چوو یا بەهەڵە گوناهێکمان کرد). وە (ڕوون کردنەوەی) ئەوەی کە دان پێدانانی کەسێك ڕاڕا بێت دروست نییە. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەو کەسەی کە دانی نا بە تاوانەکەیدا ((ئایا تۆ شێتیت؟)). وە عەلی ﷺ وتی: حەمزە کەلەکەی هەردوو مێ وشترە پیرەکەمی هەڵدڕیبوو، پێغەمبەریش ﷺ دەستی کرد بە سەرزەنشتی حەمزە، حەمزەش مەست بوو ئەوەندە سەرخۆش بوو هەردوو چاوی سوور بوو بوون، لە پاشان حەمزە وتی: ئێوە کۆیلەی باوکم نین؟ ئیتر پێغەمبەر ﷺ زانی و دڵنیا بوو کە مەست و سەرخۆشە، بۆیە لە ماڵەکە هاتە دەرەوە و ئێمە لەگەڵیا هاتینە دەرەوە. عوسمان ﷺ دەڵێ: شێت و سەرخۆش تەڵاقیان نییە[1]. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: تەڵاقی سەرخۆش و زۆر لێکراو دروست نییە. عوقبەی کوڕی عامیر دەڵێ: تەڵاقی کەسێك ڕاڕا بێت دروست نییە و ناکەوێ،

عەتا دەڵێ: ئەگەر کەسێك بە وتنی تەڵاقەکە دەستی پێ کرد، ئەوە مەرجی خۆی بۆ هەیە[2].

نافیع دەڵێ: پیاوێك تەڵاقی یەکجاری ژنەکەی دا ئەگەر لە ماڵ بڕواتە دەرەوە، ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئەگەر ڕۆشتە دەرەوە ئەوە تەڵاقی بە یەکجاری دەکەوێ، بەڵام ئەگەر نەڕۆشتە دەرەوە هیچ نییە و تەڵاقی ناکەوێ.

---

(١) واتە: تەڵاقیان ناکەوێ چونکە لەو حاڵەتەدا خاوەن تەڵاق نین.

(٢) واتە: دەتوانی مەرجەکەی بڵێ با دوا وتنی وشەی تەڵاقەکەش بێت، بۆ نموونە بڵێ بە ژنەکەی: تەڵاقت کەوتبێ، ئینجا بڵێ: ئەگەر لە ماڵ بڕۆیتە دەرەوە.

**زوهری دەربارەی کەسێك کە بڵێ: ئەگەر ئەوە و ئەوەم نەکرد ئەوە ژنەکەم سێ تەڵاقەی کەوتبێ: پرسیار لەو کەسە دەکرێت چی وتوە کاتێ ئەو تەڵاقەی خواردوە و مەبەست ونییەتی چی بووە، جا ئەگەر کات و ماوەیەکی وت کە مەبەست و نییەتی دڵی ئەوە بوو کاتێ تەڵاق خواردنەکەی، حەواڵەی دین و ئەمانەی خۆی دەکرێ[١].**

**ئیبراهیم دەڵێ: ئەگەر کەسێك وتی: (بە ژنەکەی) من پێویستم بە تۆ نییە، ئەو بە پێی نیەتەکەیەتی، وە تەڵاق خواردنی هەر گەلێ بە زمانی خۆیەتی[٢].**

**قەتادە دەڵێ: ئەگەر پیاو بە ژنەکەی بڵێ: ئەگەر سکت بوو ئەوە سێ تەڵاقەت کەوتبێ، لە هەر پاکێتیەکدا یەکجار سەرجێی لەگەڵ ژنەکەی بکات، جا ئەگەر دەرکەوت سکی بووە ئەوە بێگومان تەڵاقی دەکەوێت بە یەکجاری لە پیاوەکەی جیا دەبێتـەوە.**

**حەسەن دەڵێ: ئەگەر پیاو بەژنەکەی وت: بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت یا کەس و کارت بە پێی نییەت و مەبەست یەتی[٣].**

**ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: تەڵاقدان لە کاتی پێویست بووندا دەدرێت، ئازادکردنی کۆیلەش ئەوەیە لە بەر ڕەزامەندی خوا ئەنجام بدرێ[٤].**

**زوهری دەڵێ: ئەگەر پیاو بڵێ: تۆهاوسەری من نیت بە پێی نییەتەکەیەتی، ئەگەر نییەت و نیازی تەڵاق بوو (بەوتەیەی)، ئەوە بە گوێرەی نییەتیەکەیەتی[٥].**

---

(١) بەو جۆرەی نییەتی بوو دادەنرێ، بەڵام حەواڵەی لای خوا دەکرێ ڕاست دەکا یا نا.
(٢) واتە هەر گەلێکی غەیرە عەرەب وشەیەک لە ناویاندا بۆ تەڵاق بەکار بێت هەر کات کەسێکیان بەکاری هێنا، ئەوە بە تەڵاق دادەنرێت.
(٣) واتە: نییەت تەڵاق بوو تەڵاقە، نییەتی تەڵاق نەبوو تەڵاق نییە.
(٤) واتە هەموو کات سوننەتە و چاکە بە پێچەوانەی تەڵاقدان تەنها لە کاتی پێویستدا دەبێ بدرێ.
(٥) واتە: تەڵاقە.

**عەلی ﷺ دەڵێ: ئایا دەزانی قەڵەم لەسەر نووسینی تاوان لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر شێت هەتا چاك دەبێتەوە، وە لەسەر منداڵ تا پێدەگا و باڵغ دەبێت، وە لەسەر خەوتووە هەتا لە خەو هەڵدەستێت[1]. وە عەلی ﷺ دەڵێ: هەموو تەڵاقێك دروستە جگە لە تەڵاقدانی شێتۆلکە.**

٥٢٦٩- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ». قَالَ قَتَادَةُ: إِذَا طَلَّقَ فِي نَفْسِهِ فَلَيْسَ بِشَيْءٍ[2].

**٢٥٦٩-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خوا چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتم لە شتێك لە دڵی خۆیدا بیڵێ[3] تا نەیکات (بە کردار)، یا نەیڵێ (بە زمان) )).**
**قەتادە دەڵێ: ئەگەر کەسێك لە دڵی خۆیدا ژنەکەی تەڵاق بدات ئەوە هیچ نییە (و بەتەڵاق دانانرێت).**

٥٢٧٠- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ زَنَى. فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحَّى لِشِقِّهِ الَّذِى أَعْرَضَ فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، فَدَعَاهُ فَقَالَ: «هَلْ بِكَ جُنُونٌ؟ هَلْ أُحْصِنْتَ؟». قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ جَمَزَ حَتَّى أُدْرِكَ بِالْحَرَّةِ فَقُتِلَ[4].

---

(١) ئیبن و عەبباس دەڵێ: ئافرەتێکی شێتیان هێنا بۆ خزمەت عومەر زینای کردبوو سکی پڕ بوو ویستی ڕەجمی بکات، عەلی ئەو قسەیەی کرد (إرشاد الساري: ٣٥/١٢).
(٢) بڕوانە: ٢٥٢٨.
(٣) بێت بە دڵیدا یان بیری لێ بکاتەوە.
(٤) بڕوانە: ٥٢٧٢، ٦٨١٤، ٦٨١٦، ٦٨٢٠، ٦٨٢٦، ٧١٦٨.

**٥٢٧٠- جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێ لە هۆزی ئەسلەم هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا لە مزگەوتدا بوو وتی: كە بێگومان ئەو زینای كردوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، ئینجا پیاوەكە ڕۆشت بۆ ئەو ڕووەی كە ڕووی لێ وەرگێڕاو چوار جار شایەتی دا لەسەر خۆی (كە زینای كردوە)، پێغەمبەریش ﷺ بانگی كرد و فەرمووی: ((ئایا تۆ شێتیت؟ ئایا ژنت هێناوە؟)) وتی: بەڵێ (ژنم هێناوە)، ئینجا فەرمانی كرد پێی كە لە نوێژگە بەرد باران بكرێت، جا كە بەردەكان لێی دەدا و (ئازاری پێ گەشت) بەپەلە ڕایكرد، هەتا لە بەردەڵانە ڕەشەكە (ی دەرەوەی مەدینە) گەشتن پێی و كوژرا.**

٥٢٧١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ مِنْ أَسْلَمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي الْمَسْجِدِ فَنَادَاهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الأَخِرَ قَدْ زَنَى -يَعْنِي نَفْسَهُ- فَأَعْرَضَ عَنْهُ فَتَنَحَّى لِشِقِّ وَجْهِهِ الَّذِى أَعْرَضَ قِبَلَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الأَخِرَ قَدْ زَنَى. فَأَعْرَضَ عَنْهُ: فَتَنَحَّى لِشِقِّ وَجْهِهِ الَّذِى أَعْرَضَ قِبَلَهُ فَقَالَ لَهُ ذَلِكَ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحَّى لَهُ الرَّابِعَةَ، فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ دَعَاهُ فَقَالَ: «هَلْ بِكَ جُنُونٌ؟». قَالَ لاَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ». وَكَانَ قَدْ أُحْصِنَ[1].

**٥٢٧١- ئەبو هوڕەیڕە ﷺ وتی: پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، لەكاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا بوو، جا بانگی كرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دواكەوتووە - مەبەستی خۆی بوو- زینای كردوە، پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، ئینجا پیاوەكە ڕۆشت بۆئەو لایەی ڕووی لێ كردبوو، وتی ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان ئەم دواكەوتووە زینای كردوە،**

(١) بڕوانە: ٦٨١٥، ٦٨٢٥، ٧١٦٧.

**پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، جا پیاوەکە ڕۆشتە بەردەم ئەو لایەوەی کە ڕووی لێ وەرگێڕا بوو، ئەو قسەیەی پێ وتەوە، جارێکی تر ڕووی لێ وەرگێڕا، پیاوەکەش هەر چوویەوە بەردەمی بوو بە چوار جار، جا کاتێ چوار جار شایەتی دا لەسەر خۆی (کە زینای کردوە)، بانگی کرد و فەرمووی: ((ئایا تۆ شێتیت؟)) وتی: نەخێر، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیبەن بەرد بارانی کەن))، بێگومان پێشتر ژنی هێنا بوو.**

٥٢٧٢ - وَعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُ، فَرَجَمْنَاهُ بِالْمُصَلَّى بِالْمَدِينَةِ، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ جَمَزَ حَتَّى أَدْرَكْنَاهُ بِالْحَرَّةِ، فَرَجَمْنَاهُ حَتَّى مَاتَ[1].

**٥٢٧٢- جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ دەڵێ: من لەو کەسانە بووم کە بەرد بارانی کرد، جا بەرد بارانمان کرد لە نوێژگەی مەدینە، ئینجا کاتێ بەردەکانی بەرکەوت (و ئازاری دا)، بەپەلە ڕایکرد (شوێنی کەوتین)، هەتا لەبەردەڵانە ڕەشەکە (ی مەدینە) گرتمانەوە و بەردبارانمان کرد هەتا مرد.**

## ١٢- بَابُ الْخُلْعِ، وَكَيْفَ الطَّلَاقُ فِيهِ؟

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة: وَأَجَازَ عُمَرُ، الخُلْعَ دُونَ السُّلْطَانِ وَأَجَازَ عُثْمَانُ، الخُلْعَ دُونَ عِقَاصِ رَأْسِهَا وَقَالَ طَاوُسٌ: ﴿ إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا

(١) بڕوانە: ٥٢٧٠.

حُدُودَ ٱللَّهِ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة: فِيمَا فِيمَا افْتَرَضَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ فِي الْعِشْرَةِ وَالصُّحْبَةِ، وَلَمْ يَقُلْ قَوْلَ السُّفَهَاءِ: لاَ يَحِلُّ. حَتَّى تَقُولَ: لاَ أَغْتَسِلُ لَكَ مِنْ جَنَابَةٍ.

## ١٢- باسی خولع[1]، وە تەڵاقدان بە خولع چۆنە؟

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دروست نییە بۆ ئێوە کە هیچێك لەو شتانەی کە پێتان داون لێیان بسەننەوە مەگەر هەردووڵا بترسن (لەوەی) کە سنوری خوا ڕانەگرن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (ستەمکارانن).**

**عومەر ﷺ ڕێگەی بە خولع کردن داوە بەبێ مۆڵەتی پێشەوای باوەڕداران [2].**

**عوسمان ڕێگەی بە خولع کردن دا، با ئەو شتەش ئافرەتەکە دەیدات بە پیاوەکە کەمتر بێت لە پەتێك کە قژی سەری پێ دەبەستێت[3].**

**وە تاووس دەربارەی ئەم ئایەتە: (مەگەر هەردوو لا بترسن لەوەی کە سنووری خوا ڕانەگرن)، وتی: لەوەدا کە بۆ هەر یەکەیان پێویست بووە لەسەر بەرانبەرەکەی لە تێکەڵی و هەڵسوکەوت[4]، ئەو قسەی نەکردوە کە قسەی نەفامەکانە کە دەڵێن: خولع دروست نییە بۆی هەتا ژنەکە نەڵێ: خۆم ناشۆم لە لەش گرانی بەهۆی تۆوە[5].**

٥٢٧٣- حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ جَمِيلٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ

---

(١) خولع: ئەوەیە ژن داوا بکات مێردەکەی تەڵاقی بدات و ژنەکە واز لە هەموو مارەییەکەی یان هەندێکی بهێنێت، یان پیاو ژنەکەی تەڵاق بدات بەو مەرجەی واز لە مارەییەکەی یان هەندێکی بێنێت و ژنەکەش ڕازی بێت.

(٢) واتە: مۆڵەتی پێشەوا یا نوێنەرەکانی ناوێ، بەبێ ئامادەیی پێشەوا مۆڵەتی دروست دەکرێ.

(٣) یان تەوقەیەک بە زمانی ئەمڕۆی خۆمان.

(٤) ئەمە قسەی کوڕی تاووسە نەک تاووس.

(٥) واتە لەگەڵی ناخەوێ و سەرجێی لەگەڵدا ناکات.

مَا أَعْتُبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ». قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً»[1].

**٥٢٧٣- ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هیچ گلەییەکم لێی نییە لە بارەی ڕەوشت و ئایینەوە[2]، بەڵام من کافر بوونم لە ئیسلامدا پێ ناخۆشە[3]، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟))[4] ژنەکە وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە سابیت: ((باخەکە وەرگرە و یەك تەڵاقی بدە)).**

٥٢٧٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ الْوَاسِطِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ أُخْتَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ بِهَذَا، وَقَالَ: «تَرُدِّينَ حَدِيقَتَهُ؟». قَالَتْ: نَعَمْ. فَرَدَّتْهَا، وَأَمَرَهُ يُطَلِّقْهَا. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ،

عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَطَلِّقْهَا[5].

**٥٢٧٤- خالیدی حەززا لەعیکریمەوە دەگێڕێتەوە کە ئافرەتەکە خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوو لەم فەرموودەیەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟)) وتی: بەڵێ، ئینجا باخەکەی گێڕایەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە پیاوەکە کرد کە تەڵاقی بدات.**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٧٤، ٥٢٧٥، ٥٢٧٦، ٥٢٧٧.

(٢) بەڵام زۆر ناشرینە.

(٣) واتە: دەترسێت ئەگەر لێی جیا نەبێتەوە کافر ببێت، لە ئیسلام دەرچێت.

(٤) کە لە مارەییدا پێی داویت.

(٥) بڕوانە: ٥٢٧٣.

**ئیبراهیمی کوڕی تەهمان گێڕایەوە لە خالیدەوە ئەویش لە عیکریمەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە کە فەرمووی: ((تەڵاقی بدە)).**

٥٢٧٥ - وَعَنِ ابْنِ أَبِي تَمِيمَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةُ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لاَ أَعْتُبُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ وَلاَ خُلُقٍ، وَلَكِنِّي لاَ أُطِيقُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟». قَالَتْ: نَعَمْ[١].

**٥٢٧٥- عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕایەوە کە ئەو وتی: ژنی سابیتی کوڕی قەیس ﷺ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هیچ گلەییەکم لە سابیت نییە لەڕووی ڕەوشت و ئایینەوە، بەڵام من ناتوانم لەگەڵی بژیم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەی باخەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟)) ژنەکە وتی: بەڵێ.**

٥٢٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُبَارَكِ الْمُخَرِّمِيُّ، حَدَّثَنَا قُرَادٌ أَبُو نُوحٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةُ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَنْقِمُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ وَلاَ خُلُقٍ، إِلاَّ أَنِّي أَخَافُ الْكُفْرَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟». فَقَالَتْ: نَعَمْ. فَرَدَّتْ عَلَيْهِ، وَأَمَرَهُ فَفَارَقَهَا[٢].

**٥٢٧٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شمماس ﷺ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هیچ گلەییەکم لە سابیت نییە لە ڕووی ئایین و ڕەوشتەوە، جگە لەوەی من دەترسم لە کافر بوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەی باخەکەی بۆ**

(١) بروانە: ٥٢٧٣.

(٢) بروانە: ٥٢٧٣.

دەگێڕێتەوە؟)) ژنەکەش وتی: بەڵێ، جا باخەکەی بۆ گێڕایەوە ئیتر فەرمانی بە سابیت کرد و تەڵاقی دا و لێی جیا بوویەوە.

٥٢٧٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّ جَمِيلَةَ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

٥٢٧٧- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) سولەیمان بۆی گێڕاینەوە وتی: حەمماد بۆی گێڕاینەوە لە ئەیوبەوە ئەویش لە عیکریمەوە کە جەمیلەوە، ئیتر فەرموودەکەی (بەتەواوی) باس کرد و گێڕایەوە.

## ١٣- بابُ الشِّقَاقِ، وَهَلْ يُشِيرُ بِالْخُلْعِ عِنْدَ الضَّرُورَةِ؟

وَقَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا ﴿٣٥﴾ ﴾ إلى قوله ﴿ خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء.

٥٢٧٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ بَنِي الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُوا فِي أَنْ يَنْكِحَ عَلِيٌّ ابْنَتَهُمْ، فَلاَ آذَنُ»[2].

## ١٣- باسی ناکۆکی[3]، وە ئایا (دادوەر)[4] ئاماژە بە خولع دەکات لە کاتی پێویستدا

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەگەر لە تێکچوونی نێوان (ژن و مێرد) ترسان، ئەوە ناوبژیوانێك لە خزمی پیاوەکە و ناوبژیوانێك لە خزمی ئافرەتەکە بنێرن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (ئاگادارە).

---

(١) بڕوانە: ٥٢٧٣.

(٢) بڕوانە: ٩٢٦.

(٣) ئایا ئاژاوەی نێوان ژن و پیاو.

(٤) یان ناوبژیوان یان سەرپەرشتیار لەکاتی پێویستدا.

**٥٢٧٨-میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان بەنی موغیرە مۆڵەتیان لێ خواستم دەربارەی ئەوەی کە عەلی کچەکەیان مارە بکات، منیش مۆڵەت نادەم )).**

## ١٤- بابٌ: لاَ يَكُونُ بَيْعُ الأَمَةِ طَلاَقًا

٥٢٧٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلاَثُ سُنَنٍ، إِحْدَى السُّنَنِ أَنَّهَا أُعْتِقَتْ، فَخُيِّرَتْ فِي زَوْجِهَا. وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالْبُرْمَةُ تَفُورُ بِلَحْمٍ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَأُدْمٌ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ، فَقَالَ: «أَلَمْ أَرَ الْبُرْمَةَ فِيهَا لَحْمٌ؟». قَالُوا: بَلَى، وَلَكِنْ ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، وَأَنْتَ لاَ تَأْكُلُ الصَّدَقَةَ. قَالَ: «عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ»[1].

## ١٤- باسێک: فرۆشتنی کەنیزەک (ی شوو کردوو) نابێتە تەڵاقدان

**٥٢٧٩- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: لە بەریرەدا سێ سوننەت هەبوو: یەکێك لە سونەتەکان ئەوە بوو کە ئازادکرا سەبارەت بە مێردەکەی سەرپشك کرا، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خاوەنداریێتی بۆ ئەو کەسەیە (کۆیلەکەی) ئازاد کردوە))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە و قابلەمەیەکی پڕ لە گۆشت کوڵی دەدا، ئینجا نان و پێخۆری لە پێخۆری ماڵەوە لێ نزیك کرایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی قابلەمەکەم نەدی گۆشتی تیا بوو؟)) وتیان: بەڵێ، بەڵام ئەوە گۆشتی خێرە هێنراوە بۆ بەریرە و تۆش زەکات و خێر ناخۆیت، فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ ئەوە (بەریرە) زەکاتە بۆ ئێمە دیاری یە)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

## ١٥- بابُ خِيَارِ الأَمَةِ تَحْتَ الْعَبْدِ

٥٢٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ وَهَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: رَأَيْتُهُ عَبْدًا يَعْنِي: زَوْجَ بَرِيرَةَ[1].

## ١٥- باسی سەرپشک کردنی کەنیزەک (کە ئازاد ببێ و مێردەکەی کۆیلە بێت

**٥٢٨٠- عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بینیم کۆیلە بوو. مەبەستی: مێردی بەریرە بوو.**

٥٢٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ذَاكَ مُغِيثٌ عَبْدُ بَنِي فُلاَنٍ -يَعْنِي زَوْجَ بَرِيرَةَ- كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَتْبَعُهَا فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ، يَبْكِي عَلَيْهَا[2].

**٥٢٨١- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەو پیاوە موغیسە بەندەی بەنی فلانە - مەبەستی مێردەکەی بەریرەیە - دەڵێی بە پێش چاومەوەیە سەیری دەکەم شوێن بەریرە دەکەوت بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگریا بۆی.**

٥٢٨٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ عَبْدًا أَسْوَدَ يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ، عَبْدًا لِبَنِي فُلاَنٍ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ وَرَاءَهَا فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ[3].

---

(١) بڕوانە: ٥٢٨١، ٥٢٨٢، ٥٢٨٣.

(٢) بڕوانە: ٥٢٨٠.

(٣) بڕوانە: ٥٢٨٠.

**٥٢٨٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: مێردی بەریرە کۆیلەیەکی ڕەش پێست بوو پێی دەوترا موغیس، کۆیلەی بەنی فلان بوو، دەڵێی بەپێش چاومەومیە و سەیری دەکەم بە دوای بەریرەدا بەکۆڵانەکانی مەدینەدا دەسوڕایەوە.**

## ١٦- بَابُ شَفَاعَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي زَوْجِ بَرِيرَةَ

٥٢٨٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي، وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعَبَّاسٍ: «يَا عَبَّاسُ، أَلاَ تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ، وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا؟». فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ رَاجَعْتِهِ». قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا أَشْفَعُ». قَالَتْ: لاَ حَاجَةَ لِي فِيهِ[1].

## ١٦- باسی تکای پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مێردی بەریرە

**٥٢٨٣- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە مێردی بەریرە کۆیلەیەك بوو پێ دەوترا موغیس، دەڵێی بە پێش چاومەومیە سەیری دەکەم بە دوای بەریرەدا دەسوڕایەوە و دەگریا و فرمێسك بە ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەریش ﷺ بەعەبباسی فەرموو: ((ئەی عەبباس ئایا سەرت سوڕنامێنی لە خۆشەویستی موغیس بۆ بەریرە و لە ڕەق لێبونەوەی بەریرە بۆ موغیس؟)) بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەریرە) ((خۆزگە بگەڕایتەوە بۆ لای))، بەریرە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ((بێگومان من تکا دەکەم))، بەریرە وتی: من هیچ پێویستیەکم پێی نییە.**

(١) بڕوانە: ٥٢٨٠.

## ١٧- بابٌ

٥٢٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، أَنَّ عَائِشَةَ أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ، فَأَبَى مَوَالِيهَا إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطُوا الْوَلاَءَ، فَذَكَرَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». وَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمٍ فَقِيلَ: إِنَّ هَذَا مَا تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: «هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ».
حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ وَزَادَ: فَخُيِّرَتْ مِنْ زَوْجِهَا[١].

## ١٧- باسێک

**٥٢٨٤- ئەسوەد دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ ویستی بەریرە بکڕێ، بەڵام خاوەنەکانی ڕازی نەبوون مەگەر بەو مەرجەی خاوەندارێتیەکەی بۆ ئەوان بێت، عائیشە ﷺ ئەوەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە فەرمووی (بە عائیشە): (( (بەریرە) بکڕە و ئازادی بکە، چونکە بەدڵنیاییەوە خاوەندارێتی بۆ ئەو کەسەیە کۆیلەکەی ئازاد کردوە))، وە گۆشتێك هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ جا پێی وترا بێگومان ئەم گۆشتە ئەوەیە وەك زەکات دراوە بە بەریرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوگۆشتە بۆ بەریرە زەکات و بۆ ئێمە دیارییە)).**
**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئادەم بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبەی بۆی گێڕاینەوە و ئەمەی بۆ زیاد کردوە جا بەریرە سەرپشك کرا دەربارەی مێردەکەی[٢].**

(١) بڕوانە: ٤٥٦.
(٢) لەگەڵی دەمێنێتەوە یان لێی پەشیمان دەبێتەوە.

## ١٨- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ﴿٢٢١﴾ ﴾ البقرة

٥٢٨٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ نِكَاحِ النَّصْرَانِيَّةِ وَالْيَهُودِيَّةِ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ الْمُشْرِكَاتِ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلاَ أَعْلَمُ مِنَ الإِشْرَاكِ شَيْئًا أَكْبَرَ مِنْ أَنْ تَقُولَ الْمَرْأَةُ رَبُّهَا عِيسَى، وَهْوَ عَبْدٌ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ.

## ١٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ( ژنانی هاوبەشی پەیدا کەر مارە مەکەن تا بڕوا دەهێنن، کەنیزەکێکی بڕوادار باشترە لە ژنە (ئازادێکی) هاوبەش پەیدا کەر و با هاوبەش پەیدا کەرەکە سەرسامیشی کردبن )

**٥٢٨٥- نافیع دەڵێ: دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عومەر ﷺ هەمیشە کە پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی مارە کردنی ئافرەتی گاور و جولەکە، دەیوت: بێگومان خوا مارەکردنی ئافرەتە هاوبەش دانەرەکانی حەرام کردوە لەسەر پیاوانی باوەڕدار [1]، من لە هاوبەشدانەریدا هیچ شتێك نازانم لەوە گەورەتر بێت کە ئافرەت بڵێت: عیسا ﷺ پەروەردگاریەتی، لە کاتێکدا ئەو بەندەیەك لە بەندەکانی خوای گەورە.**

## ١٩- بابُ نِكَاحِ مَنْ أَسْلَمَ مِنَ الْمُشْرِكَاتِ وَعِدَّتِهِنَّ

٥٢٨٦- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، وَقَالَ عَطَاءٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: كَانَ الْمُشْرِكُونَ عَلَى مَنْزِلَتَيْنِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَالْمُؤْمِنِينَ: كَانُوا مُشْرِكِي أَهْلِ حَرْبٍ

(١) موسوڵمانان

يُقَاتِلُهُمْ وَيُقَاتِلُونَهُ، وَمُشْرِكِي أَهْلِ عَهْدٍ لاَ يُقَاتِلُهُمْ وَلاَ يُقَاتِلُونَهُ، وَكَانَ إِذَا هَاجَرَتِ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِ الْحَرْبِ لَمْ تُخْطَبْ حَتَّى تَحِيضَ وَتَطْهُرَ، فَإِذَا طَهُرَتْ حَلَّ لَهَا النِّكَاحُ، فَإِنْ هَاجَرَ زَوْجُهَا قَبْلَ أَنْ تَنْكِحَ رُدَّتْ إِلَيْهِ، وَإِنْ هَاجَرَ عَبْدٌ مِنْهُمْ أَوْ أَمَةٌ فَهُمَا حُرَّانِ وَلَهُمَا مَا لِلْمُهَاجِرِينَ. ثُمَّ ذَكَرَ مِنْ أَهْلِ الْعَهْدِ مِثْلَ حَدِيثِ مُجَاهِدٍ: وَإِنْ هَاجَرَ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ لِلْمُشْرِكِينَ أَهْلِ الْعَهْدِ لَمْ يُرَدُّوا، وَرُدَّتْ أَثْمَانُهُمْ.

## ١٩- باسی (حوكمی) ماره كردنی ئەو ژنە هاوبەش دانەرانەی مسوڵمان بوون و حوكمی چاوەڕوانی ئەو ئافرەتانە[1]

**٥٢٨٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هاوبەش دانەران دوو پلە و جۆر بوون بەلای پێغەمبەر و ﷺ باوەڕدارانەوە (یەكەمیان) ئەو هاوبەش دانەرانەی لە جەنگ دا بوون (لە دژی مسوڵمانان)، پێغەمبەر ﷺ جەنگی لە دژی دەكردن و ئەوانیش جەنگیان لە دژی دەكرد. (دووهەمیان) ئەو هاوبەش دانەرانەی خاوەن پەیمان بوون (لەگەڵ مسوڵمانان)، پێغەمبەر ﷺ جەنگی لە دژیان نەدەكرد ئەوانیش جەنگیان لە دژی (پێغەمبەر و ﷺ مسوڵمانان نەدەكرد)، ئەگەر ژنێك لە لای هاوبەش دانەرە جەنگیەكانەوە كۆچی بكردایە (بۆ مەدینە)، خوازبێنی نەدەكرا هەتا نەكەوتایەتە حەیزەوە و پاك نەبوایەتەوە، جا كە پاك دەبوویەوە بۆی دروست بوو شوو بكات، جا ئەگەر مێردەكەشی كۆچی بكردایە پێش ئەوە ژنەكەی شوو بكات وە مارە بكرێت، دەدرایەوە بە مێردەكەی، هەروەها ئەگەر كۆیلەیەك لە لای (هاوبەش دانەرەكان) یا كەنیزەكێكیان كۆچی بكردایە، ئەوە بێگومان هەردووكیان ئازاد بوون، وە هەرچی بۆ كۆچبەران هەبوو بۆ**

(١) ماوەكەی چەندە كە دەبێت چاوەڕوان بن.

**هەردووکیان هەبوو[١]، پاشان باسی (هاوبەش دانەرانی) خاوەن پەیمانی کرد وەك ئەوەی لە فەرموودەکەی موجاهیددا هاتووە، (کە ئەمەیە) وە ئەگەر کۆیلەیەك یان کەنیزەکیکی هاوبەش دانەرانی خاوەن پەیمان کۆچی کرد ناگەڕێنرێتەوە، بەڵکو نرخەکانیان دەگەڕێنرێتەوە.**

٥٢٨٧ - وَقَالَ عَطَاءٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: كَانَتْ قَرِيبَةُ بِنْتُ أَبِي أُمَيَّةَ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَطَلَّقَهَا، فَتَزَوَّجَهَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَتْ أُمُّ الْحَكَمِ ابْنَةُ أَبِي سُفْيَانَ تَحْتَ عِيَاضِ بْنِ غَنْمٍ الْفِهْرِيِّ فَطَلَّقَهَا، فَتَزَوَّجَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُثْمَانَ الثَّقَفِيُّ.

**٥٢٨٧-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: قەریبە -یا قورەیبە[٢] - ی کچی ئەبی ئومەییە هاوسەری عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بوو تەڵاقی دا، پاشان موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان مارەی کرد، وە ئوممو لحەکەمی کچی ئەبو سوفیان هاوسەری عیازی کوڕی غەنمی فیهری بوو تەڵاقی دا، عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانی سەقەفی مارەی کرد.**

## ٢٠- بابٌ: إِذَا أَسْلَمَتِ الْمُشْرِكَةُ أَوِ النَّصْرَانِيَّةُ تَحْتَ الذِّمِّيِّ أَوِ الْحَرْبِيِّ

وَقَالَ عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِذَا أَسْلَمَتِ النَّصْرَانِيَّةُ قَبْلَ زَوْجِهَا بِسَاعَةٍ حَرُمَتْ عَلَيْهِ. وَقَالَ دَاوُدُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ الصَّائِغِ: سُئِلَ عَطَاءٌ عَنِ امْرَأَةٍ مِنْ أَهْلِ الْعَهْدِ أَسْلَمَتْ ثُمَّ أَسْلَمَ زَوْجُهَا فِي الْعِدَّةِ، أَهِيَ امْرَأَتُهُ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَشَاءَ هِيَ بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ وَصَدَاقٍ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: إِذَا أَسْلَمَ فِي الْعِدَّةِ يَتَزَوَّجُهَا. وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴿١٠﴾ ﴾ المتحنة. وَقَالَ

(١) کۆیلە و کەنیزەک ئازاد بن هەر مافێکیش بۆ کۆچەر ئازادەکان هەبێت بۆ ئەوانیش هەیە.

(٢) ناوی ئافرەتێکە: قورەیبە ڕاسترە زۆربەی گێڕەرەوەکانی بوخاری وایان خوێندۆتەوە.کە ئەبو ذەڕو ئیبن عەساکیر وایان گیراوەتەوە.

الْحَسَنُ وَقَتَادَةُ فِي مَجُوسِيَّيْنِ أَسْلَمَا: هُمَا على نِكَاحِهِمَا، وَإِذَا سَبَقَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ وَأَبَى الآخَرُ بَانَتْ، لاَ سَبِيلَ لَهُ عَلَيْهَا. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: امْرَأَةٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ جَاءَتْ إِلَى الْمُسْلِمِينَ، أَيُعَاوَضُ زَوْجُهَا مِنْهَا، لِقَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ﴿١٠﴾ ﴾ الممتحنة.

قَالَ: لاَ، إِنَّمَا كَانَ ذَاكَ بَيْنَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَيْنَ أَهْلِ الْعَهْدِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ: هَذَا كُلُّهُ فِي صُلْحٍ بَيْنَ النَّبِيِّ ﷺ وَبَيْنَ قُرَيْشٍ.

## ٢٠- باسێک: ئەگەر ژنێکی بتپەرست یا گاور مسوڵمان بوو ژنی پیاوێکی زیممی[١] یان کافرێکی جەنگی بوو[٢]

**عەبدولواریس دەگێڕێتەوە لە خالیدەوە لە عیکریمەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەڵێ: ئەگەر ژنێکی گاور سەعاتێك[٣] پێش مێردەکەی مسوڵمان بوو، ژنەکە لە پیاوەکە حەرام دەبێت.**

**داوود لە ئیبراهیمی زەرەنگەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیار کرا لە عەتا دەربارەی ژنێك پەیمان لەگەڵ کراو بێت و مسوڵمان بێت، پاشان لە ماوەی عیددەکەیدا مێردەکەشی مسوڵمان بێت، ئایا هەر ژنیەتی؟ قەتا وتی: نەخێر (ژنی نییە) مەگەر ژنەکە بیەوێ ببێتە ژنی بە مارەکردنێکی تازە و مارەییەکی تازە.**

**موجاهید دەڵێ: ئەگەر پیاوەکە لە عیددەی ژنەکەدا مسوڵمان بوو مارەی دەکاتەوە، خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (نە ئەو ئافرەتانە بۆ ئەو مێردە بێ بڕوایانە حەڵاڵن، وە نە ئەو مێردانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن)[٤].**

---

(١) پیاوێکی گاور یا جولەکەیە پەیمانی لەگەڵدا کراوە سەرانە دەدات بە دەوڵەتی ئیسلامی لە بەرانبەر پاراستنی گیان و ماڵ و ناموسی. ( ئەلمونجید بە کوردی: ١٢٦/٢).

(٢) پێش ئەوەی پیاوەکە موسوڵمان بێ حوکمی چییە؟.

(٣) ماوەیەک یان ساتێک.

(٤) واتە: ئەگەر ئەو ئافرەتانە کۆچیان کرد بۆ مێردەکانیان حەڵاڵ نین، بە پێچەوانەشەوە کەواتە دەبێ ئەگەر مێردەکانیان کۆچیان کرد مارە بکرێنەوە لە یەکتری.

**حەسەن و قەتادە دەبارەی (ژن و مێردێ) هەردووکیان ئاگر پەرست بن و پێکەوە مسوڵمان ببن دەڵێن: ئەوە لەسەر مارە کردنەکەی پێشویان بەردەوام دەبن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان پێش هاوڕێیەکەی مسوڵمان بوو ئەوەی کەیان مسوڵمان نەبوو، لێك جیا بوونەتەوە، وە بۆ پیاوەکە دروست نییە ئافرەتەکە ببێتەوە بە ژنی.**

**ئیبنوجورەیج دەڵێ: بەعەتام وت: ژنێکی بت پەرست هات بۆ لای مسوڵمانان، ئایا مێردەکەی قەرەبووی پێ دەدرێ لەبری ژنەکەی بە بەڵگەی بە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەوەی (مێردەکان) خەرجیان کردوە بیاندەنەوە)؟ عەتا وتی: نەخێر بێگومان ئەوە[1] لە نێوان پێغەمبەر و ﷺ ئەوانەدا بووە پەیمانیان لەگەڵ کراوە (لە گاور و جولەکە). موجاهید دەڵێ: ئەوە هەمووی لە ڕێککەوتنی نێوان پێغەمبەر و ﷺ قوڕەیشدا بووە.**

٥٢٨٨- حَدَّثَنَا ابْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ.وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنِي يُونُسُ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَتِ الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَمْتَحِنُهُنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۝١٠ ﴾ الممتحنة. إِلَى آخِرِ الآيَةِ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ فَقَدْ أَقَرَّ بِالْمِحْنَةِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْطَلِقْنَ فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ». لاَ وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ بَايَعَهُنَّ بِالْكَلاَمِ، وَاللَّهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِمَا أَمَرَهُ اللَّهُ يَقُولُ لَهُنَّ إِذَا أَخَذَ عَلَيْهِنَّ: «قَدْ بَايَعْتُكُنَّ». كَلاَمًا[2].

---

(١) قەرەبوو بدرێتەوە بە مێردی ژنە کۆچەرەکان.

(٢) بڕوانە: ٢٧١٣.

٥٢٨٨- عورەوەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئافرەتانی باوەڕدار کاتێ کۆچیان بکردایە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند تاقی دەکرنەوە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن بۆ لاتان بەکۆچکەری تاقییان بکەنەوە) تا کۆتایی ئایەتەکە، عائیشە ﷺ دەڵێ: جا هەرکام لە ئافرەتانی باوەڕدار دانی بنایە بەو مەرجەدا ئەو دانی ناوە بە تاقی کردنەوەکەدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە وتەیان دانیان بنایە بەو مەرجەدا، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو پێیان: ((بڕۆن ئەی ژنان بێگومان پەیمانم لێ وەرگرتن))، نا سوێند بە خوا هەرگیز دەستی پێغەمبەر ﷺ بەر دەستی ژنێك نەکەوتووە جگە لەوەی بە قسە پەیمانی لێ وەردەگرتن، وە سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەری نەگرت لە ئافرەتان جگە لەوەی فەرمانی پێکرد کە پەیمانی لە ژنان وەردەگرت بفەرمووێ پێیان: ((بەڕاستی پەیمانم لێ وەرگرتن)) بە وتە، (بێ ئەوەی دەست بخاتە ناو دەستیانەوە).

## ٢١- بابُ قَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ﴿٢٢٦﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ ﴿ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ ﴾ البقرة. ﴿ فَإِن فَآءُو ﴿٢٢٦﴾ ﴾ البقرة: رَجَعُوا.

## ٢١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بۆ ئەوانەی سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان دروست نەبن مۆڵەتی چوار مانگ چاوەڕوانیان هەیە)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە ( (خوا) بیسەر و زانایە) ﴿ فَإِن فَآءُو ﴿٢٢٦﴾ ﴾ ئەگەر گەڕانەوە پەشیمان بوونەوە.

٥٢٨٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنْ أَخِيهِ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: آلَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ، وَكَانَتِ انْفَكَّتْ رِجْلُهُ، فَأَقَامَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، ثُمَّ نَزَلَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، آلَيْتَ شَهْرًا. فَقَالَ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»[1].

**٥٢٨٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد (مانگێك) لەگەڵ ژنەکانی دروست نەبێت، لەو کاتەدا قاچی[2] لە جێ چوو بوو، بۆیە لە ژوورێکی خۆی بیست و نۆ ڕۆژ دانیشت و مایەوە پاشان دابەزی، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندت خوارد مانگێك لەگەڵ ژنەکانت دروست نەبیت، فەرمووی: ((ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە)).**

٥٢٩٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي الإِيلاَءِ الَّذِي سَمَّى اللَّهُ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدَ الأَجَلِ إِلاَّ أَنْ يُمْسِكَ بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يَعْزِمَ بِالطَّلاَقِ، كَمَا أَمَرَ اللَّهُ ﷻ.

**٥٢٩٠- نافیع دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عومەر ﷺ دەربارەی ئەو ئیلائەی خوا (لە قورئاندا) باسی کردوە دەیوت: پاش تەواو بوونی کاتەکەی بۆکەس دروست نییە مەگەر بە باشی ژنەکە بهێڵێتەوە[3]، یان بڕیاری تەڵاق و جیابوونەوە بدات بەو شێوەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە.**

٥٢٩١ - وَقَالَ لِي إِسْمَاعِيلُ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ إِذَا مَضَتْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ يُوقَفُ حَتَّى يُطَلِّقَ، وَلاَ يَقَعُ عَلَيْهِ الطَّلاَقُ حَتَّى يُطَلِّقَ. وَيُذْكَرُ ذَلِكَ عَنْ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ وَعَائِشَةَ وَاثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ.

---

(١) بڕوانە: ٣٧٨.

(٢) لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: (لاقی).

(٣) ژیانی ژن و مێردایەتی لەگەڵدا بکات دەست بگرێ پێیەوە.

**٥٢٩١- نافیع له ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوه دەڵێ: ئەگەر چوار ڕۆژ (بەسەر ئیلاکەیدا) تێپەڕی ڕادەگیرێ تا تەڵاقی دەدا، (یان دەگەڕێتەوەو پەشیمان دەبێتەوه)، وه تەڵاقیشی ناکەوێ هەتا (ژنەکەی) تەڵاق نەدات، وه ئەم ڕاگرتنه گێڕدراوەتەوه له عوسمان و عەلی و ئەبی دەرداو و عائیشه و دوازده پیاو ﷺ له هاوەڵانی پێغەمبەروه ﷺ.**

## ٢٢- بابُ حُكْمِ الْمَفْقُودِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ

وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: إِذَا فُقِدَ فِي الصَّفِّ عِنْدَ الْقِتَالِ تَرَبَّصُ امْرَأَتُهُ سَنَةً. وَاشْتَرَى ابْنُ مَسْعُودٍ جَارِيَةً وَالْتَمَسَ صَاحِبَهَا سَنَةً فَلَمْ يَجِدْهُ وَفُقِدَ، فَأَخَذَ يُعْطِي الدِّرْهَمَ وَالدِّرْهَمَيْنِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ عَنْ فُلَانٍ وَعَلَيَّ. وَقَالَ هَكَذَا فَافْعَلُوا بِاللُّقَطَةِ.

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِي الأَسِيرِ يُعْلَمُ مَكَانُهُ: لاَ تَتَزَوَّجُ امْرَأَتُهُ، وَلاَ يُقْسَمُ مَالُهُ، فَإِذَا انْقَطَعَ خَبَرُهُ فَسُنَّتُهُ سُنَّةُ الْمَفْقُودِ.

## ٢٢- باسی حوکمی ون بوو و بێ سەر و شوێن[١] دەربارەی خێزانی و سامانی

**ئیبنو موسەییەب دەڵێ: ئەگەر پیاو له ڕیزی جەنگدا ون بێت ژنەکەی ساڵێك چاوەڕوانی دەکات[٢].**

**ئیبنو مەسعوود ﷺ کەنیزەکێکی[٣] کڕی، ساڵێك به شوێن خاوەنی کەنیزەکەکەدا گەڕاو نەیدۆزییەوه، جا دەستی کرد به بەخشینی درهەمێك و دوو درهەم و دەیوت: خوایه ئەمه له باتی فلان کەس (ئەگەر پەیدا بوو ئەوه) لەسەر خۆمه[٤]، وه وتی: ماڵی دۆزراوه ئاوەهای لێ بکەن.**

---

(١) پیاوێک بێ سەر و شوێن بێت یان ئاژەڵێک ون بێت.

(٢) دوا ئەوه عیدده دەژمێرێ شوو دەکات.

(٣) ونبووی و بێ خاوەنی کڕی، واته: کردییه ماڵ لەسەر خۆی به نرخێک.

(٤) پارەکەی دەدەمەوه.

**وە زوهری دەربارەی دیل کە جێگاکەی بزانرێت دەڵێ: ژنەکەی شوو ناکات و ماڵەکەی دابەش ناکرێت، بەڵام ئەگەر دەنگو باسی نەما ئەوە حوکم و ڕێی و شوێنی وەك حوکم و ڕێی و شوێنی بێسەر و شوێنە.**

٥٢٩٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ- أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الْغَنَمِ، فَقَالَ: «خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ». وَسُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الإِبِلِ، فَغَضِبَ وَاحْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ، وَقَالَ: «مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا الْحِذَاءُ وَالسِّقَاءُ، تَشْرَبُ الْمَاءَ، وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا». وَسُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، وَعَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ مَنْ يَعْرِفُهَا، وَإِلاَّ فَاخْلِطْهَا بِمَالِكَ». قَالَ سُفْيَانُ: فَلَقِيتُ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ -قَالَ سُفْيَانُ وَلَمْ أَحْفَظْ عَنْهُ شَيْئًا غَيْرَ هَذَا- فَقُلْتُ: أَرَأَيْتَ حَدِيثَ يَزِيدَ مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ فِي أَمْرِ الضَّالَّةِ، هُوَ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ؟ قَالَ نَعَمْ. قَالَ يَحْيَى: وَيَقُولُ رَبِيعَةُ: عَنْ يَزِيدَ مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ. قَالَ سُفْيَانُ: فَلَقِيتُ رَبِيعَةَ فَقُلْتُ لَهُ[١].

**٥٢٩٢- سوفیان لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەگێڕێتەوە لە یەزیدەوە -کە ئازادکراوی مونبەعیسە- دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی مەڕی ونبوو، ئەویش فەرمووی: ((بیبەرەوە چونکە بێگومان ئەو مەڕە بۆ تۆیە یا بۆ براکەتە یا بۆ گورگە))، وە پرسیاری لێ کرا دەربارەی وشتری ونبوو، پێغەمبەر ﷺ (ئەوەندە) توڕە بوو هەردوو کوڵمی سور بوویەوە و فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە؟ پێڵاوی خۆی و جەوەنە ئاوی خۆیی پێیە خۆی ئاو دەخواتەوە و گەڵای درەخت دەخوات (وازی لێ بێنە) هەتا خاوەنەکەی پێی دەگات[٢]))، وە پرسیاری لێ کرا دەربارەی شتی ونبوو پێغەمبەر ﷺ**

(١) بڕوانە: ٩١.
(٢) دەیدۆزێتەوە.

فەرمووی: ((بزانە زار بێن[1] و تورەكەی چۆنە، وە ساڵێك جاڕی بۆ بدە، جا ئەگەر كەسێك هات ناونیشانەكانی بزانێ (بیدەرەوە)، ئەگەر نا ئەوە تێكەڵاوی ماڵی خۆت بكە)).

سوفیان دەڵێ: ئینجا گەیشتم بە ڕەبیعەی كوڕی عەبدوڕەحمان - سوفیان دەڵێ: جگە لەم فەرموودەیە هیچم لێ نەبیستووە - پێم وت: هەواڵم بدەرێ دەربارەی فەرموودەكەی یەزیدی ئازادكراوی مونبەعیس دەربارەی ئاژەڵی ون بوو، ئایا لە یەزیدی كوڕی خالیدەوەیە؟ وتی: بەڵێ، یەحیا وتی: ڕەبیعە دەڵێ: لە یەزیدی ئازاد كراوی مونبەعیس لە زەیدی كوڕی خالیدەوە، سوفیان وتی: بە ڕەبیعە گەشتم و ئەوەم پێ وت.

## ٢٣- بابُ الظِّهَارِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا ﴿١﴾﴾ إِلَى قَوْلِهِ ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ﴿٤﴾﴾ المجادلة. وَقَالَ لِي إِسْمَاعِيلُ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ، عَنْ ظِهَارِ الْعَبْدِ، فَقَالَ: نَحْوَ ظِهَارِ الْحُرِّ. وقَالَ مَالِكٌ: وَصِيَامُ الْعَبْدِ شَهْرَانِ. وَقَالَ الْحَسَنُ بْنُ الْحُرِّ: ظِهَارُ الْحُرِّ وَالْعَبْدِ مِنَ الْحُرَّةِ وَالأَمَةِ سَوَاءٌ. وَقَالَ عِكْرِمَةُ: إِنْ ظَاهَرَ مِنْ أَمَتِهِ فَلَيْسَ بِشَيْءٍ، إِنَّمَا الظِّهَارُ مِنَ النِّسَاءِ،، وَفِي الْعَرَبِيَّةِ لِمَا قَالُوا أَيْ فِيمَا قَالُوا، وَفِي بَعْضِ مَا قَالُوا، وَهَذَا أَوْلَى؛ لأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَدُلَّ عَلَى الْمُنْكَرِ وَقَوْلِ الزُّورِ.

## ٢٣- باسی زیهار

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڕاستی خوا وتەی ئەو ژنەی بیست كە لە بارەی مێردەكەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەكردی)، تا ئەم فەرمایشتەی

(١) زاربێن: ئەوە پەتەیە دەمی تورەكەكەی پێ بەستراوە.

**خوای گەورە: (ئەگەر یەكێك نەیتوانی (دوو مانگ بەڕۆژوو بێت)، ئەوا با نانی شەست هەژار بدات)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ) ئیسماعیل پێی وتم: مالیك بۆی گێڕامەوە كە خۆی پرسیاری لە ئیبنو شیهاب كردوە دەربارەی زیهاری كۆیلە، ئیبنو شیهاب وتی: وەك زیهاری كەسێكی ئازاد وایە، مالیكیش دەڵێ: ڕۆژووی كۆیلەش دوو مانگە[1].**

**حەسەنی كوڕی حوڕ دەڵێ: زیهار كردنی[2] كەسێكی ئازاد و كۆیلەیەك لە ژنێكی ئازاد و كەنیزەك یەكسانە[3].**

**عیكریمە دەڵێ: ئەگەر پیاوێكی ئازاد زیهاری كرد لەگەڵ كەنیزەی خۆیدا ئەو هیچ نییە[4]، بێگومان زیهاری پیاوی ئازاد لەگەڵ ژنی ئازاد دەكرێ[5]، وە لە زمانی عەرەبیدا: (لِمَا قَالُوا) واتە: (فِيمَا قَالُوا)[6] وە لە هەندێ ڕیوایەتی بوخاریدا (مَا قَالُوا )[7] گێڕدراوەتەوە، ئەوە ڕاستر و لە پێشترە ((لِمَا قَالُوا) لە جیاتی (فِيمَا قَالُوا) بێت) چونكە خوا خراپە و شایەتی درۆ نیشانی خەڵك نادات[8].**

## ٢٤- بَابُ الإِشَارَةِ فِي الطَّلاَقِ وَالأُمُورِ

وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يُعَذِّبُ اللَّهُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا». فَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ[9]. وَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: أَشَارَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيَّ أَيْ خُذِ النِّصْفَ[10]. وَقَالَتْ أَسْمَاءُ: صَلَّى

---

(١) واتە: ڕۆژوەكەشی وەک ڕۆژوو گرتنی كەسێكی ئازاد وایە.

(٢) زیهار: ئەوەی پیاو بە ژنی خۆی بڵێ تۆ بۆ من وەک پشتی دایكە وایت، یان بچوێنێت بە دایكی یان هەر ئافرەتێكی مەحرەمی خۆی.

(٣) واتە: جیاوازیان نییە.

(٤) بە زیهار دادەنرێت.

(٥) بەڵام كەنیزەک ژن نییە كەنیزەكە.

(٦) مەبەستی پێ (لام) لە شوێنی پیتی (فا) بەكار هاتووە.

(٧) پیتی لامی پێوە نییە.

(٨) ئەگەر بەو شێوەیە وتمان تەفسیر نەكرێ وای لێ دێ.

(٩) بڕوانە: ١٣٠٤.

(١٠) بڕوانە: ٤٥٧.

النَّبِيُّ ﷺ فِي الْكُسُوفِ، فَقُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا شَأْنُ النَّاسِ؟ وَهْيَ تُصَلِّي، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا إِلَى الشَّمْسِ، فَقُلْتُ آيَةٌ؟ فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ نَعَمْ[1]. وَقَالَ أَنَسٌ: أَوْمَأَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ يَتَقَدَّمَ[2].

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَوْمَأَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ: لاَ حَرَجَ[3]. وَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ: «آحَدٌ مِنْكُمْ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا أَوْ أَشَارَ إِلَيْهَا؟». قَالُوا: لاَ. قَالَ: «فَكُلُوا»[4].

## ٢٤- باسی ئاماژ لە تەڵاق و کار و بارەکاندا

**ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا بە فرمێسکی چاو سزا (ی کەس) نادات، بەڵام بەمە سزا دەدات)) جا (پێغەمبەر ﷺ) ئاماژەی کرد بۆ زمانی خۆی.**

**کەعبی کوڕی مالیك ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردم، واتە: نیوەی وەرگرە[5].**

**ئەسما ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەخۆرگیراندا نوێژی کرد، منیش وتم بە عائیشە لە کاتێکدا لە نوێژەکەدا بوو خەڵك چییانە؟ عائیشە ﷺ بەسەری ئاماژەی بۆ خۆر کرد منیش وتم: نیشانەیەکە[6]؟ بەسەری ئاماژەی کرد بەڵێ.**

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئەبو بەکر ﷺ کە پێشکەوێت[7]. ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد زیانی نییە[1].**

---

(١) بڕوانە: ٨٦.
(٢) بڕوانە: ٦٨٠.
(٣) بڕوانە: ٨٤.
(٤) بڕوانە: ١٨٢١.
(٥) کەعب دەڵێ: قەرزێکم لای ئەبی حەدرە بوو، واتە ئاماژەکە بۆ وەرگرتنی نیوەی قەرزەکەیە.
(٦) خوا بەندەکانی پێ دەسپێرێت.
(٧) بۆ پێشنوێژی کردنی موسوڵمانان، بڕوانە فەرموودەی: (٦٨١) بوخاری.

**ئەبو قەتادە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕوا کردنی کەسێك لە ئیحرامدا بێت فەرمووی: ((کەسێکتان پێ وت پەلاماری بدات یان ئاماژەی بۆ کرد؟)) وتیان: نەخێر، فەرمووی: ((کەواتە بیخۆن)).**[1]

٥٢٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى بَعِيرِهِ، وَكَانَ كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ، وَكَبَّرَ[2].
وَقَالَتْ زَيْنَبُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فُتِحَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ». وَعَقَدَ تِسْعِينَ[3].

**٥٢٩٣- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە سواری وشترەکەیەوە تەوافی کرد، هەرکاتێ دەگەیشتە لای سوچەکە (ی بەردە ڕەشەکەی تیایە) ئاماژەی بۆ ئەکرد[4] و ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد.**
**زەینەب ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمڕۆ لەبەر بەستەکەی یەئجوج و مەئجوج ئەوەندەی ئەمەی لێ کوون کراوە))، بە پەنجەکانی بەئاماژەی نەوەدی دروست کرد[5].**

٥٢٩٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ عَلْقَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي، فَسَأَلَ اللَّهَ خَيْرًا، إِلاَّ أَعْطَاهُ». وَقَالَ بِيَدِهِ، وَوَضَعَ أَنْمُلَتَهُ عَلَى بَطْنِ الْوُسْطَى وَالْخِنْصَرِ. قُلْنَا: يُزَهِّدُهَا[6].

---

(١) سەیری فەرموودەی: (٨٤٠) بوخاری بکە.
(٢) بروانە: ١٦٠٧.
(٣) بروانە: ٣٣٤٦.
(٤) بە گۆچانەکەی کە بە دەستیەوە بوو.
(٥) بە پەنجە ژمارە دروست کردن جۆرێکە لە ئاماژە.
(٦) بروانە: ٩٣٥.

**٥٢٩٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبو لقاسیم ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی هەینیدا سەعاتێك هەیە هەر مسوڵمانێك بە پێوە بێت نوێژ بكات و داوا لە خوا بكات خوا (ئەوەی داوای كات) پێی دەبەخشێت))، بە دەستی وای كرد پەنجە گەورە خستە سەر پەنجەی ناوەڕاست و بەنجە بچووكی، وتمان كاتەكەی بە كەم دانا[1].**

٥٢٩٥ - وَقَالَ الأُوَيْسِيُّ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ شُعْبَةَ بْنِ الْحَجَّاجِ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: عَدَا يَهُودِيٌّ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى جَارِيَةٍ، فَأَخَذَ أَوْضَاحًا كَانَتْ عَلَيْهَا وَرَضَخَ رَأْسَهَا، فَأَتَى بِهَا أَهْلُهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْيَ فِي آخِرِ رَمَقٍ، وَقَدْ أُصْمِتَتْ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ قَتَلَكِ؟ فُلاَنٌ». لِغَيْرِ الَّذِى قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ لاَ، قَالَ: فَقَالَ لِرَجُلٍ آخَرَ غَيْرِ الَّذِى قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ أَنْ لاَ، فَقَالَ: «فَفُلاَنٌ». لِقَاتِلِهَا فَأَشَارَتْ أَنْ نَعَمْ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ[2].

**٥٢٩٥- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ وتی: كابرایەكی جولەكە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هێرشی كردە سەر كچێك و هەندێ خشڵی زیوی پێوە بوو بوو بردی وسەری شكاند بوو، جا كەس و كارەكەی[3] هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا بە حاڵ گیانی تیا مابوو لە قسە كەوتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((كێ تۆی كوشت؟ فلان كەس بوو؟)) ناوی كەسێكی دەبرد كە بكوژەكە نەبوو بە سەری ئاماژەی كرد نەخێر ئەو نەبووە، ناوی پیاوێكی تری فەرموو جگە لەوەی كە كوشتبووی هەر بە سەری ئاماژەی كرد نەخێر ئەو نەبووە، فەرمووی: ((ئەی فلان كەس بوو)) ناوی بكوژەكەی هێنا، كچەكە بەسەری ئاماژەی كرد كە بەڵێ ئەو بووە، ئەوسا پێغەمبەری خوا**

(١) واتە: ئەو كاتەی داوای تێدا گیرا دەبێت لە ڕۆژی هەینیدا كاتێكی كەمە.
(٢) بڕوانە: ٢٤١٣.
(٣) كەس و كاری كچەكە.

**ﷺ فەرمانی کرد سەری جولەکەکەیان خستە نێوان دوو بەردەوە (کوشتیان بەو جۆرەی کچەکەی کوشتبوو).**

٥٢٩٦- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْفِتْنَةُ مِنْ هَا هُنَا». وَأَشَارَ إِلَى الْمَشْرِقِ[١].

**٥٢٩٦- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئاژاوە و فیتنە لەوێوەیە))، ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد.**

٥٢٩٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قَالَ لِرَجُلٍ: «انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَمْسَيْتَ. ثُمَّ قَالَ: «انْزِلْ فَاجْدَحْ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَمْسَيْتَ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. ثُمَّ قَالَ: «انْزِلْ فَاجْدَحْ». فَنَزَلَ فَجَدَحَ لَهُ فِي الثَّالِثَةِ، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ فَقَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ اللَّيْلَ قَدْ أَقْبَلَ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ»[٢].

**٥٢٩٧- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، جا کاتێ خۆر ئاوا بوو بە پیاوێکی[٣] فەرمووی: ((دابەزە خواردنم بۆ ئامادە بکە))[٤]، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا با ئێوارەت بەسەردا بێت، لە پاشان فەرمووی: ((دابەزە خواردنم بۆ ئامادە بکە)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا با ئێوارەت بەسەردا بێت هێشتا ڕۆژەکەت ماویەتی،**

---

(١) بڕوانە: ٣١٠٤.

(٢) بڕوانە: ١٩٤١.

(٣) کە بیلالی حەبەشی بوو.

(٤) (فاجدح) خواردنم بۆ دروست بکە: بریتییە لە ئاردی گەنم یا جۆ لەگەڵ ئاو یا ڕۆن تێکەڵ دەکرێت و لەسەر ئاگر لێدەنرێت.

**پاشان فەرمووی: دابەزە و خواردن ئامادە بکە))، ئیتر لە جاری سێیەمدا دابەزی و خواردنی بۆ ئامادە کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ خواردیەوە و بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ لای خۆرهەڵاتەوە و فەرمووی: ((ئەگەر شەوتان بینی ئا لەوێوە داهات ئەوە بێگومان ڕۆژوەوان ڕۆژوو دەشکێنێت)).**

٥٢٩٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ نِدَاءُ بِلاَلٍ -أَوْ قَالَ: أَذَانُهُ- مِنْ سَحُورِهِ، فَإِنَّمَا يُنَادِي -أَوْ قَالَ يُؤَذِّنُ- لِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ، وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ». كَأَنَّهُ يَعْنِي: الصُّبْحَ أَوِ الْفَجْرَ، وَأَظْهَرَ يَزِيدُ يَدَيْهِ ثُمَّ مَدَّ إِحْدَاهُمَا مِنَ الأُخْرَى[1].

**٥٢٩٨- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با بانگ وتنی بیلال - یان بانگدانی ئەو - ڕێگری کەستان نەکات لە پارشێو کردن، چونکە بەڕاستی ئەو لە شەودا بانگ دەدات - یان بانگ دەڵێ - تا شەونوێژ گەرتان بگەڕێتەوە (سەر خەوێ بشکێنێ)، بۆ ئەوە نییە بڵێ)) وەك مەبەستی ئەوە بێ: نوێژی بەیانی یا سپێدە بووە، وە یەزید هەر دوو دەستی (بۆسەرەوە) بەرز کردەوە [2]، لە پاشان یەکێکیان لەوی تریان درێژتر کرد [3].**

٥٢٩٩- وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْبَخِيلِ وَالْمُنْفِقِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ، مِنْ لَدُنْ ثَدْيَيْهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَأَمَّا الْمُنْفِقُ فَلاَ يُنْفِقُ شَيْئًا إِلاَّ مَادَّتْ عَلَى جِلْدِهِ حَتَّى تُجِنَّ بَنَانَهُ وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَأَمَّا الْبَخِيلُ فَلاَ يُرِيدُ يُنْفِقُ إِلاَّ لَزِمَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَوْضِعَهَا، فَهْوَ يُوسِعُهَا فَلاَ تَتَّسِعُ». وَيُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ إِلَى حَلْقِهِ[4].

---

(١) بڕوانە: ٦٢١.

(٢) مەبەست سپێدەی درۆزنە.

(٣) مەبەست سپێدەی ڕاستە.

(٤) بڕوانە: ١٤٤٣.

٥٢٩٩- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی کەسی ڕەزیل و بەخشندە وەك دوو پیاو وان کە هەردووکیان دوو زرێی ئاسنیان لەبەردا بێت لە مەمکیانەوە بێت تا ددانەی سنگیان، ئینجا بە خشندەکەیان هەر شتێك دەبەخشێت زرێکە کێشی دێت بەسەر پێستیدا، تا (وای لێ دێ) پەنجەکانی پێ دادەپۆشێت شوێن پێی (خاوەنەکەی) دەسڕێتەوە، بەڵام ڕەزیل و ڕژدە هەر کە ویستی ماڵی ببەخشێ هەموو هەڵقەیەکی زریەیەك دەلکێت بە شوێنی خۆیەوە، جا ڕەزیلەکە هەر هەوڵی دەدات فراوانی بکات بەڵام زرێکە فراوان نابێت))، بە دەستی ئاماژەی بۆ گەرووی دەکرد.

## ٢٥- بابُ اللِّعَانِ

وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ ﴿٦﴾ ﴾ النور، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور. فَإِذَا قَذَفَ الأَخْرَسُ امْرَأَتَهُ بِكِتَابَةٍ أَوْ إِشَارَةٍ أَوْ بِإِيمَاءٍ مَعْرُوفٍ، فَهْوَ كَالْمُتَكَلِّمِ؛ لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَجَازَ الإِشَارَةَ فِي الْفَرَائِضِ، وَهْوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ الْحِجَازِ وَأَهْلِ الْعِلْمِ، وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ ﴾ مريم. وَقَالَ الضَّحَّاكُ: ﴿ إِلَّا رَمۡزٗاۗ ﴿٤١﴾ ﴾ آل عمران، إِشَارَةً. وَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: لاَ حَدَّ وَلاَ لِعَانَ. ثُمَّ زَعَمَ أَنَّ الطَّلاَقَ بِكِتَابٍ أَوْ إِشَارَةٍ أَوْ إِيمَاءٍ جَائِزٌ، وَلَيْسَ بَيْنَ الطَّلاَقِ وَالْقَذْفِ فَرْقٌ، فَإِنْ قَالَ: الْقَذْفُ لاَ يَكُونُ إِلاَّ بِكَلاَمٍ. قِيلَ لَهُ: كَذَلِكَ الطَّلاَقُ لاَ يَجُوزُ إِلاَّ بِكَلاَمٍ، وَإِلاَّ بَطَلَ الطَّلاَقُ وَالْقَذْفُ، وَكَذَلِكَ الْعِتْقُ، وَكَذَلِكَ الأَصَمُّ يُلاَعِنُ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ وَقَتَادَةُ: إِذَا قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ. فَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ، تَبِينُ مِنْهُ بِإِشَارَتِهِ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: الأَخْرَسُ إِذَا كَتَبَ الطَّلاَقَ بِيَدِهِ لَزِمَهُ. وَقَالَ حَمَّادٌ: الأَخْرَسُ وَالأَصَمُّ إِنْ قَالَ بِرَأْسِهِ جَازَ.

# ٢٥- باسی نەفرین کردن

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەو (پیاوانەی) بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن وە بێجگە لە خۆیان هیچ شایەتێکیان نییە)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (ئەگەر مێردەکەی لەڕاست گۆیان بێت)، جا ئەگەر پیاوێکی لاڵ بە نووسین یا ئاماژە یا هێمایەك (سەری جوڵاند) ژنەکەی تاوانبار کرد بە زینا کردن، ئەوە وەك قسەکەر وایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە بێگومان لە میرات دابەشکردندا کاری بە ئاماژەی کردووە، هەروەها ئەوە وتەی خەڵکی حیجاز و زانایانە، وە خوای گەورەش دەفەرمووی: (جا (مەریەم) ئاماژەی بۆ (منداڵە) کرد، (خزمەکانی) وتیان: چۆن قسە بکەین لەگەڵ منداڵێکدا کە لە بێشکەدایە؟).

زەححاك دەڵێ: ﴿إِلَّا رَمْزًا ﴿٤١﴾﴾ واتە: ئاماژەیەك، وە هەندێ کەس[1] دەڵێن: نە سزا (ی زینا) نە نەفرین کردن (بە ئاماژەی لاڵ) ناچەسپێ، پاشان دەڵێ: بێگومان تەڵاق بە نووسین و ئاماژە و هێما دروستە، وە لە نێوان تەڵاق و تاوانبارکردن بە زینا جیاوازی نییە. جا ئەگەر (کەسێك) بڵێ: تاوانبارکردن بەزینا هەر بە وتە دەبێت، پێی دەوترێت: تەڵاقدانیش هەر بە وتە دەبێت، ئەگەرنا تەڵاقدان و تاوانبارکردن بەزینا پوچەڵ دەبنەوە، هەروەها ئازاد کردنی کۆیلەش، هەروەها کەڕیش نەفرین دەکات (بە ئاماژە بۆی بکرێت و لێی تێبگات).

- شەعبی و قەتادە دەڵێن: ئەگەر پیاوێ وتی بە ژنەکەی: تۆ تەڵاقدراوی، ئەنجا بە پەنجەکانی ئاماژەی کرد بە ئاماژەکەی ژنەکەی لێی جیا دەبێتەوە. ئیبراهیم دەڵێ: ئەگەر لاڵ بە دەستی خۆی تەڵاق بنوسێت دەبێتە ماڵ لەسەری (و دەکەوێت). حەمماد دەڵێ: لاڵ و کەڕ بەسەر ئاماژە شتێکی وت دروستە.

---

(١) لە زانایان.

٥٣٠٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ دُورِ الأَنْصَارِ؟». قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «بَنُو النَّجَّارِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ بَنُو سَاعِدَةَ». ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ، فَقَبَضَ أَصَابِعَهُ، ثُمَّ بَسَطَهُنَّ كَالرَّامِي بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ: «وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ»[1].

**٥٣٠٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە چاكترین ماڵی ئەنصاری؟)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((بەنو نەجار پاشان ئەوانەی دوا ئەوان دێن بەنو عەبدولئەشهەل پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن بەنولحاریسی كوڕی خەزرەج، پاشان پەنجەكانی كردەوە وەك ئەوەی شتێك لە دەست دا بێت و فڕێی دات، پاشان فەرمووی: ((وە لە هەموو ماڵێكی ئەنصاریدا خێر و چاكە هەیە)).**

٥٣٠١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: سَمِعْتُهُ مِنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ -صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَذِهِ مِنْ هَذِهِ أَوْ كَهَاتَيْنِ». وَقَرَنَ بَيْنَ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى[2].

**٥٣٠١- ئەبو حازیم دەڵێ: لە سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدیم ﷺ بیست -كە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ - دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من و ڕۆژی دوایی وەكو ئەمە و ئەمە نێردراوین)) یان ((وەك ئەم دووانە))، پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاستی خستە پاڵ یەكتری.**

(١) بروانە: ٣٧٨٩.
(٢) بروانە: ٤٩٣٦.

٥٣٠٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ، سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». يَعْنِي: ثَلاَثِينَ، ثُمَّ قَالَ: «وَهَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». يَعْنِي: تِسْعًا وَعِشْرِينَ، يَقُولُ مَرَّةً: ثَلاَثِينَ، وَمَرَّةً: تِسْعًا وَعِشْرِينَ[1].

**٥٣٠٢- جەبەلەی کوڕی سوحەیم دەڵێ: لە ئیبنو عومەرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مانگ ئاوەها و ئاوەها و ئاوەهایە)) واتە: سی ڕۆژ، پاشان فەرمووی: ((وە ئاوەها و ئاوەها و ئاوەهایە)) واتە بیست و نۆ (ڕۆژ)، جارێك دەیفەرموو: سی و جارێك بیست و نۆ.**

٥٣٠٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: وَأَشَارَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ نَحْوَ الْيَمَنِ: «الإِيمَانُ هَا هُنَا -مَرَّتَيْنِ- أَلاَ وَإِنَّ الْقَسْوَةَ وَغِلَظَ الْقُلُوبِ فِي الْفَدَّادِينَ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ رَبِيعَةَ وَمُضَرَ»[2].

**٥٣٠٣- ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی ئاماژەی کرد ڕوو بەیەمەن و فەرمووی: ((کانگای باوەڕ ئا لەوێوەیە -دوو جار دووبارەی کردەوە- ئاگادار بن بێگومان دڵڕەقی و دڵ ئەستوریش لە ناو دەنگ زلەکاندایە لای خاوەن ڕەوگە وشترەکان، لە شوێنی هەردوو شاخی شەیتان (لەگەڵ خۆردا) هەڵدێت لە هۆزی ڕەبیعە و موزەڕدا)).**

٥٣٠٤- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا». وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئًا[3].

---

(١) بڕوانە: ١٩٠٠.
(٢) بڕوانە: ٣٣٠٢.
(٣) بڕوانە: ٦٠٠٥.

٥٣٠٤- سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاوەهاین))، بە پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی کرد، تۆزێ نێوانی خستن[1].

## ٢٦- بابٌ: إِذَا عَرَّضَ بِنَفْيِ الْوَلَدِ

٥٣٠٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ، لِي غُلاَمٌ أَسْوَدُ. فَقَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا؟». قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: «هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَأَنَّى ذَلِكَ؟». قَالَ: لَعَلَّهُ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَالَ: «فَلَعَلَّ ابْنَكَ هَذَا نَزَعَهُ»[2].

## ٢٦- باسێک: ئەگەر ناڕاستەوخۆ حاشا لە کوڕی خۆی بکات

٥٣٠٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا وشترت هەیە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ڕەنگیان چۆنە؟ )) وتی: سوورن، فەرمووی: ((ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تیایە؟)) وتی: بەڵێ. فەرمووی: ((دەی لە کوێوە هاتووە؟)) وتی: لەوانەیە ڕەگێ لە ڕەگەزیان ڕەنگی وابێ، فەرمووی: ((دەی ئەو کوڕەی تۆش لەوانەیە ڕەگێ بێ (لە باوانیەوە هاتبێ) )).

## ٢٧- بابُ إِحْلاَفِ الْمُلاَعِنِ

٥٣٠٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلُ حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، فَأَحْلَفَهُمَا النَّبِيُّ ﷺ، ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا[3].

---

(١) لە یەکتری جیا کردنەوە و بۆشای خستە نێوانیان.

(٢) بڕوانە: ٦٨٤٧، ٧٣١٤.

(٣) بڕوانە: ٤٧٤٨.

## ٢٧- باسی سوێند دانی نەفرین کەر

٥٣٠٦- نافیع لە عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنصاری ژنەکەی بەزینا تاوانبار کرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەردووکیانی سوێند دا و پاشان لە یەکتری جیا کردنەوە.

## ٢٨- بَابٌ: يَبْدَأُ الرَّجُلُ بِالتَّلاَعُنِ

٥٣٠٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، فَجَاءَ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ[1].

## ٢٨- باسێک: پیاوەکە دەست بە نەفرین کردن دەکات (پێش ژنەکە)

٥٣٠٧- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە هیلالی کوڕی ئومەییە ژنەکەی خۆی تاوانبار کرد بە زینا کردن، جا هات و شایەتیدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی خوا دەزانێ بێگومان یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا یەکێکتان تەوبە دەکەن؟)) پاشان ژنەکەش هەستا و شایەتیدا.

## ٢٩- بَابُ اللِّعَانِ وَمَنْ طَلَّقَ بَعْدَ اللِّعَانِ

٥٣٠٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُوَيْمِرًا الْعَجْلاَنِيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الأَنْصَارِيِّ فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ عَنْ ذَلِكَ.

---

(١) بروانە: ٢٦٧١.

فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ عَاصِمٌ لِعُوَيْمِرٍ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا. فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا. فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَسَطَ النَّاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ أُنْزِلَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا». قَالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ تَلاَعُنِهِمَا قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ سُنَّةَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ[١].

## ٢٩- باسی نەفرین کردن، وە ئەو کەسەی ژنەکەی تەڵاق دەدات پاش نەفرین کردن

**٥٣٠٨- ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە سەهلی کوڕی سەعد ساعیدی ﷺ بۆی گێڕایەوە، کە عوومیمری عەجلانی ﷺ هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدیی ئەنصاری ﷺو پێی وت: ئەی عاصیم، پێم بڵێ پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێت[٢] بیکوژێت ئێوە دەیکوژنەوە یان چی بکات؟ ئەی عاصیم دەربارەی ئەمە پرسیارم بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، عاصیمیش ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو جۆرە باسانەی پێ ناخۆش بوو بە ناشیرینی دانا بوو، (بە جۆرێ) هەتا عاصیم ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبوو بە لایەوە قورس و ناخۆش بوو، جا کاتێ عاصیم گەڕایەوە بۆ لای کەس و**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣.

(٢) زینا بکات لەگەڵ ژنەکەیدا.

کاری، عووەیمیر هات وتی: ئەی عاصیم پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ وتیت؟ عاصیمیش بە عووەیمیری وت: شتێکی چاکی پێ نەوتم، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بابەتی من پرسیارم لێ کرد لە بارەیەوە بەلایەوە ناپەسەند بوو، جاعووەیمیر وتی وڵڵاهی وازناهێنم هەتا لە بارەیەوە پرسیاری لێ نەکەم، ئەوسا عووەیمیر هات هەتا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێ ئایا بیکوژێت دەیکوژنەوە، یان چی بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خودا دەربارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاندووە، دەی بڕۆ هاوسەرەکەت بێنە) سەهل دەڵێ: جا من لەگەڵ خەڵکەکەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین کە هەردووکیان [1] نەفرەتکاریان کرد (بەرانبەر بە یەکتری)، جا کە هەردووکیان لە نەفرەتکارییەکەیان بوونەوە، عووەیمیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ درۆم بۆهەڵبەستووە ئەگەر بیهێڵمەوە لای خۆم[2]، بۆیە سێ تەلاقەی دا پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ فەرمانی پێ بکات). ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیتر ئەوە بوویە باو و نەریتی نەفرەتکاری ژن و مێرد.

## ٣٠- بَاب التَّلَاعُنِ فِي الْمَسْجِدِ

٥٣٠٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ عَنِ الْمُلَاعَنَةِ وَعَنِ السُّنَّةِ فِيهَا، عَنْ حَدِيثِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَخِي بَنِي سَاعِدَةَ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً،

---

(١) خۆی و ژنەکەی.

(٢) ئەگەر بە ژنی خۆمی بزانم لەگەڵیدا بژیم لام بمێنێتەوە.

أَيَقْتُلُهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي شَأْنِهِ مَا ذَكَرَ فِي الْقُرْآنِ مِنْ أَمْرِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ قَضَى اللَّهُ فِيكَ وَفِي امْرَأَتِكَ». قَالَ: فَتَلاَعَنَا فِي الْمَسْجِدِ وَأَنَا شَاهِدٌ، فَلَمَّا فَرَغَا قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ فَرَغَا مِنَ التَّلاَعُنِ، فَفَارَقَهَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «ذَاكَ تَفْرِيقٌ بَيْنَ كُلِّ مُتَلاَعِنَيْنِ».
قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتِ السُّنَّةُ بَعْدَهُمَا أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، وَكَانَتْ حَامِلاً، وَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى لأُمِّهِ، قَالَ: ثُمَّ جَرَتِ السُّنَّةُ فِي مِيرَاثِهَا أَنَّهَا تَرِثُهُ وَيَرِثُ مِنْهَا مَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ. قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنْ جَاءَتْ بِهِ أَحْمَرَ قَصِيرًا كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ فَلاَ أُرَاهَا إِلاَّ قَدْ صَدَقَتْ وَكَذَبَ عَلَيْهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْوَدَ أَعْيَنَ ذَا أَلْيَتَيْنِ، فَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا». فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى الْمَكْرُوهِ مِنْ ذَلِكَ[1].

## ٣٠- باسی نەفرین کردن لە مزگەوتدا

**٥٣٠٩- ئیبنوجورەیج دەڵێ: ئیبنو شیهاب دەربارەی نەفرین کردن سوننەت و باوی چۆنە بۆی گێڕامەوە، لە فەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعد -کە بەنی ساعیدەیە ﷺ گێڕایەوە کە پیاوێکی ئەنصاری هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێك ببینێ (زینا بکات)، ئایابیکوژێ یان چی بکات؟ ئیتر خواش لە بارەیەوە ئەوەی لە قورئاندا باس کراوە بابەتی نەفرین کردنی ژن و مێردی دابەزاند، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا لە باری تۆ و ژنەکەتەوە بڕیاری داوە))، (سەهل) وتی: ئیتر پیاو و ژنەکە هەردووکیان نەفرینیان بەرانبەر یەکتر کرد لە مزگەوتدا منیش ئامادە بووم، جا کە تەواو بوون پیاوەکە وتی: ئەی**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣.

پێغەمبەری خوا درۆم بۆهەڵبەستووە دەستی پێوە بگرم [١]، ئینجا کاتێ نەفرین کردنەکە تەواو بوون سێ تەڵاقەیدا پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ بکات، جا لای پێغەمبەردا ﷺ لێی جیا بوویەوە، ئینجا (سەهل یا ئیبنو شیهاب) وتی: ئەوە (نەریتی) جیابوونەوە بوو لە نێوان هەموو نەفرین کەرێکی پیاو و ژندا.

ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیتر لە دوای ئەو دوانە سوننەت وا بوو کە هەردوو نەفرین کەرەکە لە یەکتر جیاکرێنەوە، ژنەکە سکی پڕ بوو (کە منداڵەکەی بوو)، کوڕی ژنەکە بەناوی داکیەوە بانگ دەکرا (ئیبنو جورەیج) دەڵێ: لە پاشان سوننەت و نەریت دەربارەی میراتی ژنەکە وابوو ژنەکە میراتی لە کوڕەکەی دەبات و کوڕەکەش میرات لە ژنەکە (دایکی) دەبات، ئەوەی خوا بۆ کوڕی دانابوو لە میرات.

ئیبنو جورەیج لە ئیبنو شیهابەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە دەربارەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر منداڵەکەی بوو سوورێکی کورتە باڵابوو وەکو شەوگەرد بوو، ئەوە گومانم وایە ژنەکە ڕاستی کردوە پیاوەکە درۆی بۆ هەڵبەست، بەڵام ئەگەر منداڵەکەی بوو چاوەکانی گەورە و ڕەش بوون هەردوو سمتی گەورە بوون، ئەوە گومانم وایە پیاوەکە ڕاستی کرد لەوەی پێ وت)). ئینجا کە بووی لەو شێوەیان بوو کە ناخۆشە [٢].

---

(١) وەک ژنی خۆم لام بمێنێتەوە.

(٢) مێردەکەی ڕاستی کرد زینای کردبوو منداڵەکە لەو پیاوە دەچوو تاوانبار کرا بە زینا کردن لەگەڵ ژنەکە.

## ٣١- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ رَاجِمًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ»

٥٣١٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ ذُكِرَ التَّلاَعُنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ يَشْكُو إِلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، فَقَالَ عَاصِمٌ: مَا ابْتُلِيتُ بِهَذَا إِلاَّ لِقَوْلِي، فَذَهَبَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِى وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ -وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَرًّا قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبْطَ الشَّعَرِ، وَكَانَ الَّذِي ادَّعَى عَلَيْهِ أَنَّهُ وَجَدَهُ عِنْدَ أَهْلِهِ خَدْلاً آدَمَ كَثِيرَ اللَّحْمِ- فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ». فَجَاءَتْ شَبِيهًا بِالرَّجُلِ الَّذِى ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَهُ، فَلاَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا. قَالَ رَجُلٌ لاِبْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ: هِيَ الَّتِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ رَجَمْتُ أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ رَجَمْتُ هَذِهِ». فَقَالَ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ فِي الإِسْلاَمِ السُّوءَ» قَالَ أَبُو صَالِحٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ: خَدِلاً[1].

## ٣١- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەگەر کەسێکم بەرد باران بکردایە بەبێ شایەت))

**٥٣١٠- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی نەفرین کردن کرا، جا عاصیمی کوڕی عەدیی لەو بارەیەوە قسەیەکی کرد پاشان ڕۆشت، ئینجا پیاوێك لە هۆزەکەی هات بۆ لای سکاڵای ئەوەی لا کرد کە ئەو لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی بینیوە (زینای کردوە)، عاصیمیش وتی: من تەنها بە هۆی قسەکەمەوە تووشی ئەمە بووم، ئیتر عاصیم پیاوەکەی برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر و ﷺ هەواڵی ئەوەی دا بە پێغەمبەر ﷺ کە بەژنەکەیەوە بینویەتی،**

---

(١) بروانە: ٥٣١٦، ٦٨٥٥، ٦٨٥٦، ٧٢٣٨.

ئەو پیاوە (مێردی ژنەکە) ڕەنگ زەرد بووە، کەم گۆشتی قژ خاو بوو، بەڵام ئەو پیاوەی تاوانبار دەکرا بەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا بینویەتی لاق ئەستوری ڕەنگ ئەسمەری گۆشتن بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە ڕوونی کەرەوە بۆمان))، ئینجا کە منداڵەکەی بوو لەو پیاوە دەچوو کە مێردی ژنەکە وتی لەگەڵ ژنەکەی دیویەتی، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا نەفرین کردنی ئەنجامدا.

پیاوێ لە کۆڕەکەدا بە ئیبنو عەبباسی ﷺ وت: ئایا ئەو ژنە ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکم بە بێ شایەت بەرد باران بکردایە ئەم ژنەم بەرد باران دەکرد))، ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر ئەوە ژنێك بوو لە ناوی مسوڵماناندا بە ئاشکرا زینای دەکرد (بەڵام شایەت نەبوو لەسەری).ئەبو صالح و عەبدوڵلای کوڕی یوسف دەڵێن: (خَدِلاً) لە باتی (خَدْلاً)[١].

## ٣٢- بابُ صَدَاقِ الْمُلاَعَنَةِ

٥٣١١- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عُمَرَ: رَجُلٌ قَذَفَ امْرَأَتَهُ فَقَالَ: فَرَّقَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلاَنِ، وَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». فَأَبَيَا. وَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». فَأَبَيَا. فَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟» فَأَبَيَا فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا. قَالَ أَيُّوبُ: فَقَالَ لِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ إِنَّ فِي الْحَدِيثِ شَيْئًا لاَ أَرَاكَ تُحَدِّثُهُ قَالَ: قَالَ الرَّجُلُ: مَالِي؟ قَالَ: قِيلَ: "لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَادِقًا فَقَدْ دَخَلْتَ بِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَهْوَ أَبْعَدُ مِنْكَ"[٢].

---

(١) واتە: لە گێڕانەوەکەی ئەو دوانەدا بە: (خَدِلاً) گێڕاویانەتەوە کە ڕیوایەتەکانی تر بە: (خَدْلاً) گێڕاویانەتەوە.
(٢) بروانە: ٥٣١٢، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠.

## ٣٢- باسی (حوکمی) مارەیی ژنی نەفرین لەگەڵ کراو

**٥٣١١- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت: پیاوێك تاوانی زینای دایە پاڵ ژنەکەی، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەر ﷺ ژن و پیاوەکەی [(١)] بەنی عەجلانی لە یەك جیاکردەوە و فەرمووی: ((خوا دەزانێ بێگومان یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچ کامیان ملیان نەدا، بۆیە فەرمووی: ((خوا دەزانێ یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچ کامیان دانیان پێدا نەنا، ئەوسا فەرمووی: ((خوا دەزانێ یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچیان دانیان پێدا نەنا، ئیتر جیای کردنەوە لە یەکتری.**

**ئەیوب دەڵێ: عەمری کوڕی دینار پێ وتم: بەڕاستی ئەم فەرموودەیە شتێکی تیا نابینم تۆ بیگێڕیتەوە؟ وتی: پیاوەکە وتی: ئەی ماڵ و سامانەکەم؟ وتی: پێ وترا: ((ماڵت نییە ئەگەر تۆ ڕاست بکەیت (لەوەی داوتە پاڵی) ئەوە ژنت بووە (جیا دەبیتەوە هەموو مارەیی دەکەوێت)، ئەگەر درۆیش بکەیت ئەوە خراپتر و دوورترە لێت)).**

## ٣٣- بابُ قَوْلِ الإِمَامِ لِلْمُتَلاَعِنَيْنِ: إِنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟

٥٣١٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، عَنِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْمُتَلاَعِنَيْنِ: «حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ

---

(١) أخوي بني عجلان: ئەمە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن: (باب التغليب) واتە لایەک زاڵ دەکرێ بەسەر لایەکی تر، وشەی (أخ) بۆ برا دەبێژرێ بەڵام ژن و مێردەکەی بە (أخوي) هێناوە واتە: دوو براکە لەبەر ئەوەی لایەنی پیاوەکە زاڵ کراوە، یان لەبەر ئەوەی مسوڵمان برای ئیمانین، یان لەبەر خزمایەتی نێوانیان کە هەردووکیان لە هۆزی عەجلان بوون ( إرشاد الساري: ١٢/٨٧).

أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا». قَالَ: مَالِي؟ قَالَ: «لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهْوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ». قَالَ سُفْيَانُ: حَفِظْتُهُ مِنْ عَمْرٍو. وَقَالَ أَيُّوبُ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عُمَرَ: رَجُلٌ لاَعَنَ امْرَأَتَهُ، فَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ -وَفَرَّقَ سُفْيَانُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى- فَرَّقَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلاَنِ، وَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. قَالَ سُفْيَانُ: حَفِظْتُهُ مِنْ عَمْرٍو وَأَيُّوبَ كَمَا أَخْبَرْتُكَ[1].

## ٣٣- باسی پێشەوا بە هەردوو نەفرین کەرەکە بڵێ: بێگومان یەکێکتان درۆزنن دەی ئایا یەکێکتان تەوبە دەکات؟

**٥٣١٢- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عومەر ﷺ کرد دەربارەی ژن و مێردی نەفرین کەر، ئەویش وتی: پێغەمبەر ﷺ بە ژن و مێردی نەفرین کەری فەرموو: ((موحاسەبەتان لای خودایە، یەکێکتان درۆ دەکات هیچ ڕێگەیەکت نییە ژنت بێ))، پیاوەکە وتی: ئەی ماڵەکەم[2] (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ماڵت نییە، ئەگەر ئەوەی پێت وتووە ڕاست دەکەیت، ئەوە ماڵەکەت لە بەرانبەری ئەوەدا بوو ژنت بووە حەڵاڵت بووە، وە ئەگەر بوهتانت بۆکردوە ئەوە خراپترو دوورترە (هیچت بکەوێ) )).**

**سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەم لە عەمر بیستووە، ئەیوب دەڵێ: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرم بیستووە وتی: وتم بەئیبنو عومەر ﷺ پیاوێ نەفرین بکات لە ژنەکەی، ئیبنو عومەر بە پەنجەی ئاماژەی کرد، -وە سوفیان هەردوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی لە یەکتری جیا کردەوە - پێغەمبەریش ﷺ پیاو و ژنەکەی بەنی عەجلانی لە یەکتری جیا کردەوە و فەرمووی: ((بێگومان خوا**

(١) بڕوانە: ٥٣١١.

(٢) کە لە مارەییدا پێم داوە.

دەزانێ یەکێکتان درۆ دەکات، دەی ئایا تەوبە کەرێکتان تیایە؟)) پێغەمبەر ﷺ سێ جار ئەم فەرمایشتەی دووبارە کردەوە، سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم لە عەمر و ئەیوب بیستووە بەو شێوەی بۆم گێڕایەتەوە.

## ٣٤- بابُ التَّفْرِيقِ بَيْنَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ

٥٣١٣- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَّقَ بَيْنَ رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ قَذَفَهَا، وَأَحْلَفَهُمَا[١].

## ٣٤- باسی جیا کردنەوەی ژن و مێردی نەفرین کەر لە یەکتری

٥٣١٣- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو ژنێکی لە یەك جیا کردەوە، پیاوەکە ژنەکەی بە زینا تاوانبارکرد، پێغەمبەریش ﷺ هەردووکیانی سوێند دا.

٥٣١٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَاعَنَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ رَجُلٍ وَامْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا[٢].

٥٣١٤- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ نەفرین کردنی ئەنجام لە نێوان پیاو و ژنێکی ئەنصاریدا و جیای کردنەوە لە یەکتری.

---

(١) بڕوانە: ٤٧٤٨.

(٢) بڕوانە: ٤٧٤٨.

## ٣٥- بابٌ: يَلْحَقُ الْوَلَدُ بِالْمُلاَعِنَةِ

٥٣١٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لاَعَنَ بَيْنَ رَجُلٍ وَامْرَأَتِهِ، فَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ[1].

## ٣٥- باسێک: منداڵەکە (منداڵی) ژنە نەفرین کەرەکە دەبێت

**٥٣١٥- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەفرین کردنی لە نێوان پیاوێك و ژنەکەیدا ئەنجامدا، پیاوەکە حاشای کرد لە منداڵی ژنەکە، پێغەمبەریش ﷺ لە یەکتری جیاکردنەوە، کوڕەکەی دا بە ژنەکە بەکوڕی ئەوی دانا.**

## ٣٦- بابُ قَوْلِ الإِمَامِ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ

٥٣١٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْقَاسِمِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: ذُكِرَ الْمُتَلاَعِنَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ عَدِيٍّ فِي ذَلِكَ قَوْلاً، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ، فَذَكَرَ لَهُ أَنَّهُ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، فَقَالَ عَاصِمٌ: مَا ابْتُلِيتُ بِهَذَا الأَمْرِ إِلاَّ لِقَوْلِي. فَذَهَبَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي وَجَدَ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ -وَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مُصْفَرًّا قَلِيلَ اللَّحْمِ سَبْطَ الشَّعَرِ، وَكَانَ الَّذِي وَجَدَ عِنْدَ أَهْلِهِ آدَمَ خَدْلاً كَثِيرَ اللَّحْمِ جَعْدًا قَطَطًا- فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَيِّنْ». فَوَضَعَتْ شَبِيهًا بِالرَّجُلِ الَّذِي ذَكَرَ زَوْجُهَا أَنَّهُ وَجَدَ عِنْدَهَا، فَلاَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ رَجُلٌ لاِبْنِ عَبَّاسٍ فِي الْمَجْلِسِ: هِيَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ رَجَمْتُ أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ لَرَجَمْتُ هَذِهِ؟». فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَتْ تُظْهِرُ السُّوءَ فِي الإِسْلاَمِ.

---

(١) بڕوانە: ٤٧٤٨.

## ٣٦- باسی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ (لە نەفریندا): ((خوایە ڕوونی بکەیتەوە))

٥٣١٦- ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی ژن و پیاوە نەفرین کارەکە کرا، ئینجا عاصیمی کوڕی عەدیی لەو بارەیەوە قسەیەکی کرد، پاشان ڕۆشت، ئینجا پیاوێك لە هۆزەکەی هات بۆ لای (عاصیم) بۆی گێڕایەوە کە ئەو لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی بینیوە (زینای کردوە)، عاصیمیش وتی: من تەنها بەهۆی قسەکەمەوە توشی ئەم کارە بووم، ئیتر عاصیم پیاوەکەی برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر و ﷺ، جا هەواڵی ئەوەی دا بە پێغەمبەر ﷺ کە بەژنەکەیەوە بینویەتی،ئەو پیاوە (مێردی ژنەکە) ڕەنگی زەردی لەڕ و کەم گۆشتی قژ خاو بوو، بەڵام ئەو پیاوەی لەگەڵ ژنەکەیدا بینیبووی، ڕەنگ ئەسمەری لاق ئەستوری قەڵەوی قژ زۆر لول بوو- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە ڕوونی کەرەوە بۆمان))، ئینجا کە ژنەکە منداڵەکەی بوو لەو پیاوە دەچوو کە مێردی ژنەکە وتی لەگەڵ ژنەکەی دیویەتی، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا نەفرین کردنی ئەنجامدا.

پیاوێ لە کۆڕەکەدا بە ئیبنو عەبباسی ﵄ وت: ئایا ئەو ژنە ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکم بە بێ شایەت بەرد باران بکردایە ئەم ژنەم بەرد باران دەکرد)) ئیبنو عەبباس وتی: نەخێر ئەوە ژنێك بوو لە ناوی مسوڵمانانادا بە ئاشکرا زینای دەکرد، (بەڵام شایەت نەبوو لەسەری).

## ٣٧- بابٌ: إِذَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، ثُمَّ تَزَوَّجَتْ بَعْدَ الْعِدَّةِ زَوْجًا غَيْرَهُ فَلَمْ يَمَسَّهَا

٥٣١٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.
حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيَّ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، ثُمَّ طَلَّقَهَا، فَتَزَوَّجَتْ آخَرَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَتْ لَهُ أَنَّهُ لاَ يَأْتِيهَا، وَإِنَّهُ لَيْسَ مَعَهُ إِلاَّ مِثْلُ هُدْبَةٍ فَقَالَ: «لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ»[١].

## ٣٧- باسێک: ئەگەر پیاوێ سێ تەڵاقەی ژنەکە بدات، پاشان لە دوای تەواو بوونی عیددە ژنەکە شووی کرد بە پیاوێکی تر و لەگەڵ ژنەکە دروست نەبوو بوو[٢]

**٥٣١٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە ڕیفاعە قورەزی ژنێکی مارە کرد، پاشان تەڵاقی دا و شووی کرد بەپیاوێکی تر، ئینجا ژنەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێی وت: کە پیاوەکەی ناتوانێ لەگەڵی دروست بێ، وە ئالەتەکەی وەك ڕیشاڵی قوماش وایە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ هەتا هەنگوین و لەزەتی مێردەکەت نەچێژی ئەویش هەنگوین و لەزەتی تۆ نەچێژێت)).**

## ٣٨- بابٌ: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ ﴿٤﴾ ﴾الطلاق

قَالَ مُجَاهِدٌ: إِنْ لَمْ تَعْلَمُوا يَحِضْنَ أَوْ لاَ يَحِضْنَ، وَاللاَّئِي قَعَدْنَ عَنِ الحَيْضِ، ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق، ﴿فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق.

---

(١) بڕوانە: ٢٦٣٩.
(٢) ئایا حەڵاڵ دەبێت بۆ مێردی یەکەمی ئەگەر مێردی دووەمی تەڵاقی بدات؟.

## ٣٨- باسێک: (ئەوانەی کە بێ هیوا دەبن لە کەوتنە حەیزەوە لە ژنانتان، ئەگەر (دەربارەی عیددەیان) دوو دڵ بوون)

**موجاهید دەڵێ: ئەگەر نەتانزانی ئەو ژنانە دەکەونە حەیزەوە یان ناکەونە حەیزەوە، ئەوانەش لە حەیز چونەتەوە[1] و ئەوانەشیان هێشتا نەکەوتوونەتە حەیزەوە[2] هەموویان عیدەیان سێ مانگە.**

### ٣٩- بابٌ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ ﴿٤﴾﴾ الطلاق

٥٣١٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ الأَعْرَجِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، عَنْ أُمِّهَا أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَسْلَمَ يُقَالُ لَهَا: سُبَيْعَةُ كَانَتْ تَحْتَ زَوْجِهَا، تُوُفِّيَ عَنْهَا وَهْيَ حُبْلَى، فَخَطَبَهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ، فَأَبَتْ أَنْ تَنْكِحَهُ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا يَصْلُحُ أَنْ تَنْكِحِيهِ حَتَّى تَعْتَدِّي آخِرَ الأَجَلَيْنِ. فَمَكُثَتْ قَرِيبًا مِنْ عَشْرِ لَيَالٍ، ثُمَّ جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «انْكِحِي»[3].

## ٣٩- باسێک: (وە ژنانی سک پڕ (دوو گیان) عیدەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن)

**٥٣١٨-عەبدوڕەحمان گێڕایەوە کە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە بۆی گێڕایەوە لە دایکیەوە کە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرە ﷺ گێڕایەوە، کە ژنێك لە هۆزی ئەسلەم پێ دەوترا: سوبەیعە ژنی مێردەکەی بوو کە مێردەکەی مرد**

(١) لەبەر پیری و تەمەن زۆر یان ناکەونە حەیزەوە.
(٢) لەبەر منداڵی و تەمەن کەمیان.
(٣) بڕوانە: ٤٨٠٩.

**ئەوسکی پڕ بوو، ئینجا ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك خوازبێنی کرد، ژنەکە ڕازی نەبوو شووی پێ بکات [١]، (ئەبو سەنابیل) وتی: سوێند بەخوا دروست نییە شووی پێ بکەیت تا دوورترین دوو عیددەکە نەژمێری، ئینجا ژنەکەی نزیکەی دە ڕۆژ مایەوە، پاشان هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((شوو بکە)).**

٥٣١٩- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، عَنِ اللَّيْثِ، عَنْ يَزِيدَ، أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ كَتَبَ إِلَيْهِ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى ابْنِ الأَرْقَمِ أَنْ يَسْأَلَ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةَ كَيْفَ أَفْتَاهَا النَّبِيُّ ﷺ؟ فَقَالَتْ: أَفْتَانِي إِذَا وَضَعْتُ أَنْ أَنْكِحَ[٢].

**٥٣١٩- یەزید دەگێڕێتەوە کە ئیبنو شیهاب بەنامە بۆی نوسی کە عەوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕاوەتەوە لە باوکیەوە، کە بە نامە بۆ ئیبنو لئەرقەمی نووسیوە کە پرسیار لە سوبەیعەی ئەسلەمی بکات: پێغەمبەر ﷺ چۆن فەتوای بۆ دا؟ سوبەیعەش وتی: فەرمووی پێم کەی منداڵەکەم بوو شوو بکەم.**

٥٣٢٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ أَنَّ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةَ نُفِسَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَجَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَأْذَنَتْهُ أَنْ تَنْكِحَ، فَأَذِنَ لَهَا، فَنَكَحَتْ.

**٥٣٢٠- میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە کە سوبەیعەی ئەسلەمی ﷺ پاش مردنی مێردەکەی بە چەند شەوێك منداڵی بوو[٣]، ئەوسا سوبەیعە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺو مۆڵەتی لێ خواست کە شوو بکات، ئەویش مۆڵەتی دا و ئیتر شووی کرد.**

---

(١) ئەبو بیشری کوڕی حاریسیش خوازبێنی کرد کە پیاوێکی گەنج بوو، ئەبو سنابیل بەتەمەن بوو.

(٢) بڕوانە: ٣٩٩١.

(٣) (نُفِسَتْ) بە منداڵ بوون و بە خوێنی پاش منداڵ بونیش دەوترێ پێشی دەوترێت زەیسانی لە کوردەواریدا.

## ٤٠- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾ ﴾ البقرة

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ فِيمَنْ تَزَوَّجَ فِي الْعِدَّةِ، فَحَاضَتْ عِنْدَهُ ثَلاَثَ حِيَضٍ: بَانَتْ مِنَ الأَوَّلِ، وَلاَ تَحْتَسِبُ بِهِ لِمَنْ بَعْدَهُ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: تَحْتَسِبُ. وَهَذَا أَحَبُّ إِلَى سُفْيَانَ، يَعْنِي: قَوْلَ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ مَعْمَرٌ: يُقَالُ أَقْرَأَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا دَنَا حَيْضُهَا، وَأَقْرَأَتْ إِذَا دَنَا طُهْرُهَا، وَيُقَالُ: مَا قَرَأَتْ بِسَلًى قَطُّ، إِذَا لَمْ تَجْمَعْ وَلَدًا فِي بَطْنِهَا.

## ٤٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ژنە تەڵاق دراوەکان دان بە خۆیاندا دەگرن تا ماوەی سێ حەیز)[١]

**ئیبراهیم دەربارەی پیاوێ لە عیدەدا ژنێك مارە كات[٢] ئینجا لای پیاوەكە سێ جار بكەوێتە حەیزەوە لە مێردی یەكەمی جیا دەبێتەوە بە یەكجاری، وە بە عیدەش دانانرێ بۆ مێردی پاش یەكەم[٣].**

**زوهری دەڵێ: (بۆ مێردی دووەم) بە عیددە دادەنرێت (هەر چۆنێك بۆ مێردی یەكەم دانراوە)، ئەمەیان بە لای سوفیانەوە چاكترە و بەدڵیەتی، واتە: ڕایەكەی زوهری.**

**مەعمەر دەڵێ: دەوترێت: (أَقْرَأَتِ الْمَرْأَةُ) ئەگەر كەوتنە حەیزی نزیك بێتەوە، وە دەوترێت: (أَقْرَأَتْ) ئەگەر پاكێتی نزیك بێتەوە، وە دەوترێت: (مَا قَرَأَتْ بِسَلًى قَطُّ) ئەگەر هەرگیز سكی نەبێت.**

---

(١) یان سێ پاكێتی كە ڕای هەندێک لە زانایانە.
(٢) بە مارە كردنێكی نادروست.
(٣) مێردی دووەم چونكە پاش سێ حەیز ئینجا عیددەی لە مێردی یەكەمی تەواو بووە، دروستە شوو بكات لەبەر ئەوەی ئەو عیددەیە هیچ پەیوەندی بە مێردی دووهەمەوە نییە.

## ٤١- بابُ قِصَّةِ فاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ

وَقَوْلِهِ: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا (١) ﴾ الطلاق، ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ (٦) ﴾ الطلاق، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا (٧) ﴾ الطلاق.

٥٣٢١- ٥٣٢٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ سَمِعَهُمَا يَذْكُرَانِ، أَنَّ يَحْيَى بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ طَلَّقَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَكَمِ، فَانْتَقَلَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ إِلَى مَرْوَانَ -وَهْوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ-: اتَّقِ اللَّهَ وَارْدُدْهَا إِلَى بَيْتِهَا. قَالَ مَرْوَانُ فِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ: إِنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَكَمِ غَلَبَنِي. وَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ: أَوَمَا بَلَغَكِ شَأْنُ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ؟ قَالَتْ: لاَ يَضُرُّكَ أَنْ لاَ تَذْكُرَ حَدِيثَ فَاطِمَةَ. فَقَالَ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ: إِنْ كَانَ بِكِ شَرٌّ فَحَسْبُكِ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ مِنَ الشَّرِّ[1].

## ٤١- باسی بەسەرهاتی فاتیمەی کچی قەیس ﷺ

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وە لە خوا بترسن کە پەروەردگارتانە، ئەو ژنانە دەرمەکەن لە ماڵەکانی خۆیان (تا عیدەیان تەواو دەبێت)، ئافرەتانیش با دەرنەچن (لە ماڵەکانیان) مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن،**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٢٣، ٥٣٢٤، ٥٣٢٥، ٥٣٢٦، ٥٣٢٧، ٥٣٢٨.

وە ئەوانە سنوورانێکی خوایین هەر کەسێك لە سنوورانی خودا دەربچێ، ئەوە بێگومان ستەمی لە خۆی کردوە، تۆ چوزانی لەوانەیە خوا دوای ئەوە کارێکی تر پێش بێنێ)، ( (ژنانی تەڵاق دراو) دایان بنێن لەو شوێنەی کە خۆتان دادەنیشن بە پێی تواناتان، وە زیانیان پێ مەگەیەنن تا تەنگیان پێ هەڵچنن، وە ئەگەر دووگیان بوون ئەوە خەرجیان بکێشن تا سکەکەیان دائەنێن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت)

٥٣٢١- ٥٣٢٢- یەحیای کوڕی سەعید لە قاسیمی کوڕی موحەممەد و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە گێڕایەوە، کە لە هەردووکیانی بیست دەیانوت: یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص[١] ژنەکەی تەڵاقدا کە کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی حەکەم بوو، ئینجا عەبدوڕەحمان لە ماڵەکەی خۆی گوێزایەوە (بردیە ماڵی خۆی)، جا عائیشەی ﷺ دایکی ئیمانداران ناردیە لای مەڕوان (ی کوڕی حەکەم) — لەو کاتەدا لێپرسراوی مەدینە بوو - (پێی وت): لە خوا بترسە و ئەو ژنە بگێڕەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، مەڕوانیش وەك لە فەرموودەکەی سولەیماندا هاتووە وتی: بەڕاستی عەبدوڕەحمانی کوڕی حەکەم زاڵ بووە بە سەرمدا[٢]، قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ[٣]: ئایا قسەی فاتیمەی کچی قەیست پێ گەیشتووە[٤]؟ عائیشەش ﷺ وتی: هیچ زیانت لێ ناکەوێ کە قسە لە قسەی فاتیمە بکەیت، مەڕوانی کوڕی حەکەم وتی: ئەگەر ئەڵێیت ئەوە بە هۆی شەڕ و ئاژاوەی نێوان ئەو دووانەوە (فاتیمە و ئەبو عەمردا) بووە، (ئەم شەڕەش کە لە نێوان یەحیا و ژنەکەیدا هەیە) بەس نییە بۆ تۆ کە لەسەر ئەوە سەرزەنشتمان نەکەی.

---

(١) ئەم یەحیایە لەگەڵ یەحیای سەرەتای ڕشتەکە جیاوازن دوو کەسن نەک هەمان کەس بێت.
(٢) زاڵ بووە بەسەرمدا بە گوێم ناکات یان بە بەڵگە زاڵ بووە بەسەرمدا.
(٣) واتە: لە فەرموودەی قاسیمی کوڕی موحەممەددا هاتووە مەڕوان وەڵامی عائیشە دەداتەوە و دەڵێ:
کە لە ماڵی مێردەکەی بە مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ چۆتە دەر لە ماڵی خۆی.

٥٣٢٣- ٥٣٢٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا لِفَاطِمَةَ، أَلاَ تَتَّقِي اللَّهَ؟! يَعْنِي: فِي قَوْلِهَا: "لاَ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةَ"[١].

**٥٣٢٣- ٥٣٢٤- عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: فاتیمە چییەتی لە خوا ناترسی؟ واتە کە دەڵێ جێ مانەوە و خەرجی نییە (بۆ ژنی تەڵاق دراو).**

٥٣٢٥- ٥٣٢٦- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ لِعَائِشَةَ: أَلَمْ تَرَيْنَ إِلَى فُلاَنَةَ بِنْتِ الْحَكَمِ طَلَّقَهَا زَوْجُهَا الْبَتَّةَ فَخَرَجَتْ؟ فَقَالَتْ بِئْسَ مَا صَنَعَتْ. قَالَ: أَلَمْ تَسْمَعِي فِي قَوْلِ فَاطِمَةَ؟ قَالَتْ: أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ لَهَا خَيْرٌ فِي ذِكْرِ.

وَزَادَ ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ: عَابَتْ عَائِشَةُ أَشَدَّ الْعَيْبِ، وَقَالَتْ: إِنَّ فَاطِمَةَ كَانَتْ فِي مَكَانٍ وَحِشٍ، فَخِيفَ عَلَى نَاحِيَتِهَا، فَلِذَلِكَ أَرْخَصَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ.

**٥٣٢٥- ٥٣٢٦- عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسیم لە باوکیەوە گێڕایەوە دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر وتی بە عائیشە ﵂: ئایا سەیری فڵانی کچی حەکەم ناکەیت مێردەکەی بەیەکجاری تەڵاقی داوەو لەماڵی خۆی چۆتە دەرەوە، عائیشەش ﵂ وتی: (ئەو ژنە) کارێکی خراپی کردوە، (عوروە) وتی: ئایا ئەو فەرموودەیەت بیستووە دەربارەی وتەکەی فاتیمە[٢] عائیشەش وتی: جا بەڕاستی ئەو (فاتیمە) باس کردنی ئەو فەرموودە چاك نییە بۆی [٣].**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٢١، ٥٣٢٢.

(٢) کە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی چوونە دەرەوەی داوە.

(٣) چونکە لەبەر حاڵەتێکی تایبەتی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی ئەوی داوە نابێ ئەو باسی کاتی بی گشتێنێ.

ئیبنو ئەبی زیناد لە هیشامەوە لە باوکیەوە ئەمەی لێ زیاد کردوە: عائیشە زۆر بەتوندی ڕەخنەی گرت، (فاتیمە) وتی: بێگومان فاتیمە لەجێگایەکی تەنها و مەترسیداردا بوو ترس هەبوو لەدەوروبەرەکەی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا بگوێزرێتەوە.

## ٤٢- بابُ الْمُطَلَّقَةِ إِذَا خُشِيَ عَلَيْهَا فِي مَسْكَنِ زَوْجِهَا أَنْ يُقْتَحَمَ عَلَيْهَا، أَوْ تَبْذُوَ عَلَى أَهْلِهَا بِفَاحِشَةٍ

٥٣٢٧-٥٣٢٨- وَحَدَّثَنِي حِبَّانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ أَنْكَرَتْ ذَلِكَ عَلَى فَاطِمَةَ[١].

## ٤٢- باسی ژنی تەڵاقدراو لە ماڵی مێردەکەیدا بێت مەترسی لەسەر بێ هێرشی بکرێتە سەری یان ژنەکە قسەی ناشرین بە کەس و کاری خۆی یان مێردەکەی بڵێ[٢]

٥٣٢٧-٥٣٢٨- عوروە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﵂ لەسەر ئەو وتە[٣] ڕەخنەی لە فاتیمە گرت و سەرزەنشتی کرد.

## ٤٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾﴾ البقرة مِنَ الحَيْضِ وَالحَبَلِ.

٥٣٢٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَنْفِرَ، إِذَا صَفِيَّةُ عَلَى بَابِ خِبَائِهَا كَئِيبَةً، فَقَالَ

(١) بڕوانە: ٥٣٢١، ٥٣٢٢.
(٢) ئەوە دروستە لە ماڵی مێردەکەی بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر.
(٣) کە وتبووی ژنی تەڵاقدراو جێ مانەوە و نەفەقەی نییە.

لَهَا: «عَقْرَى -أَوْ حَلْقَى- إِنَّكِ لَحَابِسَتُنَا أَكُنْتِ أَفَضْتِ يَوْمَ النَّحْرِ؟». قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: «فَانْفِرِي إِذًا»[1].

# ٤٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دروست نییە بۆ ئەو (ژن)انە ئەوەی خودا لە مناڵدانیاندا دروستی کردوە (لە حەیز یان مناڵ)، بیشارنەوە لە حەیز و سک و مناڵ.

**٥٣٢٩- عائیشە ﷺ دەڵێ: (لە حەجی ماڵئاوایدا) کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە مەککە دەرچێت[2]، لە پڕ صەفییەی دی لەبەر دەرگای چادرەکەیدا بە غەمباری فەرمووی پێی: ((لەش بە باربی)) یان ((زار بەئازار بی، بێگومان تۆ دەمان هێڵیتەوە، ئایا ڕۆژی جەژن تەواف ئیفازەت کرد؟)) صەفیە وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە دەرچۆ و بگەڕێرەوە)).**

٤٤ — **بابٌ:** ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ ﴿٢٢٨﴾﴾البقرة

أي: فِي الْعِدَّةِ، وَكَيْفَ يُرَاجِعُ الْمَرْأَةَ إِذَا طَلَّقَهَا وَاحِدَةً أَوْ ثِنْتَيْنِ؟

٥٣٣٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: زَوَّجَ مَعْقِلٌ أُخْتَهُ، فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً[3].

# ٤٤- باسێک: (وە مێردەکانیان شایستەن بە گێڕانەوەیان)

**واتە:لەعیددەدا، وە ژن چۆن دەهێنرێتەوە ئەگەر پیاوەکەی تەڵاقێك یان دووانی دابێت؟**

**٥٣٣٠- حەسەن دەڵێ: مەعقیل خوشکەکەی دا بە شوو، ئینجا (مێردەکەی ئەبو لبەداح) یەك تەڵاقی دا.**

---

(١) بروانە: ٢٩٤.

(٢) دوای ئەنجامدانی حەج

(٣) بروانە: ٤٥٢٩.

٥٣٣١- وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا الْحَسَنُ، أَنَّ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ كَانَتْ أُخْتُهُ تَحْتَ رَجُلٍ فَطَلَّقَهَا، ثُمَّ خَلَّى عَنْهَا حَتَّى انْقَضَتْ عِدَّتُهَا، ثُمَّ خَطَبَهَا، فَحَمِيَ مَعْقِلٌ مِنَ ذَلِكَ أَنَفًا فَقَالَ: خَلَّى عَنْهَا وَهْوَ يَقْدِرُ عَلَيْهَا، ثُمَّ يَخْطُبُهَا فَحَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ﴿٢٣٢﴾ ﴾ البقرة، إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَرَأَ عَلَيْهِ، فَتَرَكَ الْحَمِيَّةَ وَاسْتَقَادَ لأَمْرِ اللَّهِ[1].

**٥٣٣١- حەسەن دەگێڕێتەوە کە مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ خوشکێکی هەبوو ژنی پیاوێك بوو، ئینجا تەڵاقیدا پاشان وازی لێ هێنا هەتا عیددەی بەسەر چوو، پاشان خوازبێنی کردەوە، مەعقیلیش کارەکەی نەکرد لەبەر ڕق هەڵسان و خۆ بە گەورەگرتن وتی: وازی لێ هێنا لە کاتێکدا (دەیتوانی بیباتەوە) دەسەڵاتی هەبوو بەسەریدا لەپاش ئەو خوازبێنی دەکات، ئیتر مەعقیل ڕێگر بوو لە نێوان پیاوەکە و ئافرەتەکەدا، بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (کاتێك ژنتان تەلاق دا و عیددەیان تەواو بوو ئیتر قەدەغەیان (بەرگرییان) مەکەن) تا کۆتایی ئایەتەکە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مەعقیلی بانگ کرد و ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە، مەعقیلیش وازی لە دەمارگیریەکەی هێنا و گەردن کەچ بوو بۆ فەرمانەکەی خوا.**

٥٣٣٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ وَهْيَ حَائِضٌ تَطْلِيقَةً وَاحِدَةً، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُرَاجِعَهَا، ثُمَّ يُمْسِكَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ عِنْدَهُ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ مِنْ حَيْضِهَا، فَإِنْ أَرَادَ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا حِينَ تَطْهُرُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُجَامِعَهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ. وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ إِذَا سُئِلَ عَنْ ذَلِكَ قَالَ لأَحَدِهِمْ: إِنْ كُنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلاَثًا فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْكَ، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ. وَزَادَ فِيهِ غَيْرُهُ عَنِ اللَّيْثِ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَوْ طَلَّقْتَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَنِي بِهَذَا[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٥٢٩.

(٢) بڕوانە: ٤٩٠٨.

٥٣٣٢- نافیع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ یەك تەڵاقی ژنەکەی دا لە کاتێکدا لە حەیزدا بوو، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، پاشان لای خۆی بیهێڵێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە، پاشان لای خۆی بۆ جارێکی تر دەکەوێتە حەیزەوە و پاشان لای خۆی ڕایگرێ هەتا پاك دەبێتەوە، دوای ئەوە جارێکی تر دەکەوێتە حەیزێکی ترەوە، لە پاشان لێ بوەستێ تا پاك دەبێتەوە لە حەیزەکەی، جا ئەگەر ویستی تەڵاقی بدات با تەڵاقی بدات، کاتێ پاك بوویەوە پێش ئەوەی لەگەڵی دروست بێت، ئەوە ئەو عیدەیەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە ئافرەتی لەسەر تەڵاق بدرێ، وە عەبدوڵڵا هەر کات پرسیاری لێ بکرایە لەو بارەیەوە بە یەکێکیانی دەوت: ئەگەر تۆ سێ بە سێ تەڵاقی بدەیت، ئەوە بێگومان لێت حەرام بووە هەتا شوو نەکات بە پیاوێکی تر جگە لە مێردەکەی خۆی.
وە جگە لە قوتەیبە لە لەیسەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: نافیع بۆی گێڕاومەوە دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ ئەمەی لە فەرموودەکە زیاد کردوە وتی: ئەگەر پیاو جارێك یان دوو جار ژنەکەی تەڵاق بدات (بۆی هەیە بیگێڕێتەوە)، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووم بەوە.

## ٤٥- بابُ مُرَاجَعَةِ الْحَائِضِ

٥٣٣٣- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، حَدَّثَنِي يُونُسُ بْنُ جُبَيْرٍ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ: فَقَالَ: طَلَّقَ ابْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ وَهْيَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا، ثُمَّ يُطَلِّقَ مِنْ قُبُلِ عِدَّتِهَا، قُلْتُ: فَتَعْتَدُّ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ.

## ٤٥- باسی گێڕانەوەی ژن لە حەیزدا [١]

٥٣٣٣- یونسی كوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عومەر ﷺ كرد ئەویش وتی: ئیبنو عومەر ژنەكەی تەڵاقدا لە كاتێكدا لە حەیزدا بوو، جا عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد ئەویش فەرمانی كرد ژنەكەی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، پاشان تەڵاقی بدات لە سەرەتای عیددەكەیەوە، وتم: ئەو تەڵاق دانە بە تەڵاق دادەنرێ؟ وتی: ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ فەرزێ بەجێ بێنێ وكەرێتی بكات (بەجێی نەهێنێ[٢]؟).

## ٤٦- بابٌ: تُحِدُّ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لاَ أَرَى أَنْ تَقْرَبَ الصَّبِيَّةُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا الطِّيبَ؛ لأَنَّ عَلَيْهَا الْعِدَّةَ.

حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ هَذِهِ الأَحَادِيثَ الثَّلاَثَةَ.

٥٣٣٤ - قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ -خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ- فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[٣].

---

(١) ئەگەر تەڵاقدانەكەی بە یەكجاری و بە تەواوی لە یەكتری جیا نەبووبنەوە، واتە تەلاقەكەی (ڕجعی) بێت.

(٢) ئەوە ئەبێتە بیانوو بۆی تا تەڵاقەكەی نەكەوێ؟ واتە تەڵاقەكەی دەكەوێت.

(٣) بڕوانە: ١٢٨٠.

# ٤٦- باسێک: ژنێ مێردی مردبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ تەعزێ دەگرێ

**زوهری دەڵێ: ڕام نییە کە کچۆڵەی ژنی مێرد مردوو نزیکی بۆنی خۆش کەوێتەوە، چونکە ئەو کچۆڵەش لەسەریەتی تەعزێ بار بێت.**
**نافیع لە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو (زەینەب) ئەم سێ فەرموودەی بۆ (نافیع) گێڕایەوە[1].**
**٥٣٣٤- زینەب دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای ئوممو حەبیبەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب باوکی مرد بوو، ئینجا ئوممو حەبیبە داوای بۆنێکی خۆشی کرد زەعفەرانی - خەلوقی یان جۆرێکی تر- تیا بوو، جا لەو بۆنە خۆشە کچێکی پێ بۆن خۆش کرد و پێیدا سویی، لە پاشان دای لە لای جاینەکانی خۆی پاشان وتی: سوێند بە خوا من هیچ پێویستم بە بۆنی خۆش لە خۆدان نییە، تەنها لەبەر ئەوە بووکە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((دروست نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت تەعزێ بگرێ بۆ هیچ مردوویەك لە سێ ڕۆژ زیاتر جگە لە مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ (تەعزیەی بۆ دەگیرێ) )).**

٥٣٣٥- قَالَتْ زَيْنَبُ: فَدَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَتْ: أَمَا وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[2].

---

(١) فەرموودەی یەکەم زەینەب لە ئوممو حەبیبەوە دەیگێڕێتەوە لە پەڕاوی جەنائیز باسی تەعزێباری ئافرەت بۆ غەیری مێردی خۆی، بەژمارە (١٢٨٠)، وە فەرموودەی دووەمیان نافیع لە زەینەبەوە دەیگێڕێتەوە لە پەڕاوی جەنائیز باسی تەعزێباری ئافرەت بۆ غەیری مێردی خۆی، بەژمارە (١٢٨٢). فەرموودەی سێیەمیش ئەم فەرموودەی ئێرەیە بە ژمارە: (٥٣٣٤).
(٢) بڕوانە: ١٢٨٢.

**٥٣٣٥- زەینەب [١] دەڵێ: وە چووم بۆ لای زەینەبی کچی جەحش کاتێ براکەی مرد، داوای بۆنی خۆش کرد و هەندێکی دا لە خۆی، پاشان وتی: جا سوێند بە خوا من هیچ پێویستیەکم بە بۆنی خۆی نییە، تەنها ئەوە نەبێ لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە لەسەر دوانگە دەیفەرموو: ((دروست نییە بۆ هیچ ئافرەتێك کە باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی ببێ بۆ هیچ مردوویەك تەعزێ بار ببێ لە سێ ڕۆژ زیاتر، مەگەر بۆ مێردی چوار مانگ و دە ڕۆژ (تەعزیەی بۆ دەگیرێ)) ).**

٥٣٣٦ - قَالَتْ زَيْنَبُ: وَسَمِعْتُ أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنَهَا، أَفَتَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ». مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا كُلَّ ذَلِكَ يَقُولُ: "لاَ"، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ»[٢].

**٥٣٣٦- زەینەب دەڵێ: وە لە ئوممو سەلەمەم ﵂ بیست دەیوت: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەم مێردەکەی مردووە، بێگومان چاوی ئێش دەکات ئایا چاوی بڕەژێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ دوو جار یا سێ جار فەرمووی: ((نەخێر))، هەمووجارێ دەیفەرموو: ((نەخێر))، لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان عیددە چوار مانگ و دە ڕۆژە، بەڕاستی جاران یەکێ لە ئێوە لە سەردەمی نەفامیدا دوای تەواو بوونی ساڵێك پشقلەکەی فڕێ دەدا)).**

٥٣٣٧- قَالَ حُمَيْدٌ: فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْزَيْنَبُ كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا حَتَّى تَمُرَّ

---

(١) زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەیە.

(٢) بڕوانە: ٥٣٣٨، ٥٧٠٦.

بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَائِرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعَرَةً فَتَرْمِي، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ. سُئِلَ مَالِكٌ مَا تَفْتَضُّ بِهِ قَالَ تَمْسَحُ بِهِ جِلْدَهَا[1].

**٥٣٣٧- حومەید وتی: بە زەینەبم وت: مەبەستی چی بوو لە دوای تەواو بوونی ساڵێك پشقلەكەی فڕێ دەدا؟ (زەینەب) وتی: لە سەردەمی نەفامیدا ئەگەر ژن مێردەكەی بمردایە دەچوویە زنجێكی (پیس و پۆخڵ) بچووكەوە، وە خراپترین پۆشاكی لەبەر دەكرد، بۆنی خۆشی بەكار نەدەهێنا تا ساڵێك، ئینجا گیانداریك دەهێنرا گوێدرێژ بوایە یا مەڕ یا باڵندە و دەیهێنا بەدامێن و پێشی خۆیدا، كەمجار ئەو شتەی ئەو خۆی پێ دەسڕی نەدەمرد، ئینجا لە زنجەكەی دەهاتە دەرەوە، پشقلێك دەدرایە دەستی و ئەویش فڕێی دەدا و پاشان دوای ئەوە دەگەڕایەوە بە ئارەزووی (خۆی خۆی دەشۆرد و) بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا. وە پرسیار لە مالیك كرا ﷺ مانای (تَفْتَضُّ بِهِ) چییە؟ وتی: ژنەكە دەیهێنێ بە پێستیدا.**

## ٤٧- بابُ الْكُحْلِ لِلْحَادَّةِ

٥٣٣٨- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّهَا، أَنَّ امْرَأَةً تُوُفِّيَ زَوْجُهَا فَخَشُوا عَلَى عَيْنَيْهَا، فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَأْذَنُوهُ فِي الْكُحْلِ، فَقَالَ: «لاَ تَكَحَّلْ، قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَمْكُثُ فِي شَرِّ أَحْلاَسِهَا -أَوْ شَرِّ بَيْتِهَا-، فَإِذَا كَانَ حَوْلٌ فَمَرَّ كَلْبٌ رَمَتْ بِبَعَرَةٍ، فَلاَ حَتَّى تَمْضِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ»[2].

---

(١) بروانە: ١٤٨٩.

(٢) بروانە: ٥٣٣٦.

## ٤٧- باسی (حوكمی بەكار هێنانی) كل بۆ ئافرەتی تەعزێ بار

**٥٣٣٨- زەینەبی كچی ئوممو سەلەمە لە دایكیەوە دەگێڕێتەوە كە ئافرەتێك مێردەكەی مرد لە چاوەكانی ترسان[١]، بۆیە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ داوای مۆڵەتیان لێ كرد بەكل چاوی بڕەژن، ئەویش فەرمووی: ((نابێ چاوی بە كل بڕەژێت، بێگومان جاران یەكێك لە ئێوە لە خراپترین پۆشاكیدا -یان خراپترین ماڵ و شوێنیدا- دەمایەوە جا كە ساڵێك تەواو بوو سەگێك بڕۆشتایە (بە لایدا) پشقڵێكی بۆ فڕێ دەدات، كەواتە نابێ چاوی بڕەژێ هەتا چوار مانگ و دە ڕۆژ تێدەپەڕێ (ئەنجا بۆی دروستە) )).**

٥٣٣٩ - وَسَمِعْتُ زَيْنَبَ ابْنَةَ أُمِّ سَلَمَةَ تُحَدِّثُ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجِهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[٢].

**٥٣٣٩- وە زەینەبی كچی ئوممو سەلەمە لە ئوممیی حەبیبەوە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دروست نییە بۆئافرەتێكی مسوڵمان باوەڕی بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت لە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیە بار بێت، مەگەر بۆ مێردی (دروستە) چوار مانگ و دە ڕۆژ (تەعزیە بار بێ) )).**

٥٣٤٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ عَلْقَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: نُهِينَا أَنْ نُحِدَّ أَكْثَرَ مِنْ ثَلاَثٍ إِلاَّ بِزَوْجٍ[٣].

**٥٣٤٠- موحەممەدی كوڕی سیرین دەڵێ: ئوممو عەتییە رضي الله عنها وتی: قەدەغە كرا لێمان لە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیە بگرین مەگەر بۆ مێرد (چوار مانگ و دە ڕۆژ).**

---

(١) كز بێت یا كوێر بێت.

(٢) بڕوانە: ١٢٨٠.

(٣) بڕوانە: ١٢٨٠.

## ٤٨- بابُ الْقُسْطِ لِلْحَادَّةِ عِنْدَ الطُّهْرِ

٥٣٤١- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلاَ نَكْتَحِلَ، وَلاَ نَطَّيَّبَ، وَلاَ نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا، إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ، وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطُّهْرِ إِذَا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظْفَارٍ، وَكُنَّا نُنْهَى عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ[١].

قال أبو عبد الله: والقُسْطُ، والكُسْتُ مِثْلُ الكافُورِ والقافُور. نُبْذَةٌ: قِطْعَةٌ

## ٤٨- باسی ژنی تەعزیە بار بوغورد و بۆنی خۆش بەكار بێنێ لە كاتی پاك بوونەوەدا

**٥٣٤١- حەفصە لە ئوممو عەتییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمەی ئافرەتان بەرگری دەكراین سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیە باربین بۆ مردوو، جگە لە مێرد كە چوار مانگ و دە ڕۆژ تەعزێبار دەبووین، چاومان نەدەڕشت، وە بۆنی خۆشمان لە خۆمان نەدەدا، وە جلی ڕەنگ كراومان لەبەر نەدەكرد، مەگەر جۆرە پۆشاكێكی یەمەنی، وە بێگومان ڕێگەدراین لە كاتی پاكبوونەوەدا ئەگەر یەكێكمان غوسڵی بێ نوێژی بكردایە هەندێ لە بۆنخۆشی (أَظْفَار)[٢] بەكاربهێنایە، وە ئێمە قەدەغە كرابووین لە شوێنكەوتنی جەنازەی مردووان.**

**ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (القُسْطُ) لەگەڵ (الكُسْتُ) یەكێكن وەك (الكافور) لەگەڵ (القافور)[٣]. وە (نُبْذَةٌ) واتە: پارچەیەك.**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣.

(٢) (أَظْفَار): شارێكە لە كەنارەكانی یەمەن، بۆن خۆشەكە بە ناوی ئەو شارەوە ناونراوە چونكە لەوێوە دەهێنرا. بڕوانە : إرشاد الساری، ١١٢/١٢.

(٣) واتە: ئەو دوو وشەیە (القسط) لەگەڵ (الكست) یەك مانایان هەیە پیتی قاف لە جێی كاف بەكار هاتووە وەك: (الكافور) لەگەڵ (القافور) كاف لە جێی قاف بەكار هاتووە، هەر هەمان ماناشی هەیە.

# ٤٩- بَابٌ: تَلْبَسُ الْحَادَّةُ ثِيَابَ الْعَصْبِ

٥٣٤٢- حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ حَرْبٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ حَفْصَةَ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا لاَ تَكْتَحِلُ وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ»[1].

## ٤٩- باسێک: ئافرەتی تەعزیەبار پۆشاکی عەصب[2] لەبەر دەکات

**٥٣٤٢-ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دروست نییە بۆ ئافرەتێکی مسوڵمان باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت لە سێ ڕۆژ زیاتر تەعزیەبار بێت مەگەر بۆ مێردی، جا بێگومان نابێ چاو بڕەژێت و نابێ پۆشاکی ڕەنگکراو بپۆشێت، جگە لە پۆشاکی عەصەب)).**

٥٣٤٣ - وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَتْنَا حَفْصَةُ، حَدَّثَتْنِي أُمُّ عَطِيَّةَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ: «وَلاَ تَمَسَّ طِيبًا إِلاَّ أَدْنَى طُهْرِهَا إِذَا طَهُرَتْ، نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ وَأَظْفَارٍ»[3].

**٥٣٤٣- وە (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای) ئەنصاری[4] دەڵێ: هیشام بۆی گێڕاینەوە وتی: حەفصە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئوممو عەتییە ﵂ بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد[5] و فەرمووی: (( (ژنی تەعزیەبار) بۆنی خۆش لە خۆی نەدات مەگەر نزیکی پاك بوونەوەی، کە پاك بوویەوە کەمێك لە بوغورد و (بۆنی) ئەزفار[6] (بەکار بێنێ) )).**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣.

(٢) پۆشاکێکی یەمەنییە وتراوە پۆشاکێکی ڕەش و سپییە. **بڕوانە : إرشاد الساری: ١١٢/١٢.**

(٣) بڕوانە: ٣١٣.

(٤) ئەم مامۆستایە کە ناسراوە بە ئەنصاری مامۆستای بوخاری بووە.

(٥) ئەو شتەی ڕێگری لێ کرد باسی نەکردوە، چونکە ئەم فەرمووده وەک بەشێک بێت لە فەرموودەکەی پێشوو وایە.

(٦) (قُسط و أظفار): دوو جۆر بۆنی خۆشن و بوغوردن.

## ٥٠- بابٌ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا﴾ إلى قوله: ﴿بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾﴾ البقرة

٥٣٤٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا شِبْلٌ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا ﴿٢٣٤﴾﴾ البقرة. قَالَ: كَانَتْ هَذِهِ الْعِدَّةُ تَعْتَدُّ عِنْدَ أَهْلِ زَوْجِهَا وَاجِبًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ﴿٢٤٠﴾﴾ البقرة. قَالَ: جَعَلَ اللَّهُ لَهَا تَمَامَ السَّنَةِ سَبْعَةَ أَشْهُرٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَصِيَّةً، إِنْ شَاءَتْ سَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، وَهْوَ قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴿٢٤٠﴾﴾ البقرة. فَالْعِدَّةُ كَمَا هِيَ، وَاجِبٌ عَلَيْهَا. زَعَمَ ذَلِكَ عَنْ مُجَاهِدٍ. وَقَالَ عَطَاءٌ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ نَسَخَتْ هَذِهِ الآيَةُ عِدَّتَهَا عِنْدَ أَهْلِهَا، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴿٢٤٠﴾﴾ البقرة. وَقَالَ عَطَاءٌ: إِنْ شَاءَتِ اعْتَدَّتْ عِنْدَ أَهْلِهَا، وَسَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ لِقَوْلِ اللَّهِ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ ﴿٢٤٠﴾﴾ البقرة. قَالَ عَطَاءٌ: ثُمَّ جَاءَ الْمِيرَاثُ فَنَسَخَ السُّكْنَى، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَلاَ سُكْنَى لَهَا[1].

---

(١) بروانه: ٤٥٣١.

# ٥٠- باسێک: (ئەو پیاوانەی کە دەمرن لە ئێوە و هاوسەران جێ دەهێڵن) تا ئەم فەرمایشتە (ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن)

٥٣٤٤- ئیبنو ئەبو نەجیح لەموجاهیدەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەم ئایەتە (ئەو پیاوانەی کە دەمرن لە ئێوە و هاوسەران بەجێ دەهێڵن)، وتی: مەبەست پێی ئەو عیددەیەیە کە ئافرەتەکە لای کەس و کاری مێردەکەی بەسەری دەبات واجبە، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەو پیاوانەی کە دەمرن لە ئێوە و ژنانی هاوسەر بەجێ دەهێڵن (خوا فەرمانی کردوە) بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان تا ساڵێك بەخێو بکرێ، بێ ئەوەی دەربکرێن (لە ماڵی مێردیان)، ئینجا ئەگەر خۆیان چوونە دەرەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نییە، (ئەی کەس و کاری مێرد) لەوەی کە ئەو ژنانە دەیکەن دەربارەی خۆیان بە باشی)، وتی: خوا تەواوکردنی ساڵێکی بۆ ئەو ئافرەتە داناوە حەوت مانگ و بیست شەو بە وەسیەت کردن بۆیان، (لەگەڵ چوار مانگ و دە شەو بەفەرز عیددە بکێشن، ئەگەر ئافرەتە (مێرد مردووەکە ویستی تا کۆتایی وەسیەتەکەی دادەنیشێ، ئەگەریش ویستی دەڕوات و دانانیشێ، ئەوەش مەبەست و مانای ئەو فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: (بێ ئەوەی دەربکرێن لە ماڵی مێردیان، ئینجا ئەگەر خۆیان چوونە دەرەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نییە)، جا عیددەکە (کە چوار مانگ و دە شەوە) فەرزە لەسەری وەك خۆی. (شبلی دەڵێ: ئیبنو ئەبی نەجیح) ئەو قسەیەی لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە[1].

وە عەتاش دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: ئەم ئایەتە مانەوەی عیددەی ئافرەت (ی مێرد مردوو)ی لە ماڵی کەس و کاری خودی ئافرەتەکە نەسخ کردۆتەوە،

---

(١) وا دیارە موجاهید پێی وا نییە ئەو ئایەتە نەسخ بو بێتەوە (إرشاد الساري: ٦٨/١٠)

**کەواو بوو ماوەی عیددەکەی لەهەر شوێنێك بیەوێ دەمێنێتەوە، وە بەڵگەی نەسخەکەش ئەم فەرمایشتەی خوایە: ﴿غَيۡرَ إِخۡرَاجٖ ﴿٢٤٠﴾﴾[1] عەتا دەڵێ: ئەگەر ئافرەتەکە ویستی لای کەس و کاری مێردەکەی عیددە بەسەر دەبات و لەماڵی مێردەکەی نیشتەجێ دەبێ و دەمێنێتەوە، کە لە وەسیەتی (مێردەکەیدا) بۆی کراوە، وە ئەگەر ئافرەتەکە ویستی (لە ماڵی مێردەکەی) دەڕواتە دەرەوە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئیتر ئێوە کەس و کاری مێردەکە گوناهتان لەسە نییە لەوەی کە (ئەو ئافرەتانە) دەیکەن)، عەتا دەڵێ: پاشان میرات هات و دابەزی[2] جا مافی نیشتەجێ بوون (ی ئافرەتەکە و مانەوەی لای کەس و کاری مێردەکەی) سڕایەوە، (بەڵام وەسێتەکە هەر ماوە)، بۆیە ئافرەت عیددە بەسەر دەبات لەو شوێنەی خۆی ویستی، بەڵام مافی شوێنی مانەوەی نییە.**

٥٣٤٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، حَدَّثَنِي حُمَيْدُ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ابْنَةِ أَبِي سُفْيَانَ، لَمَّا جَاءَهَا نَعِيُّ أَبِيهَا دَعَتْ بِطِيبٍ، فَمَسَحَتْ ذِرَاعَيْهَا وَقَالَتْ: مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[3].

**٥٣٤٥- زەینەبی کچی ئوممی سەلەمە لە ئوممی حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ هەواڵی مردنی باوکی بۆ هات داوای بۆنی خۆشی کرد و هێنای بە هەردوو باڵیدا و وتی: من هیچ پێویستیەکم بەبۆنی خۆش**

---

(١) بەبێ ئەوەی دەربکرێن (لە ماڵی مێردیان)

(٢) مەبەستی دابەزینی ئەم ئایەتەیە ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ﴿١٢﴾﴾ النساء.

(٣) بروانە: ١٢٨٠.

نییە، لەبەر ئەوە نەبوایە کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە دەیفەرمووی: ((دروست نییە بۆ ژنێ باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت زیاد لە سێ ڕۆژ تەعزیە بگرێت بۆ هیچ مردوویەك، جگە لە مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ (دروستە تەعزیەی بۆ بگرێ) )).

## ٥١- بَابُ مَهْرِ الْبَغِيِّ وَالنِّكَاحِ الْفَاسِدِ

وَقَالَ الْحَسَنُ: إِذَا تَزَوَّجَ مُحَرَّمَةً وَهْوَ لاَ يَشْعُرُ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا، وَلَهَا مَا أَخَذَتْ، وَلَيْسَ لَهَا غَيْرُهُ. ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: لَهَا صَدَاقُهَا.

٥٣٤٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ[1].

## ٥١- باسی (حوکمی) مارەیی ئافرەتی زیناکار و (مارەیی) مارە کردنی ناڕەوا

حەسەن دەڵێ: ئەگەر پیاو ئافرەتێك کە حەرامە بۆی مارەی بکات، پیاوەکە نەزانێ و هەست نەکات جیا دەکرێنەوە لە یەکتری، ژنەکە ئەوەی لە مارەییدا وەری گرتووە ماڵێتی، جگە لەوە هیچی تری ناکەوێ، پاشان دواتر (حەسەن) دەڵێ: مارەیی هاوشێوەی خۆی دەکەوێ.

٥٣٤٦- ئەبی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نرخی سەگ و پارەی فاڵچی (لە بەرانبەری فالگرتنەوەکەیدا)، وە کرێی و کەسابەتی ئافرەتی داوێن پیسی قەدەغە کردوە.

(١) بڕوانە: ٢٢٣٧.

٥٣٤٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ الْوَاشِمَةَ، وَالْمُسْتَوْشِمَةَ، وَآكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ، وَنَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَكَسْبِ الْبَغِيِّ، وَلَعَنَ الْمُصَوِّرِينَ[1].

**٥٣٤٧- عەونی کوڕی ئەبی جوحەیفە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردوە لە ئافرەتی خاڵ کوت و ئافرەتی خاڵ بۆ کوترا و سوو خۆر و سوو دەر، وە ڕێگری کردوە لە نرخی سەگ و کەسابەتی ئافرەتی داوێن پیس، وە نەفرینی کردوە لە وێنەکێش.**

٥٣٤٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُحَادَةَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ كَسْبِ الإِمَاءِ[2].

**٥٣٤٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ کرێ و کەسابەتی کەنیزەکی قەدەغە کردوە.**

## ٥٢- بَابُ الْمَهْرِ لِلْمَدْخُولِ عَلَيْهَا، وَكَيْفَ الدُّخُولُ، أَوْ طَلَّقَهَا قَبْلَ الدُّخُولِ وَالْمَسِيسِ

٥٣٤٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ زُرَارَةَ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: رَجُلٌ قَذَفَ امْرَأَتَهُ، فَقَالَ: فَرَّقَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَخَوَيْ بَنِي الْعَجْلاَنِ وَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». فَأَبَيَا، فَقَالَ: «اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟». فَأَبَيَا، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا. قَالَ أَيُّوبُ: فَقَالَ لِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ: فِي الْحَدِيثِ شَيْءٌ لاَ أَرَاكَ تُحَدِّثُهُ قَالَ: قَالَ الرَّجُلُ: مَالِي؟ قَالَ: «لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَادِقًا فَقَدْ دَخَلْتَ بِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَهُوَ أَبْعَدُ مِنْكَ»[3].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨٦.

(٢) بڕوانە: ٢٢٨٣.

(٣) بڕوانە: ٥٣١١.

# ٥٢- باسی (حوکمی) مارەیی ئافرەتی لەگەڵدا دروست بوو، درووست بوون چۆن دەسەلمێت؟ یا پیاو ئافرەتەکەی تەڵاق دا پێش دروست بوون لەگەڵی یان بەرکەوتن و دەست لێدانی

٥٣٤٩- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت: پیاوێك تاوانی زینای دایە پاڵ ژنەکەی، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەر ﷺ ژن و پیاوەکەی[١] بەنی عەجلانی لە یەك جیا کردەوە و فەرمووی: ((خوا دەزانێ کە بێگومان یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچ کامیان ملیان نەدا و فەرمووی: ((خوا دەزانێ یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچ کامیان دانیان پێدا نەنا، وەفەرمووی: ((خوا دەزانێ کە بێگومان یەکێکتان درۆزنن، دەی ئایا کەستان تەوبە دەکەن؟)) هیچیان دانیان پێدا نەنا، ئیتر جیای کردنەوە لە یەکتری.

ئەیوب دەڵێ: عەمری کوڕی دینار پێ وتم: ئەم فەرموودەیە شتێکی تیایە نابینم تۆ بیگێڕیتەوە؟ وتی: پیاوەکە وتی: ئەی ماڵ و سامانەکەم؟ وتی: پێ وترا: ((ماڵت نییە ئەگەر تۆ ڕاست بکەیت (لەوەی داوتە پاڵی)، ئەوە ژنت بووە (جیادەبێتەوە و هەموو مارەییەکەی دەکەوێت)، ئەگەر درۆیش بکەیت ئەوە خراپتر و دوورترە لێت )).

---

(١) أخوي بني عجلان: ئەمە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن: (باب التغليب) واتە لایەک زاڵ دەکرێ بەسەر لایەکی تر، وشە (أخ) بۆ برا دەبێژرێ بەڵام ژن و مێردەکەی بە (أخوي) هێناوە، واتە دوو براکە لەبەر ئەوەی لایەنی پیاوەکە زاڵ کراوە یان لەبەر ئەوەی موسوڵمان برای ئیمانین یان لەبەر خزمایەتی نێوانیان، کە هەردووکیان لە هۆزی عەجلان بوون (إرشاد الساري: ٨٧/١٢)

## ٥٣- بابُ الْمُتْعَةِ لِلَّتِي لَمْ يُفْرَضْ لَهَا

لِقَوْلِهِ تَعَالَى ﷻ: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ ﴿٢٣٦﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾ ﴾ البقرة. وَقَوْلِهِ ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾ البقرة. وَلَمْ يَذْكُرِ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْمُلاَعَنَةِ مُتْعَةً حِينَ طَلَّقَهَا زَوْجُهَا.

٥٣٥٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلْمُتَلاَعِنَيْنِ: «حِسَابُكُمَا عَلَى اللهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا». قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَالِي؟ قَالَ: «لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهْوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ وَأَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا»[1].

## ٥٣- باسی بەهرەمەند کردن[2] (پێویستە) بۆ ئەو ژنەی مارەیی بۆ دانەنراوە

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (گوناهتان لەسەر نییە ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان)، تا ئەم فەرمایشتە (بێگومان خوا بینایە بەوەی کە دەیکەن)، وە ئەم فەرمایشتەی خوا: (بۆ تەڵاقدراوان هەیە (بەسەر مێردەکانیانەوە) بەرهەمەند کردن بە باشی ئەوە پێویستە لەسەر پارێزکاران، ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە تای تێ بگەن و ژیربن).**

**وە پێغەمبەر ﷺ لە باسی نەفرین کردندا باسی موتعەی نەفەرموو کاتێ مێردەکەی تەڵاقی دا.**

(١) بڕوانە: ٥٣١١.

(٢) (مُتْعَةٌ): ماڵێکە پیاو دەیدات بە ژن کاتێ تەڵاقی دەدات ئەگەر مارەیی بۆ دانەنرابێت.

٥٣٥٠- سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە ژن و مێردی نەفرین کەری فەرموو: ((موحاسەبەتان لای خودایە، یەکێکتان درۆ دەکات، هیچ ڕێگەیەکت نییە ژنت بێ[١]))، پیاوەکە وتی: ئەی ماڵەکەم[٢]؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ماڵت نیە، ئەگەر ئەوە پێت وتووە ڕاست دەکەیت ئەوە ماڵەکەت لە بەرانبەری ئەوەدا بووە خێزان وحەڵاڵت بووە، وە ئەگەر بوهتانت بۆ کردوە ئەوە دوورترە تۆی دوورتر خستۆتەوە لێی (کە هیچت بکەوێ) )).

(١) بە پیاوەکەی فەرموو کە مێردی ئافرەتەکە بوو.
(٢) کە لە مارەییدا پێم داوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٦٩- كِتابُ النفقاتِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٦٩- پەڕاوی خەرجیەکان

## ١- بابُ فَضْلِ النَّفَقَةِ عَلى الأَهْلِ

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ الْحَسَنُ: العَفْوُ: الْفَضْلُ.

٥٣٥١- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ الأَنْصَارِيَّ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ -فَقُلْتُ: عَنِ النَّبِيِّ؟ فَقَالَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً على أَهْلِهِ وَهْوَ يَحْتَسِبُهَا، كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً»[1].

## ١- باسی گەورەیی خەرجی کێشانی ژن و منداڵ

**(وە پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن بڵێ: ئەوەی لێتان زیادە، ئاوەها خودا بەڵگەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا بیر بکەنەوە لە کاری دونیا و دوا ڕۆژدا).**

**حەسەن دەڵێ: (العَفْوُ): زیادەیە.**

**٥٣٥١- عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاری لە ئەبی مەسعوودی ئەنصاریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: وتم (بە ئەبو مسعوود) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕیتەوە؟**

---

(١) بڕوانە: ٥٥.

**وتی: لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕمەوە فەرموویەتی: ((ئەگەر مسوڵمان خەرجیەك بۆخێزانەکەی بکێشێ (هەرچەند پێویستە لەسەری)، وە ئەم مەبەستی ڕەزامەندی خوا بێ، بەخێر بۆی دەنوسرێ)).**

٥٣٥٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ: أَنْفِقْ يَا ابْنَ آدَمَ أُنْفِقْ عَلَيْكَ»[1].

**٥٣٥٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە منیش پێت دەبەخشم)).**

٥٣٥٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِاللَّهِ، أَوِ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ»[2].

**٥٣٥٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مشوور خۆری بێوەژن و هەژار وەکو خەباتگێڕ وایە لە ڕێی خوا، یان وەکو شەو نوێژکاری شەو، وە ڕۆژووەوانی ڕۆژوو وایە)).**

٥٣٥٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ: لِي مَالٌ، أُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً، يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَهْمَا أَنْفَقْتَ فَهُوَ لَكَ صَدَقَةٌ حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا فِي فِي امْرَأَتِكَ، وَلَعَلَّ اللَّهَ يَرْفَعُكَ، يَنْتَفِعُ بِكَ نَاسٌ وَيُضَرُّ بِكَ آخَرُونَ»[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٦٨٤.

(٢) بڕوانە: ٦٠٠٦، ٦٠٠٧.

(٣) بڕوانە: ٥٦.

**٥٣٥٤- عامیری کوڕی سەعد لە سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: من لە مەککەدا نەخۆش بووم پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردم، عەرزم کرد: من ماڵ و سامانم هەیە وەسیەت بکەم گشت ماڵەکەم بکرێ بە خێر؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: دەی سێ یەکی؟ فەرمووی: ((سێ یەك باشە هێشتا سێ یەکیش زۆرە، چونکە تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵی چاکترە لەوەی کە جێیان دێڵی هەژاربن، دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە و سواڵ بکەن، هەر چەندێ ماڵ ببەخشیت ئەوە بێگومان خێر و چاکەیە بۆت، هەتا ئەو پارووەی بەرزی دەکەیتەوە دەیخەیتە دەمی هاوسەرکەتەوە، ئومێد دەکەم خوا پلەت بەرز بکاتەوە، خەڵکانێك سوودمەند ببن لێت [١] وە کەسانێکیش زەرەرمەند ببن بە هۆتەوە[٢])).**

## ٢- بابُ وُجُوبِ النَّفَقَةِ عَلَى الأَهْلِ وَالْعِيَالِ

٥٣٥٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ مَا تَرَكَ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ».

تَقُولُ الْمَرْأَةُ: إِمَّا أَنْ تُطْعِمَنِي وَإِمَّا أَنْ تُطَلِّقَنِي. وَيَقُولُ الْعَبْدُ: أَطْعِمْنِي وَاسْتَعْمِلْنِي. وَيَقُولُ الابْنُ: أَطْعِمْنِي، إِلَى مَنْ تَدَعُنِي؟ فَقَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لاَ، هَذَا مِنْ كِيسِ أَبِي هُرَيْرَةَ[٣].

---

(١) کە موسوڵمان و باوەڕدارن.

(٢) کە بێ باوەڕ و کافرن.

(٣) بڕوانە: ١٤٢٦.

## ٢- باسی خەرجی کێشانی ژن و منداڵ پێویستە

٥٣٥٥- ئەبو صالح دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چاکترین و گەورەترین ماڵ بەخشین ئەوەیە دەوڵەمەندی بمێنێ[1]، وە دەستی سەرەوە چاکتر لە دەستی ژێرەوە، لەو کەسانەوە دەست پێ بکە بە خێویان دەکەیت)).

ژن دەڵێ: یان خۆراکم بدەرێ یان تەڵاقم بدە، کۆیلەش دەڵێ: خۆراکم بدەرێ و کارم پێ بکە، کوڕیش دەڵێ: خۆراکم پێ بدە بۆ کێم بەجێ دێڵی؟ وتیان: ئەی ئەبو هورەیرە ئەمەت[2] لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ وتی: نەخێر ئەمە لە ژیری و هۆشمەندی ئەبو هورەیرەوەیە ﷺ.

٥٣٥٦- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدِ بْنِ مُسَافِرٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[3].

٥٣٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چاکترین ماڵ بەخشین ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بێت و بکرێ، وە لەوانەوە دەست پێ بکە بەخێویان دەکەیت)).

## ٣- بابُ حَبسِ الرَّجُلِ قُوتَ سَنَةٍ عَلَى أهله، وَكيفَ نَفَقَاتُ العِيَالِ؟

٥٣٥٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ قَالَ: قَالَ لِي مَعْمَرٌ: قَالَ لِي الثَّوْرِيُّ: هَلْ سَمِعْتَ فِي الرَّجُلِ يَجْمَعُ لِأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ أَوْ بَعْضِ السَّنَةِ؟ قَالَ مَعْمَرٌ:

---

(١) خێرکەرەکە واتە: ئەوەندە نەبەخشێت هەژار بکەوێ.
(٢) لەبەشی ژن دەڵێ تا کۆتایی وتەکە.
(٣) بڕوانە: ١٤٢٦.

فَلَمْ يَحْضُرْنِي، ثُمَّ ذَكَرْتُ حَدِيثًا حَدَّثَنَاهُ ابْنُ شِهَابٍ الزُّهْرِيُّ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَبِيعُ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَيَحْبِسُ لأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ[1].

## ٣- باسی (دروستە) پیاو خەرجی و بژێوی ساڵیک بۆ ژن و منداڵی دانێت، وە خەرجیەکانی خێزان و کەس و کار چۆن بێت؟

**٥٣٥٧- ئیبنوعویەینە وتی: مەعمەر پێ وتم: سەوری پێی وتم: بیستووتە دەربارەی پیاوێ بژێوی ساڵێکی خێزانی یان بەشێکی ساڵەکە کۆ بکاتەوە (و دابنێ)؟ مەعمەر وتی: هیچم لە بیر نەبوو، پاشان فەرموودەیەکم بیرکەوتەوە کە ئیبنو شیهابی زوهری بۆی گێڕاینەوە لە مالیکی کوڕی ئەوسەوە لە عومەرەوە ﷺ گێڕایەوە، کە پێغەمبەر ﷺ خورمای باخەکانی بەنی نەزیری دەفرۆشت، خۆراك و بژێوی ساڵێکی خێزانەکانی لێ دادەنا.**

٥٣٥٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَالِكُ بْنُ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ، وَكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ذَكَرَ لِي ذِكْرًا مِنْ حَدِيثِهِ، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى دَخَلْتُ على مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مَالِكٌ: انْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ على عُمَرَ، إِذْ أَتَاهُ حَاجِبُهُ يَرْفَا، فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدٍ يَسْتَأْذِنُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمْ قَالَ: فَدَخَلُوا وَسَلَّمُوا فَجَلَسُوا، ثُمَّ لَبِثَ يَرْفَا قَلِيلاً، فَقَالَ لِعُمَرَ: هَلْ لَكَ فِي عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمَا، فَلَمَّا دَخَلاَ سَلَّمَا وَجَلَسَا، فَقَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا. فَقَالَ الرَّهْطُ -عُثْمَانُ وَأَصْحَابُهُ-: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنَهُمَا، وَأَرِحْ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ. فَقَالَ عُمَرُ: اتَّئِدُوا، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ؟». يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَفْسَهُ. قَالَ الرَّهْطُ قَدْ قَالَ ذَلِكَ. فَأَقْبَلَ عُمَرُ على عَلِيٍّ

(١) بڕوانە: ٢٩٠٤.

وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ ذَلِكَ؟ قَالا: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي أُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ، إِنَّ اللَّهَ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ ﷺ فِي هَذَا الْمَالِ بِشَيْءٍ لَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا غَيْرَهُ، قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ ﴾ الحشر. فَكَانَتْ هَذِهِ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ، وَلاَ اسْتَأْثَرَ بِهَا عَلَيْكُمْ، لَقَدْ أَعْطَاكُمُوهَا وَبَثَّهَا فِيكُمْ، حَتَّى بَقِيَ مِنْهَا هَذَا الْمَالُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْفِقُ على أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِمْ مِنْ هَذَا الْمَالِ، ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ، فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ، فَعَمِلَ بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيَاتَهُ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ لِعَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ نَبِيَّهُ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَقَبَضَهَا أَبُو بَكْرٍ يَعْمَلُ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنْتُمَا حِينَئِذٍ -وَأَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ- تَزْعُمَانِ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَذَا وَكَذَا، وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّهُ فِيهَا صَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، فَقَبَضْتُهَا سَنَتَيْنِ أَعْمَلُ فِيهَا بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جِئْتُمَانِي وَكَلِمَتُكُمَا وَاحِدَةٌ وَأَمْرُكُمَا جَمِيعٌ، جِئْتَنِي تَسْأَلُنِي نَصِيبَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، وَأَتَى هَذَا يَسْأَلُنِي نَصِيبَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهُ إِلَيْكُمَا على أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ لَتَعْمَلاَنِ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَبِمَا عَمِلَ بِهِ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ، وَبِمَا عَمِلْتُ بِهِ فِيهَا، مُنْذُ وُلِّيتُهَا، وَإِلاَّ فَلاَ تُكَلِّمَانِي فِيهَا، فَقُلْتُمَا: ادْفَعْهَا إِلَيْنَا بِذَلِكَ. فَدَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا بِذَلِكَ؟ فَقَالَ الرَّهْطُ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَقْبَلَ على عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. قَالَ أَفَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ؟ فَوَالَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ لاَ أَقْضِي فِيهَا قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ، حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَادْفَعَاهَا فَأَنَا أَكْفِيكُمَاهَا[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٩٠٤.

٥٣٥٨- ئیبنو شیهاب دەڵێ: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان بۆی گێڕامەوە، وە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمیش باسی ئەو فەرموودەی (مالیکی کوڕی ئەوسی) بۆ کردم، منیش ڕۆشتم هەتا ڕۆشتمە لای مالیکی کوڕی ئەوس و پرسیاری ئەو فەرموودەیەم لێ کرد، مالیکیش وتی: ڕۆشتم هەتا چوومە ژوورەوە بۆ لای عومەر ، لەو کاتەدا یەرفەئی دەرگاوانی هات بۆلای عومەر  وتی: ئایا دەتەوێ عوسمان و عەبدوڕەحمان و زوبەیر و سەعد  بێنە (ژوورەوە) داوای مۆڵەتت لێ دەکەن؟ وتی: بەڵێ مۆڵەتیان بدە (با بێنە ژوورەوە) دەڵێ: ئینجا هاتنە ژوورەوە سەلامیان کرد و دانیشتن، پاشان یەرفەئیش کەمێکی پێچوو، وتی بە عومەر : ئایا دەتەوێ عەبباس و عەلی بێنە (ژوورەوە)؟ وتی: بەڵێ، مۆڵەتی هەردووکیان بدە (بێنە ژوورەوە)، جا کاتێ هەردووکیان هاتنە ژوورەوە و سەلامیان کرد و دانیشتن، عەبباس  وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لە نێوان من و ئەم (عەلی)دا بڕیار بدە و قەزاوەت بکە، جا کۆمەڵەکەش- عوسمان و هاوڕێکانی- وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران بڕیار بدە لە نێوانیاندا لە دەستی یەکتری ڕزگاریان بکە، عومەریش وتی: لەسەرخۆبن تو ئەو خوایەی کە بەفەرمانی ئەو زەوی و ئاسمان ڕاوەستاوە، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە کەلەپورمان لێ ناگیرێ ئەوەی لێمان بەجێما خێرە[1]))، پێغەمبەری خوا بەم فەرموودە خۆی مەبەستە؟ کۆمەڵەکە وتیان: بێگومان ئەوەی فەرمووە، ئەوسا عومەر ڕووی کردە عەلی و عەبباس  وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە؟ هەردووکیان وتیان: بێگومان ئەوەی فەرمووە، عومەر وتی: جا بێگومان من دەربارەی ئەو کارە قسەتان بۆ دەکەم، بەڕاستی خوا هەندێ لەم

---

(١) بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان خەرج دەکرێ.

دەست کەوتەی تایبەت کردوە بە پێغەمبەرەوە ﷺ بەکەسی تری نەداوە، خوا دەفەرمووی: (ئەو (دەست کەوتانەی) کە خوا سەندیەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەزیر) ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ وشترێکتان تاونەداوە، بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکات بەسەر هەر کەسدا کە بیەوێت، وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە دەسەڵاتە). دەی ئەمە تایبەت بوو بە پێغەمبەر ﷺ، سوێند بەخوا کۆی نەکردۆتەوە بۆ خۆی بەتەنها ئێوەی لێ بێ بەش بکات، وە تایبەتی نەکردوە بەخۆی جگە لە ئێوە، بێگومان داوێتی بەئێوەش و دابەشی کردوە بەسەرتاندا، هەتا ئا ئەم سامانەی لێ ماوەتەوە، جا پێغەمبەری خوا خەرجی و بژێوی ساڵێکی خاوخێزانی لەم فەیئە بوو، پاشان ئەوەشی دەمایەوە بەماڵ و سامانی خوای دادەنا (لە بەرژەوەندی گشتیدا خەرجی دەکرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرەی دەکرد تا لە ژیاندا بوو، سوێندتان دەدەم بەخوا ئەمە دەزانن؟ وتیان: بەڵێ (دەیزانین). پاشان بەعەلی و عەبباسی وت: سوێندتان دەدەم بەخوا ئێوەش هەردووکتان ئەمە دەزانن؟ (هەردووکیان وتیان: بەڵێ)[1] عومەر وتی: پاشان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ بردەوە بۆ لای خۆی، جا ئەبو بەکر وتی: میراتگری پێغەمبەری خوام ﷺ ئیتر ئەبو بەکر ئەو ماڵی (فەیئەی) وەرگرت، و بەو جۆرەی لێ دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەکرد (کە لەژیانیدا) - جا ڕووی کردە عەلی و عەبباس- وتی: وە ئێوە هەردووکتان لەو ڕۆژگارەدا دەتانوت ئەبو بەکر وا و وایە، خواش دەزانێ کە بێگومان ئەبو بەکر دەربارەی ئەو سامانە ڕاستگۆ و بە چاکی و سەر ڕاستانە شوێن هەق کەوتبو، پاشان خوا ئەبو بەکری ﷺ بردەوە و مرد، منیش وتم: من لە جێی پێغەمبەری خوا و ﷺ ئەبو بەکرم ﷺ دوو ساڵ لە دەسەڵاتی خۆم وەرم گرت،

---

(١) لە گێڕانەوەی عەقیل لە ئیبن شیهابەوە لە (کتاب الفرائض)ـدا هاتووە.

بەو جۆرەم لێ دەكرد كە پێغەمبەری خوا ﷺ وئەبو بەكر ﷺ دەیانكرد. پاشان هەردووكتان هاتوون بۆ لام قسەم لەگەڵدا دەكەن وە قسەی هەردووكیشتان یەكە، كارەكەشتان پێكەوەیە و یەك كارە، تۆ (عەبباس) هاتووی داوای بەشەكەت لە برازاكەی خۆت دەكەیت، ئەمەش (عەلی) هاتووە بۆ لام بەشی هاوسەرەكەی لە باوكی داوا دەكات، ئەگەر حەز دەكەن دەیدەمەوە بە هەردووكتان، بەڵام مەرج بێ لەسەر هەردووكتان پەیمان و بەڵێنی خوا بێ لەسەرتان كە لەو سامانەدا بەو جۆرە بەكاری بێنن كە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكر ﷺ بەكاریان هێناوە، وە بەجۆرەی من بەكارم هێنا لەوەتەی كراومەتە گەورەی مسوڵمانان، ئەگەر نا قسەم لەگەڵ مەكەن (لەو بارەیەوە) ئێوەش هەردووكتان، وتیان: بەو جۆرە بیدەرەوە پێمان. منیش بەو جۆرە دامەتەوە پێتان، (بە كۆمەڵەكەی عوسمان و هاوڕێكانی وت): سوێندتان ئەدەم بەخوا ئایا بەو جۆرە داومەتەوە بەهەردووكیان؟ كۆمەڵەكەش وتیان: بەڵێ وابوو، دەڵێ: ئینجا ڕووی كردە عەلی و عەبباس ﷺ وتی: سوێندتان ئەدەم بەخوا ئایا بەو جۆرە داومەتەوە بە هەردووكتان؟ هەردووكیان وتیان: بەڵێ، عومەر وتی: دەی جگە لەمە بڕیارێكی ترتان لە من دەوێ؟ جا سوێند بەو خودایەی كە ئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو ڕاوەستاوە، هیچ بڕیارێكی تیا نادەم جگە لەمە، هەتا قیامەت بەرپا دەبێت، جا ئەگەر نەتان توانی بەو شێوەی وتم جێ بەجێی بكەن (و دەبێتە كێشەتان)، ئەوسا بیگێڕنەوە بۆ لای خۆم، بێگومان خۆم لە جیاتی هەردووكتان ئەو كارە دەكەم.

**٤- بابٌ: وقال الله تعالى:** ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ **إلى قوله:** ﴿ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة. **وقال:** ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًاۚ ﴿١٥﴾ ﴾ الأحقاف. **وقال تعالى:** ﴿ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ ﴿٧﴾ ﴾ **إلى قوله:** ﴿ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ ﴾ الطلاق.

وَقَالَ يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: نَهَى اللَّهُ أَنْ تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا، وَذَلِكَ أَنْ تَقُولَ الوَالِدَةُ: لَسْتُ مُرْضِعَتَهُ. وَهْيَ أَمْثَلُ لَهُ غِذَاءً، وَأَشْفَقُ عَلَيْهِ، وَأَرْفَقُ بِهِ مِنْ غَيْرِهَا، فَلَيْسَ لَهَا أَنْ تَأْبَى بَعْدَ أَنْ يُعْطِيَهَا مِنْ نَفْسِهِ مَا جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَلَيْسَ لِلْمَوْلُودِ لَهُ أَنْ يُضَارَّ بِوَلَدِهِ وَالِدَتَهُ، فَيَمْنَعَهَا أَنْ تُرْضِعَهُ ضِرَارًا لَهَا إِلَى غَيْرِهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَسْتَرْضِعَا عَنْ طِيبِ نَفْسِ الوَالِدِ وَالْوَالِدَةِ، ﴿ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَاۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة

بَعْدَ أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُما وَتَشَاوُرٍ، ﴿ فِصالُهُ ﴾ الأحقاف: فِطَامُهُ.

## ٤- باسێک:وه خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: (دایکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو، ئەمە بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (وە (خوا) بینایە بەوەی کە دەیکەن)

**وە خوا دەفەرموێ: (دووگیان بوون (ی دایک) پێیەوە و لە شیر بڕینەوەی سی مانگە)، وە خوای گەورە دەفەرمووێ (وە ئەگەر تەنگیتان کرد[1] ئەوە با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ، با دەوڵەمەند بە پێی دەوڵەمەندی نەفەقە بدات، وە هەر کەسێك کەم دەست و هەژار بوو)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە: (دوای تەنگانە ئاسانی دەبێت).**

---

(١) نە سازان لە کرێکەدا.

یونس له زوهرییەوه دەگێڕێتەوه و دەڵێ: خوای بەرز و بڵند قەدەغەی كردوه كەدایك زیان بگەیەنێت به منداڵەكەی، ئەوەش كەدایكەكه بڵێ: من شیری پێ نادەم له كاتێكدا شیری ئەو چاكترین خۆراكه بۆ منداڵەكه، وه بەسۆز و دڵسۆزتره به منداڵەكه له هەر ژنێكی تر، بۆیه ئەو دایكه ڕەوا نییه بۆی ڕازی نەبێت (شیری پێ بدات)، دوای ئەوەی باوكەكه ئەوەندەی خوا پێی داوه كرێی پێ بدات، هەروەها باوكی منداڵەكەش بۆی نییه بەهۆی منداڵەكەیەوه زیان بەدایكی منداڵەكه بگەیەنێت، ڕێگه نەدات شیر بدات بەمنداڵەكەی زیانی پێ بگەیەنێت بەو كاره، بیەوێ ژنێكی تر شیری بداتێ، ژن و پیاو گوناهیان ناگات به ڕەزامەندی هەردووكیان دایەن و شیردەرێكی بۆ بگرن، (جا ئەگەر هەردووكیان (ژن و پیاوەكه) ویستیان (منداڵەكه) له شیر ببڕنەوه[1]، به ڕەزامەندی و ڕاوێژیی هەردوو لایان ئەوه گوناهتان ناگات). پاش ئەوەی ئەو له شیر برینەوه به ڕەزامەندی و ڕاوێژی هەردوو لایان بێت. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ﴿ فِصالُهُ ﴾: بڕینەوەی له شیر.

## ٥- بابُ نَفَقَةِ المَرْأَةِ إِذَا غَابَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَنَفَقَةِ الوَلَدِ

٥٣٥٩- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِي لَهُ عِيَالَنَا؟ قَالَ: «لاَ، إِلاَّ بِالْمَعْرُوفِ»[2].

---

(١) له پێش دوو ساڵەكه.

(٢) بڕوانه: ٢٢١١.

## ٥- باسی خەرجی ژن ئەگەر مێردەكەی لە جێگايەكی دوور بوو لە ژنەكەی، هەروەها خەرجی منداڵەكانيشی[١]

**٥٣٥٩- عائيشە ﵂ دەڵێ: هيندی كچی عوتبە هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی ئەبو سوفيان پياوێكی ڕژدە و ڕەزيلە، دەی ئايا گوناحم لەسەرە لەو ماڵەی هی ئەوە خۆراك بدەم بە ژن و منداڵەكانی؟ فەرمووی: ((نەخێر پێيان مەدە مەگەر بەپێی پێويست و بە پێی عورف و عادەت)).**

٥٣٦٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ كَسْبِ زَوْجِهَا عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِهِ»[٢].

**٥٣٦٠- هەممام دەڵێ: لە ئەبو هوڕەيرەم ﵁ بيست لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕايەوە كە فەرموويەتی: ((ئەگەر ئافرەت بەبێ فەرمانی مێردەكەی لەوەی مێردەكەی پەيدای كردوە ببەخشێت، ئەوە نيوەی پاداشتەكەی بۆ مێردەكەيە[٣] )).**

## ٦- بَابُ عَمَلِ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا

٥٣٦١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي الْحَكَمُ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، أَنَّ فَاطِمَةَ ﵍ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ تَشْكُو إِلَيْهِ مَا تَلْقَى فِي يَدِهَا مِنَ الرَّحَى - وَبَلَغَهَا أَنَّهُ جَاءَهُ رَقِيقٌ- فَلَمْ تُصَادِفْهُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ، فَلَمَّا جَاءَ أَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ، قَالَ: فَجَاءَنَا وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا نَقُومُ، فَقَالَ: «على مَكَانِكُمَا». فَجَاءَ فَقَعَدَ بَيْنِي وَبَيْنَهَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ على بَطْنِي، فَقَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكُمَا على خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَا، إِذَا

---

(١) واتە: پێويستە هەم خەرجی ژنەكەی وە هەم خەرجی منداڵەكانی بدات .

(٢) بڕوانە: ٢٠٦٦.

(٣) نيوەكەی كەشی بۆ ئافرەتەكەيە.

أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا -أَوْ أَوَيْتُمَا إِلَى فِرَاشِكُمَا- فَسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَكَبِّرَا أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، فَهْوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ»[1].

## ٦- باسی ئیش و کار کردنی ژن له ماڵی مێردەکەیدا

**٥٣٦١- ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: عەلی بۆی گێڕاینەوە کە فاتیمە ﷺ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو سکاڵای ماندوو بوونی دەستی کرد بەهۆی (ئیشکردن بە) دەستاڕ، -وە هەواڵی پێ گەشتبوو کە پێغەمبەر ﷺ چەند کۆیلە و کەنیزەکێکی بۆ هاتبوو- (ئینجا فاتیمەیش ڕۆشت)، بەڵام پێغەمبەری ﷺ دەست نەکەوت، بۆیە ئەو (داوایەی) بۆ عائیشە باس کرد، ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە. عائیشە ﷺ هەواڵی پێدا، (عەلی) دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان لە کاتێکدا لەسەر جێگاکانمان ڕاکشابووین، ویستمان هەستینەوە فەرمووی: ((لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن)) ئینجا لە نێوان من فاتیمەدا دانیشت (بە جۆرێ) هەتا هەستم بەساردی پێی کرد بەسەر سنگمەوە، وە فەرمووی: ((ئایا شتێکتان فێربکەم چاکتر لەوەی هەردووکتان داواتان کردوە؟ کاتێ ڕۆشتنە سەرجێگای نووستنەکەتان هەردووکتان سی وسێ جار بڵێن** (سبحان الله) **و سی وسێ جار بڵێن** (الحمد لله) **و سی وچوار جار بڵێن** (الله أكبر)، **بەڕاستی ئەوە لە خزمەتکار چاکترە بۆ هەردووکتان)).**

## ٧- بابُ خَادِمِ المَرْأَةِ

٥٣٦٢- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي يَزِيدَ، سَمِعَ مُجَاهِدًا: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى يُحَدِّثُ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّ فَاطِمَةَ ﷺ أَتَتِ

---

(١) بڕوانە: ٣١١٣.

النَّبِيَّ ﷺ تَسْأَلُهُ خَادِمًا، فَقَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكِ مَا هُوَ خَيْرٌ لَكِ مِنْهُ، تُسَبِّحِينَ اللَّهَ عِنْدَ مَنَامِكِ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدِينَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتُكَبِّرِينَ اللَّهَ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ». -ثُمَّ قَالَ سُفْيَانُ: إِحْدَاهُنَّ أَرْبَعٌ وَثَلاَثُونَ- فَمَا تَرَكْتُهَا بَعْدُ قِيلَ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ[1].

## ٧- باسی (حوکمی ) خزمەتکاری ژن[2]

**٥٣٦٢- موجاهید دەڵێ: لە عەبدوڕەحمانی کوڕی لەیلام بیست لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، کە فاتیمە ﷺ چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای خزمەتکاری لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئایا هەواڵت بدەمێ بەوەی باشترە بۆ تۆ لە خزمەتکار؟ لە کاتی خەوتندا سی و سێ جار** (سبحان الله) **بکە و سی و سێ جار** (الحمد لله) **بکە و سی و چوار جار** (الله اكبر) **بکە)).**

**-پاشان سوفیان وتی: یەکێکیان[3] سی وچوار بوو- (عەلی دەڵێ): جا لەو کاتە تا ئێستا هێشتا وازم لێ نەهێناوە[4]، پێی وترا: لە شەوی صیففینیشدا؟ وتی: لەشەوی صیففینیشدا هەر خوێندمەوە و وازم لێ نەهێناوە.**

## ٨- بابُ خِدمَةِ الرَّجُلِ فِي أَهْلِه

٥٣٦٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَتْ: كَانَ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ، فَإِذَا سَمِعَ الأَذَانَ خَرَجَ[5].

---

(١) بڕوانە: ٣١١٣.

(٢) ئایا پێویستە پیاو خزمەتکار بۆ ژنی بگرێت یان نا؟.

(٣) لە زیکرەکان.

(٤) هەر بەردەوام دەیان ڵێم.

(٥) بڕوانە: ٦٧٦.

## ٨- باسى خزمەت كردنى پياو لە ناو ماڵ و منداڵى خۆيدا (دروستە)[١]

٥٣٦٣- ئەسوەدی کوڕی یەزید دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﵂ کرد پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە چ ئیش و کارێك دەکات؟ عائیشە وتی: پێغەمبەر ﷺ خەریکی کار و خزمەتی خێزانەکەی دەبێ، بەڵام کە گوێی لە بانگ بوو لە ماڵ دەردەچێ (بۆ مزگەوت).

## ٩- بابٌ: إِذَا لَمْ يُنفِقِ الرَّجُلُ فَلِلْمَرْأَةِ أَنْ تَأْخُذَ بِغَيْرِ عِلْمِهِ مَا يَكْفِيهَا وَوَلَدَهَا بِالْمَعْرُوفِ

٥٣٦٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ هِنْدَ بِنْتَ عُتْبَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِى مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي، إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهْوَ لاَ يَعْلَمُ. فَقَالَ: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ»[٢].

## ٩- باسێک: ئەگەر پیاو خەرجی بۆ خێزانی نەکرد، ئەو ژنەکە بۆی هەیە بە پێ پێویست ئەوەندەی بەشی خۆی و منداڵەکەی بکات لە ماڵی مێردەکەی ببات، بەبێ ئاگاداری ئەو

٥٣٦٤- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە هیندی کچی عوتبە ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە، ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆم ومنداڵەکەم بکات، جگە لەوەی کە خۆم بە دزیوە لە ماڵی ئەو دەیبەم و ئەو نازانێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوەندە ببە بەشی خۆت و منداڵەکەت بکات بە پێی پێویست)).

---

(١) ئیش کاری خۆی بکات لە ماڵەوە یان هاوکاری ژن و منداڵەکانی بکات کاری جوان و ڕەوایە.
(٢) بڕوانە: ٢٢١١.

## ١٠- بابُ حِفْظِ المَرْأَةِ زَوْجَهَا فِي ذَاتِ يَدِهِ وَالنَّفَقَةِ

٥٣٦٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ، وَأَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ نِسَاءُ قُرَيْشٍ -وَقَالَ الآخَرُ: صَالِحُ نِسَاءِ قُرَيْشٍ- أَحْنَاهُ عَلَى وَلَدٍ فِي صِغَرِهِ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ». وَيُذْكَرُ عَنْ مُعَاوِيَةَ وَابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ١٠- باسی پارێزگاری ژن لە ماڵ و سامان و خەرجی مێردەكەی

**٥٣٦٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئافرەتانی قورەیش چاكترین ئافرەتن سواری وشتر بووبن - ڕاویەكەی تریان[2] دەڵێ - باشترینی[3] ئافرەتانی قورەیشن - دڵسۆزتریی ئافرەتانن بۆ منداڵی ساوا، وە مشوورخۆرترینی ئافرەتانن بۆ مێرد دەربارەی ماڵ و سامانی)).**

**وە ئەم فەرموودەیە دەگێڕدرێتەوە لەموعاوییە و ئیبنو عەبباسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

## ١١- بابُ كِسْوَةِ المَرْأَةِ بِالْمَعْرُوفِ

٥٣٦٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَيْسَرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: آتَى إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ حُلَّةً سِيَرَاءَ فَلَبِسْتُهَا، فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَّقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي[4].

---

(١) بڕوانە: ٣٤٣٤.

(٢) ئەم فەرموودەیە سوفیان لە دوو كەسەوە گێڕایەتیەوە، ئیبنو تاووس لە باوكیەوە، لەگەڵ ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە، ئەوەی لەسەرەوە وترا و ڕاویەكەی تریان مەبەست گێڕانەوەكەی ئەبو زەنادە.

(٣) لە پێشدا بە (خیر نساء قریش) گێڕاویانەتەوە بەڵام ئەبو زیناد بە (صالح النساء قریش) گێڕاویەتیەوە.

(٤) بڕوانە: ٢٦١٤.

## ١١- باسی جل و بەرگی ژن بەپێی پێویست و با و نەریت[١]

**٥٣٦٦- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی خەت خەت کە ئاوریشمی تێکەڵ بوو بەدیار بۆ ناردم، منیش لەبەرم کرد (کە دی لەبەرمدا) توڕەییم لە دەم و چاویدا بینی، بۆیە منیش لەتم کرد لە نێوان ئافرەتانی ماڵەوەماندا، (دابەشم کرد وەك سەرپۆش).**

## ١٢- بَابُ عَوْنِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا فِي وَلَدِهِ

٥٣٦٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: هَلَكَ أَبِي وَتَرَكَ سَبْعَ بَنَاتٍ -أَوْ تِسْعَ بَنَاتٍ- فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّبًا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: «بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا». قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا. قَالَ: «فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ، وَتُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ!». قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وَتَرَكَ بَنَاتٍ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ. فَقَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ». أَوْ قَالَ خَيْرًا[٢].

## ١٢- باسی سوننەتە ژن هاوکاری مێرد بکات لە (کاروباری) منداڵیدا

**٥٣٦٧- عەمر لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: باوکم مرد و حەوت کچ - یان نۆ کچ - ی لێ بە جیما، منیش ئافرەتێکی بێوەژنم مارەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێم: ((جابیر ژنت هێناوە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((کچ یان بێوەژنت هێناوە؟)) وتم: (کچم نەهێنا) بەڵکو بێوەژنم هێنا، فەرمووی: ((ئەی بۆکچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەیت ویاریت لەگەڵ**

(١) لەسەر پیاو پێویستە بۆی بکات.

(٢) بڕوانە: ٤٤٣.

بكات، لەگەڵی پێبكەنی و لەگەڵت پێبكەنێت؟)) دەڵێ عەرزم كرد عەبدوڵڵا (ی باوكم) مرد و چەند كچێكی لێ بەجێما، منیش پێم ناخۆش بوو كچێكی وەك خۆیان بێنم، بۆیە ئافرەتێكم هێنا سەرپەرشتیان بكات و ئیش و كاریان بە چاكی بكات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا فەڕ و بەرەكەتی تێخات بۆت))، یا ((وتەی چاكی فەرمووی)).

## ١٣- بابُ نَفَقَةِ الْمُعْسِرِ عَلَى أَهْلِهِ

٥٣٦٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلَكْتُ. قَالَ: «وَلِمَ؟». قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى أَهْلِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: «فَأَعْتِقْ رَقَبَةً». قَالَ: لَيْسَ عِنْدِي. قَالَ: «فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ. قَالَ: «فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا». قَالَ: لاَ أَجِدُ. فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟». قَالَ: هَا أَنَا ذَا. قَالَ: «تَصَدَّقْ بِهَذَا». قَالَ: عَلَى أَحْوَجَ مِنَّا يَا رَسُولَ اللهِ؟!، فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ مِنَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ قَالَ: «فَأَنْتُمْ إِذًا»[1].

## ١٣- باسی پیاوی نەدار و هەژار نەفەقەی ژن و منداڵی بدات

٥٣٦٨- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: تیاچووم فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتی: لە ڕەمەزاندا لەگەڵ ژنەكەم دروست بووم، فەرمووی: ((دەی كۆیلەیەك ئازاد بكە))، وتی: كۆیلەم نییە، فەرمووی: ((دەی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بە))، وتی: ناتوانم، فەرمووی: ((دەی خواردنی شەست هەژار بدە))، وتی: نیمە، ئینجا سەبەتەیەك هێنرا بۆ

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

پێغەمبەر ﷺ خورمای تیا بوو، فەرمووی: ((كوا پرسیاركەرەكە؟ )) وتی: ئا ئەمەتام. فەرمووی: ((ئەمە بكە بە خێر))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدەم بە هەژارتر لە خۆمان؟ دەی سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە لە نێوان ئەو دوو بەردەڵانە ڕەشەی مەدینەداماڵێكی تیا نییە لە ئێمە هەژارتر و نەدارتر بێت، پێغەمبەریش ﷺ پێكەنی هەتا دانەكانی پێشەوەی دەركەوتن و فەرمووی: ((كەواتە ئێوە (شیاوترن) )).

١٤- **بابٌ**: ﴿ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ ﴿٢٣٣﴾ ﴾البقرة

وهلْ عَلَى المَرْأَةِ مِنْهُ شَيء؟ ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ ﴿٧٦﴾ ﴾ الى قوله: ﴿ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ النحل

٥٣٦٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ لِي مِنْ أَجْرٍ فِي بَنِي أَبِي سَلَمَةَ أَنْ أُنْفِقَ عَلَيْهِمْ، وَلَسْتُ بِتَارِكَتِهِمْ هَكَذَا وَهَكَذَا، إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، لَكِ أَجْرُ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ»[1].

## ١٤- باسێک: (لەسەر کەلەپوور گرە وێنەی ئەوەی (لەسەر باوک بوو) )

وە ئایا هیچێك لەو خەرجییە لەسەر ژنەكەیە؟ (وە خوا نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو یەكێكیان لاڵی زگماكییە)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا (ڕێگەیەكی ڕاست).

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

**٥٣٦٩- زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە لە ئوممی سەلەمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا من پاداشتم هەیە دەربارەی کوڕانی ئەبی سەلەمە کە خەرجیان بکێشم، وەمن هەر ئاوەها و ئاوەها وازیان لێ ناهێنم هەژاربن، بێگومان ئەوان کوڕی خۆمن؟ فەرمووی: ((بەڵێ پاداشتی ئەوەت هەیە نەفەقە و خەرجیانت کێشاوە)).**

٥٣٧٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: قَالَتْ هِنْدُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ مَا يَكْفِينِي وَبَنِيَّ؟ قَالَ: «خُذِي بِالْمَعْرُوفِ»[١].

**٥٣٧٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: هیند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕژد و ڕەزیلە، هیچ گوناحێکم لەسەرە ئەوەندەی پێویستی خۆم و منداڵەکەم لە ماڵەکەی ببەم بە دزییەوە؟ فەرمووی: ((بە ئەندازەی پێویستیت ببە)).**

## ١٥- بابٌ: قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «مَنْ تَرَكَ كَلًّا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ»

٥٣٧١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمُتَوَفَّى عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ «هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ فَضْلاً؟». فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى، وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ». فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ قَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَتَرَكَ دَيْنًا فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢٢١١.

(٢) بڕوانە: ٢٣٩٨.

## ١٥- باسێک: ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((هەر کەسێک قەرز یا منداڵ و کەسی بێ سەرپەرشتی لە دوای خۆی بە جێ هێشت ئەوە لەسەر منە)) [١]

**٥٣٧١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی مردووی قەرزار دەهێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری دەکرد و دەیفەرموو: ((ئایا بۆ دانەوەی قەرزەکەی زیادە ماڵێکی[٢] بەجێ هێشتووە؟)) جا ئەگەر بوترایە بەشی بژاردنی قەرزەکەی بەجێ هێشتووە نوێژی لەسەر دەکرد، ئەگەر نا بەمسوڵمانەکانی دەفەرموو: ((نوێژ بکەن لەسەر هاوڕێکەتان))، ئینجا کاتێ خوا دەست کەوتی جەنگ و ماڵی زۆری پێ بەخشی، فەرمووی: ((من لە پێشترم بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان بۆ خۆیان، ئەنجا هەر کەس لە باوەڕداران مرد و قەرزی لەدوا خۆی بەجێ هێشتبوو، ئەوەدانەوەی قەرزەکەی لەسەر منە، وە هەر باوەڕدارێك سامانی لێ بەجێما ئەوە بۆ میراتگرەکانیەتی)).**

## ١٦- بَابُ الْمَرَاضِعِ مِنَ الْمَوَالِيَاتِ وَغَيْرِهِنَّ

**٥٣٧٢-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، انْكِحْ أُخْتِي ابْنَةَ أَبِي سُفْيَانَ. قَالَ: «وَتُحِبِّينَ ذَلِكِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي فِي الْخَيْرِ أُخْتِي. فَقَالَ: «إِنَّ ذَلِكِ لاَ يَحِلُّ لِي». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَوَاللَّهِ إِنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ دُرَّةَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ. فَقَالَ: «ابْنَةَ أُمِّ سَلَمَةَ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ.

---

(١) دانەوەی قەرزەکەی و سەرپەرشتی منداڵی و نەخۆشەکەی.

(٢) لە پێویستی کفن و دفنەکەی زیاد بێت.

قَالَ: "فَوَاللَّهِ لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ، فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ ".
وَقَالَ شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: قَالَ عُرْوَةُ: ثُوَيْبَةُ أَعْتَقَهَا أَبُو لَهَبٍ[1].

## ١٦- باسی دایەن لە ژنانی غەیرە عەرەب و ژنانی تر بن

**٥٣٧٢- ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروە بۆی دەگێڕامەوە کە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە بۆی گێڕایەوە، کە ئوممو حەبیبەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم کە کچی ئەبی سوفیانە مارە بکە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوکارەت پێ خۆشە؟)) منیش وتم بەڵێ: من بەتەنها هاوسەرت نیم[2] وە خۆشەویسترین کەسێك هاوبەشم بێت لەچاکەدا خوشکەکەمە، پێغەمبەریش ﷺ فەمووی: ((بێگومان ئەوە (مارەکردنی) دروست نییە بۆ من)) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دەی سوێند بە خوا ئێمە لە نێوان خۆماندا دەڵێین تۆ دەتەوێ دورەی کچی ئەبی سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: ((کچی ئوممی سەلەمە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی سوێند بە خوا ئەو کچە ئەگەر کۆڵەبەستیشم نەبوایە لەماڵی خۆمدا حەڵاڵ نەبوو بۆم، بێگومان ئەو کچە (ی ئوممو سەلەمە) کچی برای شیریمە، سوەیبە شیری داوە بە من و ئەبی سەلەمە، کەوابوو (لە مەولا) کچ وخوشکەکانتانم بۆ پێشنیار مەکەن)).**

**شوعەیب لە زوهرییەوە گێڕاویەتیەوە وتی: عوروە وتی: سوەیبە ئەبو لەهەب ئازادی کردوە.**

---

(١) بڕوانە: ٥١٠١.
(٢) واتە: هەوێی هەیە خۆی بەتەنها نییە کە هاوسەری ئەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٧٠- كِتَابُ الأطعمة

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٠- پەڕاوی خواردەمەنیەکان

## ١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ۝٥٧﴾ البقرة. وَقَوْلِهِ: ﴿أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ ۝٢٦٧﴾ البقرة. ﴿كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُوا۟ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ۝٥١﴾ المؤمنون.

٥٣٧٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَطْعِمُوا الْجَائِعَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ، وَفُكُّوا الْعَانِيَ». قَالَ سُفْيَانُ: وَالْعَانِي: الأَسِيرُ[1].

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لەو خواردنە پاک و حەڵاڵانە بخۆن کە کردوومانە بە ڕۆزیتان)، وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لە پاکترینی ئەوەی پەیداتان کردوە بەختی بکەن)، وە ئەم فەرمایشتەش: (لە خۆراکی پاک و حەڵاڵ بخۆن وە کردەوەی چاک بکەن، چونکە بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارم)

**٥٣٧٣-ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خواردن بدەن بەبرسی، وە سەردانی نەخۆش بکەن، وە دیل ئازاد بکەن))، سوفیان دەڵێ: (الْعَانِيَ) واتە: دیل، یەخسیر.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٦.

٥٣٧٤- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْ طَعَامٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى قُبِضَ.

**٥٣٧٤- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: خاوخێزانی موحەممەد ﷺ سێ ڕۆژ (لەسەر یەك) تێر نەبوون لە خواردن تا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد و گیانی کێشرا.**

٥٣٧٥- وَعَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَصَابَنِي جَهْدٌ شَدِيدٌ، فَلَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَاسْتَقْرَأْتُهُ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، فَدَخَلَ دَارَهُ وَفَتَحَهَا عَلَيَّ، فَمَشَيْتُ غَيْرَ بَعِيدٍ، فَخَرَرْتُ لِوَجْهِي مِنَ الْجَهْدِ وَالْجُوعِ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي فَقَالَ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ». فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَقَامَنِي، وَعَرَفَ الَّذِي بِي فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَحْلِهِ، فَأَمَرَ لِي بِعُسٍّ مِنْ لَبَنٍ، فَشَرِبْتُ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: «عُدْ يَا أَبَا هِرٍّ». فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ، ثُمَّ قَالَ: «عُدْ». فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ حَتَّى اسْتَوَى بَطْنِي فَصَارَ كَالْقِدْحِ. قَالَ: فَلَقِيتُ عُمَرَ وَذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي كَانَ مِنْ أَمْرِي وَقُلْتُ لَهُ: تَوَلَّى اللَّهُ ذَلِكَ مَنْ كَانَ أَحَقَّ بِهِ مِنْكَ يَا عُمَرُ، وَاللَّهِ لَقَدِ اسْتَقْرَأْتُكَ الآيَةَ وَلأَنَا أَقْرَأُ لَهَا مِنْكَ. قَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ لأَنْ أَكُونَ أَدْخَلْتُكَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي مِثْلُ حُمْرِ النَّعَمِ[1].

**٥٣٧٥- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: (لە برسانا) زۆر ناڕەحەت بووم، جا بە عومەری کوڕی خەتتاب گەشتم ﷺ داوام لێ کرد ئایەتێکم لە قورئانەکەی خوا بۆ بخوێنێ، ئەویش چویە ژوورەوە بۆ ماڵەوە ئایەتەکەی بۆ خوێندمەوە، منیش کەمێ ڕۆشتم لە کەم هێزی و برسانا کەوتم بەدەما، یەکسەر پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەسەرمەوە وەستابوو فەرمووی: ((ئەی ئەبو هوڕەیرە)) وتم: گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نودی تۆم دەوێ، دەستی گرتم و هەڵی ساندمەوە و زانی زۆر برسیمە بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی فەرمانی کرد**

(١) بڕوانە: ٦٢٤٦.

جامێکی گەورە شیریان بۆ هێنام، منیش لێم خواردەوە، پاشان فەرمووی: ((ئەبو هورەیرە دووبارەی کەرەوە)) [1] منیش دووبارە لێم خواردەوە، پاشان فەرمووی: ((دووبارەی کەرەوە))، جارێکی تریش خواردمەوە هەتا ورگم ڕێك بویەوە وەك تیر، ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئینجا گەیشتم بە عومەر ﷺ ئەوەی کە ڕوویدا لێم بۆم گێڕایەوە پێم وت: ئەی عومەر خوا ئەوەی دایە دەست کەسێك کە لە تۆ شیاوترە بەو کارە، سوێند بە خوا من داوای خوێندنی ئایەتێکم لێ کردی بە دڵنیاییەوە من لە تۆ چاکتر دەمخوێندەوە، عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بم بردیتایە ماڵەوە لام خۆشەویستر بوو لەوەی وێنەی وشترانی سوورم ببوایە.

## ٢- بابُ التَّسْمِيَةِ عَلَى الطَّعَامِ وَالْأَكْلِ بِالْيَمِينِ

٥٣٧٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الْوَلِيدُ بْنُ كَثِيرٍ: أَخْبَرَنِي أَنَّهُ سَمِعَ وَهْبَ بْنَ كَيْسَانَ أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ يَقُولُ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: «يَا غُلَامُ، سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ». فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ.

## ٢- باسی ناوی خوا هێنان لەسەر خواردن و بە دەستی ڕاست خواردن

٥٣٧٦- عەمری کوڕی سەلەمە ﷺ دەڵێ: من مێرد منداڵێك بووم لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە هەمیشە دەستم بەملا و لای قاپی خواردنەکەدا درێژ دەکرد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەی غولامەکە: ناوی خوا بێنەو بە دەستی ڕاستت نان بخۆ و لەبەر دەمی خۆتەوە بخۆ))، پاش ئەوە ئیتر بەردەوام نان خواردنم بەو شێوەیە بوو.

---

(١) واتە: جارێکی تر لێی بخۆرەوە.

## ٣- بَابُ الأَكْلِ مِمَّا يَلِيهِ

وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلْيَأْكُلْ كُلُّ رَجُلٍ مِمَّا يَلِيهِ»[١].

٥٣٧٧- حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ الدِّيلِيِّ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ أَبِي نُعَيْمٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ -وَهْوَ: ابْنُ أُمِّ سَلَمَةَ- زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَكَلْتُ يَوْمًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا، فَجَعَلْتُ آكُلُ مِنْ نَوَاحِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلْ مِمَّا يَلِيكَ»[٢].

## ٣- باسی نان خواردن لە بەردەمی خۆیەوە

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( (لە نان خواردندا) ناوی خوا بێنن و هەر کەس لە بەردەمی خۆیەوە نان بخوات)).**

**٥٣٧٧- عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە-کە کوڕی ئوممی سەلەمەی خێزانی پێغەمبەرە ﷺ - دەڵێ: ڕۆژێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردنم خوارد، جا دەستم کرد بە خواردن لەملا و لای قاپەکەوە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێم: ((لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ)).**

٥٣٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ أَبِي نُعَيْمٍ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِطَعَامٍ وَمَعَهُ رَبِيبُهُ عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ: «سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ»[٣].

**٥٣٧٨- وەهبی کوڕی کەیسانی کوڕی ئەبو نوعەیم وتی: خواردنێك هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆڵەبەسەکەی کە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمەیە لەگەڵیدا بوو، فەرمووی پێی: ((بِسْمِ الله بکە و لە بەردەم خۆتەوە بخۆ)).**

---

(١) بڕوانە: ٥١٦٣.

(٢) بڕوانە: ٥٣٧٦.

(٣) بڕوانە: ٥٣٧٦.

## ٤- بابُ مَنْ تَتَبَّعَ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ مَعَ صَاحِبِهِ، إِذَا لَمْ يَعْرِفْ مِنْهُ كَرَاهِيَةً

٥٣٧٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ -قَالَ أَنَسٌ:- فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَأَيْتُهُ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ -قَالَ:- فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ[١].

## ٤- باسی کەسێک ئەملا و لای قاپەکە بگەڕێ لەگەڵ هاوڕێکەی ئەگەر بزانێ پێی ناخۆش نییە

**٥٣٧٩- ئیسحاقی کوڕی ئەبی تەڵحە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: بێگومان بەرگ دووریەك پێغەمبەری خوای ﷺ بانگ کرد بۆ خواردنێك کە دروستی کردبوو، (ئیسحاق دەڵێ:) ئەنەس وتی: منیش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتم، جا پێغەمبەرم ﷺ دی شوێن کولەکەکە دەکەوت لەملا و لای قاپەکەوە، ئەنەس دەڵێ: لەو ڕۆژەوە بەردەوام حەزم لە کولەکەیە.**

## ٥- بابُ التَّيَمُّنِ فِي الأَكْلِ وَغَيْرِهِ

**قَالَ عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: "كُلْ بِيَمِينِكَ".**

٥٣٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي طُهُورِهِ وَتَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ. وَكَانَ قَالَ بِوَاسِطٍ قَبْلَ هَذَا: فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩٢.

(٢) بڕوانە: ١٦٨.

## ٥- باسی دەستی ڕاست بەکارهێنان لە خواردن و شتی تردا عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((بەدەستی ڕاستت خواردن بخۆ)).

**٥٣٨٠- عائیشە ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە (بەکارهێنانی) لای ڕاستی پێ خۆش بوو ئەوەندەی لە توانایدا بوایە، لە خۆ شۆردن و پێڵاو لە پێ کردن وقژ داهێناندا. (وە ئەشعەس) پێشتر لە واسیت گێڕایەوە و وتی: لە هەموو کار و بارێکیدا[1].**

## ٦- بابُ مَنْ أَكَلَ حَتَّى شَبِعَ

٥٣٨١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ: لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ضَعِيفًا أَعْرِفُ فِيهِ الْجُوعَ، فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ؟ فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصًا مِنْ شَعِيرٍ، ثُمَّ أَخْرَجَتْ خِمَارًا لَهَا فَلَفَّتِ الْخُبْزَ بِبَعْضِهِ، ثُمَّ دَسَّتْهُ تَحْتَ ثَوْبِي وَرَدَّتْنِي بِبَعْضِهِ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهِ فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ النَّاسُ، فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ؟». فَقُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «بِطَعَامٍ؟». قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمَنْ مَعَهُ: «قُومُوا». فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ، وَلَيْسَ عِنْدَنَا مِنَ الطَّعَامِ مَا نُطْعِمُهُمْ. فَقَالَتِ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَقْبَلَ أَبُو طَلْحَةَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى دَخَلاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلُمِّي يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ». فَأَتَتْ بِذَلِكَ الْخُبْزِ، فَأَمَرَ بِهِ فَفُتَّ، وَعَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً لَهَا فَأَدَمَتْهُ، ثُمَّ قَالَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ: «ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ». فَأَذِنَ

---

(١) پێی خۆش بوو لای ڕاستی پێش خات.

لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: «ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ». فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: «ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ». فَأَذِنَ لَهُمْ فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ أَذِنَ لِعَشَرَةٍ، فَأَكَلَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا، وَالْقَوْمُ ثَمَانُونَ رَجُلاً[1].

## ٦- باسی کەسێک بخوات تا تێر دەبێت

**٥٣٨١- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە بە ئوممو سولەیمی ﷺ وت: بەڕاستی گوێم لەدەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو نزم و هێواش بوو، برسی بوونیم تێیدا خوێندەوە و هەست پێکرد، جا ئایا هیچ شتێکت لایە؟ ئەنجا (ئوممو سولەیم) چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێنا، پاشان سەرپۆشێکی خۆی هێنا، وەبەشێکی پێچا بە کولێرەکانەوە، پاشان لەبن باڵمدا شاردیەوە، وە بە بەشەکەی تری سەرپۆشەکەی پێچای پێمەوە، پاشان ناردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، (ئەنەس) دەڵێ: منیش کولێرەکانم برد و پێغەمبەرم ﷺ بینی لە مزگەوت و چەند کەسێکیشی لەگەڵدا بوو، منیش لایاندا وەستام، پێغەمبەری خواش ﷺ بەمنی فەرموو: ((ئەبو تەڵحە ناردوویەتی؟)) وتم: بەڵێ: فەرمووی: ((خواردنی پێدا ناردووی؟)) وتم: بەڵێ: ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەوانەی لەگەڵیدا بوون: ((هەستن))، جا پێغەمبەر (لە مزگەوت) دەرچوو منیش لە پێشیانەوە بەپەلە هاتم هەتا گەشتمە لای ئەبو تەڵحە ﷺ هەواڵەکەم پێدا، ئەبو تەڵحەش ﷺ وتی: ئەی ئوممو سولەیم بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکەکەی هێنا، ئێمەش خواردنمان نییە پێیان بدەین، ئەویش وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتری لێ دەزانن، ئەنجا ئەبو تەڵحە دەرچوو هەتا بەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەشت، ئەوسا پێغەمبەری خوا و ﷺ ئەبو تەڵحە پێکەوە هاتنە ژوورەوە، ئەنجا**

---

(١) بروانە: ٤٢٢.

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئادەی ئوممو سولەیم چیت هەیە بیهێنە))، ئوممو سولەیمیش ئەو کولێرانەی هێنا، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد و کولێرەکان وردکران، ئوممو سولەیمیش هیزەیەکی هەبوو (کە ڕۆنی تێدابوو) گوشی و تێکەڵی کرد لەگەڵ وردە نانەکەدا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خوا ویستی بیفەرمووی (لە** بسم الله الرحمن الرحيم **و دوعای فەڕ و بەرەکەت) فەرمووی، پاشان فەرمووی: ((مۆڵەت بە دە کەس بدە (بێنە ژوورەوە) ))، ئەویش مۆڵەتی دان، ئەنجا نانیان خوارد تا تێر بوون، پاشان ڕۆشتنە دەرەوە، پاشان فەرمووی: ((مۆڵەت بە دە کەس بدە))، ئەویش مۆڵەتی دان جا نانیان خوارد و تێربوون، پاشان ڕۆشتنە دەرەوە، پاشان فەرمووی: ((مۆڵەت بە دە کەس بدە))، ئەویش مۆڵەتی دان جا نانیان خوارد و تێربوون، پاشان ڕۆشتنە دەرەوە، پاشان مۆڵەتی دە کەسی تریدا، ئیتر هەموو خەڵکەکە خواردنیان خوارد و تێربوون، خەڵکەکەش هەشتا پیاو بوون.**

٥٣٨٢- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: وَحَدَّثَ أَبُو عُثْمَانَ أَيْضًا، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺقَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ؟». فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "أَبَيْعٌ أَمْ عَطِيَّةٌ؟ " أَوْ قَالَ: "هِبَةٌ". قَالَ: لاَ، بَلْ بَيْعٌ. قَالَ: فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً فَصُنِعَتْ،فَأَمَرَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ بِسَوَادِ الْبَطْنِ يُشْوَى، وَايْمُ اللَّهِ مَا مِنَ الثَّلاَثِينَ وَمِائَةٍ إِلاَّ قَدْ حَزَّ لَهُ حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهَا إِيَّاهُ، وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَهَا لَهُ، ثُمَّ جَعَلَ فِيهَا قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلْنَا أَجْمَعُونَ وَشَبِعْنَا، وَفَضَلَ فِي الْقَصْعَتَيْنِ، فَحَمَلْتُهُ على الْبَعِيرِ. أَوْ كَمَا قَالَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٢١٦.

**٥٣٨٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ئێمە سێ سەد و سی کەس لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا کەسێك لەئێوە خۆراکی پێیە؟)) دەبینین پیاوێك مەنێ یان نزیکەی ئەو ئەندازەیە ئاردی پێیە، ئینجا (کرایە هەویر) و شێلرا، پاشان پیاوێکی بتپەرستی درێژی قژ ئاڵسکاوی چەند مەڕێکی دابوویە بەر دەیبردن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((بەفرۆشتن دەیفرۆشیت یان پێمان دەدەیت؟)) یان فەرمووی: ((یان دەیبەخشیت؟)) (پیاوەکە) وتی: نەخێر (پێتان نادەم و نایبەخشم) بەڵکو دەیفرۆشم، (عەبدوڕەحمان) دەڵێ: پێغەمبەریش مەڕێکی لێ کڕی، جا سەر بڕا ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد ناو سکەکەی[1] ببرژێنرێت، سوێند بە خوا هەر یەك لەو سەد و سی کەسە پێغەمبەر ﷺ پارچەیەك لە ناو سکەکەی بۆ بڕی (و پێیدا)، جا ئەگەر ئامادە بوو دەیدایە ئەگەر ئامادەش نەبوایە بۆی هەڵدەگرت، پاشان گۆشتی مەڕەکەی کردە دوو تەشتەوە هەموومان خواردمان و تێر بووین، هەندێکیش لە دوو تەشتەکەدا مایەوە لە وشترێکم بار کرد، یا وتەیەکی لەو جۆرەی وت.**

٥٣٨٣- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ شَبِعْنَا مِنَ الأَسْوَدَيْنِ، التَّمْرِ وَالْمَاءِ[2].

**٥٣٨٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد کاتێ تێر بووین لە دوو ڕەشەکە: کە خورما و ئاوە[3].**

(١) جگەرەکەی یان هەموو ناوسکەکەی جگەر و سی و گورچیلە و دڵ.

(٢) بڕوانە: ٥٤٤٢.

(٣) بە دوو جۆر مانا دەکرێ: ١- تێر نەبووین لە خورما لەگەڵ ئاودا تا وەفاتی کرد. ٢- پێش وەفاتی و کاتێکیش وەفاتی کرد تێر بووین لە خورما لەگەڵ ئاودا.

**٧- بابٌ:** ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴿٦١﴾ ﴾ **إلى قوله** ﴿ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ النور

٥٣٨٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: سَمِعْتُ بُشَيْرَ بْنَ يَسَارٍ يَقُولُ: حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ النُّعْمَانِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، فَلَمَّا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ -قَالَ يَحْيَى: وَهْيَ مِنْ خَيْبَرَ عَلَى رَوْحَةٍ- دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِطَعَامٍ، فَمَا أُتِيَ إِلاَّ بِسَوِيقٍ، فَلُكْنَاهُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا، فَصَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قَالَ سُفْيَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْهُ عَوْدًا وَبَدْءًا[1].

## ٧- باسێک: (کوێر گوناهی لەسەر نییە)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا ( بەڵکو ئەقڵتان بخەنە کار و بیر بکەنەوە)

**٥٣٨٤- سوەیدی کوڕی نوعمان ﷺ وتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین بۆ خەیبەر جا کە گەیشتینە صەهبا- یەحیا دەڵێ: صەهبا بەئەندازەی تاقێکی ئێوارە[2] بەپیادە ڕۆشتن لە خەیبەرەوە دوورە - پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خۆراکی کرد جا تەنها قاوت[3] هێنرا، ئێمە جویمان و لێمان خوارد، پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای ئاوی کرد ئاوی لەدەمی ڕادا ئێمەش ئاومان لە دەممان ڕادا، ئینجا نوێژی مەغریبی بۆکردین و دەست نوێژی نەگرت.**

**سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم لە (یەحیای کوڕی سەعیدەوە) بیستووە لە سەرەتاوە تا کۆتایی.**

(١) بڕوانە: ٢٠٩.

(٢) لە پاش نیوەڕۆ تا خۆر ئاوا بوون بەپێ ڕۆشتن.

(٣) السویق: قاوت، حەڵوا، خواردنێکە لە ئاردی گەنم یا جۆ دروست دەکرێ لەگەڵ ئاو.

## ٨- بابُ الْخُبْزِ الْمُرَقَّقِ وَالأَكْلِ على الْخِوَانِ وَالسُّفْرَةِ

٥٣٨٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَنَسٍ وَعِنْدَهُ خَبَّازٌ لَهُ فَقَالَ: مَا أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ خُبْزًا مُرَقَّقًا وَلاَ شَاةً مَسْمُوطَةً حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ[1].

## ٨- باسی نانی تەنک کراو، وە نان خواردن لەسەر مێز و سفرە

**٥٣٨٥- قەتادە دەڵێ: ئێمە لای ئەنەس ﷺ بووین، نانەوایەکی لابوو تایبەت بوو بە خۆی، (ئەنەس) وتی: پێغەمبەر ﷺ تا گەشتە خزمەتی خوا (وەفاتی کرد) نانی تەنك و مەڕ ئاوەروتکراوی[2] بە پێستەوە برژاوی نەخواردووە.**

٥٣٨٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ يُونُسَ -قَالَ عَلِيٌّ: هُوَ الإِسْكَافُ- عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مَا عَلِمْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ عَلَى سُكُرُّجَةٍ قَطُّ، وَلاَ خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ قَطُّ، وَلاَ أَكَلَ عَلَى خِوَانٍ. قِيلَ لِقَتَادَةَ: فَعَلَى مَا كَانُوا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: على السُّفَرِ[3].

**٥٣٨٦- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئاگادار نیم پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە قاپ و دەوری بچووکدا[4] خواردنی خواردبێت، وە هەرگیز نانی تەنکی بۆ نەکراوە و لەسەر مێز نانی نەخواردووە، بە قەتادە وترا ئەی لەسەر چی نانیان دەخوارد، قەتادە وتی: سفرە.**

٣٨٧ ٥- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، أَخْبَرَنِي حُمَيْدٌ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْنِي بِصَفِيَّةَ، فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ، أَمَرَ بِالأَنْطَاعِ فَبُسِطَتْ، فَأُلْقِيَ عَلَيْهَا التَّمْرُ وَالأَقِطُ وَالسَّمْنُ. وَقَالَ عَمْرٌو، عَنْ أَنَسٍ: بَنَى بِهَا النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ صَنَعَ حَيْسًا فِي نِطَعٍ[1].

---

(١) بڕوانە: ٥٤٢١، ٦٤٥٧.

(٢) پیاوی دەوڵەمەند بەرخ و کارژۆڵەیان بۆ ئاوە ڕووت دەکرد و دەیخوارد، پێغەمبەر ﷺ شتی وای نەخواردووە.

(٣) بڕوانە: ٥٤١٥، ٦٤٥٠.

(٤) قاپ و دەوری بچووک بێخۆری تێدەکرێت یان ترشیات و شتی وای تێدەکرێت.

**٥٣٨٧- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەستا بەگواستنەوەی بوون بە زاوا بە صەفییە، منیش مسوڵمانانم بانگ كرد بۆ نانی شاییەكەی، فەرمانی كرد سفرەیەكی چەرم داخرا، ئینجا خورما و كەشك و ڕۆن كرایە سەر سفرەكە.**
**عەمر دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: لە پێشا پێغەمبەر ﷺ بوو بە زاوا[٢] و پاشان خورما و ڕۆنی بە كەشكی كوتراو دروستكرا لە ناو سفرەیەكی چەرمیندا.**

٥٣٨٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ وَعَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الشَّأْمِ يُعَيِّرُونَ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُونَ: يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ. فَقَالَتْ لَهُ أَسْمَاءُ: يَا بُنَيَّ، إِنَّهُمْ يُعَيِّرُونَكَ بِالنِّطَاقَيْنِ، هَلْ تَدْرِي مَا كَانَ النِّطَاقَانِ؟ إِنَّمَا كَانَ نِطَاقِي شَقَقْتُهُ نِصْفَيْنِ، فَأَوْكَيْتُ قِرْبَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِأَحَدِهِمَا، وَجَعَلْتُ فِي سُفْرَتِهِ آخَرَ. قَالَ: فَكَانَ أَهْلُ الشَّأْمِ إِذَا عَيَّرُوهُ بِالنِّطَاقَيْنِ يَقُولُ: إِيهًا وَالإِلَهْ، تِلْكَ شَكَاةٌ ظَاهِرٌ عَنْكَ عَارُهَا[٣].

**٥٣٨٨- وەهبی كوڕی كەیسان دەڵێ: جاران خەڵكی شام توانج و تانەیان لە ئیبنو زوبەیر دەدا و دەیان وت: ئەی كوڕی ژنە دوو پشتوێنەكە، جا ئەسماش[٤] بە عەبدوڵلای دەوت: كوڕی خۆم ئەوان تانە و تەشەرت لێ دەدەن بە دوو پشتوێن، ئایا دەزانی دوو پشتوێنەكە چی بوون؟ بێگومان پشتێوینەكەی خۆم بوو كردم بە دوو لەتەوە، بە یەكێكیان دەمی جەوەنەكەی پێغەمبەری خوام ﷺ بەست، لەتەكەی كەشیان خۆراكی سەفەركەی پێغەمبەرم ﷺ كردە ناوی. وەهب دەڵێ: ئینجا هەر كاتێ خەڵكی شام تانە و توانجیان لێ بدایە بەدوو پشتتوێن عەبدوڵلاش دەیوت: ڕاست دەكەن سوێند بەخوا ئەو وتە ناشرینەی بە دەنگی بەرز دەیڵێن، تانە و تەشەرەكەی دوورە لە تۆ و تۆ ناگرێتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.
(٢) صەفییەی بۆ گوێزرا بۆوە.
(٣) بڕوانە: ٢٩٧٩.
(٤) كە دایكی عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر بوو ﷺ.

٥٣٨٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ أُمَّ حُفَيْدٍ بِنْتَ الْحَارِثِ بْنِ حَزْنٍ -خَالَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ- أَهْدَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ سَمْنًا وَأَقِطًا وَأَضُبًّا، فَدَعَا بِهِنَّ، فَأُكِلْنَ عَلَى مَائِدَتِهِ، وَتَرَكَهُنَّ النَّبِيُّ ﷺ كَالْمُتَقَذِّرِ لَهُنَّ، وَلَوْ كُنَّ حَرَامًا مَا أُكِلْنَ عَلَى مَائِدَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَلاَ أَمَرَ بِأَكْلِهِنَّ[1].

**٥٣٨٩- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئوممی حوفەیدی کچی حاریسی کوڕی حەزن -کە پوری ئیبنو عەبباسە- ڕۆن و کەشك و چەند بزن مژەیەکی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، بە بزن مژەکان دەعوەتی کەسانێکی کرد، ئینجا لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ خوران، بەڵام پێغەمبەر ﷺ خۆی نەیخوارد وەك بێزیان لێ بکاتەوە، خۆ ئەگەر ئەو بزن مژانە حەرام بوونایە لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ نەدەخوران و فەرمانی نەدەکرد بە خواردنیان.**

## ٩- بابُ السَّوِيقِ

٥٣٩٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ النُّعْمَانِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُمْ كَانُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالصَّهْبَاءِ -وَهْيَ على رَوْحَةٍ مِنْ خَيْبَرَ- فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَدَعَا بِطَعَامٍ فَلَمْ يَجِدْهُ إِلاَّ سَوِيقًا، فَلاَكَ مِنْهُ، فَلُكْنَا مَعَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَمَضْمَضَ، ثُمَّ صَلَّى وَصَلَّيْنَا، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

## ٩- باسی قاوەت یا حەڵوا[3]

**٥٣٩٠- بوشەیری کوڕی یەسار لە سومیدی کوڕی نوعمانەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە نوعمان بۆی گێڕایەوە وتی: ئەوان لە صەهبا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون - کە**

(١) بڕوانە: ٣٧١.
(٢) بڕوانە: ٢٠٩.
(٣) السویق: خواردنێکە لە ئاردی گەنم یا جۆ دروست دەکرێ.

تاقە ڕۆژێ ڕێگا لە خەیبەرەوە دوورە - کاتی نوێژ بوو بوو پێغەمبەریش ﷺ داوای خواردنی کرد، جگەلە قاوت هیچیان پێ نەبوو، جا پێغەمبەر ﷺ کردیە دەمیٚ و لیٚ خوارد و ئێمەش لێمان خوارد، لە پاشان داوای ئاوی کرد و لە دەمی ڕادا، پاشان نوێژی کرد ئێمەش لەگەڵیدا نوێژمان کرد و دەست نوێژیشی نەگرتەوە.

## ١٠- بابٌ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ حَتَّى يُسَمَّى لَهُ فَيَعْلَمُ مَا هُوَ

٥٣٩١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ الأَنْصَارِيُّ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ -الَّذِي يُقَالُ لَهُ: سَيْفُ اللَّهِ- أَخْبَرَهُ أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَيْمُونَةَ -وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ- فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدِّمُ يَدَهُ لِطَعَامٍ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، هُوَ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ عَنِ الضَّبِّ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لاَ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ». قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ إِلَيَّ[1].

## ١٠- باسێک: ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی نەدەخوارد تا ناوەکەی پێنەوترایە و نەیزانیایە ئەو خواردنە چییە

٥٣٩١- ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفی ئەنصاری دەگێڕێتەوە، کە ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما بۆی گێڕایەوە کەخالیدی کوڕی وەلید- کە پێی دەوترا: شمشێری خوا - بۆی

---

(١) بڕوانە: ٥٤٠٠، ٥٥٣٧.

گێڕایەوە کە ئەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ چوون بۆ ماڵی مەیموونە[١]- کە پوری ئەو (خالید) و ئیبنو عەبباس بوو لە دایکیەوە- بزن مژەیەکی برژاوی لە لای بینی، کە حوفەیدەی کچی حاریسی خوشکی لە نەجدەوە بۆی هێنا بوو، ئینجا مەیموونە بزن مژەکەی خستە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە بەدەگمەن خواردنێکی بخرایەتە بەردەم هەتا باسی بۆ نەکرایە و ناوی نەهێنرایە بۆی، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی برد بۆ بزن مژەکە، یەکێ لەو ئافرەتانەی کە لەوێدا ئامادە بوون وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بکەن بەوەی کە بۆتان داناوە، وتیان: خواردنەکە بزن مژەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی کێشایەوە لە بزن مژەکە، ئینجا خالیدی کوڕی وەلید وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵام لە خاکی قەومەکەی مندا نەبووە، بۆیە دەبینی دڵم ناچێتە سەری))، خالید وتی: لەتم کرد و خواردم، پێغەمبەری خواش ﷺ سەیری دەکردم[٢].

## ١١- بَابٌ: طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الاثْنَيْنِ

٥٣٩٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ».

## ١١- باسێک: خواردنی یەک کەس بەشی دوو کەس دەکات

٥٣٩٢- ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خواردنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکات، وە خواردنی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکات)).

---

(١) کە هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ، وە پوری خالید و ئیبن عەبباسیشە ﵄.

(٢) ئەم زیادەی هەیە (وە ڕێگری لێ نەکردم).

## ١٢- بابٌ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ

٥٣٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاقِدِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَدْخَلْتُ رَجُلاً يَأْكُلُ مَعَهُ فَأَكَلَ كَثِيرًا، فَقَالَ: يَا نَافِعُ، لاَ تُدْخِلْ هَذَا عَلَيَّ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[١].

## ١٢- باسێک: باوەڕدار لە یەک ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات

**٥٣٩٣- نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﵁ خواردنی نەدەخوارد هەتا هەژارێك نەهێنرایە لەگەڵیدا بخوات، ئینجا پیاوێك هێنرایە ژوورەوە خواردن بخوات لەگەڵیدا، پیاوەکە زۆری خوارد، (ئیبنو عومەر) وتی: ئەی نافیع ئیتر ئەم پیاوە مەهێنە ژوورەوە بۆ لام، لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرمووی: (( باوەڕدار لە یەك ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات، بەڵام کافر لە حەوت ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات)).**

## ١٣- بابٌ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ

### فيه أبو هُريرة عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

٥٣٩٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَإِنَّ الْكَافِرَ -أَوِ الْمُنَافِقَ، فَلاَ أَدْرِي أَيَّهُمَا قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ- يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[٢]. وَقَالَ ابن بُكَيْرٍ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابن عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ.

---

(١) بروانە: ٥٣٩٤، ٥٣٩٥.

(٢) بروانە: ٥٣٩٣.

## ١٣- باسێک: باوەڕدار لە یەک ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات لەم باسەدا فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ هەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێراویەتیەوە[1].

٥٣٩٤-موحەممەدی كوڕی سەلام وتی:عەبدە بۆی گێڕاینەوەلەعوبەیدوڵلاوە لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان باوەڕدار لە یەك ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات، بێگومان بێ باوەڕ- یان دوو ڕوو نازانم عوبەیدوڵلا كامیانی وت- لە حەوت ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات)).

(بەم ڕشتەیەش فەرموودەكە گێڕدراوەتەوە)، ئیبنو بوكەیر وتی: مالیك بۆی گێڕاینەوە لە نافیعەوە ئەویش لە ئیبنو عومەروە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕاوەتەوە.

٥٣٩٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ أَبُو نَهِيكٍ رَجُلاً أَكُولاً، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْكَافِرَ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ». فَقَالَ: فَأَنَا أُومِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ[2].

٥٣٩٥- سوفیان لە عەمرەوە گێڕاویەتیەوە وتی: ئەبو نەهیك پیاوێكی زۆر خۆر بوو، بۆیە ئیبنو عومەر ﷺ پێی وت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەڕاستی بێ باوەڕ لە حەوت ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات))، جا (ئەبو نەهیك) وتی: منیش باوەڕم هەیە بە خوا و پێغەمبەرەكەی.

---

(١) ئەم فەرموودەیە موسلیم گێراویەتیەوە · ( إرشاد الساري: ١٦٢/١٢ ).

(٢) بڕوانە: ٥٣٩٣.

٥٣٩٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْكُلُ الْمُسْلِمُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[1].

**٥٣٩٦- ئەعرەج لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مسوڵمان لە یەك ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات، بەڵام كافر لە حەوت ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات)).**

٥٣٩٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً كَثِيرًا، فَأَسْلَمَ فَكَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً قَلِيلاً، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرَ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[2].

**٥٣٩٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێك زۆری دەخوارد، ئینجا مسوڵمان بوو كەمی دەخوارد، جا ئەوە باس كرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((بەڕاستی باوەڕدار لە یەك ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات، بەڵام بێ باوەڕ لە حەوت ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات)).**

## ١٤- بابُ الأَكْلِ مُتَّكِئًا

٥٣٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الأَقْمَرِ، سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ آكُلُ مُتَّكِئًا»[3].

## ١٤- باسی حوكمی نان خواردن بە شان دادانەوە[4]

**٥٣٩٨- عەلی كوڕی ئەقمەر دەڵێ: لە ئەبو جوحەیفەم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من بەشان دادانەوە خواردن ناخۆم)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٩٣، ٥٣٩٧.

(٢) بڕوانە: ٥٣٩٦.

(٣) بڕوانە: ٥٣٩٩.

(٤) مُتَّكِئ: بە چەند جۆرێ مانا كراوە: لەسەر لایەكی شانی دادابێ ڕاست یان چەپ، یان بە جۆرێ دانیشتبێ كە زۆر بخوات، یان دانیشتن لەسەر شتێكی نەرم، كەسێك وا دادەنیشێت كە زۆر بخوات.

٥٣٩٩- حَدَّثَنِي عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الأَقْمَرِ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ: «لاَ آكُلُ وَأَنَا مُتَّكِئٌ»[١].

**٥٣٩٩- عەلی کوڕی ئەقمەر لە ئەبو جوحەیفەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، بەپیاوێکی فەرموو کە لە خزمەتیدا بوو: ((خواردن ناخۆم لە کاتێکدا من دانیشتووم))** [٢].

## ١٥- بابُ الشِّوَاءِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ ﴾ هود: أَيْ: مَشْوِيٌّ.

٥٤٠٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِضَبٍّ مَشْوِيٍّ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ لِيَأْكُلَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ ضَبٌّ. فَأَمْسَكَ يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدٌ: أَحَرَامٌ هُوَ؟ قَالَ: «لاَ، وَلَكِنَّهُ لاَ يَكُونُ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ». فَأَكَلَ خَالِدٌ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ[٣]. قَالَ مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ[٤].

## ١٥- باسی خواردنی برژاو (دروستە)

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئیبراهیم ﷺ) گوێرەکەیەکی برژاوی هێنا)**

﴿ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ ﴾ **هود، واتە: برژاو.**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٨٩.
(٢) بە جۆرێ زۆر بخوات یان شانی دادابێ.
(٣) بڕوانە: ٥٣٩١.
(٤) بڕوانە: ٥٥٣٧.

**٥٤٠٠- ئیبنو عەبباس لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بزن مژەیەکی برژاویان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ جا دەستی بۆ برد لێی بخوات، عەرزیان کرد ئەو برژاوە بزن مژەیە، بۆیە دەستی کێشایەوە، خالیدیش عەرزی کرد ئایا بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵام لە خاکی قەومەکەی مندا نەبووە، بۆیە دەبینی دڵم ناچێتە سەری))، ئینجا خالید خواردی و پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری دەکرد.**

**مالیك لە ئیبنو شیهابەوە گێڕاویەتیەوە کە بە:** (بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ) **هێناویەتی لە جیاتی:** (بِضَبٍّ مَشْوِيٍّ) **(کەمانای هەردوو گێڕانەوەکە واتە: بزن مژەیەکی برژاو).**

## ١٦- بابُ الْخَزِيرَةِ

وَقَالَ النَّضْرُ: الْخَزِيرَةُ مِنَ النُّخَالَةِ، وَالْحَرِيرَةُ مِنَ اللَّبَنِ.

٥٤٠١- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيُّ، أَنَّ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنَ الأَنْصَارِ- أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَنْكَرْتُ بَصَرِي وَأَنَا أُصَلِّي لِقَوْمِي، فَإِذَا كَانَتِ الأَمْطَارُ سَالَ الْوَادِي الَّذِي بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ، لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ آتِيَ مَسْجِدَهُمْ فَأُصَلِّيَ لَهُمْ، فَوَدِدْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَّكَ تَأْتِي فَتُصَلِّي فِي بَيْتِي، فَأَتَّخِذُهُ مُصَلًّى. فَقَالَ: «سَأَفْعَلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». قَالَ عِتْبَانُ: فَغَدَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ، فَاسْتَأْذَنَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَذِنْتُ لَهُ فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ، ثُمَّ قَالَ لِي: «أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟». فَأَشَرْتُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَكَبَّرَ، فَصَفَفْنَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، وَحَبَسْنَاهُ على خَزِيرٍ صَنَعْنَاهُ، فَثَابَ فِي الْبَيْتِ رِجَالٌ مِنْ أَهْلِ الدَّارِ ذَوُو عَدَدٍ فَاجْتَمَعُوا، فَقَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ: أَيْنَ مَالِكُ بْنُ الدُّخْشُنِ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ ذَلِكَ مُنَافِقٌ لاَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَقُلْ، أَلاَ تَرَاهُ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. يُرِيدُ بِذَلِكَ وَجْهَ

اللَّهِ؟». قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: قُلْنَا: فَإِنَّا نَرَى وَجْهَهُ وَنَصِيحَتَهُ إِلَى الْمُنَافِقِينَ. فَقَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ على النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ».

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: ثُمَّ سَأَلْتُ الْحُصَيْنَ بْنَ مُحَمَّدٍ الأَنْصَارِيَّ -أَحَدَ بَنِي سَالِمٍ، وَكَانَ مِنْ سَرَاتِهِمْ- عَنْ حَدِيثِ مَحْمُودٍ، فَصَدَّقَهُ[1].

## ١٦- باسی خەزیرە[2]

**(نَضْر) دەڵێ: خەزیرە لە سوس (دروست دەکرێ)، حەریرەش لە شیر (دروست دەکرێ).**

**٥٤٠١- ئیبنو شیهاب دەڵێ: مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری بۆی گێڕامەوە: کە عیتبانی کوڕی مالیك - کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوو ﷺ، وە لەو کەسانە بوو کە بەشداری جەنگی بەدری کرد بوو لە ئەنصاریەکان - دەڵێ: ئەو ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بینینی چاوم خراپ بووە و من پێشنوێژی دەکەم بۆ هۆزەکەم، جا ئەگەر باران بباریێت ئەو شیوەی لە نێوان من و ئەوان دایە لافاوی هەڵدەستێ، ئیتر من ناتوانم بڕۆم بۆ مزگەوتەکەیان و نوێژیان بۆ بکەم، بۆیە پێم خۆشە ئەی پێغەمبەری خوا کە بهاتیتایە و لەماڵەکەمدا نوێژت بکردایە و منیش (جێگاکەم) بکردایە بەشوێن نوێژ، دەڵێ: پێغەمبەریش فەرمووی پێی: ((بەویستی خوا بەزوویی ئەو کارەم دەکەم))، عیتبان دەڵێ: کاتێ خۆر بەرز بوو بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبکر هاتن و پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، منیش مۆڵەتم دا و دانەنیشت هەتا هاتە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: ((حەز دەکەیت لە**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٤.

(٢) خواردنێکە لە گۆشتی وردکراو لە ئاودا دەکوڵێنرێت کە کوڵا ئاردی دەکرێت بەسەردا، ئەگەر گۆشتی تیا نەبوو ئەوە عەصیدەیە، بە چەند جۆری تر مانا کراوە ( سەیری فتح الباری بکە: ٦٧٨/١٢ ).

چ جێگایەکی ماڵەکەتدا نوێژ بکەم))، دەڵێ: منیش ئاماژەم کرد بۆ جێگایەك لە ماڵەکەدا، پێغەمبەریش ﷺ هەستا و (الله أكبر)ی کرد و ئێمەش لە دوایەوە هەستاین و ڕیز بووین و دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان سەلامی دایەوە، دەڵێ: خواردنێکمان بۆ دروست کردبوو بۆیە هێشتمانەوە، وە لە ماڵیاندا چەند پیاوێکی خزمی خۆیان کۆبوو بوونەوە، ئەنجا یەکێکیان وتی: مالیکی کوڕی دۆخەیشین لە کوێیە؟ یان کوڕی دوخەیشین لە کوێیە؟ یەکێکی تریان وتی: ئەو مالیکە دووڕووە و خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش ناوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قسەی وا مەڵێ، نابینی دەڵێ: لا إله إلا الله مەبەستیشی پێی ڕەزامەنی خوایە؟)) وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، وتی: جا بێگومان ئێمە دەبینین ڕووی و دڵسۆزی بۆ ناپاکانە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا ئەوەی بڵێ: لا إله إلا الله مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوا بێت، خوا قەدەغەی دەکات لە چوونە جەهەنەم)).

ئیبنو شیهاب دەڵێ: پرسیارم لە حوصەینی کوڕی موحەممەدی ئەنصاری کرد- کە یەکێکە لە بەنی سالیم وە لە پیاوە گەورە و سەرۆکەکانیانە- دەربارەی فەرموودەکەی مەحمودی کوڕی ڕەبیع، ئەویش گێڕانەوەکەی پشت ڕاست کردەوە.

## ١٧- بابُ الأَقِطِ

وَقَالَ حُمَيْدٌ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ: بَنَى النَّبِيُّ ﷺ بِصَفِيَّةَ، فَأَلْقَى التَّمْرَ وَالأَقِطَ وَالسَّمْنَ. وَقَالَ عَمْرُو بْنُ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ أَنَسٍ: صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ حَيْسًا.

٥٤٠٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أَهْدَتْ خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ ضِبَابًا وَأَقِطًا وَلَبَنًا، فَوُضِعَ الضَّبُّ عَلَى مَائِدَتِهِ، فَلَوْ كَانَ حَرَامًا لَمْ يُوضَعْ، وَشَرِبَ اللَّبَنَ، وَأَكَلَ الأَقِطَ[1].

## ١٧- باسی کەشک

**حومەیدی دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ کە صەفییەی گواستەوە (نانی شاییەکەی) هەندێ خورما و کەشك و ڕۆنی کردە سەر (سفرەیەکی چەرمین).**

**عەمری کوڕی ئەبو عەمر لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ خورما و ڕۆن و کەشکی کوتراوی دروست کرد (بۆنانی شایی صەفییە))** [2].

**٥٤٠٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پورم چەند بزن مژەیەك و کەشك و شیری بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئینجا بزن مژەکە لەسەر سفرەی پێغەمبەر ﷺ دانرا، جا ئەگەر حەرام بوایە دانەئەنرا، شیرەکەشی خواردەوە و کەشکەشی خوارد.**

## ١٨- بابُ السِّلْقِ وَالشَّعِيرِ

٥٤٠٣- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَفْرَحُ بِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، كَانَتْ لَنَا عَجُوزٌ تَأْخُذُ أُصُولَ السِّلْقِ، فَتَجْعَلُهُ فِي قِدْرٍ لَهَا، فَتَجْعَلُ فِيهِ حَبَّاتٍ مِنْ شَعِيرٍ، إِذَا صَلَّيْنَا زُرْنَاهَا فَقَرَّبَتْهُ إِلَيْنَا، وَكُنَّا نَفْرَحُ بِيَوْمِ الْجُمُعَةِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ، وَمَا كُنَّا نَتَغَدَّى وَلاَ نَقِيلُ إِلاَّ بَعْدَ الْجُمُعَةِ، وَاللَّهِ مَا فِيهِ شَحْمٌ وَلاَ وَدَكٌ[3].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٧٥.

(٢) بڕوانە فەرموودەی: ٥٤٢٥ بوخاری کە دواتر دێت.

(٣) بڕوانە: ٩٣٨.

## ١٨- باسی سڵق و جۆ[١]

٥٤٠٣- سەهل ﷺ دەڵێ: ئێمە دڵخۆش دەبووین بە ڕۆژی هەینی، پیرەژنێك لە ناوماندا بوو لاسکی سڵقەکانی هەڵدەکێشا و دەیکردە قابلەمەیەکەوە، پاشان هەندێ جۆشی تێ دەکرد، ئەنجا کە نوێژی هەینیمان بکردایە سەردانی ئەو پیرەژنەمان دەکرد، ئەویش ئەو خواردنەی (کە لێینابوو) دەیهێنا بۆمان، جا لەبەر ئەوە هەمووومان بە (هاتنی) ڕۆژی هەینی دڵخۆش دەبووین، وە ئێمە خواردنی نیوەڕۆمان نەدەخوارد و نیوەڕۆ خەومان نەدەکرد، مەگەر پاش نوێژی هەینی، وەڵڵاهی ئەو خواردنە نە پیوو نەچەوری تێدا نەبوو.

## ١٩- بابُ النَّهْسِ وَانْتِشَالِ اللَّحْمِ

٥٤٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: تَعَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَتِفًا ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

## ١٩- باسی قەپکردن بە گۆشتێکدا کە بە ئێسقانەوەیە، وە دەرهێنانی گۆشت لە شلەدا پێش کوڵانی

٥٤٠٤- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەقەپ گۆشتی شان و دەستی خوارد، پاشان هەستا و نوێژی کرد و دەست نوێژی نەگرتەوە.

٥٤٠٥ - وَعَنْ أَيُّوبَ وَعَاصِمٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْتَشَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَرْقًا مِنْ قِدْرٍ فَأَكَلَ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[١].

---

(١) پێکەوە لەگەڵ ئاودا خواردنێکی لێ دروست دەکرێ، پێکەوە دەکوڵێنرێن.

(٢) بڕوانە: ٢٠٧.

**٥٤٠٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پارچە ئێسقانێکی لە مەنجەڵکە دەرهێنا و گۆشتەکەی خوارد (کە بەئێسقانەکەوە بوو)، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

## ٢٠- بابُ تَعَرُّقِ الْعَضُدِ

٥٤٠٦- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ الْمَدَنِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ مَكَّةَ[٢].

## ٢٠- باسی کڕانەوە و خواردنی گۆشتی دەستی ئاژەڵ بە قەپ و ددان

**٥٤٠٦- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەرچووین (لە مەدینە) ڕوو بە مەککە.**

٥٤٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ يَوْمًا جَالِسًا مَعَ رِجَالٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَنْزِلٍ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَازِلٌ أَمَامَنَا، وَالْقَوْمُ مُحْرِمُونَ وَأَنَا غَيْرُ مُحْرِمٍ فَأَبْصَرُوا حِمَارًا وَحْشِيًّا وَأَنَا مَشْغُولٌ أَخْصِفُ نَعْلِي، فَلَمْ يُؤْذِنُونِي لَهُ، وَأَحَبُّوا لَوْ أَنِّي أَبْصَرْتُهُ، فَالْتَفَتُّ فَأَبْصَرْتُهُ، فَقُمْتُ إِلَى الْفَرَسِ فَأَسْرَجْتُهُ، ثُمَّ رَكِبْتُ وَنَسِيتُ السَّوْطَ وَالرُّمْحَ، فَقُلْتُ لَهُمْ: نَاوِلُونِي السَّوْطَ وَالرُّمْحَ. فَقَالُوا: لاَ وَاللَّهِ لاَ نُعِينُكَ عَلَيْهِ بِشَيْءٍ. فَغَضِبْتُ فَنَزَلْتُ فَأَخَذْتُهُمَا، ثُمَّ رَكِبْتُ فَشَدَدْتُ على الْحِمَارِ فَعَقَرْتُهُ، ثُمَّ جِئْتُ بِهِ وَقَدْ مَاتَ، فَوَقَعُوا فِيهِ

---

(١) بڕوانە: ٢٠٧.

(٢) بڕوانە: ١٨٢١.

يَأْكُلُونَهُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ شَكُّوا فِي أَكْلِهِمْ إِيَّاهُ وَهُمْ حُرُمٌ، فَرُحْنَا وَخَبَأْتُ الْعَضُدَ مَعِي، فَأَدْرَكْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: «مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟». فَنَاوَلْتُهُ الْعَضُدَ فَأَكَلَهَا حَتَّى تَعَرَّقَهَا، وَهُوَ مُحْرِمٌ. قَالَ ابْنُ جَعْفَرٍ: وَحَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ مِثْلَهُ[1].

**٥٤٠٧- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادەی سەلەمی لە باوکیەوە ﷺ گێڕایەوە کە ئەو وتی: من ڕۆژێکیان لەگەڵ پیاوانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ لە جێگایەکدا لە ڕێگای مەککە دانیشتبووین (بۆ پشوودان)، پێغەمبەری خواش ﷺ لە پێش ئێمەوە لایدا بوو دابەزیبوو، خەڵکە هەموو ئیحرامیان پۆشیبوو، بەڵام من ئیحرامم نەپۆشیبوو، ئینجا ئەوان کەرە وەحشیەکیان بینی لەو کاتەدا من سەرقاڵ بووم پێڵاوەکەم دەدوریەوە، ئەوانیش ئاگاداریان نەکردم لێی، وە حەزیان دەکرد کەمن بمدیایە، لە پڕ لام کردەوە یەکسەر بینیم ڕۆشتم بۆ لای ئەسپەکەم و زەینم کرد، پاشان سورا بووم و قەمچی ورمەکەم لە بیر چوو، بۆیە پێم وتن: ئەو قەمچی ورمە بدەنە دەستم، ئەوانیش وتیان: نەخێر وەڵڵاهی بە هیچ شتێك یارمەتیت نادەین بۆ ڕاوکردنی، منیش ڕقم هەستا و دابەزیم و هەردووکیانم[2] هەڵگرت، پاشان سوار ئەسپەکە بووم، هێرشم برد بۆ کەرە وەحشیەکە و بریندارم کرد (یان کوشتم)، پاشان چووم هێنام گیانی تیا نەمابوو مردبوو، جا هاوڕێکانم پەلاماریان دا و دەستیان کرد بەخواردنی، لە پاشان گومانیان بۆ پەیدا بوو دەربارەی خواردنی گۆشتی ئەو کەرە، کە ئەوان لە ئیحرامدان، ئیتر ڕۆشتین من دەستێکم لەگەڵ خۆم شاردبۆوە (هەڵمگرتبوو)، ئینجا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتین و پرسیارمان کرد لەو بارەیەوە،**

---

(١) بڕوانە: ١٨٢١.

(٢) قەمچی و ڕمەکە.

ئەویش فەرمووی: ((هچێكتان پێیە لە گۆشتەكەی؟)) منیش دەسەتەكەم دایە، ئەویش خواردی هەتا پێشەكەشی بەقەپ كڕاندەوە، لە كاتێكدا لە ئیحرامدا بوو. ئیبنو جەعفەر دەڵێ[1]: زەیدی كوڕی ئەسلەم بۆی گێڕامەوە لە عەتای كوڕی یەسارەوە لە ئەبی قەتادە ﷺ، وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕایەوە.

## ٢١- بابُ قَطْعِ اللَّحْمِ بِالسِّكِّينِ

٥٤٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ أَبَاهُ عَمْرَو بْنَ أُمَيَّةَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فِي يَدِهِ، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَلْقَاهَا وَالسِّكِّينَ الَّتِي يَحْتَزُّ بِهَا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

## ٢١- باسی گۆشت لەت كردن بە چەقۆ

٥٤٠٨-جەعفەری كوڕی عەمری كوڕی ئومەییە دەگێڕێتەوە، كە عەمری كوڕی ئومەییەی باوكی ﷺ بۆی گێڕایەوە كە پێغەمبەری ﷺ دیوە بەچەقۆ گۆشتی لە شانی مەڕێ دەكردەوە، (گۆشتەكە) لە دەستی پیرۆزیدا بوو، جا بانگ درا بۆ نوێژ، ئیتر گۆشت و ئەو چەقۆی فڕێدا كە گۆشتەكەی پێ دەبڕی و لەت دەكرد، لە پاشان هەستا و نوێژی كرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.

## ٢٢- بابٌ: مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَامًا

٥٤٠٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ[1].

---

(١) ئەم ڕشتەیە دەڕواتەوە سەر ڕشتەكەی پێشوو.

(٢) بڕوانە: ٢٠٨.

## ٢٢- باسێک: پێغەمبەر ﷺ هیچ خواردنێکی عەیبدار نەکردوە

**٥٤٠٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز هیچ خواردنێکی عەیبدار نەکردوە، ئەگەر حەزی لێ بکردایە دەیخوارد، ئەگەر حەزیشی لێ نەکردایە نەیدەخوارد و وازی لێ دەهێنا.**

## ٢٣- بَابُ النَّفْخِ فِي الشَّعِيرِ

٥٤١٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ أَنَّهُ سَأَلَ سَهْلاً: هَلْ رَأَيْتُمْ فِي زَمَانِ النَّبِيِّ ﷺ النَّقِيَّ قَالَ: لاَ. فَقُلْتُ فَهَلْ كُنْتُمْ تَنْخُلُونَ الشَّعِيرَ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ كُنَّا نَنْفُخُهُ[٢].

## ٢٣- باسی فوو کردن لە (توێکڵی ) جۆ

**٥٤١٠-ئەبو غەسسان وتی: ئەبو حازیم بۆی گێڕامەوە کە ئەو پرسیاری لە سەهل ﷺ کرد وتی: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نانی تەنکی تیریتان بینیوە؟ وتی: نەخێر، وتم: ئێوە (ئاردی) جۆتان دەبێژایەوە؟ وتی: نەخێر، بەڵام فوومان لێ ئەکرد[٣].**

## ٢٤- بَابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ يَأْكُلُونَ

٥٤١١- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَبَّاسٍ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا بَيْنَ أَصْحَابِهِ تَمْرًا، فَأَعْطَى كُلَّ إِنْسَانٍ

---

(١) بڕوانە: ٣٥٦٣.

(٢) بڕوانە: ٥٤١٣.

(٣) تا توێکڵ و پووشەکەی بڕوات فوومان لێ دەکرد و دەماندا بە بادا.

سَبْعَ تَمَرَاتٍ، فَأَعْطَانِي سَبْعَ تَمَرَاتٍ إِحْدَاهُنَّ حَشَفَةٌ، فَلَمْ يَكُنْ فِيهِنَّ تَمْرَةٌ أَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْهَا، شَدَّتْ فِي مَضَاغِي[1].

## ٢٤- باسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەیان خوارد

**٥٤١١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای دابەش كرد لە نێوان هاوەڵانیدا، هەر كەسێكیان حەوت دەنك خورمای دایە، حەوت خورماشی دا بەمن دانەیەكیان وشكەڵا بوو، هیچ خورمایەكیان تیا نەبوو لەوەیان بەلامەوە چاكتر و خۆشتر بێت، جیڕ بوو دەنوسا بەخرێمەوە[2].**

٥٤١٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ سَعْدٍ قَالَ: رَأَيْتُنِي سَابِعَ سَبْعَةٍ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ وَرَقُ الْحُبْلَةِ - أَوِ الْحَبَلَةِ- حَتَّى يَضَعَ أَحَدُنَا مَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ تُعَزِّرُنِي عَلَى الإِسْلاَمِ، خَسِرْتُ إِذًا وَضَلَّ سَعْيِي[3].

**٥٤١٢-قەیس لە سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خۆم دیوە حەوتەمینی ئەو حەوت كەسە بووم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین (غەزامان دەكرد)، جگە لە گەڵای حوبلە- یان حەبەلە[4] - هیچ خۆراكێكمان نەبوو، (بەجۆرێكمان لێ هات) هەتا هەر یەكەمان وەك مەڕ و ئاژەڵ پشقلی دادەنا[5]، پاشان بەنو ئەسەد وایان لێهاتوو لە بارەی ئیسلامەوە ڕەخنەم لێ دەگرن، كەواتە من خەسارەت مەند بووم و هەموو كۆششم بەزایە چوو.**

---

(١) بڕوانە: ٥٤٤١، ٥٤٤١م.

(٢) یان لە جویندا سەخت بوو بۆم.

(٣) بڕوانە: ٣٧٢٨.

(٤) حوبلە و حەبەلە بەری ڕووەكێكە وەكو لوبیا وایە، هەندێک دەڵێن گەڵای دار و ڕووەكێكی دڕكاویە.

(٥) لە باتی پیسی بەهۆی گەڵا و گیا خواردنەوە.

٥٤١٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَقُلْتُ: هَلْ أَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّقِيَّ؟ فَقَالَ سَهْلٌ: مَا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّقِيَّ مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللَّهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ. قَالَ: فَقُلْتُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَنَاخِلُ؟ قَالَ: مَا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْخُلاً مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللَّهُ حَتَّى قَبَضَهُ. قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غَيْرَ مَنْخُولٍ قَالَ: كُنَّا نَطْحَنُهُ وَنَنْفُخُهُ، فَيَطِيرُ مَا طَارَ، وَمَا بَقِيَ ثَرَّيْنَاهُ فَأَكَلْنَاهُ[١].

**٥٤١٣-ئەبو حازیم دەڵێ: لە سەهلی کوڕی سەعدم ﷺ پرسی وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نانی (ئاردی) بێژراوەی خواردووە؟ سەهلیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەوەی خوا ناردوویەتی تا بردیەوە بۆلای خۆی نانی (ئاردی) بێژراوەی نەدیوە، وتی: جا وتم: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هێلەکتان هەبوو؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەوەی خوا ناردوویەتی تا بردیەوە بۆلای خۆی هێلەکی نەدیوە، دەڵێ: وتم: چۆن (ئاردی) جۆی نەبێژراوتان دەخوارد؟ وتی: دەمان هاڕی و فومان لێ دەکرد [٢] ئەوەی دەڕۆی دەڕۆی، ئەوەشی دەمایەوە بە ئاو تەڕمان دەکرد و دەمان خوارد.**

٥٤١٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ مَرَّ بِقَوْمٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ شَاةٌ مَصْلِيَّةٌ، فَدَعَوْهُ فَأَبَى أَنْ يَأْكُل، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الدُّنْيَا وَلَمْ يَشْبَعْ مِنَ الْخُبْزِ الشَّعِيرِ.

**٥٤١٤-سەعیدی مەقبوری لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو (ئەبو هورەیرە) بەلای چەند کەسێکدا تێپەڕی، مەڕێکی برژاویان لە بەردەمدا بوو، جا بانگیان کرد، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو کە بیخوات، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دونیا دەرچوو لە نانی جۆ تێری نەخوارد.**

---

(١) بڕوانە: ٥٤١٠.

(٢) واتە: بە فوو دەماندا بە بادا.

٥٤١٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا مُعَاذٌ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ يُونُسَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى خِوَانٍ، وَلاَ فِي سُكْرُجَةٍ، وَلاَ خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ. قُلْتُ لِقَتَادَةَ: عَلَى مَا يَأْكُلُونَ قَالَ: على السُّفَرِ[1].

**٥٤١٥-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نە لەسەر مێز نانی خواردووە نە لە قاپ و دەوری بچووکدا، نە نانی تەنکی بۆکراوە. (یونس دەڵێ) وتم بە قەتادە: لەسەر چی نانیان دەخوارد؟ وتی: لەسەر سفرە.**

٥٤١٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ الْبُرِّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعًا، حَتَّى قُبِضَ[2].

**٥٤١٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: لەو کاتەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە بۆ مەدینە تا گیانی کێشرا، موحەممەد و خێزانەکانی سێ شەو لەسەر یەك لە نانی گەنم تێریان نەخواردووە.**

## ٢٥- بابُ التَّلْبِينَةِ

٥٤١٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلاَّ أَهْلَهَا وَخَاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ، تَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ»[3].

---

(١) بروانە: ٥٣٨٦.

(٢) بروانە: ٦٤٥٤.

(٣) بروانە: ٥٦٨٩، ٥٦٩٠.

## ٢٥- باسی شۆربای تەلبینە[١]

٥٤١٧-عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ کەسێکی لە خزمانی (عائیشە) بمردایە و ژنان بۆ (تەعزیە و سەرەخۆشی) ئەو مردووە کۆدەبوونەوە، پاشان بڵاوەیان لێ دەکرد - جگە لە کەس و خزمە نزیکەکانی -، عائیشە ﵂ فەرمانی دەکرد مەنجەڵێك شۆربای تەلبینە لێ دەنرا و پاشان نان ورد دەکرا و شۆربا تەلبینەکەی دەکرا بەسەردا، پاشان عائیشە دەیوت (بەژنەکان): هەمووتان لێی بخۆن، چونکە بەدڵنیاییەوە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((شۆربای تەلبینە ئارامی بەدڵی نەخۆش دەدات و هەندێ خەم و پەژارەش لادەبات و نایهێڵێت)).

## ٢٦- بابُ الثَّرِيدِ

٥٤١٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ الْجَمَلِيِّ، عَنْ مُرَّةَ الْهَمْدَانِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَفَضْلُ عَائِشَةَ على النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ على سَائِرِ الطَّعَامِ»[٢].

## ٢٦- باسی تریت[٣]

٥٤١٨- ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە کە فەرموویەتی: ((زۆر لەپیاوان کامڵ و تەواو بوون[٤]، بەڵام لە ژناندا تەنها

---

(١) (التلبينة): شۆربایەکە لە ئارد یان کەپەک و شیر دروست دەکرێت، هەندێک جار هەنگوینی تێ دەکرێت، ئەو کاتەی کە هەنگوینی تێ کرا پێی دەوترێت حەڵوا (بڕوانە: إرشاد الساري: ١٢/١٧٩)، المونجيد بە كوردی: ٤/٤٠٠، قاموسی ڕستە: ٤/٢٣٣٨)

(٢) بڕوانە: ٣٤١١.

(٣) الثريد، نان ورد دەکرێت و ئاوی گۆشت یان ئاوو گۆشتەکە پێکەوە دەکرێ بەسەر نانە وردکراوەکەدا. **بڕوانە : إرشاد الساری: ١٢/١٧٩.**

(٤) تەواو کامڵ واتە هەرچی سیفاتی جوان و پێویست بێت بۆ پیاوان یان بۆ ئافرەتان تیاندا هەیە.

**مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی ژنی فیرعەون کامڵ و تەواو بوون، وە بێگومان فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ژنانی تردا وەك فەزڵ و گەورەیی تریت[1] وایە بە چاو خۆراکەکانی ترەوە)).**

٥٤١٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي طُوَالَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "فَضْلُ عَائِشَةَ على النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ على سَائِرِ الطَّعَامِ»[2].

**٥٤١٩-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((فەزڵ و گەورەی عائیشە بەسەر ژنانی تردا، وەك جیاوازی و چاکی تریتە[3] بەسەر هەموو خواردنەکانی تردا)).**

٥٤٢٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ سَمِعَ أَبَا حَاتِمٍ الأَشْهَلَ بْنَ حَاتِمٍ حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى غُلَامٍ لَهُ خَيَّاطٍ، فَقَدَّمَ إِلَيْهِ قَصْعَةً فِيهَا ثَرِيدٌ -قَالَ:- وَأَقْبَلَ عَلَى عَمَلِهِ -قَالَ:- فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ -قَالَ:- فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُهُ فَأَضَعُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ -قَالَ:- فَمَا زِلْتُ بَعْدُ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ[4].

**٥٤٢٠-ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ چووین بۆ لای غولامێکی بەرگ دوور، کە غولامی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا قاپێکی لە بەردەم پێغەمبەردا ﷺ دانا کە تریتی[5] تیابوو، (ئەنەس) دەڵێ: غولامەکە چوو بەدەم کارەکەیەوە دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ بە دوای کولەکەدا دەگەڕا، (ئەنەس) دەڵێ: منیش بە شوێن کولەکەکادا دەگەڕام و دەمخستە بەردەمیەوە، (ئەنەس) دەڵێ: ئیتر لەوە کاتە بە دواوە هەمیشە حەزم لە کولەکەیە.**

---

(١) (ثريد): نانی تێکوشراو، بەڵام هەندێ دەڵێن بە گۆشتەوە بێت ئەنجا پێی دەڵێن (ثريد).

(٢) بڕوانە: ٣٧٧٠.

(٣) الثريد، واتە تێکوشراوی ئاوی گۆشت یان وردە نان بە ئاوی گۆشت و گۆشتەوە.

(٤) بڕوانە: ٢٠٩٢.

(٥) بریتی بوو لە نانی تێکوشراو لەگەڵ گۆشت و کولەکەی وشککراو.

## ٢٧- بَابُ الشَّاةِ الْمَسْمُوطَةِ وَالْكَتِفِ وَالْجَنْبِ

٥٤٢١- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: كُنَّا نَأْتِي أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ وَخَبَّازُهُ قَائِمٌ، قَالَ: كُلُوا، فَمَا أَعْلَمُ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَغِيفًا مُرَقَّقًا حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ، وَلاَ رَأَى شَاةً سَمِيطًا بِعَيْنِهِ قَطُّ[1].

## ٢٧- باسی مەڕی برژاو و دەست و پەراسوو

**٥٤٢١- قەتادە دەڵێ: ئێمە دەچووین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ نانکەرەکەی لایدا وەستابوو، ئەنەس وتی: بخۆن من ئاگادارنیم پێغەمبەر ﷺ نانێکی تەنك و نەرمی بینیبێت هەتا گەیشتەوە بە خزمەتی خوا، وە هەرگیز مەڕێکی نەبینیوە بەچاوی خۆی بەئاوی گەرم خوریەکەی لابرابێ و بەساقی برژێنرابێ[2].**

٥٤٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ فَقَامَ فَطَرَحَ السِّكِّينَ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[3].

**٥٤٢٢-عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ دیت لە گۆشتی شانی مەڕێکی دەبڕی (بە چەقۆ) و لێی خوارد[4]، ئینجا بانگی نوێژ درا، ئیتر پێغەمبەر ﷺ هەستا چەقۆکەی فڕێدا و نوێژی کرد و دەست نوێژی نەگرتەوە.**

---

(١) بروانە: ٥٣٨٥.

(٢) وە نەیخواردووە.

(٣) بروانە: ٢٠٨.

(٤) چونکە برژاو بوو.

## ٢٨- بابُ مَا كَانَ السَّلَفُ يَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِهِمْ وَأَسْفَارِهِمْ مِنَ الطَّعَامِ وَاللَّحْمِ وَغَيْرِهِ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ وَأَسْمَاءُ ﵄: صَنَعْنَا لِلنَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ ﵁ سُفْرَةً.

٥٤٢٣- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلاَثٍ؟ قَالَتْ: مَا فَعَلَهُ إِلاَّ فِي عَامٍ جَاعَ النَّاسُ فِيهِ، فَأَرَادَ أَنْ يُطْعِمَ الْغَنِيُّ الْفَقِيرَ، وَإِنْ كُنَّا لَنَرْفَعُ الْكُرَاعَ فَنَأْكُلُهُ بَعْدَ خَمْسَ عَشْرَةَ. قِيلَ: مَا اضْطَرَّكُمْ إِلَيْهِ؟ فَضَحِكَتْ قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْ خُبْزِ بُرٍّ مَأْدُومٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ. وَقَالَ ابْنُ كَثِيرٍ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ بِهَذَا(١).

## ٢٨- باسی ئەوەی پێشینان(٢) پاشەکەوتیان دەکرد لە خۆراک و گۆشت و شتی تر لە ماڵ و سەفەرەکانیاندا

**-عائیشە و ئەسما ﵄ دەڵێن: ئێمە خواردنی سەفەرمان بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﵁ دروست کرد(٣).**

**٥٤٢٣-عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە گۆشتی قوربانی لە سێ ڕۆژ زیاتر بخورێت؟ وتی: ئەوەی نەکردوە تەنها لەو ساڵەدا نەبێت کە خەڵکی تیا برسی بوون، ویستی دەوڵەمەندەکان خۆراك بدەن بە هەژارەکان لولاق و قولە پێی ئاژەڵمان هەڵ دەگرت و لە دوای پازدە ڕۆژ دەمان خوارد، وتی: چی ناچاری**

(١) بڕوانە: ٥٤٣٨، ٥٥٧٠، ٦٦٨٧.

(٢) لەسەحابە و شوێن کەوتوانیان.

(٣) کاتێ کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

**خواردنی ئەوەی دەكردن؟ عائیشەش ﵂ پێكەنی وتی: خێزانی موحەممەد ﷺ سێ ڕۆژ لەسەر یەك تێر نەبوون لە نان و پێخۆر، هەتا پێغەمبەر ﷺ گەیشتە خزمەتی خوای گەورە.**

**ئیبنو كەسیر دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڕەحمانی كوڕی عابیس ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕاینەوە.**

٥٤٢٤- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَتَزَوَّدُ لُحُومَ الْهَدْيِ على عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْمَدِينَةِ. تَابَعَهُ مُحَمَّدٌ، عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَقَالَ: حَتَّى جِئْنَا الْمَدِينَةَ؟ قَالَ: لاَ[(١)].

**٥٤٢٤-جابیر ﵁ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ توێشوومان لە گۆشتی قوربانی هەڵدەگرت بۆمەدینە.**

**-موحەممەد لە ئیبنو عویینەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عەبدوڵلای كردوە.**

**-ئیبنو جورەیج دەڵێ: وتم بە عەتا ئایا (جابر) وتی: هەتا دەچووینەوە مەدینە؟ وتی: نەخێر نەیوتووە.**

## ٢٩- باب الْحَيْسِ

٥٤٢٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَمْرِو -بْنِ أَبِي عَمْرٍو مَوْلَى الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَنْطَبٍ- أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَبِي طَلْحَةَ: «الْتَمِسْ غُلاَمًا مِنْ غِلْمَانِكُمْ يَخْدُمُنِي». فَخَرَجَ بِي أَبُو طَلْحَةَ، يُرْدِفُنِي وَرَاءَهُ، فَكُنْتُ أَخْدُمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُلَّمَا نَزَلَ، فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ». فَلَمْ أَزَلْ أَخْدُمُهُ

---

(١) بڕوانە: ١٧١٩.

حَتَّى أَقْبَلْنَا مِنْ خَيْبَرَ، وَأَقْبَلَ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ قَدْ حَازَهَا، فَكُنْتُ أَرَاهُ يُحَوِّي وَرَاءَهُ بِعَبَاءَةٍ -أَوْ بِكِسَاءٍ- ثُمَّ يُرْدِفُهَا وَرَاءَهُ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ صَنَعَ حَيْسًا فِي نِطَعٍ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَدَعَوْتُ رِجَالاً فَأَكَلُوا، وَكَانَ ذَلِكَ بِنَاءَهُ بِهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا بَدَا لَهُ أُحُدٌ قَالَ: «هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ». فَلَمَّا أَشْرَفَ على الْمَدِينَةِ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ جَبَلَيْهَا مِثْلَ مَا حَرَّمَ بِهِ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ؛ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ»[1].

## ٢٩- باسی خورما و ڕۆن بەکەشکی کوتراوەوە

**٥٤٢٥-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو تەڵحەی فەرموو: ((بگەڕێ لە ناو مێرد منداڵەکانتاندا مێرد منداڵێکم بۆ پەیدا بکە خزمەت کاریم بکات))، ئەبو تەڵحەش منی لە پاشکۆ خۆیدا سوارکرد و دەرچوو، ئیتر من بەردەستی و خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، هەر کاتێ دابەزیایە و لایبدایە، جامن گوێم لێبوو زۆر دەیفەرموو: ((خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و پەژارە و نەتوانین و تەمەڵی و ڕژدەیی و ترسنۆکی و کەڵەکەبوونی قەرز و زاڵبوونی پیاوان (بەسەرمدا) ))[2]، جا بەردەوام خزمەتم دەکرد هەتا لە خەیبەر گەڕاینەوە، وە صەفییەی کچی حویەیی لەگەڵ خۆی هێنا کە هەڵیبژاردبوو[3]، ئینجا دەمبینی عابایەك یا پشتە ماڵێکی بە دەوری کوپەری وشتەرکەدا پێچابوو[4]، پاشان لە پاشکۆی خۆیەوە سواری دەکرد، (هاتین) تا گەیشتینە صەهبا خورما و ڕۆنێك بەکەشکی کوتراوی دروست کرد لەسەر سفرەیەکی چەرم (داینا)، پاشان ناردمی و پیاوانێکم بانگ کرد و خواردیان،**

---

(١) بروانە: ٣٧١.

(٢) بەداواکردنی قەرزەکە لێم.

(٣) لە دەستکەوتەکانی خەیبەر.

(٤) بۆ ئەوەی ئەوەی سواری دەبێت لە کەوتن بیپارێزێ و لە پاڵ پێوەدانیشی پشوو بدات.

ئەوە گواستنەوەی صەفییە و نانی شاییەکەی بوو، پاشان هات تا کێوی ئوحودی لێوە دەرکەوت فەرمووی: ((ئەوە کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ))، جا کە مەدینەی لێوە دەرکەوت فەرمووی: ((خوایە من نێوانی هەردوو شاخەکەی قەدەغە دەکەم وەك ئەوەی ئیبراهیم ﷺ مەککەی قەدەغە کرد، خوایە فەڕ و بەرەکەت بخەرە موود و صاعیانەوە)) [١].

## ٣٠- بَابُ الأَكْلِ فِي إِنَاءٍ مُفَضَّضٍ

٥٤٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سَيْفُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يَقُولُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى أَنَّهُمْ كَانُوا عِنْدَ حُذَيْفَةَ فَاسْتَسْقَى، فَسَقَاهُ مَجُوسِيٌّ، فَلَمَّا وَضَعَ الْقَدَحَ فِي يَدِهِ رَمَاهُ بِهِ وَقَالَ: لَوْلاَ أَنِّي نَهَيْتُهُ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ -كَأَنَّهُ يَقُولُ: لَمْ أَفْعَلْ هَذَا- وَلَكِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَلاَ الدِّيبَاجَ، وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الآخِرَةِ»[٢].

## ٣٠- باسی (حوکمی) خواردن لە قاپ و قاپاغی زیواوی [٣]

٥٤٢٦-موجاهید دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا بۆی گێڕامەوە کە ئەوان لای حوزەیفە ﷺ بوون، جا داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، ئینجا ئاگرپەرستێك ئاوەکەی بۆهێنا، جا کاتێ جامەکەی دایە دەستی (حوزەیفە) جامەکەی هاوێشت بۆ ئاگرپەرستەکە [٤] ئەگەر جارێ یا دوو جار ڕێگری ئەمەم لێ نەکردایە -وەکو

(١) مود و ساع دوو دەفتەی پێوانەن کە خۆراک و شتی تریان پێ پێواوە.
(٢) بڕوانە: ٥٦٣٢، ٥٦٣٣، ٥٨٣١، ٥٨٣٧.
(٣) واتە: دەفرێک پینە کرابێ بە زیو یان زیوی تێکەڵاو بێت یان ڕووکەشی زیو بێت.
(٤) شکا وەک لە سەحیحی موسلیم دا هاتووە.

بلێى دەڵێ: وام نەدەكرد- بەڵكو لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووه كەدەیفەرموو: ((پۆشاكی ئاووریشم و دیباج [١] لەبەر مەكەن، وە لە قاپ و قاچاغی زێڕ و زیودا مەخۆنەوە، وە لە قاپ و قاچاغی زیو (زێڕ)دا خواردن مەخۆن، چونكە بێگومان لە دونیادا بۆ ئەوانە [٢]، وە لە دوا ڕۆژدا بۆ ئێمەیە)).

## ٣١- بابُ ذِكْرِ الطَّعَامِ

٥٤٢٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ، لاَ رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ»[٣].

## ٣١- باسی ناو هێنانی خواردن

٥٤٢٧- ئەنەسی كوڕی مالیك لە ئەبو مووسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێت (و كاری پێ دەكات) وەك ترنج[٤] وایە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، وە ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت وەك خورمان وایە، تامی خۆشەو بۆنی نییە، وە نموونەی ئەو دوو ڕووەی قورئان دەخوێنێت وەك ڕیحانە وایە، بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، وە نموونەی ئەو ناپاكەی قورئان ناخوێنێت، وەك گوژاڵكە وایە بۆنی نییە و تامیشی تاڵە)).

---

(١) دیباج: جۆرێكە لە ئاوریشم.
(٢) بێ باوەڕان.
(٣) بروانە: ٥٠٢٠.
(٤) الأُتْرُجَّةِ: درەختی ترنج، بەری ترنج (درەختێكە لە ڕەگەزی لیمۆیە) (المونجید بەكورید: ٣٣/١).

٥٤٢٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فَضْلُ عَائِشَةَ على النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ على سَائِرِ الطَّعَامِ»[1].

**٥٤٢٨- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((فەزڵ و گەورەی عائیشە ﷺ بەسەر ژنانی تردا، وەك جیاوازی و چاکی تریتە[2] بەسەر هەموو خواردنەکانی تردا)).**

٥٤٢٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ؛ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ، فَإِذَا قَضَى نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ»[3].

**٥٤٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە فەرموویەتی: (سەفەر پارچەیەکە لە سزا و ئازار، ڕێگری خواردن و خواردنەوە و نووستن دەکات لە هەر کامتان، بۆیە هەر کاتێ مەبەست و پێویستی کەسێکتان جێبەجێ بوو با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ لای کەسوکاری).**

## ٣٢- بابُ الأُدْمِ

٥٤٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ رَبِيعَةَ أَنَّهُ سَمِعَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ يَقُولُ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلَاثُ سُنَنٍ، أَرَادَتْ عَائِشَةُ أَنْ تَشْتَرِيَهَا فَتُعْتِقَهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: وَلَنَا الْوَلَاءُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لَوْ شِئْتِ شَرَطْتِيهِ لَهُمْ، فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». قَالَ: وَأُعْتِقَتْ فَخُيِّرَتْ فِي أَنْ تَقِرَّ تَحْتَ زَوْجِهَا أَوْ تُفَارِقَهُ، وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) بڕوانە: ٣٧٧٠.

(٢) الثَّرِيد، واتە تێکوشراوی ئاوی گۆشت یان وردە نان بە ئاوی گۆشت و گۆشتەوە.

(٣) بڕوانە: ١٨٠٤.

ﷺ يَوْمًا بَيْتَ عَائِشَةَ وَعَلَى النَّارِ بُرْمَةٌ تَفُورُ، فَدَعَا بِالْغَدَاءِ فَأُتِيَ بِخُبْزٍ وَأُدْمٍ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ فَقَالَ: «أَلَمْ أَرَ لَحْمًا؟». قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَكِنَّهُ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَأَهْدَتْهُ لَنَا. فَقَالَ: "هُوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهَا، وَهَدِيَّةٌ لَنَا»[١].

## ٣٢- باسی پێخۆر[٢]

**٥٤٣٠-قاسیمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: لە بەریرەدا سێ سوننەت هەبوو: عائیشە ﷺ ویستی بیکڕێت و ئازادی کات، بەڵام خاوەنەکەی وتی: سەرپەرەشتیاری بۆ ئێمە بێت، عائیشەش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر ویستت ئەو مەرجەیان بۆ دابنێ، چونکە بێگومان سەرپەرشتیاریی بۆ ئەو کەسەیە ئازادی دەکات))، (قاسیم) دەڵێ: (سوننەتی دووەم) وە ئازاد کراو سەرپشك کرا لە نێوان ئەوەی لای مێردەکەی بمێنێتەوە یان لێی جیابێتەوە، وە (سوننەتی سێ یەم) پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك چووە ژوورەوە بۆ ماڵی عائیشە ﷺ قابلەمەیەك بەسەر ئاگرەوە بوو دەکولا، پێغەمبەریش ﷺ داوای خواردنی کرد، جا نان و پێخۆرێکیان بۆ هێنا لەو پێخۆرەی لەو ماڵەدا بوو، ئەویش فەرمووی پێیان: ((گۆشتم نەبینی؟)) عەرزیان کرد، بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (گۆشت هەبوو بەڵام گۆشتێك بوو کرابوو بەخێر بۆ بەریرە ﷺ ئەویش بەدیاری هێنای بۆ ئێمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گۆشتەکە بۆ ئەو خێر و سەدەقەیە بۆ ئێمەش دیاری)).**

## ٣٣- بابُ الْحَلْوَاءِ وَالْعَسَلِ

٥٤٣١- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْحَنْظَلِيُّ، عَنْ أَبِي أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ[١].

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) پێخۆر: بەو خواردنە دەوترێت بە نانەوە دەخورێت.

## ٣٣- باسی (ناو هێنانی) حەڵوا و هەنگوین

**٥٤٣١- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە حەڵوا و هەنگوین بوو.**

٥٤٣٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شَيْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي الْفُدَيْكِ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَلْزَمُ النَّبِيَّ ﷺ لِشِبَعِ بَطْنِي حِينَ لاَ آكُلُ الخَمِيرَ، وَلاَ أَلْبَسُ الحَرِيرَ، وَلاَ يَخْدُمُنِي فُلاَنٌ وَلاَ فُلاَنَةُ، وَأُلْصِقُ بَطْنِي بِالْحَصْبَاءِ، وَأَسْتَقْرِئُ الرَّجُلَ الآيَةَ وَهْيَ مَعِي كَيْ يَنْقَلِبَ بِي فَيُطْعِمَنِي، وَخَيْرُ النَّاسِ لِلْمَسَاكِينِ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، يَنْقَلِبُ بِنَا فَيُطْعِمُنَا مَا كَانَ فِي بَيْتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ لَيُخْرِجُ إِلَيْنَا الْعُكَّةَ لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، فَنَشْتَقُّهَا فَنَلْعَقُ مَا فِيهَا[٢].

**٥٤٣٢- (سەعیدی) مەقبوری دەگێڕێتەوە لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەڵێ: من بە نانە زگ لە پێغەمبەری خوا ﷺ جیا نەدەبوومەوە، هەتا نانی هەڵاتووم نەدەخوارد، جل و بەرگی ئاوریشمم لەبەر نەدەکرد، فلان کۆیلە و فلان کەنیزەك خزمەتیان نەدەکردم، لە برسا بەردم بەزگمەوە دەبەست، خوێندنەوەی ئایەتێکم لە یەکێك داوا ئەکرد کە خۆشم ئەو ئایەتەم دەزانی و لام بوو، بۆ ئەوەی (بزانێ برسیمە وە) بمباتەوەماڵەوە شتێکم دەرخوارد بدا، (کەسیان نەیان بردمەوە بۆ ماڵەوە)، جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ﵁ لە هەمووان چاکتر بوو بۆ هەژاران، ئەیبردینەوە ماڵەوە چی لە ماڵەکەیاندا هەبوایە دەرخواردی ئەدایین، هەتا هەندێ جار هیزەیەك کە هیچ ڕۆنی تیانەمابوو بۆی ئەهێنایین، بۆی پارچە پارچە ئەکردین ئەوەی پێوەبوو ئەمان لستەوە.**

---

(١) بروانە: ٤٩١٢.

(٢) بروانە: ٣٧٠٨.

## ٣٤- بابُ الدُّبَّاءِ

٥٤٣٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَزْهَرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى مَوْلًى لَهُ خَيَّاطًا، فَأُتِيَ بِدُبَّاءٍ، فَجَعَلَ يَأْكُلُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّهُ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُهُ[1].

## ٣٤- باسی كولەكە

**٥٤٣٣-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادكراوێكی بەرگدرووی هەبوو ڕۆشت بۆ لای، جا كولەكەی بۆهێنا و ئەویش دەستی بە خواردنی كرد، ئیتر لەو كاتەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەیخوارد هەمیشە حەزم لە كولەكەیە.**

## ٣٥- بابُ الرَّجُلِ يَتَكَلَّفُ الطَّعَامَ لِإِخْوَانِهِ

٥٤٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: كَانَ مِنَ الأَنْصَارِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو شُعَيْبٍ، وَكَانَ لَهُ غُلاَمٌ لَحَّامٌ، فَقَالَ: اصْنَعْ لِي طَعَامًا أَدْعُو رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَدَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّكَ دَعَوْتَنَا خَامِسَ خَمْسَةٍ، وَهَذَا رَجُلٌ قَدْ تَبِعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَذِنْتَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ تَرَكْتَهُ». قَالَ: بَلْ أَذِنْتُ لَهُ.

## ٣٥- باسی كەسێك بەزەحمەت خواردن بۆ براكانی دروستكات

**٥٤٣٤- ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﷺ وتی: لە ناو ئەنصارییەكاندا پیاوێك هەبوو پێی دەوترا: ئەبو شوعەیب غولامێكی گۆشت فرۆشی هەبوو، پێی وت:**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩٢.

خواردنێکم بۆ دروست بکە (دەمەوێ) پێغەمبەری خوا ﷺ دەعوەت بکەم کە یەکێکە لە پێنج کەسەکە، ئینجا پێغەمبەری خوای ﷺ دەعوەت کرد کە یەکێك بوو لە پێنج کەسەکە، جا پیاوێك دوایان کەوت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( بێگومان تۆ ئێمەت دەعوەت کردوە کە پێنج کەسین، ئەم پیاوەش دوامان کەوتووە، جا ئەگەر دەتەوێ ڕێگەی پێ بدە، وە ئەگەر دەتەوێ ڕێگەی مەدە))، وتی: بەڵکو ڕێگەی دەدەم.

## ٣٦- بابُ مَنْ أَضَافَ رَجُلاً إِلَى طَعَامٍ، وَأَقْبَلَ هُوَ عَلَى عَمَلِهِ

٥٤٣٥- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ النَّضْرَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ غُلاَمًا أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى غُلاَمٍ لَهُ خَيَّاطٍ، فَأَتَاهُ بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ وَعَلَيْهِ دُبَّاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ: -قَالَ- فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ جَعَلْتُ أَجْمَعُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ -قَالَ:- فَأَقْبَلَ الْغُلاَمُ عَلَى عَمَلِهِ. قَالَ أَنَسٌ: لاَ أَزَالُ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ بَعْدَ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ مَا صَنَعَ[1].

## ٣٦- باسی کەسێک میوانداری پیاوێ بکات بۆ خواردنێک و خۆی بڕوات بەدەم ئیش و کارەکەیەوە

٥٤٣٥-ئەنەس ﷺ وتی: من مێرد منداڵێك بووم لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ غولامێکی بەرگدرووی هەبوو چوو بۆلای، ئەو لەگەنێکی هێنا خۆراکی تیا بوو کولەکەشی لەسەر بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای کولەکەکەدا دەگەڕا، دەڵێ: جا کە ئەوەم دی دەستم کرد بە کۆکردنەوەی لە بەردەمیدا، (ئەنەس) دەڵێ: غولامەکەش ڕۆشت بۆ سەر

(١) بڕوانە: ٢٠٩٢.

**کارەکەی، ئەنەس وتی: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوام ﷺ دی بەو جۆرەی کرد، هەمیشە حەزم لە کولەکە بوو.**

## ٣٧- باب الْمَرَق

٥٤٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ أَنَّ خَيَّاطًا دَعَا النَّبِيَّ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ، فَذَهَبْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَرَّبَ خُبْزَ شَعِيرٍ وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ، فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ بَعْدَ يَوْمِئِذٍ[1].

## ٣٧- باسی شلە[2]

**٥٤٣٦-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە بەرگدروویەك پێغەمبەری ﷺ بانگ کرد بۆ سەر خواردنێك کە دروستی کردبوو، منیش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتم، جا نانی جۆ و شلەیەك کە کولەکە و گۆشتی وردکراوی تیابوو هێنای (بۆ پێغەمبەر ﷺ)، ئینجا پێغەمبەرم ﷺ دی لە هەموو لایەکی لەگەنەکەدا بۆ کولەکە دەگەڕا، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە هەمیشە حەزم لە کولەکەیە.**

## ٣٨- باب الْقَدِيد

٥٤٣٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُهُ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ يَأْكُلُهَا[3].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩٢.

(٢) واتە خواردنێک شلە بێت.

(٣) بڕوانە: ٢٠٩٢.

## ٣٨- باسی گۆشتی توێ کراوی لەبەر خۆر وشک کراو [(١)]

**٥٤٣٧-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی شلەیەکی بۆ هێنرا کولەکە و پلە گۆشتی وشك کراوەی تیابوو، جا پێغەمبەرم ﷺ بینی دەگەڕا بە دوای کولەکەکاندا و دەیخواردن.**

٥٤٣٨- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا فَعَلَهُ إِلاَّ فِي عَامٍ جَاعَ النَّاسُ، أَرَادَ أَنْ يُطْعِمَ الْغَنِيُّ الْفَقِيرَ، وَإِنْ كُنَّا لَنَرْفَعُ الْكُرَاعَ بَعْدَ خَمْسَ عَشْرَةَ، وَمَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مَنْ خُبْزِ بُرٍّ مَأْدُومٍ ثَلاَثًا[(٢)].

**٥٤٣٨- عائیشە ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) تەنها لەو ساڵەدا قەدەغەی کرد (لە سێ ڕۆژ زیاتر گۆشتی قوربانی نەخورێت)، کە خەڵکی برسیان بوو، ویستی دەوڵەمەندەکان خۆراك بدەن بە هەژارەکان، وە ئێمە لولاق و قوڵە پێی ئاژەڵمان هەڵدەگرت بۆ پاش پازدە ڕۆژ (دەمان خوارد)، وە خێزانی موحەممەد ﷺ سێ ڕۆژ لەسەر یەك تێریان نەخواردووە لە نانی گەنم بە پێخۆرەوە.**

## ٣٩- بابُ مَنْ نَاوَلَ أَوْ قَدَّمَ إِلَى صَاحِبِهِ عَلَى الْمَائِدَةِ شَيْئًا

وَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُنَاوِلَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، وَلاَ يُنَاوِلُ مِنْ هَذِهِ الْمَائِدَةِ إِلَى مَائِدَةٍ أُخْرَى.

٥٤٣٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ -قَالَ أَنَسٌ:- فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ، فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خُبْزًا مِنْ شَعِيرٍ وَمَرَقًا

---

(١) بەوگۆشتە دەوتریت کە بە باری درێژیدا توێ دەکرێ و خوێی پیا دەکرێت لەبەر خۆر وشک دەکرێتەوە.

(٢) بڕوانە: ٥٤٢٣.

فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ -قَالَ أَنَسٌ:- فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوْلِ الصَّحْفَةِ، فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ(١). وَقَالَ ثُمَامَةُ، عَنْ أَنَسٍ: فَجَعَلْتُ أَجْمَعُ الدُّبَّاءَ بَيْنَ يَدَيْهِ(٢).

## ٣٩- باسی کەسێک خواردنێک لەسەر سفرەکەیە بیدات بە هاوڕێکەی یان پێشکەشی کات (دروستە)

**- (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێ: قەینا کات کەسێکیان خۆراك بدات بە کەسێکیان(٣)، بەڵام نابێ لەم سفرە بدرێ بەکەسێ لەسەر ئەو سفرەی کەیە.**

**٥٤٣٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: بەرگدروویەك پێغەمبەری ﷺ بانگ کرد بۆسەر خواردنێك کە دروستی کردبوو، ئەنەس دەڵێ: منیش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتم بۆ ئەو نان خواردنە، ئینجا نانی جۆ و شلەیەك کە کولەکە و گۆشتی وردکراوی تیابوو هێنای بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەنەس دەڵێ: جا پێغەمبەرم ﷺ دی لە هەموو لایەکی لەگانەکەدا بۆ کولەکەکە دەگەڕا، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە هەمیشە حەزم لە کولەکەیە.**

**-سومامە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەوە وتی: جا منیش دەستم کرد بە کۆکردنەوەی کولەکەکان بۆی لە بەردەمیدا.**

## ٤٠- بابُ الرُّطب بِالْقِثَّاءِ

٥٤٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ(٤).

---

(١) بروانە: ٢٠٩٢.

(٢) بروانە: ٥٤٣٥.

(٣) ئەگەر لەسەر یەک سفرە یا مێزی نان خواردن بوون.

(٤) بروانە: ٢٠٤٧، ٥٤٤٩.

## ٤٠- باسی (خواردنی) فەریکە خورما[١] بە ترۆزییەوە

**٥٤٤٠- عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی فەریکەی خورمای دەخوارد بە ترۆزییەوە.**

## ٤١- بابٌ

٥٤٤١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَبَّاسٍ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: تَضَيَّفْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ سَبْعًا، فَكَانَ هُوَ وَامْرَأَتُهُ وَخَادِمُهُ يَعْتَقِبُونَ اللَّيْلَ أَثْلاَثًا، يُصَلِّي هَذَا، ثُمَّ يُوقِظُ هَذَا. وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَصْحَابِهِ تَمْرًا، فَأَصَابَنِي سَبْعُ تَمَرَاتٍ إِحْدَاهُنَّ حَشَفَةٌ[٢].

## ٤١- باسێک

**٥٤٤١-ئەبو عوسمان دەڵێ: حەوت (شەو و ڕۆژ) میوانی ئەبو هوڕەیرە ﷺ بووم، جا خۆی و هاوسەرەکەی و خزمەتکارەکەی بەنۆرە و بەشوێن یەکتریدا شەویان کردبوویە سێ بەشەوە، ئەم سێیەکی شەو نوێژی دەکرد، پاشان ئەویان لە خەو هەڵدەسان (تا نوێژەکەی بکات)، وە گوێم لێبوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هاوەڵانیدا خورمای دابەش کرد، منیش حەوت خورمام بەرکەوت یەکێکیان خراپ و وشکەڵ بوو.**

٥٤٤١م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَنَا تَمْرًا، فَأَصَابَنِي مِنْهُ خَمْسٌ أَرْبَعُ تَمَرَاتٍ وَحَشَفَةٌ، ثُمَّ رَأَيْتُ الْحَشَفَةَ هِيَ أَشَدُّهُنَّ لِضِرْسِي[١].

---

(١) بەو خورمایە دەڵێن تازە پێگەیشتووە و بە لەزەت و خۆشە.

(٢) بڕوانە: ٥٤١١.

**٥٤٤١م- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نێوانماندا خورمای دابەش کرد، جا من پێنج خورمام بەرکەوت: چوار خورما و وشکەڵێك، پاشان وشکەڵەکەم دی زۆر جیڕ بوو دەنوسا بەخرێمەوە.**

## ٤٢- بابُ الرُّطَبِ وَالتَّمْرِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ ﴾ مريم.

٥٤٤٢- وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورِ ابْنِ صَفِيَّةَ: حَدَّثَتْنِي أُمِّي، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ شَبِعْنَا مِنَ الأَسْوَدَيْنِ: التَّمْرِ، وَالْمَاءِ[٢].

## ٤٢- باسی فەریکە خورما و خورما [٣]

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (قەدی ئەو دارخورمایەش بۆ لای خۆت ڕاوەشێنە، خورمای تازە پێ گەییووت بەسەردا دەباریّ) [٤].**

**٥٤٤٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد لەو کاتەدا ئێمە تێرمان خواردبوو لە دوو ڕەشکە: خورما و ئاو[٥].**

٥٤٤٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ

---

(١) بڕوانە: ٥٤١١.

(٢) بڕوانە: ٥٣٨٣.

(٣) خورما ئەگەر تازە پێگەیشتوو بێت پێی دەڵێن: (رُطَب) ئەگەر تازە نەبێت پێی دەڵێن: (تمر).

(٤) ئەوە خوای گەورە بە مەریەمی کچی عیمران دەفەرموێ.

(٥) لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ کاتێ خەیبەر ئازاد کرا سێ ساڵە پێش وەفاتی، دوو ڕەشکە لە بابی تغلیبە ناوی خورماکە کە ڕەشە بڕواوە بەسەر ئاوەکەشدا.

يَهُودِيٌّ، وَكَانَ يُسْلِفُنِي فِي تَمْرِي إِلَى الْجِدَادِ، وَكَانَتْ لِجَابِرٍ الأَرْضُ الَّتِي بِطَرِيقِ رُومَةَ فَجَلَسَتْ، فَخَلاَ عَامًا، فَجَاءَنِي الْيَهُودِيُّ عِنْدَ الْجَدَادِ، وَلَمْ أَجُدَّ مِنْهَا شَيْئًا، فَجَعَلْتُ أَسْتَنْظِرُهُ إِلَى قَابِلٍ فَيَأْبَى، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ لأَصْحَابِهِ: «امْشُوا نَسْتَنْظِرْ لِجَابِرٍ مِنَ الْيَهُودِيِّ». فَجَاءُونِي فِي نَخْلِي، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يُكَلِّمُ الْيَهُودِيَّ، فَيَقُولُ: أَبَا الْقَاسِمِ، لاَ أُنْظِرُهُ. فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ ﷺ قَامَ فَطَافَ فِي النَّخْلِ، ثُمَّ جَاءَهُ فَكَلَّمَهُ فَأَبَى، فَقُمْتُ فَجِئْتُ بِقَلِيلِ رُطَبٍ فَوَضَعْتُهُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَكَلَ.

ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ عَرِيشُكَ يَا جَابِرُ؟». فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «افْرُشْ لِي فِيهِ». فَفَرَشْتُهُ، فَدَخَلَ فَرَقَدَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَجِئْتُهُ بِقَبْضَةٍ أُخْرَى فَأَكَلَ مِنْهَا، ثُمَّ قَامَ فَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَقَامَ فِي الرِّطَابِ فِي النَّخْلِ الثَّانِيَةَ ثُمَّ قَالَ: «يَا جَابِرُ، جُدَّ وَاقْضِ». فَوَقَفَ فِي الْجَدَادِ، فَجَدَدْتُ مِنْهَا مَا قَضَيْتُهُ وَفَضَلَ مِنْهُ، فَخَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَبَشَّرْتُهُ، فَقَالَ: «أَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ». عُرُوشٌ وَعَرِيشٌ: بِنَاءٌ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿مَّعْرُوشَٰتٍ ١٤١﴾ الأنعام: ما يُعَرَّش مِنَ الكُرُومِ وَغَيْرِ ذَلِكَ، يُقَالُ: عُرُوشُهَا: أَبْنِيَتُهَا

**٥٤٤٣- جابیر کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە مەدینە پیاوێکی جولەکەی لێ بوو سەلەمی دەدامێ بۆ خورماکەم تا کاتی ڕنین و لێکردنەوەی، وە جابیر زەوی باخەکەی لەسەر ڕێی (بیری) ڕوومە بوو، باخەکە (ئەو ساڵە) بەری نەگرت، بۆیە سەلەمدانەکە ساڵێ دواکەوت، پیاوە جولەکەکەش لەکاتی خورما ڕنین هات بۆ لام (داوای خورمای کرد)، منیش هیچم لێ نەڕنیبوو، بۆیە داوام لێ کرد مۆڵەتم بدات تا ساڵی داهاتوو ڕازی نەبوو، ئیتر ئەو باسە گەیەنرا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بەهاوەڵانی فەرموو: ((با بڕۆین داوای دواخستن بکەین بۆجابیر لە جوولەکەکە))، ئینجا هەموویان هاتن بۆ لام لە باخەکەمدا و پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ پیاوە جوولەکەکەدا، جوولەکەکەش دەیوت: ئەبو لقاسیم مۆڵەتی نادەم، جا کە پێغەمبەر ﷺ زانی حاڵەکە وایە، هەستا بەناو**

بەخەكەدا گەڕا، پاشان هاتەوە بۆ لای (جولەكەكە) و قسەی لەگەڵ كردەوە، بەڵام ڕازی نەبوو، منیش هەستام كەمێ خورمای تازە پێگەییووم هێنا و لە بەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دامنا و خواردی، پاشان فەرمووی: ((ئەی جابیر كەپرەكەت لە كوێ دایە؟)) منیش پێم وت (و نیشانمدا) فەرمووی: ((لەوێدا شتێكم بۆ ڕابخە))، منیش بۆم ڕاخست، ئەویش ڕۆشتنە ژێری و خەوت، پاشان لە خەو هەستا، ئەم جارەش مشتێكی تر خورمای تازەم بۆ هێنا و لێی خوارد، پاشان هەستا و لەگەڵ پیاو جولەكەكە قسەی كردەوە هەر ڕازی نەبوو، ئینجا بۆ جاری دووەم بەناوی خورما تازە پێگەییوەكاندا گەڕا و پاشان فەرمووی: ((ئەی جابیر باخەكە بڕنە و قەرزەكەت بدەرەوە))، (پێغەمبەر ﷺ) خۆشی لە شوێنی خورما ڕنراوەكەدا وەستا، ئیتر ئەوەندە خورمام لە باخەكە كردەوە قەرزەكەم پێ دایەوە، ئەوەندەی تریشی لێ زیاد بوو، جا ڕۆشتم هەتا چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و مژدەم پێدا، ئەویش فەرمووی: ((شایەتی دەدەم كە من پێغەمبەری خوام)).

هەركام لە: (عُرُوشٌ) و (عَرِيشٌ) واتە: كەپر و هەرزاڵە. ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ﴿ مَّعۡرُوشَٰتٖ ﴾: ئەویە كە دەكرێ بۆ مێو درەختی تر لە كەپر و هەرزاڵە، دەوترێت: (عُرُوشُهَا) كەپر و هەرزاڵەی مێو.

## ٤٣- بابُ أكْلِ الْجُمَّارِ

٥٤٤٤- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي مُجَاهِدٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جُلُوسٌ إِذْ أُتِيَ بِجُمَّارِ نَخْلَةٍ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ لَمَا بَرَكَتُهُ كَبَرَكَةِ الْمُسْلِمِ». فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَعْنِي: النَّخْلَةَ، فَأَرَدْتُ

أَنْ أَقُولَ هِيَ النَّخْلَةُ يَا رَسُولَ اللهِ ثُمَّ الْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا عَاشِرُ عَشَرَةٍ أَنَا أَحْدَثُهُمْ فَسَكَتُّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ»[1].

## ٤٣- باسی خواردنی کرۆکی بنی دار خوردما

**٥٤٤٤-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما وتی: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین کرۆکی بنی دار خورمای بۆ هێنرا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان لە ناو درەختەکاندا درەختێك هەیە فەڕ و بەرەکەتی وەك فەڕ و بەرەکەتی مسوڵمان وایە))، منیش گومانم برد کە مەبەستی دار خورمایە، بۆیە ویستم بڵێم: ئەی پێغەمبەری خوا درەختی دار خورمایە، پاشان لام کردەوە من کەسێك بووم لەو دە کەسە من لە هەموویان تەمەنم کەمتر بوو، بۆیە بێدەنگ بووم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((درەختی دار خورمایە)).**

## ٤٤- بابُ الْعَجْوَةِ

٥٤٤٥- حَدَّثَنَا جُمْعَةُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ، أَخْبَرَنَا هَاشِمُ بْنُ هَاشِمٍ أَخْبَرَنَا عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ»[2].

## ٤٤- باسی (فەزڵی) خورمای عەجوە[3]

**٥٤٤٥- عامیر کوڕی سەعد لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێ هەمو ڕۆژێك بەیانیان بەسکی خاڵی حەوت دەنك خورمای عەجوە بخوات، لەو ڕۆژەدا نەژەهر و نەجادو و سیحر زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٦١.

(٢) بڕوانە: ٥٧٦٨، ٥٧٦٩، ٥٧٧٩.

(٣) بەسەر خورماکانی تردا.

## ٤٥- بابُ الْقِرَانِ فِي التَّمْرِ

٥٤٤٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ قَالَ: أَصَابَنَا عَامُ سَنَةٍ مَعَ ابْنِ الزُّبَيْرِ، رَزَقَنَا تَمْرًا، فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَمُرُّ بِنَا -وَنَحْنُ نَأْكُلُ- وَيَقُولُ: لاَ تُقَارِنُوا، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْقِرَانِ. ثُمَّ يَقُول: إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ. قَالَ شُعْبَةُ: الإِذْنُ مِنْ قَوْلِ ابْنِ عُمَرَ[١].

## ٤٥ - باسی (حوکمی خواردنی) خورما دوو دوو پێکەوە

**٥٤٤٦- شوعبە دەڵێ: جەبەلەی کوڕی سوحەیم ﷺ بۆی گێڕاینەوە و وتی: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا ﷺ بووین، ساڵێکی گرانی و قات وقڕیمان تووش بوو، (عەبدوڵڵا) خورمای پێ داین، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ بەلاماندا تێپەڕی. لەو کاتەدا (خورمامان) دەخوارد - دەیوت: دوو دوو (خورما) پێکەوە مەخۆن، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە خواردنی خورما دوو دوو پێکەوە، لە پاشان دەیوت: مەگەر کەسێك داوای مۆڵەت لە براکەی بکات (ئەویش مۆڵەتی بدات).**

**شوعبە وتی: باسی مۆڵەت وەرگرتنەکە وتەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە ﷺ.**

## ٤٦- باب الْقِثَّاءِ

٥٤٤٧- حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جَعْفَرٍ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ[٢].

(١) بڕوانە: ٢٤٥٥.

(٢) بڕوانە: ٥٤٤٠.

## ٤٦- باسی (خواردنی ) ترۆزی

٥٤٤٧- عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی فەریكە خورمای دەخوارد بە ترۆزییەوە.

## ٤٧- بابُ بَرَكَةِ النَّخْلِ

٥٤٤٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ طَلْحَةَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةٌ تَكُونُ مِثْلَ الْمُسْلِمِ، وَهِيَ النَّخْلَةُ»[1].

## ٤٧- باسی فەڕ و بەرەكەتی دار خورما

٥٤٤٨-موجاهید دەڵێ: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەم ﷺ بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە كە فەرموویەتی: ((لە درەختەكاندا درەختێك هەیە وەكو مسوڵمان وایە ئەویش دار خورمایە)).

## ٤٨- بابُ جَمْعِ اللَّوْنَيْنِ أَوِ الطَّعَامَيْنِ بِمَرَّةٍ

٥٤٤٩- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ[2].

## ٤٨- باسی (حوكمی خواردنی ) دوو جۆر (میوە) یان دوو جۆر خواردن لە یەك كاتدا

٥٤٤٩- عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی فەریكەی خورمای دەخوارد بە ترۆزییەوە.

---

(١) بڕوانە: ٦١.

(٢) بڕوانە: ٥٤٤٠.

## ٤٩- بابُ مَنْ أَدْخَلَ الضِّيفَانَ عَشَرَةً عَشَرَةً، وَالْجُلُوسِ عَلَى الطَّعَامِ عَشَرَةً عَشَرَةً

٥٤٥٠- حَدَّثَنَا الصَّلْتُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنِ الْجَعْدِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَنَسٍ. وَعَنْ هِشَامٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسٍ. وَعَنْ سِنَانٍ أَبِي رَبِيعَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ- أُمَّهُ- عَمَدَتْ إِلَى مُدٍّ مِنْ شَعِيرٍ، جَشَّتْهُ وَجَعَلَتْ مِنْهُ خَطِيفَةً، وَعَصَرَتْ عُكَّةً عِنْدَهَا، ثُمَّ بَعَثَتْنِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَتَيْتُهُ -وَهْوَ فِي أَصْحَابِهِ- فَدَعَوْتُهُ، قَالَ: «وَمَنْ مَعِي». فَجِئْتُ فَقُلْتُ: إِنَّهُ يَقُولُ: "وَمَنْ مَعِي"، فَخَرَجَ إِلَيْهِ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ صَنَعَتْهُ أُمُّ سُلَيْمٍ. فَدَخَلَ فَجِيءَ بِهِ وَقَالَ: «أَدْخِلْ عَلَيَّ عَشَرَةً». فَدَخَلُوا فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ قَالَ: «أَدْخِلْ عَلَيَّ عَشَرَةً». فَدَخَلُوا فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ قَالَ: «أَدْخِلْ عَلَيَّ عَشَرَةً». حَتَّى عَدَّ أَرْبَعِينَ، ثُمَّ أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَامَ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ؛ هَلْ نَقَصَ مِنْهَا شَيْءٌ!"[1].

## ٤٩- باسی كەسێک میوانەكان دە كەس دە كەس بكاتە ژوورەوە، وە باسی دانیشتن لەسەر خواردن دە كەس دە كەس

**٥٤٥٠-ئەنەس[2] ﷺ دەگێڕێتەوە كە ئوممو سولەیم - ی دایكی - چوو مشتێ جۆی هاڕی و كردی بەبرۆیش و پەڵوی[3] لێ دروست كرد، وە هیزەیەكی ڕۆنی لابوو گووشی (و ڕۆنەكەی كرد بە پەڵوەكەدا)، پاشان ناردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، منیش چوومە خزمەتی-لەو كاتە لەناو هاوەڵانیدا بوو- بانگم كرد فەرمووی: ((ئەوانەش لەگەڵم دان بێن؟)) منیش هاتمەوە و وتم: (بە دایكم) ئەو دەفەرموێ: ((ئەوانەش لەگەڵمدا بێن؟)) ئەبو تەڵحە هاتە دەرەوە بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان ئەوە خواردنێكە ئوممو سولەیم دروستی**

---

(١) بڕوانە: ٤٢٢.

(٢) ئەم فەرموودەیە بوخاری بە سێ ڕشتە لە ئەنەسەوە گێڕاویەتیەوە.

(٣) پەڵو: شیر ناردی بەسەردا دەكرێ و دەكوڵێنرێت بە پەنجە یا بە كەوچك دەخورێت، وەك مەحەلەبی وایە.

کردوە[1]، پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە و خواردنەکەی هێنا و فەرمووی: ((دە کەسم بۆ بنێرە ژوورەوە))، جا چوونە ژوورەوە و نانیان خوارد هەتا تێربوون، پاشان فەرمووی: ((دە کەسم بۆ بنێرە ژوورەوە))، ئەوانیش چوونە ژوورەوە و نانیان خوارد هەتا تێربوون، پاشان فەرمووی: ((دە کەسم بۆ بنێرە ژوورەوە))، هەتا چلی ژمارد لە پاشان پێغەمبەر ﷺ نانی خوارد لە پاشان هەڵسا، منیش تەماشام دەکرد ئایا خواردنەکە هیچ لێ کەم بۆتەوە.

## ٥٠- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الثُّومِ وَالْبُقُولِ

فِيهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٤٥١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: قِيلَ لأَنَسٍ مَا سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُول فِي الثُّومِ؟ فَقَالَ: «مَنْ أَكَلَ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا»[2].

## ٥٠- باسی ئەوەی بە ناپەسەند دادەنرێ لە سیر و سەوزەوات (ی بۆن ناخۆش)

-لەو بارەیەوە ئیبنو عومەر ﭬ فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە.

٥٤٥١-عەبدولعەزیز دەڵێ: بە ئەنەس ﭬ وترا: لە پێغەمبەر ﷺ چیت بیستووە دەربارەی سیر؟ (ئەویش وتی: (فەرموویەتی)): ((هەر کەسێك خواردی ئەوە با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێتەوە)).

---

(١) خۆی بەتەنها دروستی کردوە لەبەر ئەوەی کەم بوو.

(٢) بڕوانە: ٨٥٦.

٥٤٥٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءٌ أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ زَعَمَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: " مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا"، أَوْ "لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا"[1].

**٥٤٥٢- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك سیر یان پیازی خوارد با دوور بگرێ لێمان))، یان((با دوور بگرێ لە مزگەوتەکەمان)).**

## ٥١- بابُ الْكَبَاثِ، وَهُوَ ثَمَرُ الأَرَاكِ

٥٤٥٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ نَجْنِي الْكَبَاثَ، فَقَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ مِنْهُ، فَإِنَّهُ أَيْطَبُ». فَقَالَ: أَكُنْتَ تَرْعَى الْغَنَمَ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَهَلْ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ رَعَاهَا»[2].

## ٥١- باسێک کە باس کەبەری داری ئەراکە

**٥٤٥٣- جابیر کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە: (مَرِّ الظَّهْرَان)دا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین کەباسمان دەڕنیی، (پێغەمبەریش) فەرمووی: ((ڕەشەکەی بڕنن، چونکە بەڕاستی ئەوەی بەلزەتتر و خۆشترە))، (جابیر بە پێغەمبەر ﷺ) دەڵێ: ئایا تۆ مەڕت لەوەڕاندووە؟ فەرمووی: ((بەڵێ، ئایا پێغەمبەرێ هەیە شوانی مەڕی نەکردبێ؟)).**

---

(١) بڕوانە: ٨٥٤.

(٢) بڕوانە: ٣٤٠٦.

## ٥٢- بابُ الْمَضْمَضَةِ بَعْدَ الطَّعَامِ

٥٤٥٤- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ النُّعْمَانِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، فَلَمَّا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ دَعَا بِطَعَامٍ، فَمَا أُتِيَ إِلاَّ بِسَوِيقٍ، فَأَكَلْنَا، فَقَامَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَتَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا[1].

## ٥٢- باسی ئاو لە دەم ڕادان پاش خۆراک (خواردن)

**٥٤٥٤-سوەیدەی کوڕی نوعمان ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ڕۆشتین بۆ خەیبەر، جا کاتێ کە لە صەهبا بووین (پێغەمبەر ﷺ) داوای خۆراکی کرد تەنها قاوەتی هێنرا، جا خواردمان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا بۆ نوێژکردن و ئاوی لە دەمی ڕادا و ئێمەش ئاومان لە دەممان ڕادا.**

٥٤٥٥- قَالَ يَحْيَى: سَمِعْتُ بُشَيْرًا يَقُولُ: حَدَّثَنَا سُوَيْدٌ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، فَلَمَّا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ -قَالَ يَحْيَى: وَهْيَ مِنْ خَيْبَرَ على رَوْحَةٍ - دَعَا بِطَعَامٍ، فَمَا أُتِيَ إِلاَّ بِسَوِيقٍ، فَلُكْنَاهُ فَأَكَلْنَا مَعَهُ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. وَقَالَ سُفْيَانُ: كَأَنَّكَ تَسْمَعُهُ مِنْ يَحْيَى[2].

**٥٤٥٥-یەحیا دەڵێ: لە بوشەیرم بیست دەیوت: سوەید بۆی دەگێڕاینەوە و وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتین بۆ خەیبەر، جا کاتێ گەیشتەنە صەهبا- یەحیا دەڵێ: صەهبا نیو ڕۆژە ڕێگایەك لە خەیبەرەوە دوورە - پێغەمبەر ﷺ داوای خۆراکی کرد، تەنها قاوەت هێنرا، ئێمەش کردمانە دەممانەوە و خواردمان لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ، پاشان داوای ئاوی کرد و ئاوی لە دەمی ڕادا،**

---

(١) بروانە: ٢٠٩.

(٢) بروانە: ٢٠٩.

ئێمەش لەگەڵیدا ئاومان لە دەممان ڕادا، پاشان پێشنوێژی مەغریبی بۆ کردین ودەست نوێژی نەگرتەوە.

سوفیان (بە عەلی کوڕی مەدینی) وت: دەڵێی خۆت لە یەحیات بیستووە[1].

## ٥٣- بابُ لَعْقِ الأَصَابِعِ وَمَصِّهَا قَبْلَ أَنْ تُمْسَحَ بِالْمِنْدِيلِ

٥٤٥٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا».

## ٥٣- باسی لێستنەوەی پەنجەکان و مژینیان پێش ئەوەی بە دەستە سڕ بسڕدرێت

**٥٤٥٦-ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان نانی خوارد با دەستی نەسڕێ هەتا دەیلێسێتەوە، یان بۆی دەلێسرێتەوە)).**

## ٥٤- بابُ المِنْدِيلِ

٥٤٥٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الْوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ، فَقَالَ: لاَ، قَدْ كُنَّا زَمَانَ النَّبِيِّ ﷺ لاَ نَجِدُ مِثْلَ ذَلِكَ مِنَ الطَّعَامِ إِلاَّ قَلِيلاً، فَإِذَا نَحْنُ وَجَدْنَاهُ لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ، إِلاَّ أَكُفَّنَا وَسَوَاعِدَنَا وَأَقْدَامَنَا، ثُمَّ نُصَلِّي وَلاَ نَتَوَضَّأُ.

---

(١) مەبەستی سوفیان ئەوە بوو کە ئەوەندە ئەو فەرموودەی بە هەمان دەق گێڕاوەتەوە بۆ عەلی کوڕی مەدینی، وەک ئەوە وایە عەلی کوڕی مەدینی خۆی لە یەحیای کوڕی مەعینی بیستبێ. **بڕوانە : إرشاد الساری: ٢٠٩/١٢.**

## ٥٤- باسی دەستە سڕ

**٥٤٥٧-سەعیدی کوڕی حاریس لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو (سەعید) پرسیار لە جابیر کرد دەربارەی دەستنوێژ گرتنەوە لەو خواردنانەی ئاگریان بەرکەوتبێ (و لێنرابن)، ئەویش وتی: نەخێر[1] بێگومان ئێمە لە ڕابردوودا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بە کەمی نەبێ ئەم جۆرە خواردنانەمان دەست نەدەکەوت و نەبوو، جا ئەگەر خواردنێکمان دەست کەوتایە دەستە سڕمان نەبوو جگە لە دەست و باسك و پێیەکانمان، لە پاشان نوێژمان دەکرد و دەستنوێژمان نەدەگرتەوە.**

## ٥٥- بابُ مَا يَقُولُ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ

٥٤٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ ثَوْرٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ، رَبَّنَا».

## ٥٥- باسی ئەوەی (نان خۆر) دەیڵێ کە لەنان خواردنەکەی بوویەوە

**٥٤٥٨-ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە سفرەی خواردنەکەی هەڵبگرتایە دەیفەرموو: ((سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆز بۆخوا خوای پەروەردگارمان کە جێگرەوەی نییە و وازی لێ ناهێنرێ و کەسی لێی بێ نیاز نییە)) [2].**

---

(١) دەستنوێژ گرتنەوەی ناوێ و پێویست ناکات.

(٢) بەم جۆرەش مانا دەکرێ: (سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆز بۆ خوا، هەڵنەگەڕێتەوە و بڕژێ و بەردەوام بێ وازی لێ نەهێنرێ بێ نیازی لێ نەکرێ ئەی پەروەردگاری ئێمە.

٥٤٥٩- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ -وَقَالَ مَرَّةً: إِذَا رَفَعَ مَائِدَتَهُ- قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مَكْفُورٍ -وَقَالَ مَرَّةً: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّنَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مُوَدَّعٍ- وَلاَ مُسْتَغْنًى، رَبَّنَا»[1].

**٥٤٥٩-ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە لە نان خواردنەکەی تەواو دەبوو- جارێك وتی: کاتێ سفرەکەی هەڵدەگرت - دەیفەرموو: ((سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەومان بەسە[2] پاراوی کردووین ڕۆزی دەرە و ڕۆزی نادرێ، سوپاس کراوە و سپلەیی بەرانبەر ناکرێ))، وە جارێك فەرمووی: ((سوپاس بۆ خوای پەروەردگارمان (ڕۆزی دەرە) خۆراك پێدراو نییە[3] واز لە داواکردن لێی ناهێنرێ و بێ نیازی لێ ناکرێ ئەو پەروەردگارمانە)).**

## ٥٦- باب الأَكْلِ مَعَ الْخَادِمِ

٥٤٦٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدٍ -هُوَ ابْنُ زِيَادٍ- قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ، أَوْ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ، فَإِنَّهُ وَلِيَ حَرَّهُ وَعِلاَجَهُ»[4].

## ٥٦- باسی نان خواردن لەگەڵ خزمەتکاردا

**٥٤٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێك لە ئێوە خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا، جا ئەگەر لەگەڵ خۆی**

---

(١) بروانە: ٥٤٥٨.

(٢) یان هەموو شتێکی بەتێر و تەسەلی پێداوین.

(٣) بروانە: (النهاية في غريب الحديث والأثر: ٥٤٧/٢).

(٤) بروانە: ٢٥٥٧.

داینەنیشان دەبا پارووەیەك یا دوو پارووی [1] پێبدات، چونکە بێگومان ئەو کۆیلەیە ئاگری بۆ (خواردنەکە) کردۆتەوە، چاکی کردوە و ئامادەی کردوە)).

## ٥٧- بَابٌ الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ مِثْلُ الصَّائِمِ الصَّابِرِ

فِيهِ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٥٧- باسێک: تێری خۆش خۆری [2] سوپاس گوزار وەک ڕۆژووەوانی ئارام گر وایە

-لەم باسەدا فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ هەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە[3].

## ٥٨- بَابُ الرَّجُلِ يُدْعَى إِلَى طَعَامٍ فَيَقُولُ: وَهَذَا مَعِي

وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ إِذَا دَخَلْتَ على مُسْلِمٍ لاَ يُتَّهَمُ، فَكُلْ مِنْ طَعَامِهِ، وَاشْرَبْ مِنْ شَرَابِهِ.

٥٤٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا شَقِيقٌ، حَدَّثَنَا أَبُو مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُكْنَى أَبَا شُعَيْبٍ، وَكَانَ لَهُ غُلاَمٌ لَحَّامٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ فِي أَصْحَابِهِ، فَعَرَفَ الْجُوعَ فِي وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَهَبَ إِلَى غُلاَمِهِ اللَّحَّامِ فَقَالَ: اصْنَعْ لِي طَعَامًا يَكْفِي خَمْسَةً، لَعَلِّي أَدْعُو النَّبِيَّ ﷺ خَامِسَ خَمْسَةٍ. فَصَنَعَ

---

(١) (لقمە أو لقمتين) يا (أكلە أو أكلتين) بەیەک مانا دێن و گێڕەوەکەش دوو دڵ بووە کە کام لەو دوو ڕستە ووتراوە بۆیە هەردووکیانی هێناوە.

(٢) دەشتوانی بڵێیت: تێر خۆراک، خۆراک باش.

(٣) کە ئیمام ئەحمەد بە ژمارە (٧٨٠٦) گێڕاویەتیەوە، تورمزیش بە ژمارە (٢٤٨٦) و ئیبنو ماجەش بە ژمارە (١٧٦٤) کە فەرموودەیەکی حەسەنە).

لَهُ طُعَيِّمًا، ثُمَّ أَتَاهُ فَدَعَاهُ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا شُعَيْبٍ، إِنَّ رَجُلاً تَبِعَنَا فَإِنْ شِئْتَ أَذِنْتَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ تَرَكْتَهُ». قَالَ: لاَ، بَلْ أَذِنْتُ لَهُ[1].

## ٥٨- باسی پیاوێ بانگ بکرێ بۆ نان خواردنێک (کەسێک شوێنیی کەوێت) جا بڵێ: ئەم کەسەم لەگەڵدایە

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئەگەر چوویتە ماڵی مسوڵمانێك (لە دین و ماڵیدا) گومانی خراپی پێ نەدەبرا، ئەوە لە خواردنەکەی بخۆ و لە خواردنەوەکەشی بخۆرەوە.**

**٥٤٦١-ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری هەبوو نازناوی ئەبو شوعەیب بوو، غولامێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، (ئەبوشوعەیب) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا لە ناو هاوەڵەکانیدا بوو، برسێتی لە ڕووخساری پێغەمبەردا ﷺ خوێندەوە و زانی، بۆیە ڕۆشت بۆ لای غولامەکەی و پێی وت: خواردنێکم بۆ دروست بکە بەشی پێنج کەس بکات، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ دەعوەت کەم کە یەکێك لە پێنج کەسەکە ئەوە، ئەویش خواردنێکی کەمی دروست کرد، پاشان (ئەبو شوعەیب) هات و (پێغەمبەری ﷺ) دەعوەت کرد، پیاوێك شوێنیان کەوت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبو شوعەیب پیاوێك شوێنمان کەوتووە، جا ئەگەر دەتەوێ مۆڵەتی بدە، وە ئەگەر ویستت وازی لێ بێنە))، (ئەبو شوعەیب) وتی: نەخێر بەڵکو ڕێگەی پێ دەدەم.**

## ٥٩- بابٌ: إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ فَلاَ يَعْجَلْ عَنْ عَشَائِهِ

٥٤٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، أَنَّ أَبَاهُ عَمْرَو بْنَ أُمَيَّةَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى

(١) بروانە: ٢٠٨١.

رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فِي يَدِهِ، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَلْقَاهَا وَالسِّكِّينَ الَّتِي كَانَ يَحْتَزُّ بِهَا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[١].

## ٥٩- باسێک: ئەگەر خواردنی ئێوارە ئامادە بوو (نوێژی مەغریبیش بوو بوو) ئەوە با پەلە نەکات لە خواردنی خواردنەکەی ئێوارەی

**٥٤٦٢- جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییە دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی ئومەییەی باوکی ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری ﷺ دیوە بەچەقۆ گۆشتی لە شانی مەڕێك دەکردەوە، (گۆشتەکە) لە دەستی پیرۆزی دابوو، جا بانگ درا بۆ نوێژ، ئیتر گۆشت و ئەو چەقۆی فڕێدا کە گۆشتەکەی پێ دەبڕی و لەت دەکرد، لە پاشان هەستا و نوێژی کرد و دەست نوێژی نەگرتەوە.**

٥٤٦٣- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[٢].

**٥٤٦٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر خواردنی ئێوارە دانرا و نوێژی ئێوارە بەرپا کرا (دەستی پێکرا)، ئەوە لە پێشدا خواردنەکەی ئێوارە بخۆن)).**

٥٤٦٣م- وَعَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٣].

**٥٤٦٣م- (هەمان فەرموودە بەم ڕشتەش هاتووە)، ئەیوب لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشوو گێڕاوەتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨.
(٢) بڕوانە: ٦٧٢.
(٣) بڕوانە: ٦٧٣.

٥٤٦٤- وَعَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ تَعَشَّى مَرَّةً وَهْوَ يَسْمَعُ قِرَاءَةَ الإِمَامِ.

**٥٤٦٤- ئەیوب دەگێڕێتەوە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: جارێك نانی ئێوارەی دەخوارد، لەو کاتەدا گوێی لە قورئان خوێندنی پێش نوێژەکە بوو.**

٥٤٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَحَضَرَ الْعَشَاءُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ». قَالَ وُهَيْبٌ وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ»[1].

**٥٤٦٥- عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ئەگەر نوێژ دابەسترا خواردنی ئێوارەش ئامادە بوو، ئەوە لە پێشدا خواردنەکەی ئێوارە بخۆن)).**
**-وهیب و یەحیای کوڕی سەعید لە هیشامەوە گێڕاویانەتەوە بەم شێوە((ئەگەر خواردنی ئێوارە دانرا)).**

## ٦٠- بابُ قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب

٥٤٦٦- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَنَسًا قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِالْحِجَابِ، كَانَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يَسْأَلُنِي عَنْهُ، أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَرُوسًا بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ -وَكَانَ تَزَوَّجَهَا بِالْمَدِينَةِ- فَدَعَا النَّاسَ لِلطَّعَامِ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَجَلَسَ مَعَهُ رِجَالٌ بَعْدَ مَا قَامَ الْقَوْمُ، حَتَّى قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَمَشَى وَمَشَيْتُ مَعَهُ، حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا فَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ مَكَانَهُمْ، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ الثَّانِيَةَ، حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ قَدْ قَامُوا، فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا، وَأُنْزِلَ الْحِجَابُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٧١.
(٢) بڕوانە: ٤٧٩١.

## ٦٠- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەگەر خواردنەکەتان خوارد ئەوە بڵاوەی لێ بکەن)

٥٤٦٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: من شارەزاترین کەسم بە (هۆی دابەزینی ئایەتی) حیجاب، ئوبەیی کوڕی کەعب لەو بارەیەوە پرسیاری لێ دەکردم، پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستبوویەوە[1] -لە مەدینە مارەی کردبوو گواستبوویەوە - دوا ئەوەی خۆر بەرز بوو بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و چەند پیاوێکیش لەگەڵیدا (لەماڵەوە) دانیشتن، پاش ئەوەی خەڵکەکە هەستابوون، (مانەوە) تا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و ڕۆشت، منیش لە خزمەتیدا ڕۆشتم تاگەشتە بەر دەرگای ژوورەکەی عائیشە ﷺ، پاشان گومانی برد کە ئەو پیاوانە ڕۆشتوون گەڕایەوە، منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، بەڵام ئەوان هەر لە شوێنی خۆیان دانیشتبوون، بۆ جاری دووەم گەڕایەوە منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، ڕۆشت تا گەشتە لای دەرگای ژوورەکەی عائیشە ﷺ هەم گەڕایەوە، منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، جا ئەو کاتە پیاوەکان هەستابوون ئینجا لە نێوان من وخۆیدا پەردەیەکی دادایەوە و (ئایەتی) حیجاب دابەزێنرا.

(١) بووبوو بەزاوا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٧١- كِتَابُ الْعَقِيقَةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧١- پەڕاوی حەوتەم [١]

## ١- باب تَسْمِيَةِ الْمَوْلُودِ غَدَاةَ يُولَدُ، لِمَنْ لَمْ يَعُقَّ وَتَحْنِيكِهِ

٥٤٦٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي بُرَيْدٌ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: وُلِدَ لِي غُلَامٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ وَدَفَعَهُ إِلَيَّ. وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسَى[٢].

## ١- باسی ناونانی منداڵ کاتێ لە دایک دەبێت بۆ کەسێک ئاژەڵی بۆ سەر نەبڕێ، وە جووینی خورما و هێنانی بە مڵاشووی منداڵەکەدا

**٥٤٦٧-ئەبو بوردە وتی: ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: کوڕێکمان بوو، بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ناوی نا ئیبراهیم و دەنکێ خورمای جووی و هێنای بە مەڵاشویدا، وە دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کرد و دایەوە پێم. ئەو (ئیبراهیمە) گەورەترین منداڵی ئەبو مووسا بوو.**

(١) گوێزبانەشی پێ دەڵێن.
(٢) بڕوانە: ٦١٩٨.

٥٤٦٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِصَبِيٍّ يُحَنِّكُهُ، فَبَالَ عَلَيْهِ، فَأَتْبَعَهُ الْمَاءَ(١).

**٥٤٦٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: منداڵێك هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ تا (ناوی بنێت) خورما بجوێت و بیهێنێ بە مەلاشویدا، منداڵەكە میزی كرد بە پێغەمبەردا ﷺ، بۆیە ئاوی كرد بە شوێنەكەیدا.**

٥٤٦٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ أَنَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، قَالَتْ: فَخَرَجْتُ وَأَنَا مُتِمٌّ، فَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَنَزَلْتُ قُبَاءً، فَوَلَدْتُ بِقُبَاءٍ، ثُمَّ أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا، ثُمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ حَنَّكَهُ بِالتَّمْرَةِ، ثُمَّ دَعَا لَهُ فَبَرَّكَ عَلَيْهِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي الإِسْلَامِ، فَفَرِحُوا بِهِ فَرَحًا شَدِيدًا؛ لأَنَّهُمْ قِيلَ لَهُمْ: إِنَّ الْيَهُودَ قَدْ سَحَرَتْكُمْ فَلاَ يُولَدُ لَكُمْ(٢).

**٥٤٦٩- ئەسمائی كچی ئەبو بەكر ﵄ دەڵێ: كە ئەو بە عەبدوڵلای كوڕی زوبەیرەوە ﵄ سكی پڕ بوو وتی: جا (لە مەككە) دەرچووم لە كاتێكدا ماوەی سكەكەم تەواو كردبوو، گەشتمە مەدینە لە قوبا دابەزیم، لە قوبا منداڵم بوو، پاشان هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و خستمە كۆشیەوە پاشان داوای دنكە خورمایەكی كرد و خۆی جویی، پاشان تفی خۆی كردە دەمی منداڵەكەوە، جا یەكەم شتێك چووە دەمیەوە تفی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پاشان خورماكەی هێنا بە مەلاشویدا، ئینجا دوعای بۆكرد داوای فەڕ و بەرەكەتی خوای بۆ كرد، وە عەبدوڵلا یەكەم منداڵ بوو (لە مەدینە) لە ئیسلامدا لە دایك بوو. بۆیە زۆر پێی دڵخۆش بوون، چونكە پێیان وترابوو، بێگومان جووەكان جادوویان لێتان كردوە ئیتر منداڵتان نابێت.**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) بڕوانە: ٣٩٠٩.

٥٤٧٠- حَدَّثَنَا مَطَرُ بْنُ الْفَضْلِ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَوْنٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ ابْنٌ لأَبِي طَلْحَةَ يَشْتَكِي، فَخَرَجَ أَبُو طَلْحَةَ، فَقُبِضَ الصَّبِيُّ، فَلَمَّا رَجَعَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: مَا فَعَلَ ابْنِي؟ قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هُوَ أَسْكَنُ مَا كَانَ. فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ الْعَشَاءَ فَتَعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَتْ: وَارِ الصَّبِيَّ. فَلَمَّا أَصْبَحَ أَبُو طَلْحَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمَا». فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، قَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: احْفَظْهُ حَتَّى تَأْتِيَ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ. فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ ﷺ وَأَرْسَلَتْ مَعَهُ بِتَمَرَاتٍ، فَأَخَذَهَاالنَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَمَعَهُ شَيْءٌ؟». قَالُوا: نَعَمْ، تَمَرَاتٌ. فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ فَمَضَغَهَا، ثُمَّ أَخَذَ مِنْ فِيهِ فَجَعَلَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ، وَحَنَّكَهُ بِهِ، وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ[١].

**٥٤٧٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە ﷺ منداڵێكی هەبوو نەخۆش بوو، ئەبو تەڵحە لە ماڵ دەرچوو (بۆ كارێك) منداڵەكە مرد، جا كاتێ ئەبو تەڵحە گەڕایەوە وتی: كوڕەكەم چی لێ هات؟ ئوممو سولەیم ﷺ وتی: لە هەموو كات ئارامترە و نانی ئێوارەی بۆ ئەبو تەڵحە هێنا و نانی خوارد، پاشان لەگەڵیشی دروست بوو، ئینجا كاتێ تەواو بوو[٢] (ئوممو سولەیم) وتی: كوڕەكە بنێژە، جا كە ئەبو تەڵحە ڕۆژی لێ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ هەواڵەكەی بۆگێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەم شەو دروست بوون پێكەوە؟)) وتی: بەڵێ: فەرمووی: ((خوایە فەڕو بەرەكەت بڕژێنە بەسەر هەردووكیاندا))، ئوممو سولەیم كوڕێكی بوو، (ئەنەس دەڵێ) ئەبو تەڵحە پێی وتم: ئاگاداری بە هەتا دەیبەیت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ئوممو سولەیم ﷺ) چەند دەنكە خورمایەكی لەگەڵ منداڵەكەدا نارد، پێغەمبەریش ﷺ منداڵەكەی (لە ئەنەس) وەرگرت و فەرمووی: ((هیچی لەگەڵایە))[٣]، وتیان: بەڵێ چەند خورمایەكە، پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ١٣٠١، ١٥٠٢.

(٢) لەكاری دروست و سەرجێییەكە.

(٣) مەبەستی خورما و شتی وا بوو.

**خورماكانی وەرگرت و جووینی پاشان لە دەمی پیرۆزی دەرهێنا كردیّ دەمی منداڵەكەوە و مەڵاشوی پیّ شیرین كرد و ناوی نا عەبدوڵلا.**

**٥٤٧٠- (ئیمامی بوخاری دەڵیّ:) موحەممەدی كوڕی موسەننا بۆی گێڕاینەوە وتی: ئیبنو ئەبی عەدیی بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو عەونەوە لە موحەممەدەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ ئیتر فەرموودەكە دەهێنیّ و دەیگێڕێتەوە[1].**

## ٢- باب إِمَاطَةِ الأَذَى عَنِ الصَّبِيِّ فِي الْعَقِيقَةِ

٥٤٧١- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ. وَقَالَ حَجَّاجٌ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ وَقَتَادَةُ وَهِشَامٌ وَحَبِيبٌ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ سَلْمَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

وَقَالَ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ عَاصِمٍ وَهِشَامٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنِ الرَّبَابِ، عَنْ سَلْمَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ سَلْمَانَ قَوْلَهُ[2].

## ٢- باسی تاشینی سەری منداڵی كوڕ لە كاتی حەوتەم بۆ كردنیدا.

**٥٤٧١-ئەیوب لە موحەممەدەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە سەلمانی كوڕی عامیرەوە ﷺ دەڵیّ: منداڵی كوڕ (كە لە دایك بوو) گوێزەبانە كردنێكی لەگەڵ دایە[3].**

**وە حەججاج وتی: حەمماد بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەیوب و قەتادە و هیشام و حەبیب بۆیان گێڕاینەوە لە ئیبنو سیرینەوە ئەویش لە سەلمانەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە[4].**

**-زیاد لە كەسێك لە عاصیم و هیشامەوە گێڕاویانەتەوە لە حەفصەی كچی سیرینەوە، لە ڕەبابە و ئەویش لە سەلمانەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

---

(١) مەبەستی فەرموودەكەی پێشووە.

(٢) بڕوانە: ٥٤٧٢.

(٣) واتە: دەبیّ بۆی بكرێت و ئاژەڵی بۆ سەر ببڕدرێت.

(٤) بەم ڕشتەیەش فەرموودەكەی پێشوو گێردراوەتەوە.

-وە یەزیدی کوڕی ئیبراهیم لە ئیبنو سیرینەوە گێڕاویەتیەوە لە سەلمانەوە، بە وتەی سەلمان گێڕاویەتیەوە[1].

٥٤٧٢ - وَقَالَ أَصْبَغُ: أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، حَدَّثَنَا سَلْمَانُ بْنُ عَامِرٍ الضَّبِّيُّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى»[2].

**٥٤٧٢-سەلمانی کوڕی عامیر زەبی ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((کوڕ (کە لە دایك دەبێت) حەوتمێکی لەگەڵ دایە، کەواتە خوێنی (دوو مەڕی) بۆ بڕژن و سەری بتاشن[3])).**

٥٤٧٢م- حَدَّثَنِي عبد اللَّهِ بْنُ أَبِي الأسوَدِ، حَدَّثَنَا قرَيْشُ بْن أَنَسٍ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ الشَّهِيدِ قَالَ: أَمَرَنِي ابن سِيرِينَ أَنْ أَسْأَلَ الَحسَنَ مِمَّنْ سمِعَ حَدِيثَ العَقِيقَةِ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: مِنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ.

**٥٤٧٢م- حەبیبی کوڕی شەهید وتی: ئیبنو سیرین فەرمانی پێکردم کە پرسیار لە حەسەن بکەم فەرموودەی حەوتمی لە کێ بیستووە؟ منیش پرسیارم لێ کرد حەسەنیش وتی: لە سەمورەی کوڕی جوندەبم بیستووە.**

## ٣- بابُ الْفَرَعِ

٥٤٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، أَخْبَرَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ». وَالْفَرَعُ: أَوَّلُ النِّتَاجِ، كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ[1].

---

(١) واتە: وتەی سەلمانە و هی پێغەمبەر ﷺ نییە بەم ڕشتەیان.

(٢) بڕوانە: ٥٤٧١.

(٣) ناپوختی لێ لابەن.

## ٣- باسی فەرەع

**٥٤٧٣-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( (لە ئیسلامدا) نەفەرەع هەیە، نە عەتیرە[٢])).**

**(ئیمامی بۆخاری دەڵێ): فەرەع: یەکەم بەچکەی ئاژەڵە لە سەردەمی نەفامیدا سەریان دەبڕی بۆ بتەکانیان، عەتیرەش ئاژەڵێك بوو لە (دە ڕۆژی یەکەمی مانگی) ڕەجەبدا سەریان دەبڕی.**

## ٤- بابُ الْعَتِيرَةِ

٥٤٧٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: الزُّهْرِيُّ حَدَّثَنَا عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ». قَالَ: وَالْفَرَعَ: أَوَّلُ نِتَاجٍ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ، كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ[٣].

## ٤- باسی عەتیرە

**٥٤٧٤- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە (ئیسلامدا) نەفەرەع هەیە، نە عەتیرە)).**

**فەرەع: یەکەم بەچکەیە کەوشترەکەیان دەیبێت، (کافران پێش ئیسلام) سەریان دەبڕی بۆ بت و پەرستراوەکانیان، عەتیرەش لە مانگی ڕەجەبدا سەریان دەبڕی.**

---

(١) بڕوانە: ٥٤٧٤.

(٢) ئیمام ئەحمەد بەو شێوە گێڕاویەتیەوە، وشەی لە ئیسلامدا زیادە لە گێڕانەوەکەی بوخاری.

(٣) بڕوانە: ٥٤٧٤.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٧٢- كِتَابُ الذَّبَائِحِ وَالصَّيْدُ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٢- پەڕاوی سەربڕاوەکان و ڕاوکردن [1]

## ١- بابُ التَّسْمِيَةِ عَلَى الصيْدِ

وَقوْلهُ تعَالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ ﴾ إلى قوْله: ﴿ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ المائدة

وَقوْلهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾ إلى قوْله: ﴿ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ﴾ المائدة. وَقالَ ابن عبَّاسٍ: العُقُودُ العُهُودُ، مَا أُحِلَّ وَحُرِّمَ ﴿ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾ المائدة. الخِنْزِيرُ. ﴿ يَجۡرِمَنَّكُمۡ ﴾ المائدة: يَحْمِلنَّكُمْ ﴿ شَنَـَٔانُ ﴾ المائدة: عَدَاوَةُ. ﴿ الْمُنْخَنِقَةُ ﴾: تُخْنَقُ فتَمُوتُ ﴿ الْمَوْقُوذَةُ ﴾: تُضْرَبُ بِالْخَشَبِ يُوقِذُهَا أهلها فتَمُوتُ ﴿ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ ﴾ المائدة. تتَرَدى منَ الجَبَلِ ﴿ وَٱلنَّطِيحَةُ ﴾ المائدة: تُنْطَحُ الشَّاةُ، فمَا أدْرَكْتَهُ يَتَحَرَّكُ بِذَنَبِهِ أوْ بِعَيْنِهِ فاذْبَحْ وَكُلْ.

---

(١) دەگونجێ بوترێ ڕاوکراو واتە نێچیر.

## ١- باسی ناوی خوا هێنان لە نێچیری ڕاوکراو،

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە خوا،خوا تاقیتان دەکاتەوە بە هەندێک نێچیر)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (سزایەکی بە ئازار) ، وە ئەم فەرمایشتەی خوا کە ناوی بەرز و گەورەیە: (حەڵاڵ کراوە بۆتان ( گۆشتی) ئاژەڵی چوار پێ[1]، بێجگە لەوەی کە دەخوێنرێتەوە بە سەرتاندا (حەرامن) )، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (کەواتە لێیان مەترسن تەنها لە من بترسن)

- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (العُقُودُ) واتە: پەیمانەکان، ئەوەی حەڵاڵ کراوە و ئەوەی حەرام کراوە. ﴿ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١﴾ ﴾: مەبەستی بەرازە. ﴿ يَجْرِمَنَّكُمْ ﴿٢﴾ ﴾: هانتان نەدات، واتان لێ نەکات. ﴿ شَنَآنُ ﴿٢﴾ ﴾: خەشم و قین، دوژمنایەتی. ﴿ الْمُنْخَنِقَةُ ﴿٣﴾ ﴾: ئاژەڵێک بخنکێنرێ و بمرێ. ﴿ الْمَوْقُوذَةُ ﴿٣﴾ ﴾: ئاژەڵی بەدار لێی درابێ و بمرێت. ﴿ وَالْمُتَرَدِّيَةُ ﴿٣﴾ ﴾: لە شاخ دەکەوێتە خوارەوە (و دەمرێت). ﴿ وَالنَّطِيحَةُ ﴿٣﴾ ﴾: و شۆقی لێدراوە، جا ئەگەر پێدا گەشتیت کلکی دەجوڵان یان چاوی، ئەوە سەری ببڕە و بیخۆ.

٥٤٧٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، قَالَ: «مَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْهُ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ».

---

(١) مەڕ و بزن و وشتر و ڕەشە وڵاغ.

وَسَأَلْتُهُ عَنْ صَيْدِ الْكَلْبِ، فَقَالَ: «مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَ الْكَلْبِ ذَكَاةٌ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ -أَوْ كِلَابِكَ- كَلْبًا غَيْرَهُ، فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَهُ مَعَهُ -وَقَدْ قَتَلَهُ- فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تَذْكُرْهُ عَلَى غَيْرِهِ»[١].

**٥٤٧٥-عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی ڕاوکردن بە نێزە[٢]، فەرمووی: ((ئەوەی بە تیژیەکەی لێیدا ئەوە بیخۆ، ئەوەی بە پانیەکەی لێیدا ئەوە مردارەوە بوە بە لێدان)). وە پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕاوکردن بە سەگ، فەرمووی: ((ئەوەی بۆ تۆی گرتبێ[٣] ئەوە بیخۆ، چونکە بێ گومان (نێچیر) گرتنی سەگ سەربڕینیەتی[٤] ئەگەر لەگەڵ سەگەکەت -یان سەگەکانت- سەگی ترت بینی و ترسای ئەو سەگەی لەگەڵ سەگەکەی تۆیە نێچیرەکەی گرتبێ – لە هەمان کاتدا کوشتوویەتی - ئەوە مەیخۆ، چونکە بەڕاستی تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێنا[٥]، وە ناوی خوات لەسەر سەگەکەی تر نەهێناوە)).**

## ٢- بابُ صَيْدِ المِعْرَاضِ

وَقَالَ ابن عُمَرَ ﷺ فِي المَقْتُولَةِ بِالْبُنْدُقَةِ تِلْكَ المَوْقُوذَةُ: وَكَرِهَهُ سَالِمٌ وَالْقَاسِمُ وَمُجَاهِدٌ وَإِبْرَاهِيمُ وَعَطَاءٌ وَالْحَسَنُ، وَكَرِهَ الحَسَنُ رَمْيَ البُنْدُقَةِ فِي القُرى وَالأَمْصَارِ، وَلَا يَرى بَأْسًا فِيمَا سِوَاهُ.

٥٤٧٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَدِيَّ بْنَ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ «إِذَا

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.

(٢) یان پەلار.

(٣) واتە: لێی نەخوارد بێت.

(٤) ئەگەر لێی بخوات مەیخۆ، چونکە بۆ خۆی گرتووە بۆ تۆی نەگرتووە.

(٥) کاتێ بەرەڵات کردوە بۆ گرتنی نێچیرەکە.

أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، فَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ فَإِنَّهُ وَقِيذٌ، فَلاَ تَأْكُلْ». فَقُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي. قَالَ «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ، فَكُلْ». قُلْتُ فَإِنْ أَكَلَ قَالَ: «فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّهُ لَمْ يُمْسِكْ عَلَيْكَ، إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ مَعَهُ كَلْبًا آخَرَ. قَالَ: «لاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى آخَرَ»[١].

## ٢- باسی ڕاوکردن بە نێزە

**-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئەو ئاژەڵەی بە بوندوقە[٢] بکوژرێ ئەوا مەوقوزەیە[٣]، سالیم و قاسیم و موجاهید و ئیبراهیم و عەتا و حەسەن دەڵێن: مەکروهە.**

**-حەسەنی (بەصری) دەڵێ: هاوێشتنی بندوقە لە لادێ و شارەکاندا مەکروهە ناپەسەندە، وە لە شوێنی تر جگە لەوانە زیانی نییە بەلایەوە.**

**٥٤٧٦-عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی (ڕاو کردن) بە نێزە، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر بەسەرە تیژەکەی لێتدا بیخۆ، بەڵام ئەگەر بەپانیەکەی لێتدا و کوشتی، ئەوە مرردارەوە بووە و مەیخۆ))، عەرزم کرد سەگەکەم دەنێرم[٤]؟ فەرمووی: ((ئەگەر سەگەکەت ناردو ناوی خوات هێنا ئەوا (نێچیرەکە) بخۆ[٥]))، عەرزم کرد ئەگەر لێی خوارد؟ فەرمووی: ((مەیخۆ چونکە بێگومان بۆ تۆی نەگرتووە، بەڕاستی بۆ خۆی گرتووە))، عەرزم کرد: سەگەکەم دەنێرم جا دەبینم سەگێکی تری لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: ((مەیخۆ چونکە بەڕاستی تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، بەڵام ناوی خوات لەسەر سەگەکەی تر نەهێناوە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.
(٢) لەکۆندا لە قوڕ گوللەیان دروست کردوە و بە کەوان هاویشتوویانە ئەوە بوندوقەیە.
(٣) مەوقوزە: ئەو ئاژەڵەیە بە دارێ یان بەردێ لێی بدرێ و بمرێت گۆشتی ناخورێت.
(٤) بۆ گرتنی نێچیر.
(٥) ئەگەر سەگی فێرە ڕاو بوو.

## ٣- بابُ مَا أَصَابَ الْمِعْرَاضُ بِعَرْضِهِ

٥٤٧٧- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نُرْسِلُ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ. قَالَ: «كُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ». قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ؟ قَالَ: «وَإِنْ قَتَلْنَ». قُلْتُ: وَإِنَّا نَرْمِي بِالْمِعْرَاضِ. قَالَ: «كُلْ مَا خَزَقَ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ»[١].

## ٣- باسی (حوکمی ئەو نێچیرەی ) کە نێزەکە بە باری پانیدا لێی دەدات

**٥٤٧٧-عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە سەگانی فێرە ڕاو بەر دەدەینە نێچیر، فەرمووی: ((هەر نێچیرێکیان بۆگرتی بیخۆ))، وتم: ئەگەر نێچیرەکەشیان کوشتبوو؟ فەرمووی: ((ئەگەر کوشتبووشیان)) وتم: ئێمە نێزە دەگرینە نێچیر؟ فەرمووی: ((ئەوەی (بەسەرە تیژەکەی لێیدا و) کونی کرد بیخۆ، بەڵام ئەوەی بە پانیەکەی لێیدا مەیخۆ)).**

## ٤- باب صَيْدِ الْقَوْسِ

وَقَالَ الْحَسَنُ وَإِبْرَاهِيمُ: إِذَا ضَرَبَ صَيْدًا، فَبَانَ مِنْهُ يَدٌ أَوْ رِجْلٌ، لاَ تَأْكُلُ الذِي بَانَ منه، وَتَأْكُلُ سَائِرَهُ، وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: إِذَا ضَرَبْتَ عُنُقَهُ أَوْ وَسَطَهُ فَكُلْهُ. وَقَالَ الأَعْمَشُ، عَنْ زَيْدٍ: اسْتَعْصَى عَلَى رَجُلٍ مِنْ آلِ عَبْدِ اللَّهِ حِمَارٌ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَضْرِبُوهُ حَيْثُ تَيَسَّرَ، ودَعُوا مَا سَقَطَ مِنْهُ، وَكُلُوهُ.

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.

٥٤٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا حَيْوَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَبِيعَةُ بْنُ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيُّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ، أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ وَبِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ وَبِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ، فَمَا يَصْلُحُ لِي؟ قَالَ: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا، وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ فَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ فَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرَ مُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ»(١).

## ٤- باسی (حوکمی) ڕاوکردن بە کەوان(٢)

**حەسەن و ئیبراهیم دەڵێن: ئەگەر کەسێك دای لە نێچیرێك و دەستێکی یان پێیەکی پەڕاند ئەو دەست و پێیەی پەڕیون مەیخۆ، بەڵام ئەوەی تری بخۆ(٣).**

**ئیبراهیم دەڵێ: ئەگەر لە ملی نێچیرەکەت دا یان ناو قەدی ئەوە بیخۆ.**

**ئەعمەش لە زەیدەوە گێڕایەوە وتی: گەورێ(٤) لە ئالی عەبدوڵڵا یاخی بوو بوو، عەبدوڵڵاش ﷺ فەرمانی پێکردن بدەن لە هەر شوێنێکی بۆیان کرا(٥)، ئەو پارچەی لە نێچیرەکە بوویەوە وازی لێ بێنن ئەوەی تری بخۆن(٦).**

**٥٤٧٨- ئەبو سەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خاکی خەڵکانێك داین کە خاوەن پەڕاوی ئاسمانین، ئایا لە قاپ و قاچاغیاندا خواردن بخۆین؟ وە لە خاکێکی ڕاوکردن داین، بە کەوانەکەم ڕاو دەکەم، وە بەسەگەکەم کە فێرمڕاو نییە و بە سەگەکەم کە فێرمڕاوە ڕاو دەکەم، کام لەمانە**

---

(١) بڕوانە: ٥٤٨٨، ٥٤٩٦.

(٢) مەبەستی تیر و کەوان ئەگەر نا کەوان بەتەنها ڕاوی پێ ناکرێ.

(٣) جگە لە دەست و پێیەکەی.

(٤) کەرە وەحشیەک.

(٥) بە تیر یا هەر شتێکی تر.

(٦) واتە: ئەگەر بە لێدانەکە دەستێکی یان ڕانێکی پەڕی ئەو پارچەی بەزیندووی لێی پەڕیوە مەیخۆن ئەوەی تری بخۆن.

**بۆمن دەشێ و حەڵاڵە؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە باست کرد لە خەڵکە نامەدارەکان ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەستکەوت ئەوا لە هی ئەواندا شت مەخۆن، بەڵام ئەگەر هی ترتان دەست نەکەوت ئەوە بیان شۆن و تێیاندا بخۆن، ئەو (نێچیرە)ش بە کەوانەکەت ڕاوت کرد و ناوی خوات لەسەر هێنا بیخۆ، ئەوەش بەسەگە فێرەڕاوەکەت ڕاوت کرد و ناوی خوات لێ هێنا بوو بیخۆ، ئەوەش بەسەگە فێرە نەکراوەکەت ڕاوت کرد و بەسەر بڕیندا گەشت ئەوە بیخۆ)).**

## ٥- باب الْخَذْفِ وَالْبُنْدُقَةِ

٥٤٧٩- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ رَاشِدٍ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ وَيَزِيدُ بْنُ هَارُونَ -وَاللَّفْظُ لِيَزِيدَ- عَنْ كَهْمَسِ بْنِ الْحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَخْذِفُ فَقَالَ لَهُ: لاَ تَخْذِفْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْخَذْفِ -أَوْ كَانَ يَكْرَهُ الْخَذْفَ- وَقَالَ: «إِنَّهُ لاَ يُصَادُ بِهِ صَيْدٌ وَلاَ يُنْكَى بِهِ عَدُوٌّ، وَلَكِنَّهَا قَدْ تَكْسِرُ السِّنَّ وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ». ثُمَّ رَآهُ بَعْدَ ذَلِكَ يَخْذِفُ فَقَالَ لَهُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنِ الْخَذْفِ -أَوْ كَرِهَ الْخَذْفَ- وَأَنْتَ تَخْذِفُ! لاَ أُكَلِّمُكَ كَذَا وَكَذَا[1].

## ٥- باسی (حوکمی) پەلە پیتکە و بوندوقە[2] هاوێشتن

**٥٤٧٩-عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلەوە ﷺ کە پیاوێکی بینی پەلەپیتکەی دەتەقاند، عەبدوڵڵاش پێی وت: پەلە پیتکە مەهاوێژە چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە پیتکە هاوێژتنی قەدەغە کردوە-یان پەلە پیتکە هاوێژتنی لا نا پەسەندبوو- وە فەرموویەتی:**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤١.

(٢) بوندوقە قوڕ خڕدەکرێت و وشک دەکرێتەوە و دەهاوێژرێ.

((بێگومان نە نێچیری پێ ڕاو دەكرێ نە دوژمنی پێ كوڵەوار و بریندار دەكرێت، بەڵام هەندێ جار ددان دەشكێنێ و چاو كوێر دەكات)).

پاشان دوا ئەوەش بینی كابرا پەلە پیتكە دەهاوێژێ، بۆیە پێی وت: فەرموودەی پێغەمبەری خوات ﷺ بۆ دەگێڕمەوە كە پەلە پیتكە هاوێشتنی قەدەغە كردوە - یان پەلە پیتكە هاوێشتینی لا ناپەسەند بووە -، تۆهەر پەلە پیتكە دەهاوێژی ! ئەوەند و ئەوەندە ماوە قسەت لەگەڵدا ناكەم.

## ٦- بابُ مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لَيْسَ بِكَلْبِ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ

٥٤٨٠- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لَيْسَ بِكَلْبِ مَاشِيَةٍ أَوْ ضَارِيَةٍ، نَقَصَ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطَانِ»[1].

## ٦- باسی کەسێک سەگێک ڕاگرێت سەگی ڕاو و سەگی ئاژەڵ وڕان نەبێت

٥٤٨٠-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((هەركەسێك سەگێك ڕاگرێت، سەگی (پاسەوانی) ئاژەڵ و ماڵات نەبێت، یان (سەگی كەسانێكی) ڕاهاتوو بە ڕاو نەبێت، هەموو ڕۆژێك دوو قیرات لە (پاداشتی) كردەوەكانی كەم دەبێتەوە)).

(١) بڕوانە: ٥٤٨١، ٥٤٨١.

٥٤٨١- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمًا يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا إِلاَّ كَلْبٌ ضَارٍ لِصَيْدٍ أَوْ كَلْبَ مَاشِيَةٍ، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ»[١].

**٥٤٨١-عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر کەسێك سەگێك ڕابگرێت جگە لە سەگی ڕاهاتوو بۆ ڕاو یان سەگی (پاسەوانی) ئاژەڵ و ماڵات، ئەوە بێگومان هەموو ڕۆژێك دوو قیرات لە پاداشتی کەم دەبێتەوە)).**

٥٤٨٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا إِلاَّ كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ ضَارٍ، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ»[٢].

**٥٤٨٢-عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك سەگێك ڕاگرێت جگە لە سەگی (پاسەوانی) ئاژەڵ یان سەگی ڕاهاتوو بەڕاو، هەموو ڕۆژێك دوو قیرات لە (پاداشتی) کردەوەکانی کەم دەبێتەوە)).**

## ٧- بابُ إِذَا أَكَلَ الْكَلْبُ

وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۙ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ ﴿٤﴾ ﴾ المائدة

(١) بڕوانە: ٥٤٨٠.
(٢) بڕوانە: ٥٤٨٠.

الصَّوَائِدُ وَالْكَوَاسِبُ. ﴿ اجْتَرَحُوا ﴿٢١﴾ ﴾ الجاثية. اكْتَسَبُوا. ﴿ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ ﴿٤﴾ ﴾ المائدة، إلى قَوْلِهِ: ﴿ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٤﴾ ﴾ المائدة. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: إِنْ أَكَلَ الكَلْبُ فَقَدْ أَفْسَدَهُ، إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، والله تعالى يَقُولُ: ﴿ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ ﴿٤﴾ ﴾ المائدة. فَتُضْرَبُ وَتُعَلَّمُ حَتَّى يَتْرُكَ. وَكَرِهَهُ ابن عُمَرَ. وَقَالَ عَطَاءٌ: إِنْ شَرِبَ الدَّمَ وَلَمْ يَأْكُلْ، فَكُلْ.

٥٤٨٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ بَيَانٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ. فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ، وَإِنْ قَتَلْنَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَهُ على نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كِلاَبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ»[١].

## ٧- باسێک: ئەگەر سەگ (لە نێچیری ) خوارد[٢]

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵندە: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) پرسیارت لێ دەكەن چی حەڵاڵ كراوە بۆیان؟ بڵێ: هەموو خۆراكە پاكەكان وە (نێچیری) ئەو باڵندە و تانجی و سەگە ڕاوكەرانەی كە فێری ڕاوتان كردوون حەڵاڵ كراوە بۆتان). ﴿ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ ﴿٤﴾ ﴾: باڵندەی ڕاوكەر و سەگانی ڕاوكەر. ﴿ اجْتَرَحُوا ﴿٢١﴾ ﴾: كردوویانە.**

**(فێری ڕاویان دەكەن لەوەی خوا فێری كردوون، دە بخۆن لەوانەی بۆتان دەگرن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە خوای گەورە: (لێپرسینەوەی خێرایە).**

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.

(٢) خواردنی ئەو نێچیرە حەرامە.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەگەر سەگ لە نێچیرەکەی خوارد ئەوە بێگومان خراپی کردوە[1]، بێگومان بۆ خۆیی گرتووە، خوای گەورەش دەفەرموێ: (فێری ڕاویان بکەن لەوەی خوا فێری کردوون)، ئینجا لە سەگەکە دەدرێت و فێر دەکرێ هەتا واز دێنێ (لە خواردنی نێچیر).

-بەلای ئیبنو عومەرەوە ﷺ ئەو نێچیرەی لێی خوراوە خواردنی ناپەسەندە.

-عەتا دەڵێ: ئەگەر سەگەکە هەرخوێنی نێچیرەکەی خوارد و گۆشتی نەخوارد ئەوە بیخۆ.

٥٤٨٣- عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتم: ئێمە گەلێکین بە ئا ئەم سەگانە ڕاو دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر سەگە فێرە ڕاوەکانت بەردایە نێچیرەکە، وە ناوی خوات هێنا، ئەوە هەر نێچیرێکیان گرت بۆتان بیخۆن بابیشی کوژن، مەگەر سەگەکە لێی بخوات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە بۆ خۆی گرتبێ، وە ئەگەر سەگی تری جگە لە خۆیان تێکەڵیان بوو ئەوە مەیخۆن)).

## ٨- بابُ الصَّيْدِ إِذَا غَابَ عَنْهُ يَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً

٥٤٨٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا ثَابِتُ بْنُ يَزِيدَ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ فَأَمْسَكَ وَقَتَلَ، فَكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِذَا خَالَطَ كِلاَبًا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهَا فَأَمْسَكْنَ وَقَتَلْنَ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَيُّهَا قَتَلَ، وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، لَيْسَ بِهِ إِلاَّ أَثَرُ سَهْمِكَ، فَكُلْ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْمَاءِ فَلاَ تَأْكُلْ»[2].

---

(١) دروست نییە خاوەنی سەگەکە بیخوات.

(٢) بڕوانە: ١٧٥.

# ٨- باسی (حوکمی) نێچیر ئەگەر دوو یان سێ ڕۆژ لە ڕاوچی ون بوو بوو

**٥٤٨٤- عەدیی کوڕی خاتیم ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر سەگەکەت نارد و ناوی خوات هێنا و نێچیرەکەی کوشت، بیخۆ، وە ئەگەر لێی خوارد مەیخۆ، چونکە بێگومان بۆ خۆی گرتووە، وە ئەگەر (سەگەکەت) تێکەڵی چەند سەگێکی تر بوو کە ناوی خوایان لەسەر نەهێنرابوو، وە نێچیریان گرت و کوشتیان ئەوە مەیخۆن، چونکە تۆ نازانیت کامیان کوشتوویەتی [١]، وە ئەگەر تیرت گرتە نیچیرێك و دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دۆزیتەوە تەنها شوێنەواری تیرەکەی تۆی پێوە بوو ئەوە بیخۆ، بەڵام ئەگەر کەوتبوویە ناو ئاوەوە ئەوە مەیخۆ)).**

٥٤٨٥ - وَقَالَ عَبْدُ الأَعْلَى: عَنْ دَاوُدَ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَدِيٍّ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَرْمِى الصَّيْدَ فَيَقْتَفِرُ أَثَرَهُ الْيَوْمَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ، ثُمَّ يَجِدُهُ مَيِّتًا وَفِيهِ سَهْمُهُ. قَالَ: «يَأْكُلُ إِنْ شَاءَ»[٢].

**٥٤٨٥-عەبدولئەعلا لە داوودەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عامیرەوە لە عەدییەوە ﷺ گێراویەتیەوە، کە عەرزی پێغەمبەری ﷺ کردوە: تیرێ دەگرێتە نێچیرێ دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بەشوێنیدا دەگەڕێ، پاشان بە مردووی دەیدۆزێتەوە تیرەکەی خۆی پێوەیە، (فەرمووی: ((ئەگەر حەزی کرد بیخوات)).**

# ٩- بابٌ: إِذَا وَجَدَ مَعَ الصَّيْدِ كلباً آخَرَ

٥٤٨٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُرْسِلُ كَلْبِي وَأُسَمِّي فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ

(١) سەگەکەی خۆت کوشتوویەتی و حەڵاڵ بێت یان سەگەکانی تر و حەرام بێت.

(٢) بڕوانە: ١٧٥.

فَأَخَذَ فَقَتَلَ فَأَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: إِنِّي أُرْسِلُ كَلْبِي أَجِدُ مَعَهُ كَلْبًا آخَرَ، لاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَهُ. فَقَالَ: «لاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ». وَسَأَلْتُهُ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: «إِذَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ، فَإِنَّهُ- وَقِيذٌ فَلاَ تَأْكُلْ»[1].

## ٩- باسێک: ئەگەر (ڕاوکەر) لەگەڵ نێچیرەکەدا سەگێکی تری[2] بینی

**٥٤٨٦- عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سەگەکەی خۆم بەرەڵا دەکەم (نێچیرێك) و ناوی خوای لێ دێنم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ئەگەر سەگەکەی خۆت نارد و ناوی خوات لێ هێنا و نێچیرەکەی گرت و کوشتی (لێی) خوارد ئەوە مەیخۆ، چونکە بەڕاستی ئەو بۆ خۆی گرتووە))، وتم: من سەگەکەم دەنێرم سەگێکی تری لەگەڵدا دەبینم، نازانم کامیان نێچیرەکەی گرتووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مەیخۆ چونکە بێگومان تۆ ناوی خوات لە سەگەکەی خۆت هێناوە و ناوی خوات لە سەگی تر نەهێناوە))، وە پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕاوی نیزە، فەرمووی: ((ئەگەر بە تیژیەکەی لێت دا ئەوە بیخۆ، بەڵام ئەگەر بە پانیەکەی لێت دا و کوشتی، ئەوە بێگومان مردارەوە بوە و مەیخۆ)).**

## ١٠- بابُ مَا جَاءَ فِي التَّصَيُّدِ

٥٤٨٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنِي ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَتَصَيَّدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ. فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.

(٢) جگە لە سەگەکەی خۆی.

الْمُعَلَّمَةَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَ على نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كَلْبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ»[1].

## ١٠- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرقاڵ بوون بەڕاوەوە کردنی بەپیشە و کەسابەت

**٥٤٨٧- عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتم: ئێمە گەلێکین بە ئا ئەم سەگانە ڕاو دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر سەگەکە فێرە ڕاوەکانت بەردایە نێچیرەکە، وە ناوی خوات هێنا، جا هەر نێچیرێکیان گرت بۆتان بیخۆن، مەگەر سەگەکە لێی بخوات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە بۆ خۆی گرتبێ، وە ئەگەر سەگی تر جگە لە خۆیان تێکەڵیان بوو، ئەوە مەیخۆن)).**

٥٤٨٨- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ حَيْوَةَ. وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَبِيعَةَ بْنَ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيَّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ عَائِذُ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيَّ ﷺ يَقُولُ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ، نَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، وَأَرْضِ صَيْدٍ أَصِيدُ بِقَوْسِي، وَأَصِيدُ بِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ وَالَّذِي لَيْسَ مُعَلَّمًا، فَأَخْبِرْنِي مَا الَّذِي يَحِلُّ لَنَا مِنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكَ بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ، تَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَ آنِيَتِهِمْ فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا ثُمَّ كُلُوا فِيهَا، وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكَ بِأَرْضِ صَيْدٍ، فَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، ثُمَّ كُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ثُمَّ كُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِي لَيْسَ مُعَلَّمًا فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ، فَكُلْ»[2].

---

(١) بڕوانە: ١٧٥.

(٢) بڕوانە: ٥٤٧٨.

**٥٤٨٨-ئەبو سەعلەبی خۆشەنی ﷺ دەڵێ: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە خاکی خەڵکانێك داین کە نامەدارن، لە قاپ و قاچاغیاندا شت دەخۆین، وە لە خاکی ڕاوکردن داین بە کەوانەکەم ڕاو دەکەم، وە بە سەگە فێرە ڕاوەکەم وە بەو سەگەشیان فێرە ڕاو نییە (ڕاودەکەم)، جا ئاگادارم بکە کامەیان حەڵاڵە بۆمان لەوانە؟ ئەویش فەرمووی((دەربارەی ئەوەی کەباست کرد ئێوە لە خاکی خەڵکانێکی نامەداردان و لە قاپ و قاچاغی ئەواندا شت دەخۆن، جا ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەست کەوت جگە لە قاپ و قاچاغی ئەوان، ئەوە لە قاپ و قاچاغیاندا شت مەخۆن، بەڵام ئەگەر هی ترتان دەست نەکەوت ئەوە قاپ و قاچاغەکەیان بشۆن پاشان تیاندا بخۆن، دەربارەی ئەوەش کەوا لە خاکی ڕاودان: ئەو نێچیرەی کە بەکەوانەکەت پێکات و ناوی خوای لەسەر بێنە و پاشان بیخۆ، ئەوەش کە بە سەگە فێرە ڕاوەکەت دەیگریت و ڕاوی دەکەیت، ناوی خوای لەسەر بێنە و پاشان بیخۆ، ئەوەش بە سەگە فێرە ڕاونەکراوەکەت دەیگریت، جا ئەگەر فریای سەربڕینی کەوتی ئەوە بیخۆ)).**

٥٤٨٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي هِشَامُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَوْا عَلَيْهَا حَتَّى لَغِبُوا، فَسَعَيْتُ عَلَيْهَا حَتَّى أَخَذْتُهَا، فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ، فَبَعَثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِوَرِكِهَا أَوْ فَخِذَيْهَا، فَقَبِلَهُ[1].

**٥٤٨٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە مەڕی زەهران کەروێشکێکمان هەڵسان و ڕایان کرد بەشوێنیدا تا ماندوو بوون، ئینجا منیش ڕام کرد بەشوێنیدا هەتا گرتم وهێنام بۆ ئەبو تەڵحە ﷺ، ئەبو تەڵحەش نەرمە گۆشتی ڕانێکی یان هەردوو ڕانەکەی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش وەریگرت.**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٧٢.

٥٤٩٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ -عَنْ نَافِعٍ-مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ،حَتَّى إِذَا كَانَ بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ. وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَى حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَاسْتَوَى عَلَى فَرَسِهِ، ثُمَّ سَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطًا، فَأَبَوْا، فَسَأَلَهُمْ رُمْحَهُ، فَأَبَوْا فَأَخَذَهُ ثُمَّ شَدَّ عَلَى الْحِمَارِ فَقَتَلَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبَى بَعْضُهُمْ، فَلَمَّا أَدْرَكُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللَّهُ»[(١)].

**٥٤٩٠- نافیعی -ئازادکراوی ئەبو قەتادە- ﷺ لە ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە کە ئەو لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو (دەڕۆشتن)، تا کاتێ لە ڕێگەی مەککەدا بوون لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا دواکەوتن کەلەئیحرامدا بوون، بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی نەبەستبوو، جا ئەبو قەتادە کەرێکی وەحشی بینی و سواری ئەسپەکەی بوو، پاشان داوای لە هاوڕێکانی کرد کەقەمچیەکەی بدەنێ بەڵام نەیان دایە، وە داوای ڕمەکەی لێ کردن هەر نەیان دایە، ئینجا خۆی هەڵیگرت و پاشان هێرش بۆ کەرەکە برد و کوشتی، ئەوسا هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گۆشتەکەیان خوارد و هەندێکیشیان نەیان خوارد، جا کاتێ گەشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ئەو کارەیان لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ((بێگومان خۆراکێکە خوا دەرخواردی ئێوەی داوە)).**

٥٤٩١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ مِثْلَهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: «هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ؟»[(٢)].

**٥٤٩١-زەیدی کوڕی ئەسلەم لە عەتای کوڕی یەسارەوە گێڕاویەتیەوە، لە ئەبی قەتادەوە ﷺ وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕاوەتەوە، تەنها ئەوە نەبێ دەفەرموێ: ((ئایا لە گۆشتەکەی هیچتان پێیە؟)).**

(١) بڕوانە: ١٨٢١.

(٢) بڕوانە: ١٨٢١.

## ١١- بابُ التَّصَيُّدِ عَلَى الْجِبَالِ

٥٤٩٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا عَمْرٌو، أَنَّ أَبَا النَّضْرِ حَدَّثَهُ عَنْ نَافِعٍ -مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ- وَأَبِي صَالِحٍ -مَوْلَى التَّوْأَمَةِ- سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، وَأَنَا رَجُلٌ حِلٌّ عَلَى فَرَسٍ، وَكُنْتُ رَقَّاءً عَلَى الْجِبَالِ، فَبَيْنَا أَنَا عَلَى ذَلِكَ إِذْ رَأَيْتُ النَّاسَ مُتَشَوِّفِينَ لِشَيْءٍ، فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا هُوَ حِمَارُ وَحْشٍ، فَقُلْتُ لَهُمْ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: لاَ نَدْرِي. قُلْتُ: هُوَ حِمَارٌ وَحْشِيٌّ. فَقَالُوا: هُوَ مَا رَأَيْتَ. وَكُنْتُ نَسِيتُ سَوْطِي، فَقُلْتُ لَهُمْ: نَاوِلُونِي سَوْطِي. فَقَالُوا: لاَ نُعِينُكَ عَلَيْهِ. فَنَزَلْتُ فَأَخَذْتُهُ، ثُمَّ ضَرَبْتُ فِي أَثَرِهِ، فَلَمْ يَكُنْ إِلاَّ ذَاكَ، حَتَّى عَقَرْتُهُ، فَأَتَيْتُ إِلَيْهِمْ فَقُلْتُ لَهُمْ: قُومُوا فَاحْتَمِلُوا. قَالُوا: لاَ نَمَسُّهُ. فَحَمَلْتُهُ حَتَّى جِئْتُهُمْ بِهِ، فَأَبَى بَعْضُهُمْ، وَأَكَلَ بَعْضُهُمْ، فَقُلْتُ: أَنَا أَسْتَوْقِفُ لَكُمُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَدْرَكْتُهُ فَحَدَّثْتُهُ الْحَدِيثَ، فَقَالَ لِي: «أَبَقِيَ مَعَكُمْ شَيْءٌ مِنْهُ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: «كُلُوا، فَهْوَ طُعْمٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللَّهُ»[١].

## ١١- باسی سەرقاڵ بوون بە ڕاوەوە لە شاخەكاندا

**٥٤٩٢-ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم لە نێوان مەككە و مەدینەدا، ئەوان ئیحرامیان دابەستبوو، منیش پیاوێك بووم بەسواری ئەسپێكەوە ئیحرامم نەبەستبوو، وە من زۆر بەشاخدا سەردەكەوتم، جا لە كاتێكدا من لەو حاڵەتەدابووم لە پڕ خەڵكەكەم بینی سەیری شتێكیان دەكرد، منیش ڕۆشتم سەیر بكەم بینیم كەرە وەحشیەكە، پێم وتن ئەمە چییە؟ وتیان: نازانین، وەتم كەری وەحشییە، وتیان: ئەوەیە كە دیوتە من قەمچیەكەم لە بیر چوو بوو، بۆیە پێم وتن: قەمچیەكەم پێ بدەن، وتیان: یارمەتیت نادەین**

(١) بڕوانە: ١٨٢١.

بۆ ئەو کارە، ئیتر خۆم دابەزیم قامچیەکەم هەڵگرت پاشان شوێنی (کەرە وەحشیەکە) کەوتم، جا ئەوەندەی نەبرد تا بریندارم کرد و هاتمەوە بۆ لایان و پێم وتن هەستن هەڵیبگرن، وتیان: دەستی لێ نادەین، بۆیە خۆم هەڵم گرت هەتا هێنام بۆ لایان، جا هەندێکیان نەیان خوارد و هەندێکییان خواردیان، منیش وتم: داوا دەکەم لە پێغەمبەر ﷺ کە بوەستێت تا ئێوە (پرسیاری لێ بکەن)، جا پێی گەشتم و باسەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێم: ((بیخۆن ئەوە خۆراکێکە خوا دەرخواردی ئێوەی داوە)).

## ١٢- بابُ قوْله ﷻ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ ﴿٩٦﴾ ﴾ المائدة

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: صيْدُهُ مَا اصْطِيدَ، ﴿ وَطَعَامُهُۥ ﴿٩٦﴾ ﴾ المائدة.مَا رَمَى بِهِ. وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: الطَّافِي حَلَالٌ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: طَعَامُهُ: مَيْتَتُهُ إِلَّا مَا قَذِرْتَ مِنْهَا، وَالْجِرِّيُّ لَا تَأْكُلُهُ اليَهُودُ وَنَحْنُ نَأْكُلُهُ. وَقَالَ شُرَيْحٌ صَاحِبُ النَّبِيِّ ﷺ: كُلُّ شَيْءٍ فِي البَحْرِ مَذْبُوحٌ. وَقَالَ عَطَاءٌ: أَمَّا الطَّيْرُ فَأَرى أَنْ يَذْبَحَهُ. وَقَالَ ابن جُرَيْجٍ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: صيْدُ الأَنْهَارِ وَقِلَاتِ السَّيْلِ أَصَيْدُ بَحْرٍ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ. ثُمَّ تَلَا: ﴿ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ ﴿١٢﴾ ﴾ فاطر، ﴿ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا ﴿١٢﴾ ﴾ فاطر. وَرَكِبَ الحَسَنُ ﷺ عَلَى سَرْجٍ مِنْ جُلُودِ كِلَابِ المَاءِ. وَقَالَ الشَّعْبِيُّ: لَوْ أَنَّ أَهْلِي أَكَلُوا الضَّفَادِعَ لأَطْعَمْتُهُمْ. وَلَمْ يَرَ الحَسَنُ بِالسُّلَحْفَاةِ بَأْسًا. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: كُلْ مِنْ صَيْدِ البَحْرِ نَصرَانِيٍّ أَوْ يَهُودِيٍّ أَوْ مَجُوسِيٍّ. وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ فِي المُرِي: ذَبَحَ الخَمْرَ النِّينَانُ وَالشَّمْسُ.

# ١٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ڕاو (ی نێچیری) دەریا حەڵاڵ كراوە بۆتان)

-عومەر ﷺ دەڵێ: (صَيْدُهُ): نێچیری دەریا ئەوەیە كە ڕاو بكرێ.﴿ وَطَعَامُهُۥ (٩٦) ﴾ المائدة: ئەوەی كە دەریا بیخاتە لاوە[1]. ئەبو بەكر ﷺ دەڵێ: ئەو گیاندارەی لە دەریادا دەمرێ و سەر ئاو دەكەوێ حەڵاڵە. ئیبنو عەبباس ﷺ خواردەمەنی دەریا مردارەوە بووەكەیەتی جگە لەوەی بێزی لێ دەكەیتەوە. مارماسی[2] جوولەكە نایخۆن بەڵام ئێمە دەیخۆین. شورەیح هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ دەڵێ: هەرچی لە دەریا دایە بەسەربڕاو دادەنرێت. عەتا دەڵێ: دەربارەی باڵندەی ناو دەریا ئەوە من ڕام وایە كە مرۆڤ سەری ببڕێت. ئیبنو جورەیج دەڵێ: بە عەتام وت: نێچیر و گیانداری ناو ئاوی ڕووبارە و گۆلاوی لافاو بەگیانداری دەریا دادەنرێت و (حەڵاڵە)؟ وتی: بەڵێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ (١٢) ﴾ فاطر[3].﴿ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا (١٢) ﴾ فاطر[4].

-وە حەسەن (ی كوڕی عەلی) ﷺ سواری زینی نەرمە زین بوو كە لە پێستی سەگی ئاویی بووە.

-شەعبی دەڵێ: ئەگەر ماڵ و منداڵم قورباقیان بخواردایە پێم دەدان كە بیخۆن.

-حەسەنی (بەصری) لای وانییە خواردنی كیسەڵ هیچ خراپەیەكی تیابێ.

-ئیبنو عەبباس ﷺ ڕاو كراوی دەریا بخۆ، كە گاور یا جوولەكە یا ئاگر پەرست ڕاوی كردبێت.

---

(١) دەریا فڕێی داتە دەرەوەی دەریاكە لە كاتی شەپۆلدا.

(٢) یان سەر و قنگ باریک و ناو قەد ئەستور.

(٣) ئەمەیان سازگار و شیرینە و خواردنەوەی ئاسانە.

(٤) ئەویان سوێر و تاڵ و تفتە و لە هەردووكیان گۆشتی تەڕ و تازە دەخۆن).

**-ئەبو دەردا ﷺ دەڵێ: (المُرِي): کە بریتییە لە سەربڕینی عارەق بە ماسی و خۆڕ[١] (خواردنی دروستە).**

٥٤٩٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: غَزَوْنَا جَيْشَ الْخَبَطِ، وَأُمِّرَ أَبُو عُبَيْدَةَ، فَجُعْنَا جُوعًا شَدِيدًا، فَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتًا مَيِّتًا لَمْ يُرَ مِثْلُهُ يُقَالُ لَهُ: الْعَنْبَرُ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ، فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ عَظْمًا مِنْ عِظَامِهِ، فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ[٢].

**٥٤٩٣-عەمر دەڵێ: ئەو لە جابیری ﷺ بیست دەیوت: لەگەڵ لەشکری خەبەتدا چووم بۆ غەزا و ئەبو عوبەیدە ﷺ کرایە گەورە و لێپرسراو، ئینجا برسێتیەکی سەختمان تووش بوو، وە دەریا نەهەنگێکی مردووی فڕێ دایە کەناری دەریاکە وێنەی ئەو لە گەورەیی دا نەبینرابوو، پێی دەوترا: عەنبەر، نیو مانگ لێمان خوارد، ئەبو عوبەیدە ئێسکێکی لە ئێسکەکانی هەڵگرت[٣]، سوار بە وڵاخەکەیەوە بە ژێریدا دەڕۆشت.**

٥٤٩٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا يَقُولُ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ ﷺ ثَلاَثَمِائَةِ رَاكِبٍ وَأَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ نَرْصُدُ عِيرًا لِقُرَيْشٍ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الْخَبَطَ، فَسُمِّيَ جَيْشَ الْخَبَطِ، وَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتًا يُقَالُ لَهُ: الْعَنْبَرُ، فَأَكَلْنَا نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا بِوَدَكِهِ حَتَّى صَلَحَتْ أَجْسَامُنَا. قَالَ: فَأَخَذَأَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنَصَبَهُ، فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ، وَكَانَ فِينَا رَجُلٌ فَلَمَّا اشْتَدَّ الْجُوعُ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ[٤].

---

(١) خواردنێکە ماسی خوێی پێوە دەکرێت دەخرێتە ناو عارەقەوە و لەبەر خۆر دادەنرێت، ئەوە عارەقەکە سەر دەبڕێت و پاکی دەکاتەوە خواردنی دروستە.

(٢) بڕوانە: ٢٤٨٣.

(٣) لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ: دوو ئێسکی بە بەرزی دانا سوار بە وڵاخەوە بەژێریاندا دەڕۆشت.

(٤) بڕوانە: ٢٤٨٣.

**٥٤٩٤-عەمر دەڵێ: لە جابیرم ﷺ بیست دەیوت: ئێمە سێ سەد سوار بووین پێغەمبەر ﷺ ناردینی ئەبو عوبەیدە سەرکردەمان بوو، چاودێری کاروانێکی قورەیش بکەین، ئینجا برسێتیەکی سەختمان تووش بوو (و وامان لێ هات) هەتا گەڵای دارمان دەخوارد، لەبەر ئەوە لەشکرەکە ناوبرا بە لەشکری گەڵای وەریو، دەریا نەهەنگێکی فڕێدایە کەناری دەریا پێی دەوترا: عەنبەر، نیو مانگ لێما خوارد و بە پیو و چەوریەکی خۆمان هەنوی، هەتا لەشمان چاك بویەوە، دەڵێ: ئەبو عوبەیدە پەراسویەك لە پەراسووەکانی هێنا و بەبەرزی داینا، سوار بەوڵاخەوە دەڕۆشت بە ژێریدا. پیاوێکمان تیا بوو، کاتێ برسێتی زۆری بۆ هێنایین سێ مێ ووشتری سەربڕی، لە پاشان سێ مێ ووشتری تر سەربڕی، پاشان ئەبو عوبەیدە ڕێگری لێ کرد (هی تر سەر ببڕێت).**

## ١٣- بَابُ الْجَرَادِ

٥٤٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي يَعْفُورٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ -أَوْ سِتًّا- كُنَّا نَأْكُلُ مَعَهُ الْجَرَادَ. قَالَ سُفْيَانُ وَأَبُو عَوَانَةَ وَإِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي يَعْفُورٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى: سَبْعَ غَزَوَاتٍ.

## ١٣- باسی کوللە (خواردنی دروستە)

**٥٤٩٥- ئەبو یەعفور وتی: لە ئیبنو ئەبی ئەوفام ﷺ بیست وتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ حەوت غەزامان کرد -یا شەش-، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کوللەمان دەخوارد.**

**-سوفیان و ئەبو عەوانە و ئیسرائیل گێراویانەتەوە لە ئەبی یەعفورەوە، ئەویش لە ئیبنو ئەبی ئەوفاوە ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

## ١٤- بابُ آنِيَةِ الْمَجُوسِ وَالْمَيْتَةِ

٥٤٩٦- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ حَيْوَةَ بْنِ شُرَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي رَبِيعَةُ بْنُ يَزِيدَ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيُّ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، وَبِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي، وَأَصِيدُ بِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ، وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكَ بِأَرْضِ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلاَ تَأْكُلُوا فِي آنِيَتِهِمْ، إِلاَّ أَنْ لاَ تَجِدُوا بُدًّا، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا بُدًّا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا، وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكُمْ بِأَرْضِ صَيْدٍ، فَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ، فَكُلْهُ»[1].

## ١٤- باسی (حوکمی بەکارهێنانی) قاپ و قاچاغی ئاگرپەرەست و (حوکمی) مردارەوە بوو

**٥٤٩٦- ئەبو سەعلەبی خۆشەنی ﷺ دەڵێ: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە خاکی خەڵکانێك داین کە نامەدارن، لە قاپ وقاچاغیاندا شت دەخۆین، وە لە خاکی ڕاوکردن داین بەکەوانەکەم ڕاو دەکەم، وە بەسەگە فێرە ڕاوەکەم ڕاو دەکەم، وە بەو سەگەشیان فێرە ڕاو نییە (ڕاودەکەم)، ئەویش فەرمووی: ((دەربارەی ئەوەی کە باست کرد ئێوە لە خاکی خەڵکانێکی نامەداردان و لە قاپ و قاچاغی ئەواندا شت دەخۆن، جا ئەگەر قاپ وقاچاغی ترتان دەست کەوت جگەلە قاپ و قاچاغی ئەوان، ئەوە لە قاپ و قاچاغیاندا شت مەخۆن، بەڵام ئەگەر هی ترتان دەست نەکەوت ئەوە قاپ و قاچاغەکەیان بشۆن پاشان تیاندا بخۆن، دەربارەی ئەوەش کەوا لە خاکی ڕاودان:**

(١) بڕوانە: ٥٤٧٨.

ئەو نێچیرەی كە بەكەوانەكەت پێكات ناوی خوای لەسەر بێنە و بیخۆ، ئەوەش كە بە سەگە فێرە ڕاوەكەت دەیگریت و ڕاوی دەكەیت ناوی خوای لەسەر بێنە و بیخۆ، ئەوەش بە سەگە فێرە ڕاو نەكراوەكەت دەیگریت، جا ئەگەر فریای سەربڕینی كەوتی ئەوە بیخۆ)).

٥٤٩٧- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: لَمَّا أَمْسَوْا يَوْمَ فَتَحُوا خَيْبَرَ أَوْقَدُوا النِّيرَانَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى مَا أَوْقَدْتُمْ هَذِهِ النِّيرَانَ؟». قَالُوا: لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. قَالَ: «أَهْرِيقُوا مَا فِيهَا، وَاكْسِرُوا قُدُورَهَا». فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: نُهَرِيقُ مَا فِيهَا وَنَغْسِلُهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْ ذَاكَ»[1].

٥٤٩٧-سەلەمەی كوڕی ئەكوەع ﷺ وتی: لەو ڕۆژەی خەیبەر ئازاد كرا، كاتێ (هاوەڵان) ئێوارەیان بەسەردا هات، چەند ئاگرێكیان كردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم ئاگرانەتان بۆچی كردۆتەوە؟)) وتیان: بۆ (كوڵاندنی) گۆشت كەری ماڵی، فەرمووی: ((هەرچی لەو مەنجەڵانە دایە بیڕێژن مەنجەڵەكانیش بشكێنن، ئینجا پیاوێك لە ناو خەڵكەكەدا هەستا وتی: ئەوەی تیایان دایە بیڕێژن و بیانشۆرین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: یان ئەوەیان (واتە بیشكێنن یان بیشۆرن).

## ١٥- بَابُ التَّسْمِيَةِ عَلَى الذَّبِيحَةِ، وَمَنْ تَرَكَ مُتَعَمِّدًا

قَالَ ابن عَبَّاسٍ ﷺ: مَنْ نَسِيَ فَلَا بَأْسَ. وَقَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ﴿١٢١﴾ ﴾ الأنعام. وَالنَّاسِي لَا يُسَمَّى فَاسِقًا، وَقَوْلُهُ تعالى: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾ الأنعام.

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧٧.

٥٤٩٨- حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ، فَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَمًا -وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أُخْرَيَاتِ النَّاسِ- فَعَجِلُوا فَنَصَبُوا الْقُدُورَ، فَدُفِعَ إِلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ فَأَمَرَ بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنَ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ، فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، وَكَانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا نَدَّ عَلَيْكُمْ فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا». قَالَ: وَقَالَ جَدِّي: إِنَّا لَنَرْجُو -أَوْ نَخَافُ- أَنْ نَلْقَى الْعَدُوَّ غَدًا، وَلَيْسَ مَعَنَا مُدى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ فَقَالَ: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُخْبِرُكُمْ عَنْهُ، أَمَّا السِّنُّ عَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ»[1].

## ١٥- باسی (حوکمی ) ناوی خوا هێنان لەسەر ئاژەڵی سەردەبڕدرێ، وە (حوکمی) کەسێک بە ئەنقەست ناوی خوای لەسەر نەهێنێت

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کەسێك ناو هێنانی خوای لە بیرچوو (لە کاتی سەربڕیندا) زیانی نییە، وە خوا ﷻ دەفەرموێ: (لەو (سەر بڕاوە) مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (لە کاتی سەربڕیندا)، بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان لەسنوور دەرچوونە)، کەسی لەبیرچوو پێی ناوترێت فاسیق و لە سنور دەرچوو، وە ئەم فەرمایشتەی خوا: (وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بە دۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن، جا ئەگەر بەگوێیان بکەن، ئەوە بێگومان لە هاوبەش بڕیار دەران دەبن).**

(١) بروانە: ٢٤٨٨.

٥٤٩٨- عەبایەی كوڕی ڕیفاعەی كوڕی ڕافیع لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە -كە ڕافیعی كوڕی خەدیجە- دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لە زولحولەیفە، خەڵك تووشی برسیەتی بوو بوون، ئەنجا چەند سەر وشتر و مەڕمان دەسكەوت، ڕافیع دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە كۆتایی لەشكرەكەوە بوو، بۆیە خەڵكانێك پەلەیان كرد (و سەریان بڕین) و مەنجەڵیان خستەسەر (ئاگر)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ گەیەنرایە لایان و فەرمانی كرد كە مەنجەڵەكان (قلّپ بكرێنەوە)، ئەوسا مەنجەڵەكان قلّپ كرانەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ (وشتر و مەڕەكانی) دابەشكرد و هەر دە سەر مەڕێكی لە جێی وشترێك دانا، جا وشترێك لەو وشترانە یاخی بوو، وە لە ناو خەڵكەكەدا چەند ئەسپ سوارێكی كەم هەبوو، ئینجا بەدوایدا ڕۆشتن بەڵام ماندووی كردن (و بۆیان نەگیرایەوە)، ئەنجا پیاوێكیان تیرێكی تێگرت خواش (بەهۆی ئەو تیرەوە) جوڵەی لێ بڕی و ڕایگرت، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم ئاژەڵانە یاخی بوونێكیان هەیە وەك یاخی بوونی ئاژەڵی كێوی، جا هەر كامێكیان لە دەستان دەرچوو (بۆتان نەگیرا) ئاوای لێ بكەن))، عەبایە دەڵێ باپیرەم وتی: ئێمە سبەینێ بەتەمای دەسكەوتین لە دوژمنەوە یا دەترسین لێیان و چەقۆشمان پێ نییە، ئایا ئەتوانین بە قامیش (ئاژەڵ) سەر ببڕین؟ فەرمووی: ((هەر شتێك خوێنی بڕژێنێت و ناوی خوای لەسەر هێنرا بێ ئەوە بیخۆن، نەك بە ددان و نینۆك سەر بڕابێ، لەو بارەشەوە قسەتان بۆ دەكەم سەبارەت بە ددان ئەوە ئێسكێكە و سەبارەت بە نینۆكیش ئەوە چەقۆی خەڵكی حەبەشەیە)).

## ١٦- بابُ مَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ والأزلام

٥٤٩٩- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ -يَعْنِي: ابْنَ الْمُخْتَارِ- أَخْبَرَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ لَقِيَ زَيْدَ بْنَ

عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ بِأَسْفَلِ بَلْدَحٍ، وَذَاكَ قَبْلَ أَنْ يُنْزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْوَحْيُ، فَقَدَّمَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُفْرَةً فِيهَا لَحْمٌ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لاَ آكُلُ مِمَّا تَذْبَحُونَ عَلَى أَنْصَابِكُمْ، وَلاَ آكُلُ إِلاَّ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ[1].

## ١٦- باسی ئەو (ئاژەڵ و ماڵاتانەی) بۆ پەرەستراو و بتەکان سەربڕاون

**٥٤٩٩-سالیم دەگێڕێتەوە کە لە عەبدوڵڵای ﷺ بیست ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە خوارووی (شیوی) بەلدەحەوە گەیشت بەزەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، پێش ئەوە کە نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزێت.ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆراکێکی لە بەردەمیدا[2] دانا گۆشتی تیابوو. زەیدیش لێ نەخوارد، پاشان وتی: بێگومان من لەو گۆشتانە ناخۆم کە ئێوە بۆ بتەکانتانی سەر دەبڕن، وە من تەنها لە (گۆشتی) ئەو ئاژەڵانە دەخۆم کە ناوی خوای لەسەر هێنراوە[3].**

## ١٧- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ»

٥٥٠٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدَبِ بْنِ سُفْيَانَ الْبَجَلِيِّ قَالَ: ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُضْحِيَةً ذَاتَ يَوْمٍ، فَإِذَا أُنَاسٌ قَدْ ذَبَحُوا ضَحَايَاهُمْ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَآهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدْ ذَبَحُوا قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ حَتَّى صَلَّيْنَا فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ»[4].

---

(١) بروانە: ٣٨٢٦.

(٢) لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ: خۆراکێک هێنراو خرایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ، جیاوازی ناگەیەنێت، دەگونجێ خەڵکەکە خۆراکەکەیان هێناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش خستوویەتی بەردەمی زەید.

(٣) لە کاتی سەربڕیندا.

(٤) بڕوانە: ٩٨٥.

## ١٧- باسی ئەم فەرمووده‌یەی پێغەمبەر ﷺ: ((با (مسوڵمان قوربانیەکەی ) بەناوی خواوە سەر ببڕێت)).

٥٥٠٠- جوندەبی کوڕی سوفیانی بەجەلی ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ قوربانیەکمان سەر بڕی، جا بینی کەسانێ قوربانیەکانیان پێش نوێژ (ی جەژن) سەر بڕیوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك پێش نوێژ قوربانی سەر بڕیوە با لە جیاتی ئەو (سەر بڕاوە)دا یەکێکی تر سەر ببڕێت، هەرکەسێش (قوربانی) سەر نەبڕیوە تا نوێژ (ی جەژن) مان کرد، با بە ناوی خواوە سەری ببڕێت)).

## ١٨- بَابُ مَا أَنْهَرَ الدَّمَ مِنَ الْقَصَبِ وَالْمَرْوَةِ وَالْحَدِيدِ

٥٥٠١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، سَمِعَ ابْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ يُخْبِرُ ابْنَ عُمَرَ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ جَارِيَةً لَهُمْ كَانَتْ تَرْعَى غَنَمًا بِسَلْعٍ، فَأَبْصَرَتْ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا مَوْتًا، فَكَسَرَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا، فَقَالَ: لأَهْلِهِ: لاَ تَأْكُلُوا حَتَّى آتِيَ النَّبِيَّ ﷺ فَأَسْأَلَهُ، -أَوْ حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْهِ مَنْ يَسْأَلُهُ- فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ أَوْ بَعَثَ إِلَيْهِ- فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِأَكْلِهَا[١].

## ١٨- باسی ئەوەی خوێن بڕژێنی لە قامیش و بەرد و ئاسنی (تیژ، سەربڕین پێی دروستە)[٢]

٥٥٠١- کەعبی کوڕی مالیك بۆ ئیبنو عومەری ﷺ گێڕایەوە کەباوکی بۆی گێڕاوەتەوە کە کەنیزەیەکی خۆیان هەندێ مەڕی دەلەوەڕاند لە (کێوی)

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٤.

(٢) واتە: هەر یەک لە قامیش یا دار یا بەرد و ئاسن بەمەرجێ سەربڕین پییان دروستە، ئەوەندە تیژ بن خوێن لە ئاژەڵەکە بێنن و خوێنەکە بڕژێت و بڕوا.

**سەلع[١]، جا مەڕێكی بینی لە ڕانەكەی خەریكە بمرێت، ئەویش بەردێكی شكاند و پێی سەربڕی[٢]، جا (كەعب) بە كەس و كارەكەی وت: گۆشتەكەی مەخۆن هەتا دەچمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ دەكەم - یان تا كەسێ دەنێرمە خزمەتی و پرسیاری لێ بكات - جا ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ - یان كەسێكی نارده خزمەتی-، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی كرد بە خواردنی.**

٥٥٠٢- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ أَخْبَرَ عَبْدَ اللَّهِ، أَنَّ جَارِيَةً لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ تَرْعَى غَنَمًا لَهُ بِالْجُبَيْلِ الَّذِي بِالسُّوقِ وَهْوَ بِسَلْعٍ، فَأُصِيبَتْ شَاةٌ، فَكَسَرَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا، فَذَكَرُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَهُمْ بِأَكْلِهَا[٣].

**٥٥٠٢- عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە كەكەنیزەیەكی كەعبی كوڕی مالیك ﷺ هەندێ مەڕی كەعبی كوڕی مالیكی دەلەوەڕاند لەو كێوە بچووكەی كە لای بازاڕ بوو كە لە سەلعە، ئینجا مەڕێك (نزیك بوو) بمرێت، كەنیزەكەش بەردێكی شكاند و سەری بڕی پێی، باسەكەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمانی پێكردن بە خواردنی.**

٥٥٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَيْسَ لَنَا مُدى. فَقَالَ: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ، لَيْسَ الظُّفُرَ وَالسِّنَّ، أَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ، وَأَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ». وَنَدَّ بَعِيرٌ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ: «إِنَّ لِهَذِهِ الإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا هَكَذَا»[٤].

---

(١) كێوێكی بچووكە لە مەدینە.

(٢) بەردەكە تیژ بوو وەک چەقۆ شتی دەبری.

(٣) بڕوانە: ٢٣٠٤.

(٤) بڕوانە: ٢٤٨٨.

٥٥٠٣-عەبایەی كوڕی ڕافیع لە باپیرەیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەقۆمان پێ نییە، پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئەوەی خوێن بڕژێنێ و ناوی خوای لەسەر هێنرابێ ئەوە بیخۆ، بەڵام (سەر بڕینەكە) بە ددان و نینۆك نەبێت، جا سەبارەت بە نینۆك ئەوە چەقۆی حەبەشیەكانە، سەبارەت بە ددانیش ئەوە ئێسكە، وشترێك یاخی بوو خوا (بەتیری پیاوێك) وەستاندی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم وشترانە یاخی بوونیان هەیە وەك یاخی بوونی ئاژەڵی كێوی، جا هەر كامیان دەسەڵاتتان بەسەریدا نەما (بۆتان نەگیرا) ئاوەها لێی بكەن)).

## ١٩- بَابُ ذَبِيحَةِ الْمَرْأَةِ وَالأَمَةِ

٥٥٠٤- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنٍ لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ امْرَأَةً ذَبَحَتْ شَاةً بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَ بِأَكْلِهَا. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنَا نَافِعٌ أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُخْبِرُ عَبْدَ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ جَارِيَةً لِكَعْبٍ بِهَذَا[1].

## ١٩- باسی (حوكمی) سەربڕاوی ژن و كەنیزەك

٥٥٠٤-نافیع لە كەعبی كوڕی مالیكەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە كە ئافرەتێك مەڕێكی بە بەرد سەربڕی، ئینجا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا لەو بارەیەوە، ئەویش فەرمانی كرد بە خواردنی.

-لەیس دەڵێ: نافیع بۆی گێڕاینەوە كە ئەو لە پیاوێكی ئەنصاری بیست هەواڵی داوە بەعەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە: كە كەنیزەیەكی كەعب ئیتر فەرموودەكە دەگێڕێتەوە.

(١) بڕوانە: ٢٣٠٤.

٥٥٠٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ سَعْدٍ -أَوْ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ- أَخْبَرَهُ أَنَّ جَارِيَةً لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ كَانَتْ تَرْعَى غَنَمًا بِسَلْعٍ، فَأُصِيبَتْ شَاةٌ مِنْهَا، فَأَدْرَكَتْهَا فَذَبَحَتْهَا بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «كُلُوهَا».

**٥٥٠٥-ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە وتی: مالیك بۆی گێڕاینەوە لە نافیعەوە لە پیاوێکی ئەنصاریەوە لە موعازی کوڕی سەعدەوە - یان سەعدی کوڕی موعازەوە - بۆی گێڕاوەتەوە، کە کەنیزەیەکی کەعبی کوڕی مالیك ڕانە مەڕێکی لە سەلع دەلەوەڕاند، ئینجا مەڕێکیان نزیك بوو بمرێت، کەنیزەکەکەش فریای کەوت و بە بەردێك سەری بڕی، جا پرسیار لە پێغەمبەر کرا ئەویش فەرمووی: ((بیخۆن)).**

## ٢٠- بابٌ: لاَ يُذَكَّى بِالسِّنِّ وَالْعَظْمِ وَالظُّفُرِ

٥٥٠٦- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلْ -يَعْنِي: مَا أَنْهَرَ الدَّمَ- إِلاَّ السِّنَّ وَالظُّفُرَ»[1].

## ٢٠- باسێک: بە ددان و ئێسک و نینۆک (ئاژەڵ و ماڵات) سەر نابڕدرێت

**٥٥٠٦-ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیخۆ- واتە: ئەوەی خوێن بڕژێنێت - جگە لە ددان و نینۆك)).**

## ٢١- بابُ ذَبِيحَةِ الأَعْرَابِ وَنَحْوِهِمْ

٥٥٠٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أُسَامَةُ بْنُ حَفْصٍ الْمَدَنِيُّ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ قَوْمًا قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ لاَ نَدْرِي أَذُكِرَ

---

(١) بڕوانە: ٢٤٨٨.

اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ. فَقَالَ: «سَمُّوا عَلَيْهِ أَنْتُمْ وَكُلُوهُ». قَالَتْ: وَكَانُوا حَدِيثِي عَهْدٍ بِالْكُفْرِ. تَابَعَهُ عَلِيٌّ، عَنِ الدَّرَاوَرْدِيِّ. وَتَابَعَهُ أَبُو خَالِدٍ وَالطُّفَاوِيُّ[1].

## ٢١- باسی (حوكمی ) سەر بڕاوی عەرەبی دەشتەكەی و هاوشێوەیان

**٥٥٠٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە كەسانێك عەرزی پێغەمبەریان ﷺ كرد: بەڕاستی كەسانێك گۆشتمان بۆ دێنن نازانین ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئێوە ناوی خوای لێ بێنن و بیخۆن)).**

**عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەو كەسانەی بەینیان تازەبوو لەگەڵ كوفردا (واتە تازە مسوڵمان بوون).**

**عەلی پاڵپشتی ئوسامەی كوڕی زەید كردوە. ئەو فەرموودەی لە دەراوەردیەوە گێڕاوەتەوە.**

**ئەبو خالدیش لەگەڵ توفاویدا پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئوسامەی كوڕی زەیدیان كردوە.**

## ٢٢- بابُ ذَبَائِحِ أَهْلِ الْكِتَابِ وَشُحُومِهَا مِنْ أَهْلِ الْحَرْبِ وَغَيْرِهِمْ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْۖ ﴿٥﴾ ﴾ المائدة

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لاَ بَأْسَ بِذَبِيحَةِ نَصَارِيِّ الْعَرَبِ، وَإِنْ سَمِعْتَهُ يُسَمِّي لِغَيْرِ اللَّهِ فَلاَ تَأْكُلْ، وَإِنْ لَمْ تَسْمَعْهُ فَقَدْ أَحَلَّهُ اللَّهُ، وَعَلِمَ كُفْرَهُمْ. وَيُذْكَرُ عَنْ عَلِيٍّ نَحْوُهُ. وَقَالَ الْحَسَنُ وَإِبْرَاهِيمُ: لاَ بَأْسَ بِذَبِيحَةِ الأَقْلَفِ.

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٧.

## ٢٢- باسی سەربڕاوی نامەدارەکان (حەڵاڵە)، هەروەها پیوی سەربڕاوی نامەدارە جەنگێکان و خەڵکانی تریش (حەڵاڵە)

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەمڕۆ خۆراکە پاك و خاوێنەکان حەڵاڵ کراوە بۆتان، وە خۆراکی ئەوانەی نامەیان پێ دراوە حەڵاڵە بۆتان، وە خۆراکی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان).

-زوهری دەڵێ: سەربڕاوی گاوری عەرەب زیانی نییە، بەڵام ئەگەر گوێت لێ بو ناوی غەیری خوا لێ هێنان لەکاتی سەربڕیندا ئەوە مەیخۆ، ئەگەر گوێت لێ نەبوو ئەوە خوا حەڵاڵی کردوە، کە ئاگاداریشە بە بێ باوەڕییان.

-لە عەلیشەوە ﷺ وێنەی ئەو وتەی زوهری دەگێڕێتەوە.

-حەسەن و ئیبراهیم دەڵێن: سەر بڕاوی خەتەنە نەکراو زیانی نییە و حەڵاڵە.

٥٥٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مُحَاصِرِينَ قَصْرَ خَيْبَرَ، فَرَمَى إِنْسَانٌ بِجِرَابٍ فِيهِ شَحْمٌ، فَنَزَوْتُ لآخُذَهُ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ، فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: طَعَامُهُمْ: ذَبَائِحُهُمْ[1].

٥٥٠٨- عەبدوڵڵای کوڕی موغەففل ﷺ دەڵێ: ئێمە کۆشك و باڵەخانەکەی خەیبەرمان گەمارۆدا، ئەنجا کەسێك تورەکەیەکی پێستی فڕێدا کە پیوی تیا بوو، منیش بە پەلە ڕامکرد هەڵیگرم، کە لامکردەوە دەبینم پێغەمبەر ﷺ (سەیرم دەکات) ئیتر شەرمم کرد لە پێغەمبەر ﷺ.

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (طَعَامُهُمْ) واتە: سەربڕاویان.

(١) بڕوانە: ٣١٥٣.

## ٢٣- بابُ مَا نَدَّ مِنَ الْبَهَائِمِ فَهْوَ بِمَنْزِلَةِ الْوَحْشِ

وَأَجَازَهُ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: مَا أَعْجَزَكَ مِنَ الْبَهَائِمِ مِمَّا فِي يَدَيْكَ فَهْوَ كَالصَّيْدِ، وَفِي بَعِيرٍ تَرَدَّى فِي بِئْرٍ مِنْ حَيْثُ قَدَرْتَ عَلَيْهِ فَذَكِّهِ، وَرَأَى ذَلِكَ عَلِيٌّ وَابْنُ عُمَرَ وَعَائِشَةُ.

## ٢٣- باسی ئەوەی یاخی بێت و هەڵ بێت لە ئاژەڵ و ماڵاتی (ماڵی) ئەوە وەک ئاژەڵی وەحشی وایە[1]

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ ڕێگەی داوە (بریندار بکرێت).**

**وە ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەر ئاژەڵێکی ماڵی توانای بەسەریدا نەما (بۆ سەربڕین) ئەوە وەك نێچیری ڕاو وایە، وە وشتریکیش کەوتبێتە بیرێکەوە هەرچۆنێك توانیت سەری ببڕە.**

**-عەلی و ئیبنو عومەر و عائیشە ﷺ هەر ئەو ڕایەیان هەیە.**

٥٥٠٩- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَاقُو الْعَدُوِّ غَدًا، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى. فَقَالَ: «اعْجَلْ -أَوْ أَرِنْ- مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ». وَأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وَغَنَمٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِهَذِهِ الإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَإِذَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شَيْءٌ فَافْعَلُوا بِهِ هَكَذَا»[2].

**٥٥٠٩-ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سبەینێ ئێمە بە دوژمن دەگەین وچەقۆمان پێ نییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پەلە بکە- یان**

---

(١) بۆ برینداری کردنی لە جیاتی سەربڕینی کە بەسەر بڕین دادەنرێت.

(٢) بڕوانە: ٢٤٨٨.

دەستت سوك بكە- هەرچی خوێن فیشقە بێ بكات و ناوی خواشی لێ هێنرابێ ئەوە بیخۆ، نەك بە ددان و نینۆك، با پێت بڵێم: كە ددان ئێسقانە و نینۆكیش چەقۆی حەبەشیەكانە))، دەڵێ: لەو ووشتر و مەڕ و دەستكەوتی جەنگەی دەستمان كەوت، وشترێكیان یاخی بوو، پیاوێك تیرێكی بۆ هاویشت و ڕای گرت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم وشترانە هەیانە یاخی دەبێ هەر وەك یاخی بوونی كێوییەكان، ئەگەر یەكێكیان لێتان یاخی بوو ئێوەش ئاوای لێ بكەن)).

## ٢٤- بابُ النَّحْرِ وَالذَّبْحِ

وَقَالَ ابن جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ لَا ذَبْحَ وَلَا نحر إِلَّا فِي المَذْبَحِ وَالْمَنْحَرِ. قُلْتُ: أَيَجْزِي مَا يُذْبَحُ أَنْ أَنْحَرَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، ذَكَرَ اللَّهُ ذَبْحَ البَقَرَةِ، فَإِنْ ذَبَحْتَ شَيْئًا يُنْحَرُ جَازَ، وَالنَّحْرُ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَالذَّبْحُ قَطْعُ الأَوْدَاجِ. قُلْتُ: فَيُخَلِّفُ الأَوْدَاجَ حَتَّى يَقْطَعَ النِّخَاعَ؟ قَالَ: لَا إِخَالُ. وَأَخْبَرَنِي نَافِعٌ أَنَّ ابن عُمَرَ نَهَى عَنِ النَّخْعِ، يَقُولُ: يَقْطَعُ مَا دُونَ العَظْمِ، ثُمَّ يَدَعُ حَتَّى تَمُوتَ. وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ﴿٦٧﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ: ﴿ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ سعيد عن ابن عَبَّاسٍ: الذَّكَاةُ فِي الحَلْقِ وَاللَّبَّةِ. وَقَالَ ابن عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ إِذَا قَطَعَ الرَّأْسَ فَلَا بَأْسَ.

## ٢٤- باسی سەربڕینی ملی وشتر و قوڕگی ئاژەڵ وماڵات[1]

ئیبنو جورەیج لە عەتاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: سەربڕینی ئاژەڵ وشتر دروست نییە، لە قوڕگدا نەبێت بۆ ئاژەڵ، وە لە ملدا نەبێت بۆ وشتر، (ئیبنو جورەیج)

(١) (النحر) واتە: سەربڕین لە ملدا لای سنگیەوە بۆ حەیوانی مل درێژ وەک وشتر.. (الذبح) واتە: سەربڕین لە قوڕگدا لای سەری بۆ حەیوانی مل کورت وەک مەڕ و مانگا.

**دەڵێ وتم: ئایا دروستە ئەوەی لە قورگا سەر دەبڕێت؟ وتی: بەڵێ سەربڕینی قورگی بۆ مانگا باسكردوە، جا ئەگەر حەیوانێكت لە قورگیدا سەربڕی كە خۆی لە ملیدا سەر دەبڕدرێت دروستە، بەڵام سەربڕینی لە ملیدا لام چاكترە. سەربڕینی قورگ[1]: بریتی لە بڕینی دوو شادەمارەكەی لا مل، وتم بە عەتا دروستە لە شادەمارەكان تێپەڕ بكەیت، تا چاڵای پشت ملی ببڕی شادەمارەكان نەبڕی؟ وتی: گومان نابەم[2].**

**نافیع بۆی گێڕانەوە كە ئیبنو عومەر ﭬ ڕێگری لێ كردوە، وە دەیوت: تاسەر ئێسكی دەبڕێ و وازی لێ دێنێ تا دەمرێ.**

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە بیربكەنەوە كاتێك كەمووسا ﷻ بە گەلەكەی فەرموو بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات كە مانگایەك سەر ببڕن)، وە دەفەرموێ: (ئینجا سەریان بڕی و خەریك بوو ئەو (سەربڕینە) نەكەن).**

**-سەعید (ی كوڕی جوبەیر) لە ئیبنو عەبباسەوە ﭬ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: سەربڕین لە گەردندا لە لای سنگەوە دەبێت.**

**-ئیبنو عومەر و ئیبنو عەبباس و ئەنەس ﭭ دەڵێن: (لە كاتی سەربڕیندا) ئەگەر سەری بە تەواوی جیا بكاتەوە (لە لاشەكەی)، هیچ زیانێكی نییە و حەڵاڵە.**

٥٥١٠- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي فَاطِمَةُ بِنْتُ الْمُنْذِرِ امْرَأَتِي: عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﭭ قَالَتْ: نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَرَسًا فَأَكَلْنَاهُ[3].

**٥٥١٠-ئەسمائی كچی ئەبو بەكر ﭭ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ماینێكمان[1] سەربڕی گۆشتەكەیمان خوارد.**

---

(١) كە بۆ ئاژەڵی مل كورتە.

(٢) واتە: زیانی نییە لەگێڕانەوەیەكی تردا دەڵێ: ناترسم.

(٣) بڕوانە: ٥٥١١، ٥٥١٢، ٥٥١٩.

٥٥١١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، سَمِعَ عَبْدَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: ذَبَحْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَسًا وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ فَأَكَلْنَاهُ(٢).

**٥٥١١- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ؓ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسپێکمان سەربڕی – لە کاتێکدا ئێمە لە مەدینە بووین- وە گۆشتەکەیمان خوارد (٣).**

٥٥١٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَسًا فَأَكَلْنَاهُ. تَابَعَهُ وَكِيعٌ وَابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامٍ فِي النَّحْرِ(٤).

**٥٥١٢- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ؓ دەڵێ:لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ماینێکمان(٥) سەربڕی گۆشتەکەیمان خوارد.**
**-وەکیع و ئیبنو عویەینە لە هیشامەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی جەریریان کردوە لە هێنانی فەرموودەکە لە وشەی (نَحَرْنا)دا.**

## ٢٥- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْمُثْلَةِ وَالْمَصْبُورَةِ وَالْمُجَثَّمَةِ

٥٥١٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَنَسٍ عَلَى الْحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَرَأَى غِلْمَانًا -أَوْ فِتْيَانًا- نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا. فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ

---

(١) فرس: بە ئەسپ و ماین دەوترێت و بۆ هەردووکیان بەکاردەهێنرێت.
(٢) بڕوانە: ٥٥١٠.
(٣) جیاوازیان لە بەکارهێنانی وشەی: (نحرنا) لەگەڵ (ذبحنا) کە هەردووکیان بۆ سەربڕینی ئەسپ و ماین بەکارهێناوە.
(٤) بڕوانە: ٥٥١٠.
(٥) فرس: بە ئەسپ و ماین دەوترێت.

## ٢٥- باسی ئەوەی ناپەسەندە (لە ئاژەڵدا) لە بڕینی ئەندام و نانەوە بە نیشانە و بەستنەوەی و نانەوەی بە نیشانە [1]

**٥٥١٣-هێشامی کوڕی زەید دەڵێ: لەگەڵ ئەنەسدا (کە باپیرەیەتی) چووینە لای حەکەمی کوڕی ئەیوب، (ئەنەس) چەند غولامێکی -یا تازە لاوێکی- بینی مریشکێکیان بە نیشانە ناوەتەوە تیری تێدەگرن، ئەنەسیش ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە گیاندار بە نیشانە بنرێتەوە و تیری پێوە بنرێت.**

٥٥١٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يَعْقُوبَ، أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَهُ يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ دَخَلَ على يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، وَغُلَامٌ مِنْ بَنِي يَحْيَى رَابِطٌ دَجَاجَةً يَرْمِيهَا، فَمَشَى إِلَيْهَا ابْنُ عُمَرَ حَتَّى حَلَّهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ بِهَا وَبِالْغُلَامِ مَعَهُ فَقَالَ: ازْجُرُوا غُلَامَكُمْ عَنْ أَنْ يَصْبِرَ هَذَا الطَّيْرَ لِلْقَتْلِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ تُصْبَرَ بَهِيمَةٌ أَوْ غَيْرُهَا لِلْقَتْلِ [2].

**٥٥١٤-سەعدی کوڕی عەمر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو لێی بیستووە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە چوو بۆ لای یەحیای کوڕی سەعید، لەو کاتەدا کوڕێکی یەحیا مریشکێکی بە ستبوویەوە تیری تێ دەگرت، ئیبنو عومەریش ڕۆشت بۆ لای مریشکەکە و پەتەکەی کردەوە (پێی بەسترابوویەوە)، پاشان مریشکەکە و کوڕەکەشی هێنا و هات وتی: ڕێگری بکەن لە کوڕەکەتان کە پەلەوەر بە نیشانە بنێتەوە بۆ کوشتن، چونکە من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە: ڕێگری کردوە کە ئاژەڵ و گیانداری تر بەنیشانە بنرێتەوە بۆ کوشتن.**

---

(١) ئەم شێوانە نا پەسەند چونکە ئەزیەتی تیایە بۆ گیاندارەکە، وە ئەگەر بە یەکێک لەو حاڵەتانەوە مرد گۆشتی ناخورێت.

(٢) بڕوانە: ٥٥١٥.

٥٥١٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَمَرُّوا بِفِتْيَةٍ -أَوْ بِنَفَرٍ- نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَلَمَّا رَأَوُا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا عَنْهَا، وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَعَنَ مَنْ فَعَلَ هَذَا.

تَابَعَهُ سُلَيْمَانُ، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا الْمِنْهَالُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ مَنْ مَثَّلَ بِالْحَيَوَانِ[1]. وَقَالَ عَدِيٌّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٥٥١٥- سەعدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: من لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بووم ، جا تێپەڕنین بەلای چەند گەنجێکدا-یا چەند کەسێکدا - مریشکێکیان بەنیشانە نابوویەوە تیریان تێ دەگرت، جا کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان  بینی بڵاوەیان کرد و لە مریشەکەکە دوورکەوتنەوە، ئیبنو عومەریش وتی: کێ ئەمەی کردوە؟ بێگومان من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە نەفرینی کردوە لەوانەی ئەم کارە دەکەن.**

**-سولەیمان لە شوعبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: مینهال لە سەعیدەوە لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی ئەندامی گیاندار ببڕێ بەزیندوویی.**

**-عەدیی لە سەعیدەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە  لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەمان فەرموودە دەگێڕێتەوە.**

٥٥١٦- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنِ النُّهْبَةِ وَالْمُثْلَةِ[2].

**٥٥١٦- عەدیی کوڕی سابیت دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاریم  بیست گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ڕێگری کرد لە تالان و ڕاوڕووت و شێواندنی لاشەی مرۆڤ لووت و گوێ بڕینی.**

---

(١) بروانە: ٥٥١٤.

(٢) بروانە: ٤٥٦.

## ٢٦- بَابُ الدَّجَاجِ

٥٥١٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى -يَعْنِي: الأَشْعَرِيَّ- قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَأْكُلُ دَجَاجًا(١).

## ٢٦- باسی (حوكمی خواردنی گۆشتی) مریشک

**٥٥١٧-زەهدەمی جەرمیی لە ئەبی موسای- واتە: ئەشعەری - وە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی مریشكێكی دەخوارد.**

٥٥١٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ أَبِي تَمِيمَةَ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ -وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ هَذَا الْحَيِ مِنْ جَرْمٍ إِخَاءٌ- فَأُتِيَ بِطَعَامٍ فِيهِ لَحْمُ دَجَاجٍ، وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ جَالِسٌ أَحْمَرُ فَلَمْ يَدْنُ مِنْ طَعَامِهِ، قَالَ: ادْنُ، فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهُ. قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهُ أَكَلَ شَيْئًا فَقَذِرْتُهُ، فَحَلَفْتُ أَنْ لاَ آكُلَهُ. فَقَالَ: ادْنُ أُخْبِرْكَ - أَوْ أُحَدِّثْكَ- إِنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ، فَوَافَقْتُهُ وَهْوَ غَضْبَانُ، وَهْوَ يَقْسِمُ نَعَمًا مِنْ نَعَمِ الصَّدَقَةِ، فَاسْتَحْمَلْنَاهُ فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا، قَالَ: «مَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ». ثُمَّ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِنَهْبٍ مِنْ إِبِلٍ، فَقَالَ: «أَيْنَ الأَشْعَرِيُّونَ؟ أَيْنَ الأَشْعَرِيُّونَ؟». قَالَ: فَأَعْطَانَا خَمْسَ ذَوْدٍ غُرَّ الذُّرَى، فَلَبِثْنَا غَيْرَ بَعِيدٍ، فَقُلْتُ لأَصْحَابِي: نَسِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ تَغَفَّلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ لاَ نُفْلِحُ أَبَدًا. فَرَجَعْنَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا اسْتَحْمَلْنَاكَ، فَحَلَفْتَ أَنْ لاَ تَحْمِلَنَا، فَظَنَنَّا أَنَّكَ نَسِيتَ يَمِينَكَ. فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ حَمَلَكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَتَحَلَّلْتُهَا»(٢).

---

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

(٢) بڕوانە: ٤١٣٣.

٥٥١٨-زەهدەم دەڵێ: ئێمە لای ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ بووین - لە ڕابردوودا لە نێوان ئێمە و ئەم هۆزی جەرمدا برایەتی هەبوو- جا خواردنێکی هێنرا گۆشتی مریشکی تیابوو، لەناو خەڵکەکەشدا پیاوێکی سوری تیابوو دانیشتبوو، لە خواردنەکەی (ئەبو مووسا ﷺ) نزیك نەبوویەوە، (ئەبو مووسا) وتی: نزیك بەرەوە بێگومان پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لێی خواردووە، کابرا وتی: من ئەو مریشکەم دیوە شتێکی دەخوارد ئیتر قێزم لێی هاتەوە و سوێندم خوارد و کە نەیخۆم، ئەویش (ئەبو مووسا) وتی: وەرە نزیك بەرەوە هەواڵت دەدەمێ - یان بۆت دەگێڕمەوە - من ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەریدا، لەو کاتە چوومە خزمەتی زۆر تووڕە بوو هاو کات ماڵات و وشتری زەکاتی دابەش دەکرد، ئێمەش داوای وڵاخی سواریمان لێ کرد، ئەویش سوێندی خوارد سوارمان نەکات [1] و فەرمووی: ((هیچم (وڵاخم) لانیە سواریانتان بکەم))، لە پاشان وشتری تاڵانییان هێنا خزمەتی جا فەرمووی: ((ئەشعەرییەکان کوان؟ ئەشعەرییەکان کوان؟)) ئەبو مووسا وتی: جا پێنج وشتری کۆپارە بەرزی پێدراین، ئینجا کە گەڕاینەوە زۆرمان پێنەچوو وتم بەهاوڕێکانم: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندەکەی لەبیر چوو، دەی سوێند بەخوا سوێندەکەمان نەخستەوە بیری پێغەمبەری ﷺ هەرگیز سەرکەوتوو نابین، بۆیە گەڕاینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە داوای وڵاخی سواریمان لە تۆ کرد، تۆش سوێندت خوارد کە سوارمان نەکەیت، جا ئێمە گومانمان برد کە جەنابت سوێندەکەت لە بیر چووەتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دڵنیابن خوا ئێوەی سوار کردوە، وڵلاهی من - ئەگەر خوا بیەوێ - هیچ سوێندێك ناخۆم غەیر ئەو شتە بەچاکتر بزانم، ئیللا ئەو شتەی چاکە دەیکەم و کەفارەتی سوێندەکەم ئەدەم)).

---

(١) وڵاخی سواریمان نەداتێ.

## ٢٧- بابُ لُحُومِ الْخَيْلِ

٥٥١٩- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَسًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَكَلْنَاهُ[1].

## ٢٧- باسی (حوکمی) گۆشتی ئەسپ و مایین

**٥٥١٩- ئەسما رضي الله عنها دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مایینێکمان[2] سەربڕی و گۆشتەکەیمان خوارد.**

٥٥٢٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَرَخَّصَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ[3].

**٥٥٢٠- جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا ڕێگری کرد لە (خواردنی) گۆشتی کەری (ماڵی) و ڕێگەیدا (بە خواردنی گۆشتی) ئەسپ و مایین.**

## ٢٨- بابُ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ

فِيهِ: سَلَمَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٥٢١- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَالِمٍ وَنَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٥٥١٠.

(٢) فرس: بە ئەسپ و مایین دەوترێت.

## ٢٨- باسی (حەرامێتی خواردنی) گۆشتی گوێدرێژی ماڵی

**لەم باسەدا فەرموودەیەك هەیە كە سەلەمە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٥٥٢١-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە كرد.**

٥٥٢٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. تَابَعَهُ ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ. وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ: عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَالِمٍ[٢].

**٥٥٢٢ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە كرد.**
**-عەبدوڵڵای كوڕی موبارەك لە عوبەیدوڵڵاوە لە نافیعەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی یەحیای قەتتانی دەكات.**
**-ئەبوئوسامە دەڵێ: لە عوبەیدوڵڵاوە لە سالیمەوە فەرموودەكەی یەحیا دەگێڕێتەوە.**

٥٥٢٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ وَالْحَسَنِ ابْنَيْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِمَا، عَنْ عَلِيٍّ - ﷺ - قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُتْعَةِ عَامَ خَيْبَرَ وَلُحُومِ حُمُرِ الإِنْسِيَّةِ[٣].

**٥٥٢٣- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی (غەزای) خەیبەردا مارەبڕینی كاتی قەدەغە كرد، هەروەها گۆشتی گوێدرێژی ماڵیشی قەدەغە كرد.**

---

(١) بڕوانە: ٨٥٣.
(٢) بڕوانە: ٨٥٣.

٥٥٢٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ:

نَهَى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَرَخَّصَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ[1].

**٥٥٢٤- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا ڕێگری كرد لە (خواردنی) گۆشتی كەری (ماڵی) و ڕێگەیدا (بە خواردنی) گۆشتی ئەسپ و مایین.**

٥٥٢٥- ٥٥٢٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَدِيٌّ، عَنِ الْبَرَاءِ وَابْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالاَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ[2].

**٥٥٢٥-٥٥٢٦- بەڕاو و ئیبنو ئەبی ئەوفا ﷺ هەردووكیان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كرد لە (خواردنی) گۆشتی گوێدرێژی ماڵی.**

٥٥٢٧- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا إِدْرِيسَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا ثَعْلَبَةَ قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. تَابَعَهُ الزُّبَيْدِيُّ وَعُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ. وَقَالَ مَالِكٌ وَمَعْمَرٌ وَالْمَاجِشُونُ وَيُونُسُ وَابْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ.

**٥٢٢٧- ئەبو سەعلەبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڕام كرد.**

**-زوبەیدیی و عوقەیل ئەم فەرموودەیان لە ئیبنو شیهابەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی صاڵحی كوڕی كەیسان دەكەن.**

---

(١) بڕوانە: ٤٢١٩.

(٢) بڕوانە: ٤٢٢١، ٣١٥٥.

-مالیك و مەعمەر و ماجیشون و یونس و ئیبنو ئیسحاق هەموویان لە زوهریەوە دەیگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەرچی دڕندەی جنگۆڵدارە قەدەغەی کرد.

٥٥٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ الثَّقَفِيُّ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُكِلَتِ الْحُمُرُ، ثُمَّ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُكِلَتِ الْحُمُرُ. ثُمَّ جَاءَهُ جَاءٍ فَقَالَ: أُفْنِيَتِ الْحُمُرُ. فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى فِي النَّاسِ: إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ. فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِاللَّحْمِ[1].

٥٥٢٨-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێك هاتە خزمەتی وتی: گوێدرێژیەکان خوران، پاشان کەسێکی تر هاتە خزمەتی وتی گوێدرێژەکان خوران، لە پاشان کەسێکی تر هاتە خزمەتی وتی: گوێدرێژەکان کۆتاییان هات و تەواو بوون، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی کرد کەسێك لە ناو خەڵکەکەدا جاڕ بدات و بڵێ: ((بێگومان خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕێگریتان لێ دەکەن لە (خواردنی) گۆشتی گوێدرێژیماڵی، چونکە بەدڵنیاییەوە پیسە))، جا مەنجەڵەکان قەڵپ کرانەوە لە کاتێکدا (مەنجەڵەکان) کوڵیان دەدا بەو گۆشتانەوەی لە ناویاندا بوو.

٥٥٢٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ زَيْدٍ: يَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ حُمُرِ الأَهْلِيَّةِ، فَقَالَ: قَدْ كَانَ يَقُولُ ذَاكَ الْحَكَمُ بْنُ عَمْرٍو الْغِفَارِيُّ عِنْدَنَا بِالْبَصْرَةِ، وَلَكِنْ أَبَى ذَاكَ الْبَحْرُ ابْنُ عَبَّاسٍ وَقَرَأَ: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام.

---

(١) بڕوانە: ٣٧١.

٥٥٢٩- عەمر دەڵێ: بە جابیری کوڕی زەیدم وت: دەڵێن کە پێغەمبەری خوا ﷺ (خواردنی گۆشتی) گوێدرێژی ماڵی قەدەغە کردوە؟ جابیریش وتی: بێگومان پێشتریش حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری لای ئێمە لەبەصرە ئەو قسەی دەکرد، بەڵام زانای هەرەگەورە ئیبنو عەبباس پێی ڕازی نییە، وە (ئیبنو عەبباس) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ( (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ دەستم ناکەوێ لەوەی کە سروش کراوە بۆم هیچ حەرام کراوێك)[1].

## ٢٩- بَابُ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ

٥٥٣٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيِّ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ. تَابَعَهُ يُونُسُ وَمَعْمَرٌ وَابْنُ عُيَيْنَةَ وَالْمَاجِشُونُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[2].

## ٢٩- باسی حەرامێتی خواردنی (گۆشتی) هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار

٥٥٣٠-ئەبو ئیدریسی خەولانی لە ئەبی سەعلەبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە (خواردنی گۆشتی) هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار.

-یونس و مەعمەر و ئیبنو عویەینە و ماجیشون لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی مالیك دەکەن.

(١) ئەم ئایەتەی خوێندەوە وەک بەڵگە بۆ وتەکەی خۆی.
(٢) بڕوانە: ٥٧٨٠، ٥٧٨١.

## ٣٠- بابُ جُلُودِ الْمَيْتَةِ

٥٥٣١- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِشَاةٍ مَيِّتَةٍ فَقَالَ: «هَلاَّ اسْتَمْتَعْتُمْ بِإِهَابِهَا؟». قَالُوا: إِنَّهَا مَيِّتَةٌ. قَالَ: «إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا»[1].

## ٣٠- باسی (حوکمی) پێستی مردارەوە بووان (پێش خۆشەکردنی)

**٥٥٣١-ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە کە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕایەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای مەڕێکی مردارەوە بوودا و فەرمووی: ((ئەوە بۆ سوودتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟)) وتیان: چونکە مردارەوە بووە، فەرمووی: ((بێگومان خواردنی حەرام کراوە)).**

٥٥٣٢- حَدَّثَنَا خَطَّابُ بْنُ عُثْمَانَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حِمْيَرَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ عَجْلاَنَ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِعَنْزٍ مَيْتَةٍ فَقَالَ: «مَا على أَهْلِهَا لَوِ انْتَفَعُوا بِإِهَابِهَا»[2].

**٥٥٣٢-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای بزنێکی مردارەوە بوودا، جا فەرمووی: ((خاوەنەکەی هیچ زیانێکیان لەسەر نەبوو ئەگەر سوودیان لە پێستەکەی وەربگرتایە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٩٢.

(٢) بڕوانە: ١٤٩٢.

## ٣١- بابُ الْمِسْكِ

٥٥٣٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، عَنْ عَبْدِ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا عُمَارَةُ بْنُ الْقَعْقَاعِ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مَكْلُومٍ يُكْلَمُ فِي اللَّهِ إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَكَلْمُهُ يَدْمَى، اللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ مِسْكٍ»[١].

## ٣١- باسی (حوکمی) میسک

**٥٥٣٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر برینداریێك لە ڕێی خوادا بریندار دەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و برینەکەی خوێنی لێ دێت، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنیشی بۆنی میسکە)).**

٥٥٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ جَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً»[٢].

**٥٥٣٤- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((نموونەی هاوڕێ و هاودەمی[٣] چاك و خراپ، وەکو میسك فرۆش و موشەدەمە[٤] وان، جامیسك فرۆش یان بەشت دەدات یان لێی دەکڕیت، یان بۆنێکی خۆشی لێوە هەست پێ دەکەیت[٥]، موشەدەمەکەش: یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنێکی ناخۆش دێت بەسەرتدا و هەستی پێ دەکەیت)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٧.

(٢) بڕوانە: ٢١٠١.

(٣) جلیس: بەمانای هاونیشین واتە: دووکەس کە پێکەوە دادەنیشن و هاوڕێی یەکترن.

(٤) موشەدەمە: دەمەی ئاسنگەر، ئامێرێکە ئاسنکە خەڵوزو ئاگری پێ گەشدەکاتەوە بۆ سورکردنەوەی ئاسن. بڕوانە: فەرهەنگی خاڵ: ٥٦٣.

(٥) بۆنی خۆشی دێت بەسەرتدا.

## ٣٢- بابُ الأَرْنَبِ

٥٥٣٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا وَنَحْنُ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا، فَأَخَذْتُهَا فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِوَرِكَيْهَا -أَوْ قَالَ بِفَخِذَيْهَا- إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَبِلَهَا[١].

## ٣٢- باسی کەروێشک [٢]

**٥٥٣٥-ئەنەس ﷺ دەڵێ: کەروێشکێکمان هەڵساند و ڕاونا لە کاتێکدا ئێمە لە مەڕی زەهران بووین، ئینجا خەڵکەکە ڕایان کرد بە دوایدا و ماندوو بوون، پاشان من (ڕامە کرد) و گرتم و بردم بۆ ئەبو تەڵحە، ئەویش سەری بڕی هەردوو نەرمە ڕانەکەی- یان دوو ڕانەکەی- نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش قەبوڵی کرد.**

## ٣٣- بابُ الضَّبِّ

٥٥٣٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الضَّبُّ لَسْتُ آكُلُهُ وَلاَ أُحَرِّمُهُ».

## ٣٣- باسی بزن مژە[٣]

**٥٥٣٦-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( (گۆشتی) بزن مژە ناخۆم و حەرامیشی ناکەم)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٥٧٢.
(٢) خواردنی حەڵاڵە.
(٣) خواردنی حەڵاڵە.

٥٥٣٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَيْتَ مَيْمُونَةَ، فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، فَقَالَ بَعْضُ النِّسْوَةِ: أَخْبِرُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ. فَقَالُوا: هُوَ ضَبٌّ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَرَفَعَ يَدَهُ، فَقُلْتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «لاَ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ». قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ[1].

**٥٥٣٧-ئیبنو عەبباس ﵄ لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە ﵁ دەگێڕێتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ چوونە ماڵی مەیموونە، جا بزن مژەیەکی برژاو هێنرا، پێغەمبەریش ﷺ دەستی برد بۆی، جا یەکێك لە ژنەکان وتی: پێغەمبەری خوا ئاگادار بکەن بەوەی کە دەیەوێت بیخوات، ئینجا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بزن مژەیە [2]، ئیتر دەستی کێشایەوە (خالید دەڵێ) منیش وتم: ئایا حەرامە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: ((نەخێر (حەرام نییە) بەڵام لە خاکی قەومەکەی مندا نییە، بۆیە دەبینم دڵم ناچێتە سەری))، خالید وتی: منیش لەتم کرد و خواردم پێغەمبەری خواش ﷺ سەیری دەکرد.**

## ٣٤- بابٌ إِذَا وَقَعَتِ الْفَأْرَةُ فِي السَّمْنِ الْجَامِدِ أَوِ الذَّائِبِ

٥٥٣٨- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يُحَدِّثُهُ، عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ فَأْرَةً وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ فَمَاتَتْ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهَا، فَقَالَ: «أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، وَكُلُوهُ». قِيلَ لِسُفْيَانَ: فَإِنَّ مَعْمَرًا يُحَدِّثُهُ عَنِ

---

(١) بڕوانە: ٥٣٩١.

(٢) کەبۆت دانراوە بیخۆیت.

الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. قَالَ: مَا سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ إِلاَّ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَقَدْ سَمِعْتُهُ مِنْهُ مِرَارًا[1].

## ٣٤- باسێک: ئەگەر مشک کەوتە ڕۆنێکی بەستوو یان تواوەوە [2]

**٥٥٣٨-عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە دەگێڕێتەوە کە لە ئیبنو عەبباسی ﷺ بیستووە و لە مەیمونەوە بۆی دەگێڕایەوە: کە مشکێك کەوتە ڕۆنێکەوە و تۆپی (تێیدا)، جا لەم بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا، ئەویش فەرمووی: ((مشکەکە و چوار دەور فڕێ بدەن و ڕۆنەکە بخۆن)).**

**بە سوفیان وترا: بێگومان مەعمەر ئەم فەرموودەیە لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ. سوفیان وتی: من هەر بەم شێوەیە بیستوومە: زوهری دەڵێ لە عوبەیدوڵلاوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ لە مەیموونەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە سوێند بەخوا چەندین جار بەو شێوەیە لە زوهریم بیستووە.**

٥٥٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنِ الدَّابَّةِ تَمُوتُ فِي الزَّيْتِ وَالسَّمْنِ وَهْوَ جَامِدٌ أَوْ غَيْرُ جَامِدٍ، الْفَأْرَةِ أَوْ غَيْرِهَا، قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِفَأْرَةٍ مَاتَتْ فِي سَمْنٍ، فَأَمَرَ بِمَا قَرُبَ مِنْهَا فَطُرِحَ، ثُمَّ أُكِلَ، عَنْ حَدِيثِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ[3].

**٥٥٣٩-یونس لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی (حوکمی) گیاندارێك بمرێت لە ناو زەیت و ڕۆندا بەستوو و ڕەق بێت یان بەستوو نەبێت، مشك یان گیاندارێکی تر بێت، (زوهری) وتی: پێمان گەشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

(١) بروانە: ٢٣٥.

(٢) حوکمی چییە و چۆنە؟.

(٣) بروانە: ٢٣٥.

فەرمانی كرد ئەگەر مشك لە ناو ڕۆن (ی بەستو)دا تۆپی، فەرمانی كرد مشكەكە و ئەوەی نزیكە لێوەی فڕێ دراوە، پاشان ڕۆنەكە خوراوە، ئەمە لەو فەرموودەی عوبەیدوڵلای كوڕی عەبدوڵلاوە (پێمان گەشتووە).

٥٥٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂ قَالَتْ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: «أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، وَكُلُوهُ»[1].

٥٥٤٠-ئیبنو عەبباس لە مەیموونەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا دەربارەی مشكێك بكەوێتە ناو ڕۆنەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((مشكەكە و ئەو ڕۆنەی بەدەوری دایە فڕێی بدەن و ڕۆنەكە بخۆن)).

## ٣٥- بابُ الْوَسْمِ وَالْعَلَمِ فِي الصُّورَةِ

٥٥٤١- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ حَنْظَلَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ تُعْلَمَ الصُّورَةُ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُضْرَبَ. تَابَعَهُ قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا الْعَنْقَزِيُّ، عَنْ حَنْظَلَةَ وَقَالَ: تُضْرَبُ الصُّورَةُ.

## ٣٥- باسی داخ كردن و نیشانە دار كردن لە دەموچاوی ئاژەڵدا (حەرامە)

٥٥٤١-سالیم لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ دەگێڕێتەوە كە ئیبنو عومەر لای نا پەسەند بوو دەم و چاوی ئاژەڵ داخ بكرێ و نیشانە بكرێ، وە ئیبنو عومەر دەیوت: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردوە لەوەی بدرێ (لە ئاژەڵ).

---

(١) بروانە: ٢٣٥.

-قوتەیبە دەڵێ: عەنقەزیی بۆی گێڕاینەوە لە حەنزەلەوە (لە سالیمەوە لە ئیبنو عومەرەوە) وتی: لە دەم و چاوی ( ئاژەڵ) بدرێ. بەم گێڕانەوە پاڵپشتی عوبەیدوڵڵای کوڕی مووسا دەکات.

٥٥٤٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِأَخٍ لِي يُحَنِّكُهُ وَهْوَ فِي مِرْبَدٍ لَهُ، فَرَأَيْتُهُ يَسِمُ شَاةً حَسِبْتُهُ قَالَ: فِي آذَانِهَا[1].

٥٥٤٢-ئەنەس ﷺ دەڵێ: برایەکم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی (ناوی بنێت و) شیرینی بێنێت بە مەلاشوویدا، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لە شوێنی موڵی وشترەکاندا بوو کە هی خۆی بوو، بینیم مەڕێکی داخ دەکرد.

- (شوعەیب دەڵێ) وابزانم (هیشام وتی: (داخ کردنەکە) لە گوێیەکانیاندا بوو.

## ٣٦- بابٌ: إِذَا أَصَابَ قَوْمٌ غَنِيمَةً فَذَبَحَ بَعْضُهُمْ غَنَمًا أَوْ إِبِلاً بِغَيْرِ أَمْرِ أَصْحَابِهِمْ، لَمْ تُؤْكَلْ، لِحَدِيثِ رَافِعٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

وَقَالَ طَاوُسٌ وَعِكْرِمَةُ فِي ذَبِيحَةِ السَّارِقِ: اطْرَحُوهُ.

٥٥٤٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّنَا نَلْقَى الْعَدُوَّ غَدًا، وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى. فَقَالَ: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلُوا، مَا لَمْ يَكُنْ سِنٌّ وَلاَ ظُفُرٌ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفْرُ فَمُدى الْحَبَشَةِ». وَتَقَدَّمَ سَرَعَانُ النَّاسِ فَأَصَابُوا مِنَ الْغَنَائِمِ وَالنَّبِيُّ ﷺ فِي آخِرِ النَّاسِ، فَنَصَبُوا قُدُورًا، فَأَمَرَ بِهَا فَأُكْفِئَتْ، وَقَسَمَ بَيْنَهُمْ وَعَدَلَ بَعِيرًا بِعَشْرِ شِيَاهٍ، ثُمَّ نَدَّ بَعِيرٌ مِنْ أَوَائِلِ الْقَوْمِ، وَلَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ خَيْلٌ، فَرَمَاهُ

---

(١) بڕوانە: ١٥٠٢.

رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ. فَقَالَ: «إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا فَعَلَ مِنْهَا هَذَا، فَافْعَلُوا مِثْلَ هَذَا»[1].

## ٣٦- باسێک: ئەگەر کەسانێک دەستکەوتیان گرت، ئینجا هەندێکیان بە بێ فەرمانی خاوەنەکانیان مەڕ و وشتریان سەربڕی، ناخورێـت، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ڕافیع کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە

**-تاووس و عیکریمە دەربارە سەربڕاوی دز دەڵێن: فڕێی بدەن [2].**

**٥٥٤٣-ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: وتم بە پێغەمبەر ﷺ ئێمە سبەی بە دوژمن دەگەین چەقۆمان پێ نییە، ئەویش فەرمووی: ((هەرچی خوێن فیشقە پێ بکات و ناوی خوای لێ هێنرابێ بیخۆ، بە مەرجێ ددان و نینۆك نەبێت، وە باسی ئەو شتانەتان بۆدەکەم سەبارەت بە ددان ئێسقانە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشەییەکانە))، جا ئەو خەڵکانەی خێرا بوون پێشکەوتن و دەستکەوتیان دەستگیر بوو، پێغەمبەریش ﷺ لە کۆتایی خەڵکەکەدا بوو، ئینجا مەنجەڵیان نابوویە سەر (و گۆشتی تیابوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد قەڵپ کرانەوە و دەست کەوتەکانی دابەش کرد لە نێوانیاندا وشترێکی بە دە سەرمەڕ دادەنا، پاشان وشترێك ڕایکرد و یاخی بوو لە لای ئەوانەی لە پێشەوە بوون و ئەوان ئەسپیان پێ نەبوو، جا پیاوێك تیرێکی تێ گرت و خوا (بەهۆی ئەوتیرەوە) ڕایگرت، پێغەمبەریش فەرمووی((بێگومان ئەم وشتر و ئاژەڵانە هەیانە یاخی دەبێت هەروەك یاخی بوونی کێوییەکان، جا هەر یەکێکیان ئاوەهای کرد ئێوەش ئا بەو جۆرەی لێ بکەن)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٨٨.

(٢) واتە: گۆشتی ئەو سەربڕاوە کە دزێک سەری بڕیوە ناخورێت.

## ٣٧- بَابٌ إِذَا نَدَّ بَعِيرٌ لِقَوْمٍ فَرَمَاهُ بَعْضُهُمْ بِسَهْمٍ فَقَتَلَهُ فَأَرَادَ إِصْلاَحَهُمْ فَهُوَ جَائِزٌ

لِخَبَرِ رَافِعٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

٥٥٤٤- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عُمَرُ بْنُ عُبَيْدٍ الطَّنَافِسِيُّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَنَدَّ بَعِيرٌ مِنَ الإِبِلِ -قَالَ:- فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ لَهَا أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَكُونُ فِي الْمَغَازِي وَالأَسْفَارِ، فَنُرِيدُ أَنْ نَذْبَحَ فَلاَ تَكُونُ مُدًى. قَالَ: «أَرِنْ، مَا نَهَرَ -أَوْ أَنْهَرَ- الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ فَكُلْ، غَيْرَ السِّنِّ وَالظُّفُرِ، فَإِنَّ السِّنَّ عَظْمٌ، وَالظُّفُرَ مُدَى الْحَبَشَةِ»[1].

## ٣٧- باسێک: ئەگەر وشتری کەسانێک یاخی بوو، جا کەسێکیان تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی، بەو کارە چاکەیان ویستووە، ئەوە دروستە

**بەبەڵگەی ئەو فەرموودەی رافیع کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە.**

**٥٥٤٤- عەبایەی کوڕی ڕیفاعە لەڕافیعی کوڕی خەدیجی باپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، وشترێك لە وشترەکان یاخی بوو، دەڵێ ئینجا پیاوێك تیرێکی تێ گرت و وشکی کرد و ڕایگرت، دەڵێ: پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((بێگومان ئەم (وشتر)انە یاخی بوونیان هەیە وەك یاخی بوونی کێویەکان، جا هەر کامیان لێتان یاخی بوو ئێوەش ئاوەها لەگەڵدا بکەن))، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە جاری وا**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٨٨.

هەیە لە غەزا و سەفەردا دەبین و دەمانەوێ ئاژەڵێك سەربڕین چەقۆ نییە، فەرمووی: ((دەستت سوك بكە ئەوەی خوێن لێ بێنێ- یان فیشقەی پێ بكات – و ناوی خواشی لێ هێنرابێ ئەوە بیخۆ، ددان و نینۆك نەبێت، چونكە بێگومان ددان ئێسقانە و نینۆكیش چەقۆی حەبەشەییەكان)).

## ٣٨- بابُ أَكْلِ الْمُضْطَرِّ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ ﴿١٧٣﴾ ﴾ البقرة. وَقَالَ: ﴿ فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ ۙ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة. وَقَوْلِهِ: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ الأنعام. ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مُهْرَاقًا.

﴿ أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ ﴿١٤٥﴾ ﴾ إلى قوله: ﴿ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام. وَقَالَ: ﴿ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٨٨﴾ ﴾ المائدة، الآية.

# ٣٨- باسی ناچار خواردنی (مردارەوە بووی بۆ دروستە)

بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو كەسانەی كە بڕواتان هێناوە، لەو خواردەمەنییە پاكانەی كردوومانە بە ڕۆزیتان بخۆن، وە سوپاسی خوا بكەن ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرەستن، ئەوەی (كە خوا) قەدەغەی كردوە لێتان تەنها مردارەوە بووو خوێن (ی ڕەوان) و گۆشتی بەراز و ئەوەی كەسەر بڕا بێ بەناوی غەیری خواوە، ئینجا هەر كەسێك ناچار بوو (بەخواردنی یەكێك لەمانە) بەبێ یاخی بوون و دەرچوون لە سنوور، ئەوە هیچ گوناهێكی لەسەر نییە).

وە فەرموویەتی: (جا هەر كەس ناچار بوو لە برسیەتیدا بێ ئەوەی نیەتی گوناهكردنی هەبێ)، وە ئەم فەرمایشتەی خوا (دەبخۆن لەو (سەربڕاو)ـەی كە ناوی خوای لەسەر هێنراوە، ئەگەر ئێوە بە ئایەتەكانی خوا بڕوادارن، بۆچی ئێوە لە (گۆشتی) ئەو (ئاژەڵان)ـەی كە ناوی خوای لەسەر هێنراوە (لە كاتی سەربڕیندا) ناخۆن؟ كە بێگومان خوا ئەوەی حەرامی كردوە لەسەرتان بۆتانی ڕوون كردۆتەوە، جگە لەوەی كە ناچار دەبن بۆی (كە بیخۆن)، بەڕاستی زۆر كەس خەڵكی گومڕا دەكەن بە هەوا و ئارەزووی خۆیان بە بێ هیچ زانیارییەك (كە لە خواوە وەرگیرابێ)، بێگومان پەروەردگارت دەست درێژكاران و سەركەشان چاك دەناسێ).

وە دەفەرموێ: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ لەوەی كە سروشت كراوە بۆم هیچ خۆراكێك حەرام كراوم دەست ناكەوێ كەسێ (بیەوێ) بیخوات، مەگەر مردارەوە بوو بێ، یا خوێنی ڕژێنراو یا گۆشتی بەراز، چونكە بێگومان ئەوە پیسە یان سەربڕاوێك بێ (كاتی سەربڕین) ناوی غەیری خوای لەسەر برابێ، جا هەر كەس ناچار بوو (كە ئەو حەرامانە بخوات) زیاد لە پێویست نەخوات و

مەبەستی سنوور بەزاندن نەبێ، ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی میهرەبانە).

وەفەرمووی: (جا لەو بژێویەی خوا پێی بەخشیوون بخۆن كە حەڵاڵ و پاكە و سوپاسی چاكە و نیعمەتی خوا بكەن، ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن، بێگومان (خوا) تەنها مردارەوە بوو و خوێن وگۆشتی بەراز و ئەوەی (كە سەربڕاوە و) ناوی غەیر خوای لێ هێنراوە حەرامی كردوە لێتان، بەڵام هەر كەسێك ناچار بوو (لەو حەرامانە بخوات) بێ دەست درێژی و زیادە ڕەوی، ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٧٣- كِتابُ الأضاحي

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٣- پەڕاوی قوربانی

## ١- باب سُنَّةِ الأُضْحِيَّةِ

وَقَالَ ابن عُمَرَ ﷺ: هِيَ سُنَّةٌ وَمَعْرُوفٌ.

٥٥٤٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ زُبَيْدٍ الإِيَامِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، مَنْ فَعَلَهُ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلُ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ». فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ -وَقَدْ ذَبَحَ- فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي جَذَعَةً. فَقَالَ: «اذْبَحْهَا وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ». قَالَ مُطَرِّفٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنِ الْبَرَاءِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ تَمَّ نُسُكُهُ وَأَصَابَ سُنَّةَ الْمُسْلِمِينَ»[١].

## ١- باسی سوننەت بوونی قوربانی

**-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: قوربانی سوننەتە و زانراوە (لە ناو خەڵكدا)[٢].**

**٥٥٤٥-بەرائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان یەكەم شتێك لەم ڕۆژەماندا كە بەو دەست پێ دەكەین نوێژ دەكەین، پاشان دەگەڕێنەوە (بۆ**

---

(١) بڕوانە: ٩٥١.

(٢) كەس ناڵێ لە ئیسلامدا نییە یان دژی بوونی وەستابێتەوە.

**ماڵەوە) و قوربانیەکە سەر دەبڕین، جا هەر کەس (بەو جۆرەی) کرد، ئەوە بێگومان سوننەتی ئێمەی جێ بەجێ کردوە، هەر کەسیش پێش (نوێژی جەژن) سەری بڕیبێ ئەوە بێگومان گۆشتێکە و داوێتی بەخێزانەکەی خۆی، هیچ پەیوەندی بە قوربانیەوە نییە))، ئەوسا ئەبو بوردەی کوڕی نیار هەستایە سەرپێ - کە ئاژەڵەکەی سەربڕی بوو- وتی: بێگومان من چتیرێکم هەیە (لە مەڕێك چاکترە)[1]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەری ببڕە، لە پاش تۆ بۆ هیچ کەس دروست نییە)).**

**-موتەڕیف لە عامیرەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە بەڕائە و ﷺ دەڵێ: پێغەمبە ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس پاش نوێژی جەژن قوربانی سەربڕێ، ئەوە سەربڕینەکەی تەواوە و سوننەتی مسوڵمانانی پێکاوە و بەجێی هێناوە)).**

٥٥٤٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّمَا ذَبَحَ لِنَفْسِهِ، وَمَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَدْ تَمَّ نُسُكُهُ وَأَصَابَ سُنَّةَ الْمُسْلِمِينَ»[2].

**٥٥٤٦-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك پێش نوێژ (ی جەژن) قوربانیەکەی سەربڕیبێ، ئەوە بێگومان بۆخۆیی سەربڕیوە، هەر کەسێکیش دوای نوێژ (ی جەژن) سەری بڕیبێ، ئەوە بێگومان قوربانیەکەی تەواوە، وە سوونەتی مسوڵمانانی بەجێهێنا و پێکاوێتی)).**

## ٢- بابُ قِسْمَةِ الإِمَامِ الأَضَاحِيَّ بَيْنَ النَّاسِ

٥٥٤٧- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ بَعْجَةَ الْجُهَنِيِّ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَصْحَابِهِ ضَحَايَا، فَصَارَتْ لِعُقْبَةَ جَذَعَةٌ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَارَتْ جَذَعَةٌ. فقال: «ضَحِّ بِهَا»[1].

---

(١) ئەوەی نێوان دوو قەوسەکە لە گێڕانەوەیەکی تردا لە بوخاریدا هاتووە بە ژمارە (٩٦٥).

(٢) بڕوانە: ٩٥٤.

## ٢- باسی پێشەوا بۆ خۆی [٢] قوربانیەکانیەکان دابەش بکات لە نێوان خەڵکیدا

**٥٥٤٧-بەعجەی جوهەنی لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ لە نێوان هاوەڵانیدا چەند ئاژەڵێکی قوربانی دابەش کرد، جا چتیرێك بوو بەشی عوقبە، (عوقبە دەڵێ) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چتیرێك بەر من کەوتووە؟ فەرمووی: (بیکەرە قوربانی)).**

## ٣- بابُ الأُضْحِيَّةِ لِلْمُسَافِرِ وَالنِّسَاءِ

٥٥٤٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَحَاضَتْ بِسَرِفَ قَبْلَ أَنْ تَدْخُلَ مَكَّةَ وَهْيَ تَبْكِي، فَقَالَ: «مَا لَكِ؟ أَنَفِسْتِ؟». قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: «إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ». فَلَمَّا كُنَّا بِمِنًى أُتِيتُ بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَزْوَاجِهِ بِالْبَقَرِ[٣].

## ٣- باسی (حوکمی) قوربانی بۆ ڕێبوار و ژنان

**٥٥٤٨-عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای - لە سەریف کەوتبوویە حەیزەوە پێش ئەوە بڕواتە ناو مەککە-لەو کاتەدا دەگریا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((کەوتوویتە حەیزەوە؟)) وتی: بەڵێ،**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٠٠.

(٢) یان بە فەرمانی ئەو دابەش کرێت، وە لە فەرموودەکەد دەبینرێت.

(٣) بڕوانە: ٢٩٤.

**فەرمووی: ((بێگومان ئەمە شتێکە خوا بۆ ئافرەتانی داناوە، جا حاجی چی دەکات تۆش بیکە تەنها تەوافی کەعبە مەکە))، ئینجا کاتێ کە لە مینا بووین، گۆشتی مانگایان بۆ هێنام، منیش وتم: ئەمە چییە؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگای کردوە بە قوربانی بۆ خێزانەکانی))** [1].

## ٤- بَابُ مَا يُشْتَهَى مِنَ اللَّحْمِ يَوْمَ النَّحْرِ

٥٥٤٩- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ: «مَنْ كَانَ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَلْيُعِدْ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ -وَذَكَرَ جِيرَانَهُ- وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ. فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَلاَ أَدْرِي أَبَلَغَتِ الرُّخْصَةُ مَنْ سِوَاهُ أَمْ لاَ، ثُمَّ انْكَفَأَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى كَبْشَيْنِ فَذَبَحَهُمَا، وَقَامَ النَّاسُ إِلَى غُنَيْمَةٍ فَتَوَزَّعُوهَا. أَوْ قَالَ: فَتَجَزَّعُوهَا[2].

## ٤- باسی ئەو گۆشتەی لە ڕۆژی جەژنی قورباندا حەزی لێ بکرێ

**٥٥٤٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربانیدا فەرمووی: ((هەر کەسێك پێش نوێژ (ی جەژن) ئاژەڵی سەربڕیوە با دووبارەی بکاتەوە))**[3]**، پیاوێك هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکە حەز لە گۆشت دەکرێ- وە باسی (پێویستی) دراوسێکانی کرد-، چتیرێکم هەیە لەدوو مەڕی گۆشتن چاکترە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی ئەوەی دا**[4]،

---

(١) واتە بەمۆڵەتی خێزانەکانی چونکە نابێ قوربانی بکەیت بۆ کەسێک ئاگادار نەبێت، ئەو قسەی عائیشە ﷺ وا ناگەینێت کە ئەو ڕێگەی نەداوە پێغەمبەر ﷺ قوربانی بۆ بکات، بەڵکو نەیزانیوە قوربانیەکەی هی کێیە.

(٢) بڕوانە: ٩٥٤.

(٣) ئاژەڵێکی تر سەر ببڕێت.

(٤) چێرەکە بکات بەقوربانی کە لە بنەڕەتدا نابێ و دروست نیە قوربانی کردن بە چێر چونکە تەمەنی کەمە.

**جانازانم ئەم ڕێگە پێدانە گەشتۆتە خەڵکی تر جگە لەو یا نا، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای دوو بەرانەکە و سەری بڕین، خەڵکیش ڕۆشتن بۆ لای مەڕێکی بچووك و بەپشك لە نێوانیاندا بەشیان کرد، یان وتی: دابەشیان کرد لە نێوانیاندا[1]**

## ٥- بابُ مَنْ قالَ: الأَضْحَى يَوْمَ النَّحْرِ

٥٥٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الزَّمَانُ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ، أَيُّ شَهْرٍ هَذَا». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: «أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ؟». قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: «أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ؟». قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: «أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ؟». قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ -قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَأَعْرَاضَكُمْ- عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، أَلاَ فَلاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلاَّلاً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يَبْلُغُهُ أَنْ يَكُونَ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ- وَكَانَ مُحَمَّدٌ إِذَا ذَكَرَهُ قَالَ: صَدَقَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: - أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟ أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟»[2].

---

(١) ئەو دوو ووشەیە: (فَتَوَزَّعُوهَا) (فَتَجَزَّعُوهَا)هەردوکیان بەمانای دابەشکردنیەتی بە پشك بەزیندووی نەك بەسەربڕاوی.

(٢) بڕوانە: ٦٧.

# ٥- باسی ئەو کەسەی کە دەڵێ: قوربانی کردن تەنها لە ڕۆژی (یەکەمی) جەژن دایە

٥٥٥٠- ئەبو بەکرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((بێگومان چەرخ و زەمانە سوڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی لەو ڕۆژدا کە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، ساڵ دوانزە مانگە، چواریان مانگی حەرامن [١] سیانیان بەدوای یەکتردا دێن، (کەئەمانەن): زولقەعدە و زولحیجە و موحەڕەم و ڕەجەبی موزەڕ کە لە نێوان جومادی دووەم و شەعبان دایە، ئەم مانگە چ مانگێکە؟)) وتمان خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، جا بێدەنگ بوو هەتا گومانمان وابوو بەناوێکی تر جگەلە ناوەکەی خۆی ناوی دەبات، فەرمووی: ((ئایا زولحیجە نییە؟)) وتمان بەڵێ، فەرمووی: ((ئەی ئەمە چ شارێکە؟)) وتمان خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، ئەنجا بێدەنگ بوو تاوامان زانی کە بەناوێکی تر ناوی دەبات جگەلە ناوەکەی خۆی، فەرمووی: ئایا شارەکە (ی مەککە) نییە))، وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەم ڕوژە چ ڕۆژێکە؟)) وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، جا بێدەنگ بوو هەتا گومانمان وابوو کە ناوی دەبات بەغەیری ناوەکەی خۆی، فەرمووی: ((ئەمڕۆ جەژنی قوربان نییە؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((جا بێگومان خوێنتان وماڵ و سامانتان)).

موحەمەد وتی: وابزانم فەمووی: ناموستان- لە یەکتر حەرامە وەك حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان لەم شارتانەدا، وە لەم مانگەتاندا، بێگومان (لە قیامەتدا) دەگەنەوە بەپەروەردگارتان و پرسیاری کردەوەکانتان لێ دەکات، بێدارن پاش (مردنی) من گومڕا مەبنەوە، هەندێکتان بدەن لەگەردنی هەندێکتان، بێداربن ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێ بەوەی لێرە نییە، چونکە لەوانەیە هەندێك لەوانەی پێی

---

(١) ڕێزگیراون و حەرامە نابێ جەنگیان تیا بکرێت.

دەگەیەنرێت باشتر هەڵی بگرێی و لێی تێبگات لە هەندێ لەوانەی کە بیستویەتی – وە موحەمەد (ی کوڕی سیرین) کە ئەم فەرموودەی باس بکردایە دەیوت: موحەمەد (ﷺ راستی فەرمووە- لە پاشان پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ ئایا پێم ڕاگەیاندن؟)).

## ٦- بابُ الأَضْحَى وَالْمَنْحَرِ بِالْمُصَلَّى

٥٥٥١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَنْحَرُ فِي الْمَنْحَرِ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: يَعْنِي مَنْحَرَ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٦- باسی قوربانی کردن و شوێنی سەربڕینی لە نوێژگە دەبێت

٥٥٥١-عوبەیدوڵڵا دەڵێ: نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای (کوڕی عومەر) ﷺ هەمیشە لەو جێگای قوربانی تێدا سەر دەبڕدرا قوربانی سەردەبڕی. عەبدوڵڵا ئەڵێ: مەبەستی ئەو جێگایە بوو پێغەمبەر ﷺ قوربانی تێدا سەر دەبڕی (لە نوێژگە).

٥٥٥٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ فَرْقَدٍ، عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَذْبَحُ وَيَنْحَرُ بِالْمُصَلَّى[2].

٥٥٥٢-نافیع دەگێڕێتەوە کەئیبنو عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لە نوێژگە ئاژەڵ و وشتری سەردەبڕی.

(١) بڕوانە: ٩٨٢.

(٢) بڕوانە: ٩٨٢.

## ٧- بابٌ:فِي أُضْحِيَّةِ النَّبِيِّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَيُذْكَرُ: سَمِينَيْنِ

وَقَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ بْنَ سَهْلٍ قَالَ: كُنَّا نُسَمِّنُ الأُضْحِيَّةَ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُسَمِّنُونَ.

٥٥٥٣- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ وَأَنَا أُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ[1].

## ٧- باسێک: دەربارەی قوربانی کردنی پێغەمبەر ﷺ بەدوو بەرانی شاخدار، وە دەوترێت: دوو بەرانی قەڵەو بوون

**یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلم بیست وتی: ئێمە لە مەدینەدا قوربانیمان قەڵەو دەکرد، وە جاران مسوڵمانانیش قوربانییەکانیان قەڵەو دەکرد.**

**٥٥٥٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: جاران پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی دەکردە قوربانی و منیش بەدوو بەران قوربانی دەکەم.**

٥٥٥٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ انْكَفَأَ إِلَى كَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ فَذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ.

تَابَعَهُ وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ وَحَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ عَنْ أَيُّوبَ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسٍ[2].

**٥٥٥٤-ئەبو قیلابە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ لای دوو بەرانی شاخداری ڕەش و سپی ڕەنگ، وە بەدەستی خۆی هەردووکیانی سەربڕی.**

---

(١) بڕوانە: ٥٥٥٤، ٥٥٥٨، ٥٥٦٤، ٥٥٦٥، ٧٣٩٩.

(٢) بڕوانە: ٥٥٥٣.

-وهیب لە ئەیوبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدورەحمانی کردوە.

-ئیسماعیل و حاتیمی کوڕی وەردان لە ئەیوبەوە دەڵێن و گێڕاویانەتەوە ئەویش لە ئیبنو سیرینەوە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[1].

٥٥٥٥- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْطَاهُ غَنَمًا يَقْسِمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ ضَحَايَا، فَبَقِيَ عَتُودٌ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «ضَحِّ أَنْتَ بِهِ»[2].

٥٥٥٥- ئەبولخەیر لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕانێك مەڕی پێدا تا دابەشی کات بەسەر هاوەڵانیدا وەك قوربانی، ئینجا چتیرێك مایەوە و عوقبە بۆ پێغەمبەری ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((تۆ خۆت بیکە بە قوربانی)).

## ٨- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لأَبِي بُرْدَةَ: «ضَحِّ بِالْجَذَعِ مِنَ الْمَعَزِ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»

٥٥٥٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى خَالٌ لِي يُقَالُ لَهُ: أَبُو بُرْدَةَ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عِنْدِي دَاجِنًا جَذَعَةً مِنَ الْمَعَزِ. قَالَ: «اذْبَحْهَا وَلَنْ تَصْلُحَ لِغَيْرِكَ». ثُمَّ قَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّمَا يَذْبَحُ لِنَفْسِهِ، وَمَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَدْ تَمَّ نُسُكُهُ، وَأَصَابَ سُنَّةَ الْمُسْلِمِينَ»[3].

---

(١) مەبەست گێڕانەوەی هەمان فەرموودەی: ٥٥٥٤ـە بەڵام بەم ڕێگە و ڕشتەیە.

(٢) بڕوانە: ٢٣٠٠.

(٣) بڕوانە: ٩٥١.

تَابَعَهُ عُبَيْدَةُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ وَإِبْرَاهِيمَ. وَتَابَعَهُ وَكِيعٌ، عَنْ حُرَيْثٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ. وَقَالَ عَاصِمٌ وَدَاوُدُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ: عِنْدِي عَنَاقُ لَبَنٍ. وَقَالَ زُبَيْدٌ وَفِرَاسٌ، عَنِ الشَّعْبِيِّ: عِنْدِي جَذَعَةٌ. وَقَالَ أَبُو الأَحْوَصِ: حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ: عَنَاقٌ جَذَعَةٌ. وَقَالَ ابْنُ عَوْنٍ: عَنَاقٌ جَذَعٌ، عَنَاقُ لَبَنٍ.

## ٨- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەئەبی بوردەی فەرموو: ((چتیرە بزنەکە سەربڕە بۆ قوربانی[١] وە لە پاش تۆ بۆ کەسی تر دروست نییە))

**٥٥٥٦- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: خاڵێکم کە پێی دەوترا: ئەبو بوردە پێش نوێژی جەژن قوربانییەکەی سەربڕی بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێی: ((مەڕەکەت مەڕی گۆشتە[٢]))، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان چتیرە بزنێکی دابەستەم هەیە لەماڵەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس پێش نوێژ (ی جەژن) ئاژەڵ سەر ببڕێت، ئەوە بێگومان بۆ خۆی سەر بڕیوە، هەر کەسیش پاش نوێژ (ی جەژن) ئاژەڵ سەر ببڕێت، ئەوە بێگومان قوربانییەکەی تەواوە و سوننەتی مسوڵمانانی جێبەجێ کردوە)).**

**-عوبەیدە لە شەعبی و ئیبراهیمەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی موتەریفی کردوە لەگێڕانەوەکەیدا.**

**-وەکیع لە حوریسەوە ئەویش لە شەعبی یەوە گێڕاویەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موتەڕیفی کردوە.**

**-عاصیم و داوود لە شەعبی یەوە گێڕاویانەتەوە: چتیرێکم هەیە تازە بڕاوەتەوە لە شیر.**

(١) قوربانی بکە بە چتیرە بزنێک.

(٢) واتە: بەقوربانی دانانرێت.

**-ئەبو لئەحوەس دەڵێ: مەنصور بۆی گێڕاینەوە وتی: گیسكێك، چتیرێكم هەیە.**
**-ئیبنو عەون وتی: گیسكێك، چتیرێك، گیسكێكی تازە لە شیر بڕاوە.**

٥٥٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: ذَبَحَ أَبُو بُرْدَةَ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَبْدِلْهَا». قَالَ: لَيْسَ عِنْدِي إِلاَّ جَذَعَةٌ -قَالَ شُعْبَةُ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ:- هِيَ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ قَالَ: «اجْعَلْهَا مَكَانَهَا، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[١].

**٥٥٥٧-بەڕا ﷺ دەڵێ: ئەبو بوردە پێش نوێژ (ی جەژن) قوربانی سەربڕی، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((یەكێكی تر لە جیاتی سەرببڕە))، وتی: تەنها چتیرێكم هەیە، شوعبە وتی: وابزانم وتی: لە بزن و مەڕ چاكترە، فەرمووی: ((بیخەرە جێی ئەو، لە پاش تۆ بۆ كەسی تر دروست نییە)).**

## ٩- بَابُ مَنْ ذَبَحَ الأَضَاحِيَّ بِيَدِهِ

٥٥٥٨- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ، فَرَأَيْتُهُ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا يُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، فَذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ[٢].

## ٩- باسی ئەو كەسەی قوربانییەكان بە دەستی خۆی سەربڕی

**٥٥٥٨-ئەنەس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی ڕەش و سپی كردە قوربانی، جا بینیم قاچی نابوویە سەر لاملیان ناوی خوای هێنا و ئەڵڵاهو ئەكبەری كرد و هەردووكیانی بەدەستی خۆی سەربڕی.**

(١) بڕوانە: ٩٥١.
(٢) بڕوانە: ٥٥٥٣.

## ١٠- بابُ مَنْ ذَبَحَ أُضَحِيَّةَ غَيْرِهِ

وَأَعَانَ رَجُلٌ ابن عُمَرَ فِي بَدَنَتِهِ. وَأَمَرَ أَبُو مُوسَى بَنَاتِهِ أَنْ يُضَحِّينَ بِأَيْدِيهِنَّ.

٥٥٥٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَرِفَ وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا لَكِ؟ أَنَفِسْتِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ على بَنَاتِ آدَمَ، اقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ». وَضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ[1].

## ١٠- باسی کەسێک قوربانی کەسێکی تر سەر ببڕێت

**-پیاوێك هاوكاری ئیبنو عومەری ﷺ كرد لە سەربڕینی وشترەكەیدا[2].**

**-ئەبو مووسا ﷺ فەرمانی بەكچەكانی كرد كە بە دەستی خۆیان قوربانییەكانیان سەربڕی.**

**٥٥٥٩- عەبدوڕەحمانی كوڕی قاسیم لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام – لە سەریف لەو كاتەدا من دەگریام - پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((چیتە كەوتوویتە حەیزەوە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((بێگومان ئەمە شتێكە خوا بۆ ئافرەتانی داناوە، جا حاجی چی دەكات تۆش بیكە تەنها تەواف كەعبە مەكە))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ مانگای كردوە بە قوربانی بۆ خێزانەكانی))[3].**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٤.

(٢) كە لەمینا سەری بڕی وەك قوربانی.

(٣) واتە: بەمۆڵەتی خێزانەكانی، چونكە نابێ قوربانی بكەیت بۆ كەسێک ئاگادار نەبێت، ئەو قسەی عائیشە ﷺ وا ناگەینێت كە ئەو ڕێگەی نەداوە پێغەمبەر ﷺ قوربانی بۆ بكات، بەڵكو نەیزانیوە قوربانیەكە هی كێیە.

## ١١- بابُ الذَّبْحِ بَعْدَ الصَّلَاةِ

٥٥٦٠- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ الْمِنْهَالِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي زُبَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ مِنْ يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ هَذَا فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ نَحَرَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ يُقَدِّمُهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ». فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أُصَلِّيَ، وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. فَقَالَ: «اجْعَلْهَا مَكَانَهَا، وَلَنْ تَجْزِيَ -أَوْ تُوفِيَ- عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[1].

## ١١- باسی (كاتی قوربانی) سەربڕین دوا نوێژ (ی جەژنە)

**٥٥٦٠- بەڕاو ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان یەكەم شتێك لەم ڕۆژەماندا كە بەو دەست پێ دەكەین نوێژ دەكەین، پاشان دەگەڕێینەوە (بۆ ماڵەوە) و قوربانی سەر دەبڕین، جا هەر كەس (بەو جۆرەی) كرد، ئەوە بێگومان سوننەتی ئێمەی جێ بەجێ كردوە، هەر كەسیش پێش (نوێژی جەژن) سەری بڕیبێ، ئەوە بێگومان گۆشتێكە و داوێتی بەخێزانەكەی خۆی و هیچ پەیوەندی بە قوربانیەوە نییە))، ئەبو بوردە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من ئاژەڵەكەم سەربڕی پێش ئەوەی نوێژ بكەم، بەڵام چتیرێكم هەیە لە مەڕێك چاكترە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیخەرە جێگای ئەو و سەری ببڕە و لە پاش تۆ بۆ هیچ كەس دروست نییە)).**

## ١٢- بابٌ مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ أَعَادَ

٥٥٦١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلْيُعِدْ». فَقَالَ رَجُلٌ: هَذَا يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ

---

(١) بڕوانە: ٩٥١.

اللَّحْمُ -وَذَكَرَ مِنْ جِيرَانِهِ، فَكَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَذَرَهُ- وَعِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْنِ. فَرَخَّصَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَلاَ أَدْرِي بَلَغَتِ الرُّخْصَةُ أَمْ لاَ، ثُمَّ انْكَفَأَ إِلَى كَبْشَيْنِ- يَعْنِي: فَذَبَحَهُمَا- ثُمَّ انْكَفَأَ النَّاسُ إِلَى غُنَيْمَةٍ فَذَبَحُوهَا[1].

## ١٢- باسی هەر کەسێک پێش نوێژ (ی جەژن) قوربانییەکەی سەربڕی دەبێ دووبارەی بکاتەوە

**٥٥٦١-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((هەرکەسێك پێش نوێژ (ی جەژن قوربانی) سەربڕیوە بادووبارەی کاتەوە))، پیاوێکیش وتی: ئەمە ڕۆژێکە حەز لە گۆشت دەکرێت- باسی پێویستی دراوسێکانی کرد وەك ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بیانووەکەی قبوڵ کردبێت-، (وتی): چتیرێکم هەیە لە دوو مەڕ چاکترە، ئیتر پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتی دا، جا نازانم مۆڵەتەکە گەشتووە بەخەڵکی کە یا نا؟ پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ لای دوو بەرانەکە و- واتە: هەردووکیانی سەربڕی- پاشان خەڵك گەڕانەوە بۆ لای مەڕێکی بچووك و سەریان بڕی.**

٥٥٦٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الأَسْوَدُ بْنُ قَيْسٍ، سَمِعْتُ جُنْدَبَ بْنَ سُفْيَانَ الْبَجَلِيَّ قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ فَقَالَ: «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُعِدْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ»[2].

**٥٥٦٢-جوندەبی کوڕی سوفیانی بەجەلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ دی لە ڕۆژی جەژنی قورباندا فەرمووی: ((هەر کەسێك قوربانی سەر بڕێ پێش ئەوەی نوێژی جەژن بکات، ئەوە با لە جێی ئەو قوربانییە دووبارە قوربانییەك سەر ببڕێ، هەر کەسێکیش سەری نەبڕیوە با سەری ببڕێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٩٥٤.

(٢) بڕوانە: ٩٨٥.

٥٥٦٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ فِرَاسٍ، عَنْ عَامِرٍ، عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَقَالَ: «مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، فَلاَ يَذْبَحْ حَتَّى يَنْصَرِفَ». فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَعَلْتُ. فَقَالَ: «هُوَ شَيْءٌ عَجَّلْتَهُ». قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي جَذَعَةً هِيَ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّتَيْنِ، آذْبَحُهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، ثُمَّ لاَ تَجْزِي عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ». قَالَ عَامِرٌ: هِيَ خَيْرُ نَسِيكَتِهِ[١].

**٥٥٦٣-بەڕا ﷺ دەڵێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەر ﷺ نوێژی كرد ئینجا فەرمووی: ((هەر كەسێك وەك ئەم نوێژەی ئێمە بكات و ڕوو بكاتە ڕووگەی ئێمە و قوربانی سەر نەبڕێت هەتا (لە نوێژی جەژن) دەگەڕێتەوە))، جا ئەبو بوردەی كوڕی نیار ﷺ هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سەرم بڕیوە، فەرمووی: ((ئەوە شتێكە كە پێشت خستووە (بۆ خێزانەكەت) ))، وتی: چتیرێكم هەیە لە دوو مەڕ چاكترە سەری ببڕم؟ فەرمووی: ((بەڵێ پاشان لە دوای تۆ بۆ كەسی كە دروست نییە))، عامیر دەڵێ: چتیرەكە چاكترینی دوو قوربانییەكەی بوو[٢].**

## ١٣- بابُ وَضْعِ الْقَدَمِ عَلَى صَفْحَةِ الذَّبِيحَةِ

٥٥٦٤- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ على صَفْحَتِهِمَا، وَيَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ[٣].

## ١٣- باسی پێ خستنە سەر ملی (ئەو قوربانییەی) كە سەر دەبڕدرێت

**٥٥٦٤-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی ڕەش و سپی شاخداری دەكردە قوربانی، قاچی خستە سەر لاملی هەردووكیان، وە بەدەستی خۆی سەری بڕین.**

---

(١) بڕوانە: ٩٥١.

(٢) واتە: چتیرەكە لە جیاتی مەڕەكەی یەكەم سەری بڕی لەوەی كە پێشتر سەری بڕیبوو چاكتر بوو.

(٣) بڕوانە: ٥٥٥٣.

## ١٤- بَابُ التَّكْبِيرِ عِنْدَ الذَّبْحِ

٥٥٦٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا[١].

## ١٤- باسی ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن لە کاتی سەربڕینی (قوربانیدا)

**٥٥٦٥- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دووبەرانی ڕەش و سپی شاخداری کردە قوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین، ناوی خوای هێنا و ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد و قاچی خستە سەر ملیان.**

## ١٥- بَابٌ إِذَا بَعَثَ بِهَدْيِهِ لِيُذْبَحَ لَمْ يَحْرُمْ عَلَيْهِ شَيْءٌ

٥٥٦٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ أَنَّهُ أَتَى عَائِشَةَ، فَقَالَ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ رَجُلاً يَبْعَثُ بِالْهَدْيِ إِلَى الْكَعْبَةِ، وَيَجْلِسُ فِي الْمِصْرِ، فَيُوصِي أَنْ تُقَلَّدَ بَدَنَتُهُ، فَلاَ يَزَالُ مِنْ ذَلِكَ الْيَوْمِ مُحْرِمًا حَتَّى يَحِلَّ النَّاسُ. قَالَ: فَسَمِعْتُ تَصْفِيقَهَا مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ فَقَالَتْ: لَقَدْ كُنْتُ أَفْتِلُ قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَبْعَثُ هَدْيَهُ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَمَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ مِمَّا حَلَّ لِلرِّجَالِ مِنْ أَهْلِهِ، حَتَّى يَرْجِعَ النَّاسُ[٢].

## ١٥- باسی ئەگەر کەسێک ئاژەڵی دیاری نارد (لە مەککە) سەرببڕدرێت، هیچ شتێکی لێ حەرام نابێت

**٥٥٦٦-مەسروق دەڵێ: چوو بۆ خزمەت عائیشە ﷺ پێی وت: ئەی دایکی باوەڕداران پیاوێك ئاژەڵی دیاری دەنێرێت بۆ کەعبە و خۆی لە شارەکەی خۆی**

(١) بڕوانە: ٥٥٥٣.

(٢) بڕوانە: ١٦٩٦.

دانیشێت، ئینجا وەسیەت دەكات وشترەكەی گوڵەن بكرێتە ملی (دیاری بكرێت)، جا بەردەوام لەو ڕۆژەوە لە ئیحرام دایە هەتا خەڵكی ئیحرام دەشكێنن، (مەسروق) وتی: لە پشت پەردەكەوە گوێم لە چەپڵەی عائیشە بوو وتی: سوێند بەخوا خۆم پەتی گوڵەنگەكانی ئاژەڵ وشتری دیاری پێغەمبەری خوام ﷺ ئەهۆنیەوە و ئینجا ئاژەڵە دیارییەكانی دەنارد بۆ كەعبە، وە هیچ شتێكی لێ حەرام نەدەبوو لەو شتانەی بۆ پیاوانی خێزانەكەی حەڵاڵ بوو، هەتا خەڵك دەگەڕانەوە (لە حەج).

## ١٦- بابُ مَا يُؤْكَلُ مِنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ وَمَا يُتَزَوَّدُ مِنْهَا

٥٥٦٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَتَزَوَّدُ لُحُومَ الأَضَاحِيِّ على عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَقَالَ غَيْرَ مَرَّةٍ: لُحُومَ الْهَدْيِ(١).

## ١٦- باسی ئەوەی لێی دەخورێت لە گۆشتی قوربانییەكان و ئەوەی بە توێشوو لێی هەڵدەگیرێت

٥٥٦٧-عەتا دەڵێ: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵام ﷺ بیست وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ گۆشتی قوربانیمان بە توێشوو هەڵدەگرت تا مەدینە، (عەلی كوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: سوفیان) زیاد لە جارێك وتوویەتی: گۆشتی ئاژەڵی دیاری كەعبە.

٥٥٦٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ، أَنَّ ابْنَ خَبَّابٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ يُحَدِّثُ أَنَّهُ كَانَ غَائِبًا، فَقَدِمَ فَقُدِّمَ إِلَيْهِ لَحْمٌ. قَالَ: وَهَذَا

(١) بڕوانە: ١٧١٩.

مِنْ لَحْمِ ضَحَايَانَا. فَقَالَ: أَخِّرُوهُ، لاَ أَذُوقُهُ. قَالَ: ثُمَّ قُمْتُ فَخَرَجْتُ حَتَّى آتِيَ أَخِي أبا قَتَادَةَ -وَكَانَ أَخَاهُ لأُمِّهِ، وَكَانَ بَدْرِيًّا - فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ حَدَثَ بَعْدَكَ أَمْرٌ[1].

**٥٥٦٨-قاسیم دەڵێ: ئیبنو خەبباب بۆی گێڕایەوە کە لە ئەبو سەعیدی ﷺ بیستووە دەیگێڕایەوە کە لەماڵەوە نەبوو هاتۆتەوە، ئینجا گۆشتێکی بۆ هێنرا، (کەسەکە) وتی: ئەمە لە گۆشتی قوربانییەکانمانە، ئەبو سەعید وتی: دووری خەنەوە تامی ناکەم، (ئەبو سەعیدی) وتی: پاشان هەستام چوومە دەرەوە هەتا بڕۆم بۆ لای ئەبو قەتادەی برام - کەبرای بوو لە دایکەوە و لە بەشدارانی بەدر بوو- جا ئەو باسەم بۆ ئەبو قەتادە کرد، ئەویش وتی: بێگومان پاش تۆ کارێکی تر ڕووی داوە[2].**

٥٥٦٩- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلاَ يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ وَفِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ». فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا عَامَ الْمَاضِي؟ قَالَ: «كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا، فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا».

**٥٥٦٩- سەلەمی کوڕی ئەکوع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەرکەسێکتان قوربانی کرد، نابێ دوای سێ ڕۆژ لە ماڵیدا هیچ لەو قوربانیە بمێنێتەوە))، جا کە ساڵی داهاتوو هات وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ساڵی ڕابردوو چۆنمان کرد (ئەمساڵیش) هەروا بکەین؟ فەرمووی ((بخۆن و دەرخواردی خەڵکی بدەن و پاشکەوتیشی بکەن، چونکە ئەو ساڵە[3] خەڵکی برسی بوون، بۆیە ویستم یارمەتی خەڵکی تیا بکەن)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٩٩٧.

(٢) کە ئەوەی هەڵوەشاندەوە کە نابێ لەپاش سێ ڕۆژ گۆشتی قوربانی بخورێت، بەڵکو ئێستا درووستە.

(٣) ساڵی پێشوو.

٥٥٧٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتِ: الضَّحِيَّةُ كُنَّا نُمَلِّحُ مِنْهُ، فَنَقْدَمُ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَقَالَ: «لاَ تَأْكُلُوا إِلاَّ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ». وَلَيْسَتْ بِعَزِيمَةٍ، وَلَكِنْ أَرَادَ أَنْ يُطْعِمَ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ[1].

**٥٥٧٠- عائیشه ﷺ دەڵێ: ئێمه گۆشتی قوربانی هەندێکیمان خوێ پیا دەکرد له مەدینه دەمان خسته خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی((مەیخۆن جگه له سێ ڕۆژ))، ئەو فەرمانه بۆحەرامی نییه، بەڵکو ویستی لەو (گۆشته) دەرخواری خەڵك بدرێ، خواش زاناترە.**

٥٥٧١- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو عُبَيْدٍ -مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ- أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ يَوْمَ الأَضْحَى مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَصَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ نَهَاكُمْ عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْعِيدَيْنِ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَيَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَأَمَّا الآخَرُ فَيَوْمٌ تَأْكُلُونَ نُسُكَكُمْ[2].

**٥٥٧١-ئەبو عوبەیدی- ئازادکراوی ئیبنو ئەزهەر- دەگێڕێتەوە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا ﷺ ئامادەی جەژن بوو له ڕۆژی قورباندا، عومەر نوێژی کرد پێش وتارەکه، پاشان وتاری دا بۆ خەڵکەکه و وتی: ئەی خەڵکینه بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیاییەوە ڕێگری لێ کردوون له ڕۆژوو گرتن لەم دوو جەژنەدا، جا یەکێکیان ڕۆژی ڕۆژوو شکاندتانه له ڕۆژووەکەتاندا، ئەوەی کەشیان ڕۆژێکه قوربانییەکەتان دەخۆن.**

---

(١) بڕوانه: ٥٤٢٣.

(٢) بڕوانه: ١٩٩٠.

٥٥٧٢ - قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ فَكَانَ ذَلِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَصَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ هَذَا يَوْمٌ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِيهِ عِيدَانِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْتَظِرَ الْجُمُعَةَ مِنْ أَهْلِ الْعَوَالِي فَلْيَنْتَظِرْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعَ فَقَدْ أَذِنْتُ لَهُ.

**٥٥٧٢-ئەبو عوبەیدە دەڵێ: پاشان لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففاندا ﷺ ئامادەی جەژن بووم، جا ئەو جەژنە ڕۆژی هەینی بوو، ئینجا نوێژی کرد پێش وتاردان، پاشان وتاری دا و وتی: ئەی خەڵکینە بێگومان ئەمە ڕۆژێکە دوو جەژنی تیا کۆبۆتەوە بۆتان، جا هەر کەس لە خەڵکی عووالی دەیەوێ چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکات با چاوەڕوان بێت، هەر کەسیش دەیەوێ بگەڕێتەوە، ئەوە بێگومان من مۆڵەتی ئەو کەسەم داوە.**

٥٥٧٣ - قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُهُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، فَصَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَاكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ نُسُكِكُمْ فَوْقَ ثَلاَثٍ. وَعَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ نَحْوَهُ.

**٥٥٧٣-ئەبو عوبەیدە دەڵێ: پاشان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ ئامادەی جەژن بووم، پێش وتار نوێژی کرد پاشان وتاری دا بۆ خەڵکی وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کردوون گۆشتی قوربانییەکانتان بخۆن لەپاش سێ ڕۆژ.**

**-مەعمەر لە زوهری یەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبی عوبەیدەوە وێنەی فەرموودەی پێشوو دەگێڕێتەوە.**

٥٥٧٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمِّهِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ

ﷺ: «كُلُوا مِنَ الأَضَاحِيِّ ثَلاَثًا». وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَأْكُلُ بِالزَّيْتِ حِينَ يَنْفِرُ مِنْ مِنًى، مِنْ أَجْلِ لُحُومِ الْهَدْيِ.

**٥٥٧٤-سالیم گێڕایەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ ڕۆژ (لە گۆشتی) قوربانییەکان بخۆن))، عەبدوڵڵا نانی دەخوارد بەزەیتەوە کاتێ لە مینا دەڕۆشتن لەبەر ئەوەی لە گۆشتی قوربانی نەخوات.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٧٤- كِتابُ الأشْرِبَةِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٤- پەڕاوی خواردنەوەكان

**وَقَوْلُ اللَّهِ تَعالَى:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ **المائدة**

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی كە كراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی (كە بە كارئەهێنرێن بۆ دیاری كردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن، وە لەكردەوەی شەیتانن، كەواتە دووركەونەوە لێی تا ڕزگاربن)

٥٥٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ».

**٥٥٧٥-عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك لە دونیادا ئاڕەق بخواتەوە، پاشان تەوبەی لێ نەكات،لە دواڕۆژدا بێبەش دەبێت لێی)).**

٥٥٧٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ، وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، ثُمَّ أَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، وَلَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ. تَابَعَهُ مَعْمَرٌ وَابْنُ الْهَادِ وَعُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ وَالزُّبَيْدِيُّ عَنِ الزُّهْرِيِّ[١].

**٥٥٧٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەوەی شەو ڕەوی پێکرا لە ئیلیا (بەیتولموقەدیسە)وە دوو جامی بۆ هێنرا یەکیان عارەق و ئەوەی تریان شیر بوو، پێغەمبەریش ﷺ سەیری هەردووکیانی کرد پاشان شیرەکەیانی هەڵگرت، جیبریل ﷺ فەرمووی سوپاس بۆ خوا کە ڕێنموونی کردی بۆ سروشتی (ئیسلامەتی)، ئەگەر عارەقەکەت هەڵگرتایە ئوممەتەکەت سەرلێشێوا و لارێ دەبوون.**

**-مەعمەر و ئیبنو لهاد وعوسمانی کوڕی عومەر و زوبەیدی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە زوهرییەوە، وە پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعەیب دەکات.**

٥٥٧٧- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا لاَ يُحَدِّثُكُمْ بِهِ غَيْرِي قَالَ: «مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَقِلَّ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا، وَتُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمُهُنَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ»[٢].

**٥٥٧٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە جگە لە من کەسی تر بۆتان ناگێڕێتەوە، فەرمووی: ((لە نیشانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە: نەزانی دەردەکەوێ و بڵاو دەبێتەوە و زانست و**

(١) بڕوانە: ٣٣٩٤.

(٢) بڕوانە: ٨٠.

**زانیاری کەم دەبێتەوە، وە داوێن پیسی بە ئاشکرا دەکرێ، وە عارەق دەخورێتەوە، پیاوان کەم دەبنەوە، ئافرەتان زۆر دەبنەوە (بەهۆی ئاشووب و شەڕ و شۆڕەوە)، هەتا وای لێدێ کە پەنجا ئافرەت یەك سەرپەرشتیاری پیاویان دەبێ!)).**

٥٥٧٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَابْنَ الْمُسَيَّبِ يَقُولاَنِ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ يُحَدِّثُهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ثُمَّ يَقُولُ: كَانَ أَبُو بَكْرٍ يُلْحِقُ مَعَهُنَّ: «وَلاَ يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ، يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ أَبْصَارَهُمْ فِيهَا حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ»[1].

**٥٥٧٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوێن پیس داوێن پیسی ناکات لە کاتی داوێن پیسییەکەیدا باوەڕدار بێت، (عارەق خۆر) عارەق ناخواتەوە و لە کاتی عارەق خواردنەوەکەیدا باوەڕدار بێت، وە دز دزی ناکات و لە کاتی دزی کردنەکەیدا باوەڕدار بێت))، ئیبنو شیهاب دەڵێ: عەبدولەلیکی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی عەبدڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام دەڵێ: ئەبو بەکر لە ئەبو هورەیرەوە بۆی دەگێڕایەوە و پاشان دەیوت: ئەبو بەکر ئەم ڕستەشی لەگەڵ فەرموودەکە دەهێنا: (( وە هیچ (تالانچیەك) تالانێکی بەنرخ ناکات کە خەڵکی چاویان تێبڕیوە و سەیری دەکەن، لە کاتی تالانکردنەکەیدا باوەڕدار بێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧٥.

## ٢- بابٌ: الْخَمْرُ مِنَ العِنَبِ

٥٥٧٩- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَابِقٍ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ -هُوَ ابْنُ مِغْوَلٍ- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَقَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، وَمَا بِالْمَدِينَةِ مِنْهَا شَيْءٌ[١].

## ٢- باسێک: ئارەق لە ترێیە[٢]

**٥٥٧٩-نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: سوێند بە خوا ئارەق حەرام کراوە لەو کاتەدا لە مەدینە هیچ ئارەقی[٣] تیا نەبوو.**

٥٥٨٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: حُرِّمَتْ عَلَيْنَا الْخَمْرُ حِينَ حُرِّمَتْ، وَمَا نَجِدُ -يَعْنِي: بِالْمَدِينَةِ- خَمْرَ الأَعْنَابِ إِلاَّ قَلِيلاً، وَعَامَّةُ خَمْرِنَا الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ[٤].

**٥٥٨٠-ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ ئارەقمان لەسەر حەرام کرا، لە کاتێکدا بوو، ئارەقی ترێمان دەست نەدەکەوت- واتە لە مەدینەدا- بەکەمی نەبێت (دروست کردنی) زۆربەی ئارەقمان فەریکە خورما و[٥] خورما بوو.**

٥٥٨١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي حَيَّانَ، حَدَّثَنَا عَامِرٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: قَامَ عُمَرُ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهْيَ مِنْ خَمْسَةٍ: الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ[٦].

---

(١) بڕوانە: ٤٦١٦.

(٢) واتە: لە ترێ دروست دەکرێت.

(٣) ترێی تیا نەبوو.

(٤) بڕوانە: ٢٤٦٤.

(٥) فەریکە خورما خورمایە کە هێشتا پێنەگەشتووە، بەڵام خورما بە خورمای وشک یان تازە نەبێت دەوترێت.

(٦) بڕوانە: ٤٦١٩.

**٥٥٨١- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: لە عومەرم ﷺ بیست لەسەر دوانگەی پێغەمبەر ﷺ وەستا بوو دەیوت: ئەمە و پاشان ئەی خەڵکینە بێگومان حەرام بوونی عارەق دابەزیوە کە ئەویش لە پێنج (شت دروست دەکرێ): لە ترێ و خورما و هەنگوین و گەنم و جۆ، وە عارەق ئەوەیە عەقڵ داپۆشێت و نەیهێڵێ.**

## ٣- بابٌ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهْيَ مِنَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ

٥٥٨٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا عُبَيْدَةَ وَأَبَا طَلْحَةَ وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ مِنْ فَضِيخِ زَهْوٍ وَتَمْرٍ فَجَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: قُمْ يَا أَنَسُ فَأَهْرِقْهَا. فَأَهْرَقْتُهَا[1].

## ٣- باسێک: حەرام بوونی ئارەق دابەزی لە کاتێکدا ئارەق لە فەریکە خورما و خورما بوو

**٥٥٨٢-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من ئارەقم دەگێڕا بۆ ئەبو عوبەیدە و ئەبو تەڵحە و ئوبەیی کوڕی کەعب ﷺ کەدروست کرابوو لە فەریکە خورما و خورما، ئینجا کەسێك هات بۆ لایان وتی: بێگومان بەدڵنیاییەوە ئارەق حەرام کرا، ئەبو تەڵحەش وتی: ئەنەس هەستە و بیڕێژە، منیش ئارەقەکەم ڕشت.**

٥٥٨٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا على الْحَيِّ أَسْقِيهِمْ -عُمُومَتِي وَأَنَا أَصْغَرُهُمْ- الْفَضِيخَ، فَقِيلَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ. فَقَالُوا: أَكْفِئْهَا.

(١) بروانە: ٢٤٦٤.

فَكَفَأْتُهَا. قُلْتُ لأَنَسٍ: مَا شَرَابُهُمْ؟ قَالَ: رُطَبٌ وَبُسْرٌ. فَقَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَنَسٍ: وَكَانَتْ خَمْرَهُمْ. فَلَمْ يُنْكِرْ أَنَسٌ. وَحَدَّثَنِي بَعْضُ أَصْحَابِي أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَتْ خَمْرَهُمْ يَوْمَئِذٍ[1].

**٥٥٨٣-موعتەمیر لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: من بەسەر كۆمەڵێ خەڵكەوە وەستا بووم- مامەكانم بوون من لە هەموویان تەمەنم كەمتر بوو- ئارەقی (دروست كراو) لە فەریكە خورمام بۆ دەگێڕان و پێم دەدان، جا وترا ئارەق حەرام كرا، ئەوانیش[2] وتیان: ئارەقەكە بڕێژە منیش ڕشتم، (سولەیمان دەڵێ): وتم بەئەنەس: خواردنەوەیان لە چی بوو؟ وتی (عارەقی) خورمای تازە و فەریكە خورما بوو، جا ئەبو بەكری كوڕی ئەنەس وتی: ئەوە ئارەقیان بوو. ئەنەسیش وتەكەی ئەبو بەكری ڕەد نەكردەوە، (وە سولەیمان دەڵێ:) یەكێك لە هاوڕێكانم بۆی گێڕامەوە كە لە ئەنەسی ﷺ بیستووە دەیوت: لەو ڕۆژگارەدا ئارەقی ئەوان بوو[3]**

٥٥٨٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا يُوسُفُ أَبُو مَعْشَرٍ الْبَرَّاءُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي بَكْرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ: أَنَّ الْخَمْرَ حُرِّمَتْ، وَالْخَمْرُ يَوْمَئِذٍ الْبُسْرُ وَالتَّمْرُ[4].

**٥٥٨٤-سەعیدی كوڕی عوبەیدوڵلا دەڵێ: ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە كە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕاونەتەوە كە بێگومان ئارەق حەرام كرا، ئارەقیش لەو ڕۆژگارەدا لە فەریكە خورما و خورما (دروست دەكرا).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٦٤.

(٢) مامەكانم.

(٣) واتە: عارەقیان لە خورمای تازەو فەریكە خورما دروست دەكردو عارەقی ئەوان لەوە بوو.

(٤) بڕوانە: ٢٤٦٤.

## ٤- بابٌ الْخَمْرُ مِنَ الْعَسَلِ وَهْوَ الْبِتْعُ

وَقَالَ مَعْنٌ: سَأَلْتُ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ عَنِ الفُقَّاعِ فَقَالَ: إِذَا لَمْ يُسْكِرْ فَلَا بَأْسَ. وَقَالَ ابن الدَّرَاوَرْدِيِّ: سَأَلْنَا عَنْهُ فَقَالُوا: لَا يُسْكِرُ، لَا بَأْسَ بِهِ.

٥٥٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْبِتْعِ، فَقَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهْوَ حَرَامٌ»[١].

## ٤- باسێک:ئارەق لە هەنگوین (دروست دەکرێ) کە بیتعە[٢]

**- مەعن دەڵێ: پرسیارم لە مالیکی کوڕی ئەنەس کرد دەربارەی فوققاع[٣]، مالیکیش وتی: ئەگەر خەڵک سەرخۆش نەکات زیانی نییە.**

**ئیبنو دەراوەردی دەڵێ: دەربارەی فوققاع پرسیارمان کرد وتیان: خەڵك سەرخۆش ناکات قەیناکت زیانی نییە.**

٥٥٨٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْبِتْعِ -وَهْوَ نَبِيذُ الْعَسَلِ، وَكَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَشْرَبُونَهُ- فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهْوَ حَرَامٌ»[٤].

**٥٥٨٦- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: دەربارەی بیتع- کە شەڕابی هەنگوینە و خەڵکی یەمەن دەیخۆنەوە- پرسیار لە**

(١) بڕوانە: ٢٤٢.
(٢) بەشێوەی دەربڕینی یەمەنی بە هەنگوین دەڵێن:بیتع.
(٣) فوققان: خواردنەوەیەکە لە مێوژ دروست دەکرێت.
(٤) بڕوانە: ٢٤٢.

**پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی ((هەر خواردنەوەیەك (خەڵك) سەرخۆش كات، ئەوە بێگومان حەرامە)).**

٥٥٨٧ - وَعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَلاَ فِي الْمُزَفَّتِ». وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُلْحِقُ مَعَهَا الْحَنْتَمَ وَالنَّقِيرَ.

**٥٥٨٧- لە زوهرییەوە گێڕدراوەتەوە وتوویەتی: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (خۆشاو لە كولەكەی هەڵكۆڵراو و كوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواودا دروست مەكەن).**

**-ئەبو هورەیرە ﷺ كوپەی (لە قوڕ دروست كراو) و دەفری هەڵكۆڵراو لە بنكی دار خورما خراونەتە پاڵ ئەو دووانەی پێشوو[١].**

## ٥- بابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الْخَمْرَ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ مِنَ الشَّرَابِ

٥٥٨٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ أَبِي حَيَّانَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، وَهْيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وَثَلاَثٌ وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا عَهْدًا: الْجَدُّ، وَالْكَلاَلَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا عَمْرٍو، فَشَيْءٌ يُصْنَعُ بِالسِّنْدِ مِنَ الرُّزِّ؟ قَالَ: ذَاكَ لَمْ يَكُنْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ. أَوْ قَالَ: عَلَى عَهْدِ عُمَرَ. وَقَالَ حَجَّاجٌ، عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ أَبِي حَيَّانَ: مَكَانَ الْعِنَبِ: الزَّبِيبَ[٢].

---

(١) كولەكەی هەڵكوڵراوو كوپەی قیرو زەفت تێهەلسواو.

(٢) بڕوانە: ٤٦١٩.

# ٥- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئارەق ئەوەیە ئەقڵ و ژیری ناهێڵێ لە خواردنەوەکان

**٥٥٨٨- ئەبو حەییانی تەیمی لە شەعبییەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: عومەر لەسەر دوانگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا و وتی: بێگومان حەرام بوونی ئارەق دابەزیوە، کە لە پێنج شت (دروست دەکرێ): ترێ و خورما و گەنم و جۆ و هەنگوین، ئارەق ئەوە عەقڵ داپۆشێ و نەیهێڵێ، وە سێ بابەت هەبوون ئاواتە خوازبووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان جیانەبوایەتەوە (وەفاتی نەکردایە) تابۆمانی ڕوون بکردایەتەوە: باپیرە[1]کەلالە[2]چەند باسێك لە باسەکانی سوو، (ئەبو حەییان دەڵێ) وتم: ئەبو عەمر[3]: خواردنەوەیەك هەیە لە سینددا لە چەڵتوك دروست دەکرێت؟ وتی: ئەوە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا نەبووە، یان وتی: لە سەردەمی عومەردا ﷺ نەبووە.**

**-حەججاج دەڵێ: لە حەممادەوە لە ئەبی حەییانەوە لەجێگای: ترێ وتی: مێوژ.**

٥٥٨٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ قَالَ: الْخَمْرُ يُصْنَعُ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ الزَّبِيبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْعَسَلِ[4].

**٥٥٨٩-ئیبنو عومەر لە عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئارەق لە پێنج شت دروست دەکرێ: لە مێوژ و خورما و گەنم و جۆ و هەنگوین.**

---

(١) باپیرە: ئایە برا بێبەش دەکات لە میرات یان بە پێچەوانەوەیە یان لە نێوانیاندا دابەش دەبێت.

(٢) کەلالە: واتە کەسێك بمرێ نەمنداڵ نە دایك و باوکی نەبێت تونها خوشك و برای هەبێت.

(٣) ئەبو عەمر نازناوی شەعبی یە.

(٤) بڕوانە: ٤٦١٩.

## ٦- بابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَسْتَحِلُّ (الْخَمْرَ) وَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ

٥٥٩٠ - وَقَالَ هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ: حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ، حَدَّثَنَا عَطِيَّةُ بْنُ قَيْسٍ الْكِلَابِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَنْمٍ الْأَشْعَرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو عَامِرٍ -أَوْ أَبُو مَالِكٍ - الْأَشْعَرِيُّ -وَاللَّهِ مَا كَذَبَنِي- سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ -يَعْنِي: الْفَقِيرَ- لِحَاجَةٍ فَيَقُولُوا: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا. فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ وَيَضَعُ الْعَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ».

## ٦- باسی ئەوەی هاتووە (لە هەڕەشە) دەربارەی ئەو کەسەی ئارەق حەڵاڵ دەکات، بەناوێکی تر جگە لە ناوی خۆی ناوی دەبات

**٥٥٩٠- عەبدوڕەحمانی کوڕی غەنمی ئەشعەری دەڵێ: ئەبوعامیر-یان ئەبو مالیك-ئەشعەری بۆی گێڕامەوە و سوێند بەخوا درۆی لەگەڵ نەکردووم، لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: (( لە ئوممەتی من کۆمەڵانێك دەبن زینا و هاوریشم و مەی و ئامێرەکانی مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن، کۆمەڵانێك لە لای شاخێکی بەرزدا نیشتەجێ دەبن و (شوانەکەیان) ئێواران ڕانەکەیان دەباتەوە بۆیان[1]**

**کەسێك - مەبەستی هەژارە- بۆ پێویستیەك دێت بۆ لایان، ئەوانیش پێی دەڵێن: سبەینێ وەرەوە بۆ لامان، خوای گەورە شەو لەناویان دەبات، چیاکەش دەکەوێت (بەسەریاندا)، ئەوانەی کە شێوەیان دەکاتە مەیمون و بەراز تا ڕۆژی قیامەت)).**

---

(١) لە لەوەڕاندنی ڕۆژ بۆیان دەباتەوە بۆ دۆشین و حەوانەوە.

## ٧- بابُ الانْتِبَاذِ فِي الأَوْعِيَةِ وَالتَّوْرِ

٥٥٩١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَهْلاً يَقُولُ: أَتَى أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ فَدَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي عُرْسِهِ، فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ وَهْيَ الْعَرُوسُ، قَالَتْ: أَتَدْرُونَ مَا سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ أَنْقَعْتُ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ[١].

## ٧- باسی حوکمی خۆشاو دروست کردن لە دەفر و قاپی بەردیندا[٢]

**٥٥٩١سەهل دەڵێ: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ هات و پێغەمبەری خوای ﷺ دەعوەت کرد لە شاییەکەیدا، جا هاوسەرەکەی- کە لەو کاتەدا بووك بوو- خزمەتکاریان بوو، (سەهل) وتی: دەزانی ئەو بووکە چ خواردنەوەیەکی دا بە پێغەمبەر ﷺ بیخواتەوە؟ لە شەودا هەندێ خورمای کردبوویە ئاوەوە بۆی لە دەفرێکی بەردیندا.**

## ٨- بابُ تَرْخِيصِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الأَوْعِيَةِ وَالظُّرُوفِ بَعْدَ النَّهْيِ

٥٥٩٢- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الظُّرُوفِ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: إِنَّهُ لاَ بُدَّ لَنَا مِنْهَا. قَالَ: «فَلاَ إِذًا».وَقَالَ خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ بِهَذَا.

٥٥٩٢ /م- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بِهَذَا، وَقَالَ فِيهِ: لَمَّا نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الأَوْعِيَةِ.

---

(١) بڕوانە: ٥١٧٦.

(٢) یان قاپی مس یان قاپی دروستکراو لە دار.

## ٨- باسی ڕێگەدانی پێغەمبەر ﷺ (بەخۆشاو کردن) لە چەند دەفر و زەرفێکدا پاش ئەوە پێشتر ڕێگری لێ کردبوو

**٥٥٩٢-جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردبوو (لە خۆشاو دروست کردن) لە هەندێ زەرف و دەفردا، ئینجا ئەنصارییەکان وتیان: ئێمە ناچارین و پێویستمان پێیانە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کەواتە ڕێگریان لێ ناکرێ)).**

**خەلیفە دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە و وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە مەنصورەوە لە سالیمی کوڕی ئەبی جەعدەوە، ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە.**

**٥٥٩٢-عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، وە لەو فەرموودەدا دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد (لە خۆشاو کردن) لە دەفردا.**

٥٥٩٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي مُسْلِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أَبِي عِيَاضٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: لَمَّا نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الأَسْقِيَةِ، قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: لَيْسَ كُلُّ النَّاسِ يَجِدُ سِقَاءً. فَرَخَّصَ لَهُمْ فِي الْجَرِّ غَيْرِ الْمُزَفَّتِ.

**٥٥٩٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد (لە خۆشاو شەربەت کردن) لە جەوەنەدا، بە پێغەمبەر ﷺ وترا: هەموو خەڵك جەوەنەیان نییە، بۆیە ڕێگەی دان (بەخۆشاو کردن) لە هەموو کوپەیەکدا جگە لەکوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواو.**

٥٥٩٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ. حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ بِهَذَا.

**٥٥٩٤-عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (خۆشاوکردنی) لە ناو کولەکە و کوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواوی قەدەغە کرد.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) عوسمان بۆی گێڕاینەوە وتی: جەریر بۆی گێڕاینەوە لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەی پێشووی بۆ گێڕاینەوە.**

٥٥٩٥- حَدَّثَنِي عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ: قُلْتُ لِلأَسْوَدِ: هَلْ سَأَلْتَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَمَّا يُكْرَهُ أَنْ يُنْتَبَذَ فِيهِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، عَمَّا نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُنْتَبَذَ فِيهِ؟ قَالَتْ: نَهَانَا فِي ذَلِكَ -أَهْلَ الْبَيْتِ- أَنْ نَنْتَبِذَ فِي الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ. قُلْتُ: أَمَا ذَكَرْتِ الْجَرَّ وَالْحَنْتَمَ؟ قَالَ: إِنَّمَا أُحَدِّثُكَ مَا سَمِعْتُ، أَفَأُحَدِّثُ مَا لَمْ أَسْمَعْ؟

**٥٥٩٥-ئیبراهیم دەڵێ: بە ئەسوەدم وت: ئایا پرسیارت لە عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ کرد دەربارەی ئەو شتانەی کە ناپەسەندە خۆشاو شەربەتیان تیا بکرێ؟ ئەویش وتی: بەڵێ وتم: ئەی دایکی باوەڕداران پێغەمبەر ﷺ چ شتێکی قەدەغە کردوە کە خۆشاوی تیا بکرێ؟ عائیشەش ﷺ وتی: لەو بارەیەوە - ئێمەی ماڵ و منداڵی - ڕێگری لێ کردین کە خۆشاو بکەین لە کولەکە و کوپەی قیر و زەفت تێهەڵسواو، (ئیبراهیم دەڵێ) وتم: ئەی باسی کوپە (ی لەقوڕەوە دروست کراو) و دەفری هەڵکۆڵراو لە بنکی دار خورمای نەکرد؟ (ئەسود) وتی: بێگومان من ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە کە بیستومە، ئایا ئەوەت بۆ بگێڕمەوە کە نەمبیستووە؟**

٥٥٩٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الشَّيْبَانِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْجَرِّ الأَخْضَرِ. قُلْتُ: أَنَشْرَبُ فِي الأَبْيَضِ؟ قَالَ: لاَ.

**٥٥٩٦-شەیبانی دەڵێ: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ئەوفام ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ (خۆشاو كردنی) لە كوپەی سەوزدا قەدەغە كرد، وتم: ئەی لە كوپەی سپیدا ئاو بخۆینەوە؟ (عەبدوڵلا) وتی: نەخێر.**

## ٩- بابُ نَقِيعِ التَّمْرِ مَا لَمْ يُسْكِرْ

٥٥٩٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْقَارِيُّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ، أَنَّ أَبَا أُسَيْدٍ السَّاعِدِيَّ دَعَا النَّبِيَّ ﷺ لِعُرْسِهِ، فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَهْيَ الْعَرُوسُ. فَقَالَتْ: مَا تَدْرُونَ مَا أَنْقَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ أَنْقَعْتُ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ[1].

## ٩- باسی (دروستە خواردنەوەی) خۆشاوی خورما بەمەرجێ (مرۆڤ) سەرخۆش نەكات

**٥٥٩٧- سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەیگێڕێتەوە: كە ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دەعوەت كرد بۆشاییەكەیی، جا هاوسەرەكەی-كە لەو كاتەدا بووك بوو- خزمەتكاریان بوو (ئوممو ئوسەید) وتی: دەزانن چ خواردنەوەیەكم دا بە پێغەمبەر ﷺ بیخواتەوە؟ لە شەودا هەندێ خورمام كردبوویە ئاوەوە بۆی لە دەفرێكی بەردیندا.**

## ١٠- بابُ الْبَاذَقِ، وَمَنْ نَهَى عَنْ كُلِّ مُسْكِرٍ مِنَ الْأَشْرِبَةِ

وَرَأَى عُمَرُ وَأَبُو عُبَيْدَةَ وَمُعَاذٌ ﷺ شُرْبَ الطِّلَاءِ على الثُّلُثِ. وَشَرِبَ البَرَاءُ وَأَبُو جُحَيْفَةَ ﷺ على النِّصْفِ. وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: اشْرَبِ العَصيرَ مَا دَامَ طَرِيًّا. وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَدْتُ مِنْ عُبَيْدِ اللَّهِ رِيحَ شَرَابٍ، وَأَنَا سَائِلٌ عَنْهُ، فَإِنْ كَانَ يُسْكِرُ جَلَدْتُهُ.

---

(١) بڕوانە: ٥١٧٦.

## ١٠- باسی شەربەتی ترێ کەمێ بکوڵێنرێت، وە باسی ئەو کەسەی هەموو سەرخۆش کەرێکی قەدەغە کردوە لە خواردنەوەکان

-عومەر و ئەبو عوبەیدە و موعاز ﷺ ڕایان وایە خواردنەوەی شەربەتی ترێ (کوڵێنرابوو) نیوەی مابویەوە سێیەکی مابێت دروستە بخورێتەوە.

-بەڕاو و ئەبو جوحەیفە ﷺ شەربەتی ترێ یان خواردۆتەوە کە (کوڵێنراوبێ و) نیوەی مابێتەوە.

-عومەر ﷺ: هەستم بە بۆنی ئارەق کرد لە عوبەیدوڵلاوە، وەمن پرسیاری دەکەم لە بارەی ئەو خواردنەوەیەوە، جا ئەگەر مرۆڤ سەرخۆش بکات شەلاقی شەراب خواردنەوەی لێ دەدەم[1].

٥٥٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الْجُوَيْرِيَةِ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنِ الْبَاذَقِ،

فَقَالَ: سَبَقَ مُحَمَّدٌ ﷺ الْبَاذَقَ فَمَا أَسْكَرَ فَهْوَ حَرَامٌ. قَالَ: الشَّرَابُ الْحَلاَلُ الطَّيِّبُ. قَالَ: لَيْسَ بَعْدَ الْحَلاَلِ الطَّيِّبِ إِلاَّ الْحَرَامُ الْخَبِيثُ.

٥٥٩٨-ئەبو لجومیرییە دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس ﷺ کرد دەربارەی بازەق[2]ئیبنو عەبباس وتی: موحەممەد ﷺ پێش بازەق بووە، بۆیە هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش کات ئەوە بێگومان حەرامە، (ئەبو جووەیرییە) وتی: ( بازەق) خواردنەوەیەکی حەڵاڵی پاکە؟ ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: لە پاش حەڵاڵی پاك هیچ نییە جگەلە حەرامی پیس.

---

(١) پرسیاری لێ کردو زانی سەرخۆشکەرە بۆیە شەلاقی لێ دا.

(٢) بازەق: شەربەتی ترێیە کەمێ کوڵا بێ.

٥٥٩٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ[١].

**٥٥٩٩-عوروه له باوكييەوە ئەويش لە عائيشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە حەڵوا و هەنگوین بووە)).**

## ١١- بابُ مَنْ رَأَى أَنْ لاَ يَخْلِطَ الْبُسْرَ وَالتَّمْرَ إِذَا كَانَ مُسْكِرًا، وَأَنْ لاَ يَجْعَلَ إِدَامَيْنِ فِي إِدَامٍ

٥٦٠٠- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: إِنِّي لأَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ وَأَبَا دُجَانَةَ وَسُهَيْلَ ابْنَ الْبَيْضَاءِ خَلِيطَ بُسْرٍ وَتَمْرٍ إِذْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، فَقَذَفْتُهَا وَأَنَا سَاقِيهِمْ وَأَصْغَرُهُمْ، وَإِنَّا نَعُدُّهَا يَوْمَئِذٍ الْخَمْرَ. وَقَالَ عَمْرُو بْنُ الْحَارِثِ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، سَمِعَ أَنَسًا[٢].

## ١١- باسی ئەوەی ڕای وایە فەریکە خورما و خورما تێکەڵ نەکرێن ئەگەر (تێکەڵ کردنەکەیان) سەرخۆش کەربێت، وە دوو پێخۆر نەکرێن بەیەک پێخۆر[٣]

**٥٦٠٠-ئەنەس ﵁ دەڵێ: من ئارەقم دەگێڕا بۆ ئەبو ئەبو تەڵحە و ئەبو دوجانە و سوهەیلی کوڕی بەیزا (کە بریتی بوو لە) تێکەڵ کراوی فەریکە خورما و خورما، کاتێ حەرام کرا، جا منیش فڕێم دا، من ئارەقم بۆ دەگێڕان و لە هەمووشیان تەمەنم کەمتر بوو، وە ئێمە لەو ڕۆژگارەدا ئەوەمان بە ئارەق دادەنا.**

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٢) بڕوانە: ٢٤٦٤.

(٣) وەك تێكەڵ كردنی خورماو مێوژ هۆكارەكەشی لەوانەیە بە تێكەڵكردنیان ببنە سەرخۆشكەر.

**-عەمری كوڕی حاریس دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە كە (ئەم فەرموودەی) لە ئەنەس بیستووە.**

٥٦٠١- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ وَالْبُسْرِ وَالرُّطَبِ.

**٥٠٦١-جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردوە (لە تێكەڵكردنی) خورما و مێوژ، وە (تێكەڵكردنی) فەریكە خورما و خورما.**

٥٦٠٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ التَّمْرِ وَالزَّهْوِ، وَالتَّمْرِ وَالزَّبِيبِ، وَلْيُنْبَذْ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا على حِدَةٍ.

**٥٦٠٢-عەبدوڵڵای كوڕی قەتادە لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردوە لە فەریكە خورما و خورما پێكەوە كۆبكرێنەوە، هەروەها خورما و مێوژ، كەواتە با هەر یەكەیان بە تەنها خۆشاو و شەربەتی لێ دروست بكرێ.**

## ١٢- بابُ شُرْبِ اللَّبَنِ

وقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّـٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ النحل

٥٦٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ وَقَدَحِ خَمْرٍ[1].

(١) بڕوانە: ٣٣٩٤.

## ١٢- باسی خواردنەوەی شیر (دروستە)

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بلّند: (لە نێوان سرپوان و خوێندا شیرێکی پاکی بێخەوشی ڕەوان هەیە بۆ نۆشەرانی).**

**٥٦٠٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەو شەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوڕەوی پێکرا، جامێ شیر و جامێ ئارەقی بۆ هێنرا.**

٥٦٠٤- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، سَمِعَ سُفْيَانَ، أَخْبَرَنَا سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ أَنَّهُ سَمِعَ عُمَيْرًا -مَوْلَى أُمِّ الْفَضْلِ- يُحَدِّثُ عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ قَالَتْ: شَكَّ النَّاسُ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِإِنَاءٍ فِيهِ لَبَنٌ فَشَرِبَ. فَكَانَ سُفْيَانُ رُبَّمَا قَالَ: شَكَّ النَّاسُ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَرَفَةَ فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ أُمُّ الْفَضْلِ. فَإِذَا وُقِفَ عَلَيْهِ قَالَ: هُوَ عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ[1].

**٥٦٠٤-سالیم ئەبو نەزر دەڵێ: لە عومەیری -ئازاد کراوی ئوممو لفەزلی ﷺ- بیست لە ئوممی لفەزڵەوە دەیگێڕایەوە کە وتی: لە ڕۆژی عەرەفەدا خەڵکی گومانیان هەبوو لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش جامێکم بۆ نارد کە شیری تیا بوو، پێغەمبەریش ﷺ لێی خواردووە.**

**جا سوفیان هەندێ جار دەیوت:[2] لە ڕۆژی عەرەفەدا خەڵکی بەگوومان بوون لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئوموو لفەزڵیش (جامێ شیری) بۆ نارد. ئەگەر سوفیان لەسەر فەرموودەکە بوەستایەو بەمورسەلی بیهێنایە (پرسیاری لێ بکردایە) دەیوت: ئەم فەرموودەم لەئوممو لفەزڵەوە گێڕاوەتەوە[3]**

---

(١) بروانە: ١٦٥٨.

(٢) فەرموودەکەی بەم جۆرە دەگێرایەوە.

(٣) واتە: هەندێ جار سوفیان فەرمودەکەی بە مورسەلی دەگێرایەوە، واتە: ناوی ئوممو لفەزلی نەدەهێنا، بەڵام کە پرسیاری لێ بکرایە دەیوت ئوممولفەزڵ گێراویەتیەوە.

٥٦٠٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ وَأَبِي سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ اللَّهِ قَالَ: جَاءَ أَبُو حُمَيْدٍ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ مِنَ النَّقِيعِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَّ خَمَّرْتَهُ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُودًا»[١].

**٥٦٠٥-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئەبوحومەید لە نەقیعەوە[٢] جامێ شیری هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێی: ((بۆ دات نەپۆشیوە با دارێکیش بوایە لەسەری داتنایە)).**

٥٦٠٦- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ يَذْكُرُ - أُرَاهُ- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَبُو حُمَيْدٍ -رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ- مِنَ النَّقِيعِ بِإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلاَّ خَمَّرْتَهُ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُودًا». وَحَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا[٣].

**٥٦٠٦-جابیر ﷺ دەڵێ: ئەبو حومەید-کەپیاوێکی ئەنصاری بوو-لە نەقیعەوە بەجامێ شیرەوە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بۆ جامەکەت دانەپۆشیوە بادارێکیش بوایە لەسەری داتنایە)).**
**(ئەعمەش دەڵێ:) ئەبو سوفیان لە جابیرەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە.**

٥٦٠٧- حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا النَّضْرُ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ ﷺ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ مَكَّةَ وَأَبُو بَكْرٍ مَعَهُ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَرَرْنَا بِرَاعٍ وَقَدْ عَطِشَ

---

(١) بڕوانە: ٥٦٠٦.
(٢) نەقیع: شوێنەکە (٣٨) سی و هەشت کیلۆ مەتر لە مەدینەوە دوورە لە شیوی عەقیق کە دەکەوێتە ئەوسەری ئەو ڕێگایەی پێغەمبەر ﷺ لە کۆچدا پێیدا هات بۆ مەدینە لەخوارەوەی مەدینە.
(٣) بڕوانە: ٥٦٠٥.

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: فَحَلَبْتُ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ فِي قَدَحٍ،فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ، وَأَتَانَا سُرَاقَةُ بْنُ جُعْشُمٍ عَلَى فَرَسٍ، فَدَعَا عَلَيْهِ، فَطَلَبَ إِلَيْهِ سُرَاقَةُ أَنْ لاَ يَدْعُوَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يَرْجِعَ، فَفَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ[1].

**٥٦٠٧-ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە بەڕائم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە و ئەبو بەکریشی ﷺ لەگەڵدا بوو، ئەبو بەکر ﷺ وتی: بەلای شوانێکدا ڕۆشتین لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ تینوی بوو، پڕی جامێ شیرم دۆشییە جامێکەوە، جا پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی لێی خواردەوە، تا زانیم تێر بوو، سوراقەی کوڕی جوعشوم بەسواری ئەسپێکەوە هات بۆمان[2](پێغەمبەر ﷺ) دوعای لێ کرد، سوراقەش داوای لێ کرد تا دوعای لێ نەکات و سوراقە بگەڕێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ دوعای لێ نەکرد (و ئەویش گەڕایەوە).**

٥٦٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «نِعْمَ الصَّدَقَةُ، اللِّقْحَةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً، وَالشَّاةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً، تَغْدُو بِإِنَاءٍ، وَتَرُوحُ بِآخَرَ»[3].

**٥٦٠٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چەند چاکە پێدانی وشترێکی شیرای تازە زاو بەکەسێك بۆ شیر و ماستەکەی زۆر کارێکی چاکە، هەروەها مەڕێکی چاکی شیرا بەیانیان و ئێواران جامێ شیر دەبەخشێت بەو کەسە (ی پێی بەخشراوە) )).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٣٩.

(٢) بەنیازی ئەوە بمانکوژێت بەهیوای پاداشتە گەورەی قورەیشی دەسکەوێت کە دەیدا بەهەرکەسێ ئێمە بکوژێ.

(٣) بڕوانە: ٢٦٢٩.

٥٦٠٩- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا فَمَضْمَضَ وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا»[١].

**٥٦٠٩-ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ شیرێكی خواردەوە ئینجا ئاوی لە دەمی ڕادا و فەرمووی: ((بێگومان چەوری هەیە)).**

٥٦١٠ - وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ: عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رُفِعْتُ إِلَى السِّدْرَةِ فَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ، نَهَرَانِ ظَاهِرَانِ، وَنَهَرَانِ بَاطِنَانِ، فَأَمَّا الظَّاهِرَانِ النِّيلُ وَالْفُرَاتُ، وَأَمَّا الْبَاطِنَانِ فَنَهَرَانِ فِي الْجَنَّةِ، فَأُتِيتُ بِثَلَاثَةِ أَقْدَاحٍ، قَدَحٌ فِيهِ لَبَنٌ، وَقَدَحٌ فِيهِ عَسَلٌ، وَقَدَحٌ فِيهِ خَمْرٌ، فَأَخَذْتُ الَّذِي فِيهِ اللَّبَنُ فَشَرِبْتُ، فَقِيلَ لِي: أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ أَنْتَ وَأُمَّتُكَ».

قَالَ هِشَامٌ وَسَعِيدٌ وَهَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الأَنْهَارِ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرُوا ثَلَاثَةَ أَقْدَاحٍ[٢].

**٥٦١٠- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیدرە[٣]هێنرایە پێش چاوم جا چوار ڕووبارم بینی تیایدا، دوو ڕوووباریان ئاشكراو دیار بوون، دوو ڕوباریشیان شاراوە و نادیار بوون، جا دووانە دیارەكەیان: نیل و فوڕات بوون، دووانە شاراوەكەشیان دوو ڕوبار بوون لە بەهەشتدا، ئینجا سێ جامم بۆ هێنرا، جامێكیان شیری تیا بوو خواردمەوە، جا پێم وترا تۆ و ئوممەتەكەت ڕێگای ڕاستان دۆزیوەتەوە[٤])).**

(١) بروانە: ٢١١.

(٢) بروانە: ٣٥٧٠.

(٣) سیدرە: مەبەست پێی (سدرة المنتهى) یە.

(٤) مەبەست بە (الفطرة) ڕێگای ڕاستە كە ئیسلام و ڕێبازەكەیەتی.

-هشام و سەعید و هەممام لە قەتادەوە دەیگێڕنەوە ئەویش لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەیگێڕێتەوە، ئەویش لە مالیكی كوڕی صەعصەعەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودە دەگێڕنەوە، دەربارەی ڕووبارەكان وەك فەرموودەكەی شوعبە لە قەتادەوە، بەڵام باسی سێ جامەكەیان نەكردوە.

## ١٣- بَابُ اسْتِعْذَابِ الْمَاءِ

٥٦١١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبُّ مَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَاءَ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ. قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران. قَامَ أَبُو طَلْحَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ ﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ آل عمران. وَإِنَّ أَحَبَّ مَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ أَرَاكَ اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَخٍ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ -أَوْ رَايِحٌ، شَكَّ عَبْدُ اللَّهِ- وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ». فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَفِي بَنِي عَمِّهِ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ وَيَحْيَى بْنُ يَحْيَى: "رَايِحٌ"[١].

## ١٣- باسی داوای ئاوی شیرین كردن

٥٦١١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە لە ناو ئەنصارییەكاندا لە مەدینە لە هەموو باخی دار خورمای زیاتر بوو، وە باخی بەیروحا لە هەموو ماڵەكانی لای خۆشەویستر بوو، كە بەرانبەر مزگەوت بوو، وە پێغەمبەری خوا

(١) بڕوانە: ١٤٦١.

ﷺ هەمیشە دەڕۆشتە ناوییەوە و لەو ئاوە شیرین و سازگارەی تێیدا بوو دەیخواردەوە، ئەنەس دەڵێ: جا کاتێ ئەم ئایەت دابەزی: (ئێوە ناگەن خێر و چاکە دەستگیرتان نابێ تا هەندێ لەو ماڵ و سامانەی کە خۆشتان دەوێ بەختی نەکەن)، ئەبو تەڵحە هەستا (و ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خوای گەورە دەفەرمووی: (بەچاکە ناگەن تا هەندێ لەو ماڵەی خۆشتان دەوێ نەیبەخشن)، وە بەڕاستی خۆشەویسترین ماڵی من بەلامەوە بەیروحایە، ئەوە خێربێ لە ڕێی خوادا هیوای چاکە و پاداشتی لای خوای لێ دەکەم، جا ئەی پێغەمبەری خوا تۆ خۆت خوا چۆنت پێ دەڵێ لەوێدا داینێ، ئەنەس: دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەخوا ئەوە ماڵێکی پڕ قازانج و خێرە -یان ماڵێکە قازانجەکە دەست خاوەنەکەی دەکەوێت، عەبدوڵلا گومانی بردووە- بێگومان ئەوەی ووتت بیستم و بەڕاستی من ڕام وایە بیکەیتە خێر چاکە بۆ خزمەکانت))، ئەبو تەڵحەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەواتە وای لێ دەکەم، جا ئەبو تەڵحە لە نێوان خزم و ئامۆزاکانیدا بەشی کرد. وە ئیسماعیل و یەحیای کوڕی یەحیا بە ((رَايِحٌ)) گێڕاویانەتەوە لەجیاتی ((رَابِحٌ)).

## ١٤- بابُ شَوْبِ اللَّبَنِ بِالْمَاءِ

٥٦١٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا وَأَتَى دَارَهُ، فَحَلَبْتُ شَاةً، فَشُبْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْبِئْرِ، فَتَنَاوَلَ الْقَدَحَ فَشَرِبَ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ، فَأَعْطَى الأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: «الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ»[1].

(١) بروانە: ٢٣٥٢.

## ١٤- باسى تێكەڵكردنی شیر لەگەڵ ئاو

**٥٦١٢-زوهری دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە كە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی شیرێكی خواردەوە و هات بۆ ماڵی ئەنەس، منیش مەڕێكم بۆ دۆشی لە (ئاوی) بیرەكەم تێكەڵ كرد[١] بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ جامەكەی[٢] وەرگرت و خواردیەوە، وە ئەبو بەكر ﷺ لای چەپیەوە بوو لای ڕاستیشیەوە عەرەبێكی دەشتەكی بوو، ئینجا ئەوی لە خۆی زیاد بوو دای بە عەرەبە دەشتەكییەكە، پاشان فەرمووی ((لای ڕاست (پێشخەن) ئینجا لای ڕاست)).**

٥٦١٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ على رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنَّةٍ، وَإِلاَّ كَرَعْنَا». قَالَ: وَالرَّجُلُ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطِهِ قَالَ: فَقَالَ الرَّجُلُ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِنْدِي مَاءٌ بَائِتٌ فَانْطَلِقْ إِلَى الْعَرِيشِ. قَالَ: فَانْطَلَقَ بِهِمَا، فَسَكَبَ فِي قَدَحٍ، ثُمَّ حَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ قَالَ: فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ شَرِبَ الرَّجُلُ الَّذِي جَاءَ مَعَهُ[٣].

**٥٦١٣-جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی پیاوێكی ئەنصاری و هاوەڵێك لە خزمەتی دا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بەخاوەن ماڵەكە): ئەگەر ئاوت لایە شەو كە لەو كونەدا مابێتەوە بماندەرێ، ئەگەر نییە دەم دەخەینە ناو ئاوەكە و دەیخۆینەوە))، (جابیر) دەڵێ: خاوەن**

(١) واتە: لە ئاوی بیرەكەم تێكەڵ بە شیرەكە كرد.
(٢) كە شیری تێكەڵاوكراو بە ئاو تیا بوو.
(٣) بڕوانە: ٥٦٢١.

ماڵەكە ئاوی باغی خورماكەی دەدێرا و دەگواستەوە، دەڵێ: پیاوەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئاوی شەو ماوەم لایە، جەنابت بڕۆ بۆ ژێر كەپرەكە، ئینجا لە خزمەتی هەردووكیاندا[1] ڕۆشت تا بردنیە ژێر كەپرەكە، جا ئاوی كردە جامێكەوە پاشان بەسەر ئاوەكەدا ئاژەڵێكی ماڵی بۆ دۆشین، دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نۆشی كرد لە دوای ئەو ئەو پیاوەش كە لە خزمەتیدا هاتبوو خواردیەوە و نۆشی كرد.

## ١٥- بابُ شَرَابِ الْحَلْوَاءِ وَالْعَسَلِ

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لَا يَحِلُّ شُرْبُ بَوْلِ النَّاسِ لِشِدَّةٍ تَنْزِلُ؛ لأَنَّهُ رِجْسٌ. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَٰتُ ۝٥ ﴾ المائدة، وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ فِي السَّكَرِ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ.

٥٦١٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الْحَلْوَاءُ وَالْعَسَلُ[2].

## ١٥- باسی خواردنەوەی شیرین و (خواردنەوەی) هەنگوین

-زوهری دەڵێ: دروست نییە میزی مرۆڤ بخورێتەوە لەبەر سەختیەك بەسەر مرۆڤدا دێت چونكە پیسە، خوای بەرز و بڵند دەفەرمووی: (هەموو خۆراكە پاكەكانتان بۆ حەڵاڵ كراوە).

-ئیبنو مەسعوود ﵁ دەربارەی ئارەق دەڵێ: بێگومان خوا چارەسەری ئێوەی لە شتێكدا دانەناوە كە حەرام كراوە لەسەرتان.

٥٦١٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە حەڵوا و هەنگوین بوو)).

---

(١) پێغەمبەر و ﷺ هاوڕێكەیدا.

(٢) بڕوانە: ٤٩١٢.

## ١٦- بابُ الشُّرْبِ قائمًا

٥٦١٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنِ النَّزَّالِ قَالَ: أَتَى عَلِيٌّ ﷺ عَلَى بَابِ الرَّحَبَةِ، فَشَرِبَ قَائِمًا فَقَالَ: إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُ أَحَدُهُمْ أَنْ يَشْرَبَ وَهْوَ قَائِمٌ، وَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَ كَمَا رَأَيْتُمُونِي فَعَلْتُ[1].

## ١٦- باسی (حوکمی) خواردنەوە بە پێوە

**٥٦١٥-نەززال دەڵێ: عەلی ﷺ هاتە لای دەرگای حەوشە (ی مزگەوتی کوفە) و بەپێوە ئاوی خواردەوە، ئینجا وتی: بێگومان کەسانێك بەلایانەوە ناپەسەندە کەسێکیان بە پێوە ئاو بخواتەوە، وە بەڕاستی من پێغەمبەرم ﷺ دیوە وای کرد، وەك ئەوەی منتان دی کردم.**

٥٦١٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَيْسَرَةَ، سَمِعْتُ النَّزَّالَ بْنَ سَبْرَةَ يُحَدِّثُ عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ قَعَدَ فِي حَوَائِجِ النَّاسِ فِي رَحَبَةِ الْكُوفَةِ حَتَّى حَضَرَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ، ثُمَّ أُتِيَ بِمَاءٍ، فَشَرِبَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ -وَذَكَرَ رَأْسَهُ وَرِجْلَيْهِ- ثُمَّ قَامَ فَشَرِبَ فَضْلَهُ وَهْوَ قَائِمٌ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُونَ الشُّرْبَ قَائِمًا، وَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُ[2].

**٥٦١٦-نەززالی کوڕی سەبرە: دەگێڕێتەوە لە عەلیەوە ﷺ کە نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان لە مزگەوتی گەورەی کوفەدا دانیشت بۆ (گوێگرتن لە) پێویستی خەڵك تا نوێژی عەسر، پاشان ئاوێکیان هێنا و خواردییەوە و ڕووخسار و دەستەکانی شۆرد.**

---

(١) بڕوانە: ٥٦١٦.

(٢) بڕوانە: ٥٦١٥.

-باسی سەری و پێیەكانیشی كرد - پاشان هەستا و ئەو ئاوە لێی زیادبوو خواردیەوە، لە پاشان فەرمووی: بێگومان كەسانێك ئاو خواردنەوەی بە پێوەیان لا ناپەسەندە، وە بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەی كرد من كردم.

٥٦١٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: شَرِبَ النَّبِيُّ ﷺ قَائِمًا مِنْ زَمْزَمَ[١].

٥٦١٧-ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەپێوە لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە.

## ١٧- بابُ مَنْ شَرِبَ وَهُوَ واقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ

٥٦١٨- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، أَخْبَرَنَا أَبُو النَّضْرِ، عَنْ عُمَيْرٍ -مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ- عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ أَنَّهَا أَرْسَلَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِقَدَحِ لَبَنٍ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَشَرِبَهُ. زَادَ مَالِكٌ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ: عَلَى بَعِيرِهِ[٢].

## ١٧- باسی (حوكمی) كەسێک لە كاتێكدا بەسەر وشترەكەیەوە خواردنەوە بخواتەوە

٥٦١٨- عومەیری ئازاد كراوی ئیبنو عەبباس لە ئوممو لفەزڵی كچی حاریس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، كە جامێ شیری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا لە ئێوارەی عەرەفەدا ڕاوەستابوو، بەدەستی جامە شیرەكەی وەرگرت و خواردیەوە.

مالیك (لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەدا) ئەم زیادەی هێناوە: لەسەر وشترەكەی (وەستا بوو).

---

(١) بڕوانە: ١٦٣٧.

(٢) بڕوانە: ١٦٥٨.

## ١٨- بابٌ: الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ فِي الشُّرْبِ

٥٦١٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ وَعَنْ شِمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ، فَشَرِبَ، ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ، وَقَالَ: «الأَيْمَنَ الأَيْمَنَ»[1].

## ١٨- باسێک: لای ڕاستەوە دەست پێبکە تا کۆتایی لە خواردنەوەی (ئاو و شتنی لەو جۆرە)

**٥٦١٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە شیرێك تێکەڵ بە ئاوکرا بوو، هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ عەرەبێکی دەشتەکی لای ڕاستیەوە بوو، ئەبو بەکریش ﷺ لای چەپیەوە بوو، ئینجا خۆی لێی خواردەوە، پاشان دای بەعەرەبە دەشتەکییەکە و فەرمووی: ((لای ڕاستەوە دەست پێبکەن تا کۆتایی)).**

## ١٩- بابٌ: هَلْ يَسْتَأْذِنُ الرَّجُلُ مَنْ عَنْ يَمِينِهِ فِي الشُّرْبِ لِيُعْطِيَ الأَكْبَرَ؟

٥٦٢٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلاَمٌ وَعَنْ يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلاَمِ: «أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هَؤُلاَءِ؟». فَقَالَ الْغُلاَمُ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا. قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي يَدِهِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٢.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥١.

## ١٩- باسێك: ئایا کەسێك لە خواردنەوەدا مۆڵەت بخوازێ لە کەسێکی لای ڕاستیەوە بۆ ئەوەی خواردنەوەکە بدات بە گەورەتر لەو؟

**٥٦٢٠-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنەوەیەکی بۆ هێنرا و لێی خواردەوە، مێر منداڵێك لای ڕاستیەوە بوو، چەند پیاوێکی بە تەمەنیش لای چەپیەوە بوون، جا بە مێر منداڵەکەی فەرموو: ((ڕێگەم پێ دەدەیت کە (خواردنەوەکە) بدەمە ئا ئەوانە؟ مێر منداڵەکەش وتی: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی خۆم لە پاشماوەی تۆ بە کەس نادەم و پێشی ناخەم بەسەر خۆمدا، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ جامەکەی دایە دەستی)).**

## ٢٠- بابُ الْكَرْعِ فِي الْحَوْضِ

٥٦٢١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ، فَسَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ وَصَاحِبُهُ، فَرَدَّ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي. وَهْيَ سَاعَةٌ حَارَّةٌ، وَهْوَ يُحَوِّلُ فِي حَائِطٍ لَهُ -يَعْنِي: الْمَاءَ- فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ وَإِلاَّ كَرَعْنَا». وَالرَّجُلُ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ. فَانْطَلَقَ إِلَى الْعَرِيشِ فَسَكَبَ فِي قَدَحٍ مَاءً، ثُمَّ حَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ، فَشَرِبَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ أَعَادَ، فَشَرِبَ الرَّجُلُ الَّذِي جَاءَ مَعَهُ[1].

(١) بڕوانە: ٥٦١٣.

## ٢٠- باسی ئاوخواردنەوە بەدەم خستنە حەوزەوە

٥٦٢١- جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی پیاوێكی ئەنصاری و هاوەڵێك لە خزمەتی دا بوو، پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵەكەی سەلامیان لێ كرد، پیاوەكەش وەڵامی دانەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایك و باكمەوە بە قوربانت بم. كاتەكە زۆر گەرم بوو، ئاوی باخی خورماكەی دەدێرا و دەگواستەوە- واتە ئاوی دەدێرا-، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( (بە خاوەن ماڵەكە) ئەگەر ئاوت لایە شەو لەو كونەدا مابێتەوە بماندەرێ، ئەگەر نییە دەم دەخەینە ناو ئاوەكە و دەیخۆینەوە))، (جابیر) دەڵێ: پیاوەكەش ئاوی بەناو باخی خورمایەكدا دەدێرا و دەگواستەوە، پیاوەكەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوم لایە شەو مابێتەوە لە كونەدا، جەنابت بڕۆ بۆ ژێر كەپرەكە، جا ئاوی كردە جامێكەوە پاشان شیری ئاژەڵێكی لە ماڵەوە بووی بۆ دۆشین بەسەر ئاوەكەدا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نۆشی كرد، پاشان دووبار هێنایەوە، جا ئەو پیاوەش كە لە خزمەتیدا هاتبوو خواردیەوە و نۆشی كرد.

## ٢١- بابُ خِدْمَةِ الصِّغَارِ الكِبَارَ

٥٦٢٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا على الْحَيِّ أَسْقِيهِمْ -عُمُومَتِي وَأَنَا أَصْغَرُهُمُ- الْفَضِيخَ، فَقِيلَ: حُرِّمَتِ الْخَمْرُ. فَقَالوا: أَكْفِئْهَا. فَكَفَأْنَا. قُلْتُ لأَنَسٍ: مَا شَرَابُهُمْ؟ قَالَ: رُطَبٌ وَبُسْرٌ. فَقَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَنَسٍ: وَكَانَتْ خَمْرَهُمْ. فَلَمْ يُنْكِرْ أَنَسٌ.

وَحَدَّثَنِي بَعْضُ أَصْحَابِي أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَتْ خَمْرَهُمْ يَوْمَئِذٍ[1].

---

(١) بروانە: ٢٤٦٤.

## ٢١- باسی بچووک و کەم تەمەن خزمەتی گەورە و بەتەمەن بکات

**٥٦٢٢- موعتەمیر لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: من بەسەر کۆمەڵێ خەڵکەوە وەستابووم کە مامەکانم بوو من لەهەموویان تەمەنم کەمتر بوو - ئارەقی (دروست کراو) لە فەریکە خورمام بۆ دەگێڕان و پێم دەدان، جا وترا ئارەق حەرام کرا، ئەوانیش[1] وتیان: ئارەقەکە بڕژە ئێمەش ڕشتمان، (سولەیمان دەڵێ) وتم بە ئەنەس: خواردنەوەیان چی بوو؟ وتی: (عارەقی) خورمای تازە و فەریکە خورما بوو، ئەبو بەکری کوڕی ئەنەسیش وتی: ئەوە ئارەقیان بوو، ئەنەسیش وتەکەی ئەبو بەکری ڕەد نەکردەوە، (وە سولەیمان دەڵێ:) هەندێ لە هاوڕێکانم بۆیان گێڕامەوە کە لە ئەنەسی ﷺ بیستووە دەیوت: لەو ڕۆژگارە ئارەقی ئەوان بوو.**

## ٢٢- بابُ تَغْطِيَةِ الإِنَاءِ

٥٦٢٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ -أَوْ أَمْسَيْتُمْ- فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَحُلُّوهُمْ، فَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئًا، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ»[2].

---

(١) مامەکانی ئەنەس.

(٢) بڕوانە: ٣٢٨٠.

## ٢٢- باسی داپۆشینی دەفر

**٥٦٢٣-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەگەر تاریکای شەو داهات -یان ئێوارەتان بەسەردا هات-، ئەوسا منداڵەکانتان قەدەغە بکەن (لە ڕۆشتنە دەرەوە)، چونکە بێگومان شەیتانەکان لەو کاتەدا بڵاو دەبنەوە، جا کە سەعاتێ لە شەو تێپەڕی وازیان لێبێنن (برۆنە دەرەوە)، دەرگاکانیش داخەن و ناوی خوابێنن[1]، چونکە بەڕاستی شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، وە دەمی کوندە و مەشکەکانتان ببەستن و ناوی خوا بێنن و دەفرەکانتان داپۆشن و یادی خوا بکەن، با شتێکیشتان ڕایەڵ کردبێ بەسەریدا، چراکانیشتان بکوژێننەوە)).**

٥٦٢٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَطْفِئُوا الْمَصَابِيحَ إِذَا رَقَدْتُمْ، وَغَلِّقُوا الأَبْوَابَ، وَأَوْكُوا الأَسْقِيَةَ، وَخَمِّرُوا الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ - وَأَحْسِبُهُ قَالَ: - وَلَوْ بِعُودٍ تَعْرُضُهُ عَلَيْهِ»[2].

**٥٦٢٤-جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ خەوتن چراکانتان بکوژێننەوە، دەرگاکانیش دابخەن، دەمی کوندە و مەشکەکان ببەستن، خواردن و خواردنەوە داپۆشن، وابزانم فەرمووی با بەچیلکەیەکیش بێت بیخەیتە لەسەری)).**

## ٢٣- بابُ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ

٥٦٢٥- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ. يَعْنِي: أَنْ تُكْسَرَ أَفْوَاهُهَا فَيُشْرَبَ مِنْهَا[1].

---

(١) یان یادی خوا بکەن.

(٢) بڕوانە: ٣٢٨٠.

## ٢٣- باسی سەربەرەوخوارکردنەوەی کوندە

**٥٦٢٥-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە دەم بەرە و خوارکردنەوەی کونە، واتە: سەر بەرەو خوار بکرێتەوە لە دەمەکەیەوە ئاو بخورێتەوە.**

٥٦٢٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ مَعْمَرٌ أَوْ غَيْرُهُ: هُوَ الشُّرْبُ مِنْ أَفْوَاهِهَا[٢].

**٥٦٢٦- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست ڕێگری کرد لە دەم بەرەو خوارکردنەوەی کوندە، عەبدوڵلا وتی: مەعمەر یان کەسێکی تر جگەلە ئەو وتی: بریتییە لەئاو خواردنەوە لە دەمی کوندە (ی دەم بەرەو خوار کراو).**

## ٢٤- بابُ الشُّرْبِ مِنْ فَمِ السِّقَاءِ

٥٦٢٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ: قَالَ لَنَا عِكْرِمَةُ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَشْيَاءَ قِصَارٍ حَدَّثَنَا بِهَا أَبُو هُرَيْرَةَ؟ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فَمِ الْقِرْبَةِ -أَوِ السِّقَاءِ- وَأَنْ يَمْنَعَ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي دَارِهِ[٣].

## ٢٤- باسی خواردنەوە لە دەمی کوندە و جەوەنەوە

**٥٦٢٧-ئەیوب دەڵێ: عیکریمە پێی وتین: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەچەن هەواڵێکی کورت کە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕاوینەتەوە؟ (وتی): پێغەمبەری خوا ﷺ**

(١) بروانە: ٥٦٢٦.
(٢) بروانە: ٥٦٢٥.
(٣) بروانە: ٢٤٦٣.

**ڕێگری کردوه لەوەی مرۆڤ لە دەمی کوندە-یا جەوەنەوە- ئاو بخواتەوە، هەروەها ڕێگری کردوه لەوەی دراوسێ ڕێگە نەدات دراوسێکەی دار بخاتە سەر دیوارەکەی.**

٥٦٢٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ[1].

**٥٦٢٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە خواردنەوە لە دەمی کوندە و جەوەنەوە.**

٥٦٢٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فِي السِّقَاءِ.

**٥٦٢٩-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە خواردنەوە لە دەمی جەوەنە و کونەوە.**

## ٢٥- بابُ النَّهْيِ عَنِ التَّنَفُّسِ فِي الإِنَاءِ

٥٦٣٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ، وَإِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمْسَحْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا تَمَسَّحَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ»[2].

## ٢٥- باسی ڕێگری کردن هەناسەدان لەدەفر (ی خواردنەوە)دا

**٥٦٣٠-عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان خواردنەوەی خواردەوە، ئەوە با هەناسە نەدات لە**

(١) بڕوانە: ٢٤٦٣.
(٢) بڕوانە: ١٥٣.

دەفرەکەدا، وە ئەگەر کەسێکتان میزی کرد، با بەدەستی ڕاستی چووکی پاك نەکاتەوە، وە ئەگەر کەسێکتان خۆی پاککردەوە، با بەدەستی ڕاستی خۆی پاك نەکاتەوە)).

## ٢٦- بابُ الشُّرْبِ بِنَفَسَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ

٥٦٣١- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ وَأَبُو نُعَيْمٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ أَنَسٌ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَنَفَّسُ ثَلاَثًا.

## ٢٦- باسی خواردنەوە بە دوو جار یان سێ جار هەناسەدان

٥٦٣١-عەزرەی کوڕی سابیت وتی: سومامەی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە وتی: ئەنەس ﷺ لە دەفری خواردنەوەدا دوو جار یان سێ جار هەناسەی دەدا و دەیوت: کە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار هەناسەی دەدا (لە کاتی خواردنەوەدا).

## ٢٧- بابُ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ

٥٦٣٢- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ حُذَيْفَةُ بِالْمَدَايِنِ فَاسْتَسْقَى، فَأَتَاهُ دِهْقَانٌ بِقَدَحٍ فِضَّةٍ، فَرَمَاهُ بِهِ فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَرْمِهِ إِلاَّ أَنِّي نَهَيْتُهُ فَلَمْ يَنْتَهِ، وَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَانَا عَنِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ وَالشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَقَالَ: «هُنَّ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَهْيَ لَكُمْ فِي الآخِرَةِ»[1].

## ٢٧- باسی خواردنەوە لە دەفری ئاڵتووندا

٥٦٣٢-ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: حوزەیفە ﷺ لە مەدائین بوو داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، کوێخایەك[2] لە دەفرێکی زیودا ئاوی بۆ هێنا، حوزەیفەش

(١) بڕوانە: ٥٤٢٦.

(٢) یان گەورەی ئەو خەڵکە ئاگر پەرستەی لەوێدا بوون لە مەدائین.

**جامەکەی تێگرت و وتی: من بۆیە تێمگرت چونکە جارێکی تر ڕێگریم لێ کردوە هەر وازی نەهێنا، پێغەمبەریش ﷺ ئاوریشم و دیباج خواردنەوە لەدەفری ئاڵتوون و زیودا لێی قەدەغە کردووین و فەرموویەتی: ((ئەوانە بۆ ئەوانە (کافران) لە دونیا، وە ئەوانە لە دواڕۆژدا بۆ ئێوەیە)).**

## ٢٨- بَابُ آنِيَةِ الْفِضَّةِ

٥٦٣٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ حُذَيْفَةَ ذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَالدِّيبَاجَ، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ»[1].

## ٢٨- باسی (حوکمی بەکارهێنانی) دەفری زیو

**٥٦٣٣-ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: لەگەڵ حوزەیفە ﷺ دەرچووین (بۆجێگایەك لە عێراق) و باسی پێغەمبەری ﷺ کرد کە فەرموویەتی: ((لە دەفری ئاڵتوون و زیودا مەخۆنەوە، ئاوریشم و دیباج مەپۆشن، چونکە بێگومان لە دونیادا بۆ ئەوانە (بێباوەڕان)، وە لە دواڕۆژدا بۆ ئێوەیە)).**

٥٦٣٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ».

**٥٦٣٤-ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە دەفری زیودا خواردنەوە بخواتەوە، بێگومان ئاگری دۆزەخ لە ناو سکیدا قوڵتە قوڵتی دێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٤٢٦.

٥٦٣٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجِنَازَةِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ، وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الشُّرْبِ فِي الْفِضَّةِ -أَوْ قَالَ: آنِيَةِ الْفِضَّةِ- وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَالْقَسِّيِّ، وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالإِسْتَبْرَقِ[1].

**٥٦٣٥-بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، حەوت شتیشی لێ قەدەغەکردین، فەرمانی پێکردین بەسەردانی کردنی نەخۆش و شوێنکەوتنی تەرم، هەرکەس پژمی وتی** (الحمد لله) **پێی بڵێ** (يرحمك الله)**، بەدەم دەعوەتەوە چون و زۆر سەلام لەیەکتری کردن و یارمەتی دانی ستەم لێکراو، نەخستنی (سوێندی) سوێند خۆر. وە قەدەغەی لێکردین لە ئەنگوستیلەی ئاڵتون و لە خواردنەوە لە زیودا- یان فەرمووی: لەدەفری زیودا-، لە سوارگەی[2] ئاوریشم، وە لە قەسسیی[3]، وە لەبەرکردنی ئاوریشم و دیباج[4] و ئاوریشمی ئەستوری قەدەغە کردین.**

## ٢٩- بابُ الشُّرْبِ فِي الأَقْدَاحِ

٥٦٣٦- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ عُمَيْرٍ -مَوْلَى أُمِّ الْفَضْلِ- عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ أَنَّهُمْ شَكُّوا فِي صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَبُعِثَ إِلَيْهِ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبَهُ[5].

---

(١) بڕوانە: ١٢٣٩.

(٢) سەرزینێکی ئاوریشمە ناوئاخنی لوکە یاخوریە لەسەر زینی ئەسپ و ماین دادەندرێ جوانی و نەرم و شلی دەخرێتە سەرزینی وڵاخەکە.

(٣) قەسسیی: قوماشێکی کەتانە و ئاوریشمی تێکەڵە.

(٤) دیباج: جۆرێکە لە ئاوریشم.

(٥) بڕوانە: ١٦٥٨.

## ٢٩- باسی (شیر) خواردنەوە لە جامدا (دروستە)

**٥٦٣٦-ئوممو لفەزڵ ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەوان لە ڕۆژی عەرەفەدا لە بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر ﷺ بەگومان بوون، بۆیە جامێ شیری بۆ نێردرا، پێغەمبەریش ﷺ خواردییەوە.**

## ٣٠- بابُ الشُّرْبِ في قدَحِ النَّبيِّ ﷺ وآنيَتِه

وَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ -واسمه عامر- قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: أَلَا أَسْقِيكَ فِي قَدَحٍ شَرِبَ النَّبِيُّ ﷺ فِيهِ؟

٥٦٣٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ امْرَأَةٌ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ السَّاعِدِيَّ أَنْ يُرْسِلَ إِلَيْهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَقَدِمَتْ فَنَزَلَتْ فِي أُجُمِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى جَاءَهَا فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَإِذَا امْرَأَةٌ مُنَكِّسَةٌ رَأْسَهَا، فَلَمَّا كَلَّمَهَا النَّبِيُّ ﷺ قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ. فَقَالَ: «قَدْ أَعَذْتُكِ مِنِّي». فَقَالُوا لَهَا: أَتَدْرِينَ مَنْ هَذَا؟ قَالَتْ: لاَ. قَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَاءَ لِيَخْطُبَكِ. قَالَتْ: كُنْتُ أَنَا أَشْقَى مِنْ ذَلِكَ. فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَئِذٍ حَتَّى جَلَسَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ «اسْقِنَا يَا سَهْلُ». فَخَرَجْتُ لَهُمْ بِهَذَا الْقَدَحِ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ، فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا مِنْهُ. قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بَعْدَ ذَلِكَ، فَوَهَبَهُ لَهُ[1].

## ٣٠- باسی خواردنەوە لە جام و دەفری پێغەمبەردا ﷺ

**-ئەبو بوردە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ پێی وتم: ئایا ئاوی خواردنەوەت بدەمێ لە جامێکدا کە پێغەمبەر ﷺ ئاوی تێدا خواردۆتەوە؟**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٥٦.

**٥٦٣٧-ئەبو حازیم لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ژنێكی عەرەب باسكرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی كرد بەئەبو ئوسەیدی ساعیدیی كەسێك بنێرێ بۆ لای ژنەكە، ئەویش كەسێكی نارد بۆ لای ژنەكە، هات لە كۆشكی بەنی ساعیدەدا دابەزی، پێغەمبەریش ﷺ ڕۆشت تا گەشتە لای، ئینجا چووە ژوورەوە بۆ لای بینی ژنێكە سەری داخستووە، جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵدا كرد وتی: پەنا دەگرم بەخوا لە تۆ! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان پەنام دای بەخوا لە من))، جا وتیان بەژنەكە: ئەزانی ئەوە كێ بوو؟ وتی: نەخێر، وتیان ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو هاتبوو خوازبێنی تۆ بكات، وتی: من خۆم لەوە بەدبەختر م[1]، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا ڕۆشت هەتا لە ساباتەكەی بەنی ساعیدە خۆی و هاوەڵانی دانیشتن، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی سەهل خواردنەوەیەكمان بدەرێ بیخۆینەوە، (سەهل وتی:) منیش ئەو جامەم بۆ دەرهێنان و ئاوم پێدان تیایدا، (ئەبو حازیم دەڵێ) جا سەهل ئەو جامەی بۆ دەرهێناین ئاومان پێ خواردەوە، (ئەبو حازیم) دەڵێ: لە پاشان عومەری كوڕی عەبدولعەزیز دوای ئەوە داوای لە سەهل كرد ئەو جامەی پێ ببەخشێت، سەهلیش پێی بەخشی.**

٥٦٣٨- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُدْرِكٍ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ قَالَ: رَأَيْتُ قَدَحَ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ -وَكَانَ قَدِ انْصَدَعَ فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّةٍ- قَالَ: وَهْوَ قَدَحٌ جَيِّدٌ عَرِيضٌ مِنْ نُضَارٍ. قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْقَدَحِ أَكْثَرَ مِنْ كَذَا وَكَذَا[2].

---

(١) كە ئەو بەهرەم لە كیس خۆمدا، تاوانی ئەو نەبوو دەبو پێیان بوتایە بۆچی بۆ كێ هێنراوەتە ئەو جێگایە؟

(٢) بڕوانە: ٣١٠٩.

٥٦٣٨-عاصیمی ئەحوەل دەڵێ: جامەكەی پێغەمبەرم ﷺ لای ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ بینی كە پێشتر درزی برد بوو، (پێغەمبەر ﷺ یان ئەنەس) بەتەلێكی زیو قایمی كرد بوو، (عاصیم) دەڵێ: ئەو جامە جامێكی چاكی پان بوو لە داری جەوهەر بوو، (عاصیم) دەڵێ: ئەنەس ﷺ وتی: سوێند بەخوا بە دڵنیاییەوە بەم جامە لە ئەوەندە و ئەوەندە جار زیاتر خواردنەوەم تێدا داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

## ٣١- بَابُ شُرْبِ البَرَكَةِ وَالْمَاءِ المُبَارَكِ

٥٦٣٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمُ بْنُ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ هَذَا الْحَدِيثَ قَالَ: قَدْ رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ حَضَرَتِ الْعَصْرُ، وَلَيْسَ مَعَنَا مَاءٌ غَيْرَ فَضْلَةٍ فَجُعِلَ فِي إِنَاءٍ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِهِ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ وَفَرَّجَ أَصَابِعَهُ ثُمَّ قَالَ: «حَيَّ على أَهْلِ الْوُضُوءِ، الْبَرَكَةُ مِنَ اللَّهِ». فَلَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَتَفَجَّرُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ النَّاسُ وَشَرِبُوا، فَجَعَلْتُ لاَ آلُو مَا جَعَلْتُ فِي بَطْنِي مِنْهُ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ بَرَكَةٌ. قُلْتُ لِجَابِرٍ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ. تَابَعَهُ عَمْرٌو، عَنْ جَابِرٍ. وَقَالَ حُصَيْنٌ وَعَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ: خَمْسَ عَشْرَةَ مِائَةً. وَتَابَعَهُ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ جَابِرٍ[1].

## ٣١- باسی خواردنەوەی ئاو، وە ئاوی بە فەڕ و بەرەكەت

٥٦٣٩-سالیمی كوڕی ئەبی سەعد لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە ئەم فەرموودە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خۆم بینی لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا نوێژی عەسر بوو بوو، ئاومان پێنەبوو جگە كەمێك ئاو كە مابوویەوە، ئەو ئاوە كرایە دەفرێكەوە

(١) بڕوانە: ٣٥٧٦.

و برا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دەستی خستە ناو دەفرەكە و پەنجەكانی لە یەكتری جیا كردەوە، لە پاشان فەرمووی: ((هەر كەس دوستنوێژ دەگرێ بابێت فەڕ و بەرەكەت لە خواوەیە))، (جابیر دەڵێ:) سوێند بەخوا بەڕاستی بینیم ئاوەكە لە نێوانی پەنجەكانییەوە هەڵدەقوڵا، ئینجا خەڵكەكە دەست نوێژیان گرت و ئاویان خواردەوە، جا دەستم بە ئاو خواردنەوە كرد و درێغیم نەكرد چەندی لێ بخۆمەوە و بیكەمە ورگمەوە، چونكە زانیم بە فەڕ و بەرەكەتە.

(سالیم دەڵێ:) بە جابیرم وت: لەو ڕۆژەدا ئێوە چەند كەس بوون؟ وتی: هەزار و چوارسەد كەس بووین، عەمر لە جابیرەوە ئەم فەرموودە دەگێڕێتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی سالیم دەكات.

-حوصەین و عەمری كوڕی موڕە لە سالیمەوە دەیگێڕنەوە ئەویش لە جابیرەوە دەڵێ: هەزار و پێنج سەد كەس بووین.

-سەعیدی كوڕی مەسەییەب لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی سالیم دەكات.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٧٥- كِتابُ المَرضَى

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٥- پەڕاوی نەخۆشەكان

## ١- بابُ مَا جَاءَ فِي كَفَّارَةِ الْمَرَضِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴿١٢٣﴾﴾ النساء

٥٦٤٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُصِيبَةٍ تُصِيبُ الْمُسْلِمَ إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا عَنْهُ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا».

## ١- باسی ئەوەی دەربارەی كەفالەتی نەخۆشی هاتووە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەر كەسێك خراپەیەك بكات پاداشتی دەدرێتەوە).**

**٥٦٤٠- عورووەی كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە كە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ موسیبەتێك نییە كە تووشی مسوڵمان ببێت و خوا بەو موسیبەتە گوناهێكی نەبەخشێت، هەتا دڕكێكیش بچەقێت پیایدا (گوناهێكی لادەبات) )).**

٥٦٤١- ٥٦٤٢- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ».

**٥٦٤١- ٥٦٤٢- ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:((هیچ مسوڵمانێك نییە کەماندوو بونێ یان نەخۆشیێ یان غەم و خەفەتێ[1] یان دڵتەنگییەکی توش ببێ، هەتا دڕکێ کە بچەقێت بەشوێنێکیدا، ئیللا خوا بە هۆیانەوە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت)).**

٥٦٤٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سَعْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَالْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ، تُفَيِّئُهَا الرِّيحُ مَرَّةً، وَتَعْدِلُهَا مَرَّةً، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ كَالأَرْزَةِ لاَ تَزَالُ حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدَةً».وَقَالَ زَكَرِيَّاءُ: حَدَّثَنِي سَعْدٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٥٦٤٣- عەبدوڵڵای کوڕی کەعب لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((نموونەی باوەڕدار وەك قەرسیلی سەوزی کشتوکاڵ وایە، جارێ با لاری دەکاتەوە وجارێ ڕاستی دەکاتەوە، وە نموونەی دووڕووش وەك داری سنۆبەری بەهێز و قایم وایە، (با نایجوڵێنێ) هیچی تووش نابێ تا بەجارێ لە بێخ دێ (یان دەشکێتەوە) )).**
**-زەکەریا دەڵێ: سەعد بۆی گێڕامەوە وتی ئیبنو کەعب (ئەم فەرموودەی) بۆگێڕاینەوە لە کەعبی باوکییەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

(١) لەسەر شتی ڕابردوو یان شتێ کە بترسێ لەمەولا توشی بێت.

٥٦٤٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ كَفَأَتْهَا، فَإِذَا اعْتَدَلَتْ تَكَفَّأُ بِالْبَلاَءِ، وَالْفَاجِرُ كَالأَرْزَةِ صَمَّاءَ مُعْتَدِلَةً، حَتَّى يَقْصِمَهَا اللَّهُ إِذَا شَاءَ»[1].

**٥٦٤٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی باوەڕدار وەك قەرسیلی سەوزی كشتوكاڵ وایە، لە هەر لایەكەوە بای بۆ بێت لاری دەكاتەوە، ئینجا كەڕاست بوویەوە بەلاّ و ناخۆشی لاری دەكاتەوە، كەسی خراپەكاریش وەك دار سنەوبەر وایە بە هێز و قایم و ڕاستە، تا كاتێ خوا ویستی دەیشكێنێ)).**

٥٦٤٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ يَسَارٍ أَبَا الْحُبَابِ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ».

**٥٦٤٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك خوا چاكەی بۆی بوێ بەلاّ و ناڕەحەتی تووش دەبێ)).**

## ٢- بابُ شِدَّةِ الْمَرَضِ

٥٦٤٦- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ حَدَّثَنِي بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشَدَّ عَلَيْهِ الْوَجَعُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

---

(١) بروانە: ٧٤٦٦.

## ٢- باسی (ئەوەی دەربارەی) سەختی نەخۆشی (هاتووە لە پاداشت)

**٥٦٤٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: کەسم نەدیوە بەقەدەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئێش و ئازاری سەخت بوو بێت.**

٥٦٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي مَرَضِهِ -وَهْوَ يُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا- وَقُلْتُ: إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، قُلْتُ: إِنَّ ذَاكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ. قَالَ: «أَجَلْ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلاَّ حَاتَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطَايَاهُ، كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ»[1].

**٥٦٤٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: چوومە سەردانی پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا- لەو کاتەدا تایەکی سەختی لێ هاتبوو- وتم: بەڕاستی تۆ تایەکی سەختت لێ هاتووە، وتم: بێگومان ئەوە لەبەر ئەوەیە تۆ دوو بەرانبەر پاداشت هەیە؟ فەرمووی: ((بەڵێ هەر مسوڵمانێك ئازار و ئەزیەتی تووش ببێت گوناهەکانی دەوەرێت، وەك چۆن گەڵای دار دەوەرێت (لە پایزدا) )).**

## ٣- بابٌ: أَشَدُّ النَّاسِ بَلاَءً الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ

٥٦٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: دَخَلْتُ على رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَهْوَ يُوعَكُ- فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا. قَالَ: «أَجَلْ، إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ». قُلْتُ: ذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ. قَالَ: «أَجَلْ، ذَلِكَ كَذَلِكَ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى -شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا- إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ، كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[2].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٤٨، ٥٦٦٠، ٥٦٦١، ٥٦٦٧.

(٢) بڕوانە: ٥٦٤٧.

## ٣- باسێک: سەخترین کەس بەڵایان توش ببێ پێغەمبەرانن، پاشان کێ چاکترە دوای ئەو کێ چاکترە[١]

**٥٦٤٨- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ -لەو کاتەدا تا دایدەگرت- منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی تۆتایەکی سەختت دەتگرێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ، بەڕاستی من تا دام دەگرێ بەئەندازەی دووکەس لە ئێوە تا داتان بگرێ))، وتم: ئەوە لەبەر ئەوەیە تۆ دوو پاداشتت هەبێت؟ فەرمووی: ((بەڵێ ئەوە وایە، هەر مسوڵمانێك ئازارێکی تووش ببێت - درِك پیا چونێك بێت یان لەو گەورەتر و زیاتر بێت-، ئیللا خوا بەهۆیەوە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت، (هەڵدەوەرێت) وەك چۆن گەڵای درەخت دەوەرێت (لە پایزدا) )).**

## ٤- بابُ وُجُوبِ عِيَادَةِ الْمَرِيضِ

٥٦٤٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَطْعِمُوا الْجَائِعَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ، وَفُكُّوا الْعَانِيَ»[٢].

## ٤- باسی سەردانکردنی نەخۆش واجبە

**٥٦٤٩-ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خواردن دەرخواردی برسی بدەن، وە سەردانی نەخۆش بکەن و دیل ئازاد بکەن)).**

٥٦٥٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺقَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ،

(١) زۆربەی گێڕەوەرانی صەحیحی بوخاری بە (الأمثل فالأمثل) گێڕاویانەتەوە.
(٢) بڕوانە: ١٢٣٩.

وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: نَهَانَا عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَلُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَالْمِيثَرَةِ، وَأَمَرَنَا أَنْ نَتْبَعَ الْجَنَائِزَ، وَنَعُودَ الْمَرِيضَ، وَنُفْشِيَ السَّلاَمَ[١].

**٥٦٥٠-بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكردین بەحەوت شت، حەوت شتیشی لێ قەدەغە كردین: ئەنگوستیلەی ئاڵتون و لەبەركردنی ئاوریشم و دیباج و ئاوریشمی ئەستور و قەسسیی[٢] و سوارگەی ئاوریشمی[٣] لێ قەدەغە كردین. وە فەرمانی پێكردین كە دوای تەرمی مردوو بكەوین و سەردانی نەخۆش بكەین، وە (لە ناو خۆماندا) سەلام كردن (لە یەكتری) بلاو بكەینەوە.**

## ٥- بابُ عِيَادَةِ الْمُغْمَى عَلَيْهِ

٥٦٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَرِضْتُ مَرَضًا، فَأَتَانِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَوَجَدَانِي أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ صَبَّ وَضُوءَهُ عَلَيَّ، فَأَفَقْتُ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ[٤].

---

(١) بڕوانە: ٣٠٤٦.

(٢) قەسسیی: قوماشێكی كەتانەو ئاوریشمی تێكەڵە.

(٣) سەرزینێكی ئاوریشمە ناوئاخنی لوكە یاخورییە دوخرێتە سەر زینی ئەسپ و مایین بۆ جوانی و نەرم و شلی.

(٤) بڕوانە: ١٩٤.

## ٥- باسی سەردانیکردنی کەسێک لە هۆش خۆی چوبێتەوە

**٥٦٥١-جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: نەخۆشییەکم توش بوو، جا پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ هاتن بۆ لام سەردانیان کردم، هەردووکیان بە پیادە هاتن، منیان دی لە هۆش خۆم چوومەتەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەست نوێژی گرت، پاشان ئاوی دەست نوێژەکەی ڕشت بەسەرمدا، منیش هۆشم کردەوە و بینیم پێغەمبەرە ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بکەم دەربارەی ماڵ و سامانەکەم؟ چۆن بڕیار بدەم لە سامانەکەمدا؟ پێغەمبەر ﷺ هیچ وەڵامی نەدامەوە هەتا ئایەتی میرات دابەزی.**

## ٦- بابُ فَضْلِ مَنْ يُصْرَعُ مِنَ الرِّيحِ

٥٦٥٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عِمْرَانَ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِي. قَالَ: «إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ». فَقَالَتْ: أَصْبِرُ. فَقَالَتْ إِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا مَخْلَدٌ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ رَأَى أُمَّ زُفَرَ -تِلْكَ امْرَأَةٌ طَوِيلَةٌ سَوْدَاءُ- عَلَى سِتْرِ الْكَعْبَةِ.

## ٦- باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی بەهۆی باوە فێی لێ بێت

**٥٦٥٢-عەتایی کوڕی ئەبی ڕەباح دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ پێی وتم: ئایا ژنێکی بەهەشتیت نیشان بدەم؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەو ژنە ڕەش پێستە هاتە خزمەتی**

پێغەمبەر ﷺ وتى: من فێم لێ دێ و لەشم بەدەردەكەوێ بۆیە لاى خوا دوعام بۆ بكە، ئەویش فەرمووى: ئەگەى دەتەوێ ئارام بگرە بەهەشتى دەبێت، ئەگەریش دەتەوێ دوعات بۆدەكەم كە خوا چاكت كاتەوە))، ژنەكەش وتى: ئارام دەگرم، جا وتى: (كە فێم لێ دێ) خۆم دەر دەخەم بۆیە لاى خوا دوعام بۆ بكە كە خۆم دەر نەخەم، ئەویش دووعاى بۆ كرد.

ئیبنو جورمیج دەڵێ: عەتا هەواڵى دامێ كە ئەو ئوممو زوفەرى بینیوە- كە ئافرەتێكى درێژى ڕەش پێست بوو -لەسەر بەرگى كەعبە دانیشتبوو.

## ٧- بابُ فَضْلِ مَنْ ذَهَبَ بَصَرُهُ

٥٦٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ الْهَادِ، عَنْ عَمْرٍو -مَوْلَى الْمُطَّلِبِ- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ». يُرِيدُ عَيْنَيْهِ. تَابَعَهُ أَشْعَثُ بْنُ جَابِرٍ وَأَبُو ظِلاَلٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٧- باسى فەزڵ و گەورەیى ئەو كەسەى نابینا بوو بێت

٥٦٥٣-ئەنەسى كوڕى مالیك ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان خواى گەورە فەرموویەتى: ئەگەر بەندەیەكم دوو چاوى خۆشەویستیم لێ سەندەوە و ئارامى گرت لە باتى ئەو دووچاوە بەهەشتى دەدەمێ)). مەبەستى بە (حَبِيبَتَيْهِ) هەردوو چاویەتى.

-ئەشعەسى كوڕى جابیر و ئەبو زیلال لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕنەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە و پاڵپشتى گێڕانەوەكەى عەمر دەكەن.

## ٨- بَابُ عِيَادَةِ النِّسَاءِ الرِّجَالَ

وَعَادَتْ أُمُّ الدَّرْدَاءِ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ المَسْجِدِ مِنَ الأَنْصَارِ.

٥٦٥٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ ﷺ قَالَتْ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِمَا قُلْتُ: يَا أَبَتِ كَيْفَ تَجِدُكَ؟ وَيَا بِلاَلُ كَيْفَ تَجِدُكَ؟ قَالَتْ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ... وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أَقْلَعَتْ عَنْهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً... بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مِجَنَّةٍ... وَهَلْ تَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ وَصَحِّحْهَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا فَاجْعَلْهَا بِالْجُحْفَةِ»[1].

## ٨- باسی سەردانی كردنی ئافرەت بۆ لای پیاوانی نەخۆش

**-ئوممو دەردا ﷺ سەردانی پیاوێكی (نەخۆشی) پابەندی بە مزگەوتی كرد كە ئەنصاری بوو.**

**٥٦٥٤- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ (كۆچی كرد و) هات بۆ مەدینە، ئەبو بەكر و بیلال ﷺ تووشی تا و لەرز بوون، (عائیشە) دەڵێ: ئەبو بەكر ﷺ كاتێ تایی لێ بهاتایە دەیوت: هەموو كەس با لە ناو كەسوكاریدا ڕۆژ بكاتەوە (بەساغی)، مردن نزیكترە لێوەی لە قەیتانی پێڵاوەكانی، بیلالیش كە تاكەی بەری دەدا دەیوت: ئای خۆزگە بمزانیایە**

(١) بڕوانە: ١٨٨٩.

**جارێکی تر لە شیوێکدا (لە شیوەکانی مەککە) شەو ڕۆژ دەکەمەوە، کە زوڕناتك و گیای جەلیل لە دەورم بێ؟! ئایا ڕۆژی دەبێ بچمە سەر ئاوی مەجەننە[1] و ئایا شاخی شامە و تەفیلم[2] لێوە دەردەکەوێ؟!**

**عائیشە ﷺ وتی: منیش چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی (هەردووکیانم) پێدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە وەك خۆشویستنمان بۆ مەککە مەدینەشمان لای خۆشەویست بکە یان زیاتر، وە نەخۆشی لە مەدینەدا مەهێڵە و تەندروستی بکە، وە خوایە فەڕ و بەرەکەت بخەرە ساع و مودیەوە بۆمان، وە تا و لەرزەکەی بگوازەرەوە و بیبە بۆ جوحفە[3])).**

## ٩- بابُ عِيَادَةِ الصِّبْيَانِ

٥٦٥٥- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَاصِمٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ ابْنَةً لِلنَّبِيِّ ﷺ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِ -وَهْوَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَسَعْدٍ وَأُبَيٍّ: نَحْسِبُ أَنَّ ابْنَتِي قَدْ حُضِرَتْ فَاشْهَدْنَا. فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا السَّلاَمَ وَيَقُولُ: «إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَمَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ مُسَمًّى، فَلْتَحْتَسِبْ وَلْتَصْبِرْ». فَأَرْسَلَتْ تُقْسِمُ عَلَيْهِ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَقُمْنَا، فَرُفِعَ الصَّبِيُّ فِي حَجْرِ النَّبِيِّ ﷺ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ، فَفَاضَتْ عَيْنَا النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: مَا هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «هَذِهِ رَحْمَةٌ وَضَعَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ مَنْ شَاءَ مِنْ عِبَادِهِ، وَلاَ يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ إِلاَّ الرُّحَمَاءَ»[4].

---

(١) جێگایەکە چەند میلێك لەمەکەوە دوورە لەسەردەمی نەفامیدا بازاڕێکی لێبووە. **بڕوانە : إرشاد الساری: ٣٨٦/١٢.**

(٢) دوو شاخن لە نزیك مەککەوە، خەتتابی دەڵێ: دوو کانیاو و سەرچاوەی ئاون. **بڕوانە : إرشاد الساری:** ٣٨٦/١٢.

(٣) جوحفە: شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی شامە شامە کەدێن بۆ حەج و عومرە. **بڕوانە : إرشاد الساری:** ٣٨٦/١٢.

(٤) بڕوانە: ١٢٨٤.

## ٩- باسی سەردانی كردنی منداڵان (ی نەخۆش لە لایەن پیاوانەوە)

**٥٦٥٥-ئەبو عوسمان گێڕایەوە كە ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ دەڵێ: كچێكی پێغەمبەر ﷺ كەسێكی نارد بۆ خزمەتی-ئەو (ئوسامە) و سەعد و وابزانم ئوبەییش بوو لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون-، (وتی): كە كچێكم لە گیان دەرچوونایە وەرە بۆماڵمان و ئامادەبە لامان، پێغەمبەریش ﷺ كەسێكی نارد كە سەلامی لێ بكات و پێی بڵێ: ((بێگومان ئەوەی دەیباتەوە و ئەوەی دەیدات هەر هی خودایە، هەموو شتێكیش لای خوا (بۆ ماوەیەكی) دیاری كراوە، جا با چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت و با ئارام بگرێ))، ئینجا كچەكەی ناردی بۆ لای پێغەمبەر و ﷺ سوێندی لێ خوارد (كە دەبێت بڕوات بۆ ماڵیان)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەستا و ئێمەش (لە خزمەتیدا) هەستاین[1]، ئینجا منداڵەكە هێنراو خرایە كۆشی پێغەمبەرەوە ﷺ بە نارەحەتی هەناسەی دەدا، بۆیە چاوەكانی پێغەمبەر ﷺ فرمێسكیان پیا هاتە خوارەوە، سەعد عەرزی كرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چییە؟ فەرمووی: ((ئەمە بەزەیی یە خوا لە دڵی هەر كام لە بەندەكانیدا بیەوێ دایناوە، وە خوای گەورە لە ناو بەندەكانیدا تەنها ڕەحم بەوانەیان دەكات كە بەبەزەیی و میهرەبانن)).**

## ١٠- بَابُ عِيَادَةِ الأَعْرَابِ

٥٦٥٦- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُخْتَارٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ على أَعْرَابِيٍّ يَعُودُهُ، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ فَقَالَ لَهُ: «لاَ بَأْسَ، طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». قَالَ: قُلْتَ: طَهُورٌ؟ كَلاَّ بَلْ هِيَ حُمَّى تَفُورُ -أَوْ تَثُورُ- عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ، تُزِيرُهُ الْقُبُورَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَنَعَمْ إِذًا»[2].

---

(١) ڕۆیشتین تا چوینە ماڵیان.

(٢) بڕوانە: ٣٦١٦.

## ١٠- باسی سەردانیکردنی عەرەبی دەشتەکی[1]

٥٦٥٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی (نەخۆش بوو) سەردانی کرد، ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دەڕۆشت بۆ لای نەخۆشێك و سەردانی دەکرد دەیفەرموو: ((زیانی نییە بەویستی خوا پاکەرەوەی گوناهە))، کابرا وتی: (بە پێغەمبەرم ﷺ) وتت: پاکەرەوەیە؟ نەخێر پاکەرەوە نییە بەڵکو لەرز و تایەکە پیرێکی بەتەمەن هەڵدەچۆقێنێ و سەردانی گۆڕستانی پێ دەکات[2]، پێغەمبەریش فەرمووی: ((جا ئەگەر ناتەوێ بەڵێ بەو جۆرەیە خۆت گومانت بردووە)).

## ١١- بابُ عِيَادَةِ الْمُشْرِكِ

٥٦٥٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ غُلاَمًا لِيَهُودَ كَانَ يَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ فَقَالَ: «أَسْلِمْ». فَأَسْلَمَ[3].

## ١١- باسی سەردانیکردنی نەخۆشی هاوبەش دانەر بۆ خوا

٥٦٥٧- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: مێر مندالێ جولەکەیەك کە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد نەخۆش کەوت، پێغەمبەریش ﷺ چوو بۆ لای و سەردانی کرد و فەرمووی پێی: ((مسوڵمان بە)) ئەویش مسوڵمان بوو.

---

(١) کە نەخۆش بێت.
(٢) واتە: لەکۆڵی نابێتەوە تا نەیباتە ناو گۆڕەوە.
(٣) بڕوانە: ١٣٥٦.

## ١٢- بابٌ: إِذَا عَادَ مَرِيضًا فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى بِهِمْ جَمَاعَةً

٥٦٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهِ نَاسٌ يَعُودُونَهُ فِي مَرَضِهِ، فَصَلَّى بِهِمْ جَالِسًا، فَجَعَلُوا يُصَلُّونَ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: «إِنَّ الإِمَامَ لَيُؤْتَمُّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِنْ صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا»[١].

## ١٢- باسێک:ئەگەر (خەڵکانێ) سەردانی نەخۆشێکیان کرد و کاتی نوێژ بوو نەخۆشەکەش نوێژی بە کۆمەڵی بۆ کردن[٢]

**٥٦٥٨- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا خەڵکانێك چوون بۆ لای سەردانیان کرد، ئەویش بە دانیشتنەوە پێشنوێژی بۆ کردن، خەڵکەکەش دەستیان کرد بە نوێژکردن بە پێوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کردن دانیشن، ئینجا کاتێ لێ بوویەوە فەرمووی: ((بێگومان پێشنوێژ پەیڕەوی لێوە دەکرێ، جائەگەر کوڕنوشی برد ئێوەش کوڕنوش ببەن، وە ئەگەر بەرز بوویەوە ئێوەش بەرز ببنەوە، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن)).**

## ١٣- بابُ وَضْعِ الْيَدِ عَلَى الْمَرِيضِ

٥٦٥٩- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا الْجُعَيْدُ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدٍ، أَنَّ أَبَاهَا قَالَ: تَشَكَّيْتُ بِمَكَّةَ شَكْوًا شَدِيدًا، فَجَاءَنِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنِّي أَتْرُكُ مَالاً وَإِنِّي لَمْ أَتْرُكْ إِلاَّ ابْنَةً وَاحِدَةً، فَأُوصِي بِثُلُثَيْ مَالِي وَأَتْرُكُ الثُّلُثَ؟ فَقَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَأُوصِي

---

(١) بروانە: ٦٨٨.

(٢) واتە: پێشنوێژی بۆ کردن و پێکەوە نوێژی بەکۆمەڵیان کرد.

بِالنِّصْفِ وَأَتْرُكُ النِّصْفَ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَأُوصِي بِالثُّلُثِ وَأَتْرُكُ لَهَا الثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ». ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ عَلَى وَجْهِي وَبَطْنِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا وَأَتِمَّ لَهُ هِجْرَتَهُ». فَمَا زِلْتُ أَجِدُ بَرْدَهُ عَلَى كَبِدِي فِيمَا يُخَالُ إِلَيَّ حَتَّى السَّاعَةِ[1].

## ١٣- باسی (سەردانی کەر) دەستی بخاتە سەر نەخۆشەکە

**٥٦٥٩- عائیشەی كچی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە كە باوكی وتی: لە مەككە نەخۆش كەوتم بە نەخۆش كەوتنێكی سەخت، ئینجا پێغەمبەری ﷺ هات بۆ لام سەردانی كردم، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری ﷺ من سامانێكی زۆر بەجێ دێڵم (لە پاش مردنم)، وە من تەنها یەك كچ لە دوای خۆم بەجێ دێڵم، دەی ئایا وەسێت بكەم دوو بەش لە سێ بەشی ماڵەكەم (دوای مردنم بۆم بكەن بە خێر)، سێیەكی بەجێ بێڵم (بۆ كچەكەم)؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: وەسێت بكەم نیوەی بكەن بەخێر و نیوەی بەجێ بێڵم؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئەی وەسێت بكەم سێیەكی بكەن بە خێر و دوو لەسەر سێی بەجێ بێڵم (بۆ كچەكەم)؟ فەرمووی: (( (وەسێت بكە) بە سێ یەك سێ یەكیش هێشتا زۆرە))، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) دەستی خستە سەر نێوچاوانی[2] و دواتر دەستی هێنا بە ناوچاوان و سكمدا لە پاشان فەرمووی: ((خودایە شیفای سەعد بدەیت كۆچەكەشی بۆ تەواو كەیت[3]))، جا بەردەوام هەستم بە فێنكی دەستی دەكرد لەسەر جگەرم، بەو جۆرەی گومان دەبەم تا ئەم ساتەش.**

---

(١) بڕوانە: ٥٦.

(٢) لە ڕیوایەتی ئەبو زەردا بۆ صەحیحی بوخاری بەم جۆرەیە:(نێوچاوانم).

(٣) واتە: لەمەككە نەی مرێنێت كە لێیەوە كۆچی كردوەو لەبەر خوا بەجێی هێڵاوە. **بڕوانە : إرشاد الساري: ١٢/٣٩٠.**

٥٦٦٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ يُوعَكُ، فَمَسِسْتُهُ بِيَدِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَجَلْ، إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ». فَقُلْتُ: ذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَجَلْ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى -مَرَضٌ فَمَا سِوَاهُ- إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ لَهُ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[١].

**٥٦٦٠-عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تای لێ هاتبوو، بۆیە بەدەستی خۆم دەستم لێدا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ تایەكی قورست هەیە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ، بێگومان من تام لێ دێ بە ئەندازەی دوو پیاو لە ئێوە كە تای لێ دێ))، منیش وتم: ئەمە لەبەر ئەوەیە دوو پاداشتت هەیە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ وایە))، پاشان فەرمووی: ((هیچ مسوڵمانێك نییە كە تووشی ئازارێك ببێ – لە نەخۆشی و غەیری نەخۆشی- ئیللا خوای گەورە تاوانەكانی هەڵدەوەرێنێ، وەك چۆن دار گەڵا ڕێزان دەكات)).**

## ١٤- بابُ مَا يُقَالُ لِلْمَرِيضِ، وَمَا يُجِيبُ

٥٦٦١- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي مَرَضِهِ فَمَسِسْتُهُ وَهْوَ يُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، فَقُلْتُ: إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، وَذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ. قَالَ: «أَجَلْ، وَمَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلاَّ حَاتَّتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ، كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٤٧.

(٢) بڕوانە: ٥٦٤٧.

## ١٤- باسی چی دەوترێت بە نەخۆش (لە سەردانی کردنیدا، نەخۆشیش) چی وەڵامێک دەداتەوە

**٥٦٦١- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشییەكەیدا، وە دەستم لێدا كەتایەكی زۆری هەبوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ تایەكی زۆرت هەیە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە بێگومان تۆ دوو پاداشتت هەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ وایە، هیچ مسوڵمانێك نییە كە تووشی ئازارێك ببێ، ئیللا خوای گەورە تاوانەكانی هەڵدەوەرێنێ، وەك چۆن دار گەڵا ڕێزان دەكات)).**

٥٦٦٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ يَعُودُهُ فَقَالَ: «لاَ بَأْسَ، طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَقَالَ: كَلاَّ بَلْ حُمَّى تَفُورُ عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ كَيْمَا تُزِيرَهُ الْقُبُورَ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَنَعَمْ إِذًا»[1].

**٥٦٦٢- ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای پیاوێك نەخۆش بوو سەردانی كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زیانی نییە بەویستی خوا پاككەرەوەی گوناهە))، پیاوەكەش وتی: نەخێر پاكەرەوە نییە، بەڵكو لەرز و تایە كە پیرێكی بەتەمەن هەڵدەچۆقێنێ بۆ ئەوەی سەردانی گۆڕستانی پێ بكات[2]، پێغەمبەریش فەرمووی: ((جائەگەر ناتەوێ بەڵێ بەو جۆرەیە خۆت گومانت بردووە)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٦.

(٢) واتە: لەكۆڵی نابێتەوە تا نەیباتە ناو گۆڕەوە.

## ١٥- بابُ عِيادَةِ الْمَرِيضِ رَاكِبًا وَمَاشِيًا وَرِدْفًا عَلَى الحِمَارِ

٥٦٦٣- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَى إِكَافٍ على قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ وَرَاءَهُ، يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَسَارَ حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللهِ، وَفِي الْمَجْلِسِ أَخْلاَطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ وَالْيَهُودِ، وَفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ خَمَّرَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ، قَالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا.

فَسَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ وَوَقَفَ وَنَزَلَ فَدَعَاهُمْ إِلَى اللهِ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ: يَا أَيُّهَا الْمَرْءُ، إِنَّهُ لاَ أَحْسَنَ مِمَّا تَقُولُ إِنْ كَانَ حَقًّا، فَلاَ تُؤْذِنَا بِهِ فِي مَجْلِسِنَا، وَارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ، فَمَنْ جَاءَكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ. قَالَ ابْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، فَاغْشَنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ. فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى كَادُوا يَتَثَاوَرُونَ، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى سَكَتُوا، فَرَكِبَ النَّبِيُّ ﷺ دَابَّتَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَقَالَ لَهُ: «أَيْ سَعْدُ، أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالَ أَبُو حُبَابٍ؟». يُرِيدُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ.

قَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، اعْفُ عَنْهُ وَاصْفَحْ، فَلَقَدْ أَعْطَاكَ اللهُ مَا أَعْطَاكَ، وَلَقَدِ اجْتَمَعَ أَهْلُ هَذِهِ البَحْرَةِ أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ، فَلَمَّا رَدَّ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ شَرِقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ الَّذِي فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ[١].

## ١٥- باسی سەردانی كردنی نەخۆش بەسواری و بە پیادە و بەسواری كەر لە پاشكۆدا

٥٦٦٣- عوروە دەگێڕێتەوە كە ئوسامەی كوڕی زەید ﵄ بۆی گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو، كە (كورتانێكی) قەیفەی

(١) بڕوانە: ٢٩٨٧.

فەدەیكییەی لێ كرابوو، وە ئوسامەی لە پاشكۆی خۆیدا سوار كردبوو دەچوو بۆ سەردانی سەعدی كوڕی عوبادە [١] پێش ڕووداوی بەدر، جا ڕۆشت تا تێپەڕی بەلای كۆڕێكی دانیشتندا كە عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلولی تیابوو، ئەوەش پێش ئەوەبوو عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی مسوڵمان ببێت، وە لە كۆڕەكەدا تێكەڵ بوو لە مسوڵمانان و هاوبەشدانەرە بتپەرستەكان و جولەكەكان، وە عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحەش لە كۆڕەكەدا بوو.

جا كاتێ تەپو تۆزی گوێدرێژەكە چوو بەسەر كۆڕەكەدا، عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی بە پۆشاكەكەی لوتی داپۆشی، پاشان وتی: تەپو تۆز مەكەن بەسەرماندا، پێغەمبەریش ﷺ سەلامی كرد، پاشان وەستا و دابەزی و خەڵكەكەی بانگ كرد بۆ لای خوا (و ئایینی ئیسلام)، وە قورئانی بەسەردا خوێندن، ئەنجا عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی وتی: ئەی كابرا بێگومان لەم قسانەی تۆ دەیكەیت چاكتر نییە، ئەگەر ڕاست بێت، بەڵام بەم قسانە ئەزێتمان مەدە لە كۆڕی دانیشتنەكەماندا، بگەڕێرەوە بۆ جێگا و شوێنی خۆت، ئەوسا هەر كەسێك هات بۆ لات ئەم قسە و بەسەرهاتەی بۆ باس بكە، عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە ﷺ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كۆڕەكانماندا وەرە بۆلامان بەم وتانەوە، چونكە بەڕاستی ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە ئیتر مسوڵمانەكان و بتپەرستەكان و جوولەكەكان دەستیان كرد بە جنێودان و قسە وتن بە یەكتر، هەتا خەریك بوو پەلاماری یەكتری بدەن، پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام هێوری دەكردنەوە تا ئارام بوونەوە و بێدەنگ بوون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژەكەی بوو ڕۆشت تا چووە لای سەعدی كوڕی عوبادە ﷺ وە پێی فەرموو: ((ئەی سەعد ئایا نەتبیستووە

(١) كە نەخۆش بوو.

ئەبو حوباب چی وتوە؟)) مەبەستی عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی بوو، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ببورە و چاوپۆشی لێ بكە، بەڕاستی خوا ئەوەی پێ بەخشیوی كە پێی بەخشیوی، سوێند بەخوا خەڵكی ئەم شارە ڕێكەوتبوون كە تاجی پادشایەتی بكەنە سەری و سەرپێچی پادشایی ببێچن بەسەریەوە، جا كاتێ خوا نەیهێشت ئەوە ببێ بە هۆی ئەو پەیامە ڕاستەی خوا بەتۆیدا (ناردی بۆمان) بەوە پەست بوو، ئەوەش ئەوەی پێكردوە كە بینیت.

٥٦٦٤- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدٍ -هُوَ ابْنُ الْمُنْكَدِرِ- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: جَاءَنِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي لَيْسَ بِرَاكِبِ بَغْلٍ وَلاَ بِرْذَوْنٍ[1].

**٥٦٦٤-جابیر ﷺ دەڵێ: نەخۆش بووم پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام سەردانی كردم، نەسواری هێستر نەبارگیر[2] بوو (بەڵكو بە پیادە هات).**

## ١٦- بابُ قَوْلِ الْمَرِيضِ: إِنِّي وَجِعٌ، أَوْ: وَارَأْسَاهْ، أَوِ: اشْتَدَّ بِي الْوَجَعُ

وَقَوْلِ أَيُّوبَ ﷺ: ﴿ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ الأنبياء

٥٦٦٥- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ وَأَيُّوبَ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أُوقِدُ تَحْتَ الْقِدْرِ، فَقَالَ: «أَيُؤْذِيكَ هَوَامُّ رَأْسِكَ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. فَدَعَا الْحَلاَّقَ فَحَلَقَهُ ثُمَّ أَمَرَنِي بِالْفِدَاءِ[3].

---

(١) بڕوانە: ١٩٤.

(٢) باگیر: واتە: ئەسپ و ماینی بار. بڕوانە: فەرهەنگی خاڵ: ل ٢٣، ئەملونجید بەكوردی:١٤٣/١.

(٣) بڕوانە: ١٨١٤.

# ١٦- باسی نەخۆش بڵێ من نەخۆشم[١] یان ئای سەرم یان زۆر نەخۆشم[٢] (دروستە)

**وە باسی ئەم وتەی ئەیووب ﷺ (بەڕاستی من زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە و تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی).**

**٥٦٦٥- کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلامدا تێپەڕی من لەو کاتەدا ئاگرم هەڵدەگیرساند لە ژێر قابلەمەکەدا، ئەویش فەرمووی: ((ئایا جانەوەرەکانی سەرت ئازارت دەدەن؟)) منیش وتم: بەڵێ، جا پێغەمبەر ﷺ سەرتاشەکەی بانگ کرد و (سەرمی) تاشی، لە پاشان فەرمانی پێکردم فیدیە بدەم[٣].**

٥٦٦٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى أَبُو زَكَرِيَّاءَ، أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلَالٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: وَارَأْسَاهْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَاكِ لَوْ كَانَ وَأَنَا حَيٌّ، فَأَسْتَغْفِرُ لَكِ وَأَدْعُو لَكِ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: وَاثُكْلِيَاهْ، وَاللَّهِ إِنِّي لَأَظُنُّكَ تُحِبُّ مَوْتِي، وَلَوْ كَانَ ذَاكَ لَظَلِلْتَ آخِرَ يَوْمِكَ مُعَرِّسًا بِبَعْضِ أَزْوَاجِكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بَلْ أَنَا وَارَأْسَاهْ، لَقَدْ هَمَمْتُ -أَوْ أَرَدْتُ- أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ، وَأَعْهَدَ أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ، ثُمَّ قُلْتُ: يَأْبَى اللَّهُ وَيَدْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ" أَوْ: "يَدْفَعُ اللَّهُ وَيَأْبَى الْمُؤْمِنُونَ»[٤].

**٥٦٦٦- قاسیمی کوڕی موحەمەد دەڵێ: عائیشە ﷺ وتی: وای سەرم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی((ئەگەر ئەوە ببوایە[٥] منیش زیندوو بوومایە داوای لێبوردنم بۆ دەکردی بۆشت دەپاڕامەوە لە خوا))، عائیشەش ﷺ وتی: وای دایک**

---

(١) یان بڵێ من ئازام هەیە.

(٢) یان زۆر ئازارم هەیە.

(٣) کە سێ ڕۆژ بەڕۆژو بونە یان نانی شەش هەژار دانە یان سەربڕینی مەڕێکە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٩٥/١٢.

(٤) بڕوانە: ٧٢١٧.

(٥) ئەگەر بمردیتایە.

رۆڵە رۆم بۆ بکات، وەڵلاهی من وا گومانت پێ دەبەم پێت خۆشە بمرم، ئەگەر من بمرم، لە کۆتای رۆژی مردنەکەمدا سەرجێی لەگەڵ یەکێك لە ژنەکانتدا دەکەیت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی(( (واز لەوە بێنە) بەڵکو من وای سەرم، سوێند بەخوا هات بەخەیاڵمدا- یان ویستم- بنێرم بەشوێن ئەبو بەکر و کورەکەیدا ﷺ، تاوسێت (ی بۆ بکەم) [1] نەوەك کەسانێك بڵێن[2]" یان کەسانی ئاوات خوازن ئاواتی بۆ بخوازن لە پاشان وتم: خوا (بە غەیری ئەبو بەکر) رازی نابێ، باوەرداڕانیش (جگە لەو) رەددەکەنەوە ))، یان ((خوا (جگە لەو) رەددەکاتەوە و باوەرداڕانیش (بەغەیری ئەبو بەکر) رازی نابن.

٥٦٦٧- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُوعَكُ فَمَسِسْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا. قَالَ: «أَجَلْ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ».
قَالَ: لَكَ أَجْرَانِ. قَالَ: «نَعَمْ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى -مَرَضٌ فَمَا سِوَاهُ- إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[3].

٥٦٦٧- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تای لێ هاتبوو، بۆیە دەستم لێدا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ تایەکی قورست هەیە؟ ئەویش فەرمووی: ((بەڵێ، بێگومان من تام لێ دێ بە ئەندازەی دوو پیاو لەئێوە کەتای لێ دێ))، عەبدوڵڵاش وتی: ئەمە لەبەر ئەوەیە دوو پاداشتت هەیە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ وایە، هیچ مسوڵمانێك نییە کە توشی ئازارێك ببێ -لە نەخۆشی و غەیری نەخۆشی - ئیللا خوای گەورە تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێ، وەك چۆن دار گەڵا رێزان دەکات)).

(١) لەپاش مردنم ئەو جێنشینم بێت.
(٢) جێنشینی بۆ فلانەکەس یان بۆمن.
(٣) بڕوانە: ٥٦٤٧.

٥٦٦٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، أَخْبَرَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: جَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي مِنْ وَجَعٍ اشْتَدَّ بِي زَمَنَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَقُلْتُ: بَلَغَ بِي مَا تَرَى، وَأَنَا ذُو مَالٍ وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ لِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: بِالشَّطْرِ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: الثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ كَثِيرٌ، أَنْ تَدَعَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَلَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ عَلَيْهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ»[1].

**٥٦٦٨- عامیری کوڕی سەعد لە سەعدی باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: لە کاتی حەجیماڵئاواییدا لە نەخۆشیەکدا کە زۆر نارەحەتی کردبووم پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام و سەردانی کردم، منیش وتم: من نەخۆشیەکەم بەو ڕادە گەیشتووە کە دەیبینی، وە من خاوەن ماڵ و سامانم، وە تەنها کچێکم هەیە میراتم لێ ببات، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم ببەخشم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: نیوەی ببەخشم؟ ئەویش فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: سێ یەکی ببەخشم؟ فەرمووی: ((سێ یەکی ببەخشە سێ یەك زۆریشە، چونکە تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵی باشترە لەوەی وا بەجێیان بێڵی دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، وە بێگومان تۆ هەر بەخشینێك ببەخشیت کە مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێت، دڵنیابە پاداشتت دەدرێتەوە لەسەری هەتا لەسەر ئەو پاروەش دەیدەیت بەخێزانەکەت بیخوات)).**

(١) بڕوانە: ٥٦.

## ١٧- بابُ قَوْلِ الْمَرِيضِ: قُومُوا عَنِّي

٥٦٦٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ.
وَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا حُضِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَفِي الْبَيْتِ رِجَالٌ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلُمَّ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدَهُ».
فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ غَلَبَ عَلَيْهِ الْوَجَعُ وَعِنْدَكُمُ الْقُرْآنُ، حَسْبُنَا كِتَابُ اللَّهِ. فَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْبَيْتِ، فَاخْتَصَمُوا، مِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: قَرِّبُوا يَكْتُبْ لَكُمُ النَّبِيُّ ﷺ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ. وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ مَا قَالَ عُمَرُ، فَلَمَّا أَكْثَرُوا اللَّغْوَ وَالاِخْتِلاَفَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُومُوا».
قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّ الرَّزِيَّةَ كُلَّ الرَّزِيَّةِ مَا حَالَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ أَنْ يَكْتُبَ لَهُمْ ذَلِكَ الْكِتَابَ مِنِ اخْتِلاَفِهِمْ وَلَغَطِهِمْ[١].

## ١٧- باسی نەخۆش بڵێت (بەو کەسانەی لای ئەون): هەستن لام بڕۆن

**٥٦٦٩-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا لەسەرە مەرگدا بوو پیاوانێك لە ماڵەکەیدا بوون، عومەری کوڕی خەتتابیان تێدا بوو ﷺ، پێغەمبەر فەرمووی: ((وەرن با نوسراوێکتان بۆ بنووسم لە دوای ئەونوسراوە گومڕا و سەرگەردان نەبن))، عومەریش ﷺ: وتی: بێگومان پێغەمبەر بەدڵنیاییەوە ئازار زۆری بۆ هێناوە (ئەزیەتی مەیەن لەو حاڵەدا نامەتان بۆ بنووسێت)، قورئانتان لایە و لەبەر دەستتان دایە، قورئانەکەی خوامان بەسە، جا ئەو**

---

(١) بڕوانە: ١١٤.

کەسانەی لە ماڵەکەدا بوون ناکۆك بوون، بوویە کێشەیان، هەیان بوو دەیوت: لێی نزیك ببنەوە تا پێغەمبەر نووسراوێکتان بۆ بنوسێت لە پاش ئەو گومڕا نەبن، هەشیان بوو ئەو قسەی دەکرد کە پێشتر عومەر وتی، جا کە دەنگە دەنگ و ناکۆکی زۆریان کرد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەری خواش فەرمووی: ((هەستن))، عوبەیدوڵڵا دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ دەیوت: کارەساتی هەرە گەورە ئەوە بوو کە بوویە ڕێگر لە نێوان پێغەمبەری خوا و ئەوەی کە ئەو نووسراوەیان بۆ بنوسێت، بەهۆی جیاوازی و دەنگە دەنگیانەوە.

## ١٨- بابُ مَنْ ذَهَبَ بِالصَّبِيِّ الْمَرِيضِ لِيُدْعَى لَهُ

٥٦٧٠- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ -هُوَ ابْنُ إِسْمَاعِيلَ- عَنِ الْجُعَيْدِ قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، وَقُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الحَجَلَةِ[١].

## ١٨- باسی کەسێک منداڵی نەخۆش ببات (بۆلای پیاو چاکێک) تا دوعای بۆ بکات

٥٦٧٠- جوعەید دەڵێ: لە سائیبم بیست دەیوت: پوورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕی خوشکەزایەم نەخۆشە و ئازاری هەیە، پێغەمبەریش ﷺ دەستی پیرۆزی هێنا بەسەرمدا و دوعای خێری بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، پاشان لە پشتیەوە وەستام و سەیری مۆری پێغەمبەراتیم کرد لەنێو شانیدا وەك هێلکەی کەو وابوو.

---

(١) بڕوانە: ١٩٠.

## ١٩- بابُ تَمَنِّي الْمَرِيضِ الْمَوْتَ

٥٦٧١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي»[١].

## ١٩- باسی نەخۆش ئاواتی مردن بخوازێت

**٥٦٧١-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با كەسێكتان لەبەر زیانێك تووشی بووە ئاواتی مردن نەخوازێت، خۆ ئەگەر هەر ناچار بوو ئەوە با بڵێت: خودایە بمژییەنیت ئەگەر ژیان چاكترە بۆم، وە ئەگەر مردنیش چاكترە بۆم بم مرێنیت)).**

٥٦٧٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: دَخَلْنَا على خَبَّابٍ نَعُودُهُ -وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ- فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ سَلَفُوا مَضَوْا وَلَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا، وَإِنَّا أَصَبْنَا مَا لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعًا إِلاَّ التُّرَابَ، وَلَوْلاَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ مَرَّةً أُخْرَى وَهْوَ يَبْنِي حَائِطًا لَهُ فَقَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ لَيُوجَرُ فِي كُلِّ شَيْءٍ يُنْفِقُهُ إِلاَّ فِي شَيْءٍ يَجْعَلُهُ فِي هَذَا التُّرَابِ[٢].

**٥٦٧٢-قەیسی كوڕی ئەبی حازیم دەڵێ: چووین بۆ لای خەبباب سەردانیمان كرد- كە بێگومان حەوت جار خۆی داخ كردبوو- جا وتی: ئەو هاوڕێیانەمان پێشكەوتن و (مردن لە پێشدا) ڕۆشتن، دونیا هیچ لە پاداشتی كەم نەكردنەوە، ئێستا ئێمە ئەوەندەمان دەستكەوتووە جێمان دەست ناكەوێ تێیكەین، مەگەر**

---

(١) بڕوانە: ٦٣٥١.

(٢) بڕوانە: ٦٣٤٩، ٦٣٥٠، ٦٤٣٠، ٦٤٣١، ٧٢٣٤.

**خانووی پێبکەین، وە لەبەر ئەوە نەبوایە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لێمان کە داوای مردن بکەین داوام دەکرد، لە پاشان جارێکی تر هاتینەوە بۆ لای (خەبباب) دیوارێکی دروست دەکرد کە هی خۆی بوو، ئینجا وتی: بەڕاستی مسوڵمان لە هەموو شتێکدا خەرجی دەکات پاداشت دەدرێتەوە جگە لەشتێك کە لەو خانوو کردنەوەیەدا خەرج بکات.**

٥٦٧٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو عُبَيْدٍ -مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا عَمَلُهُ الْجَنَّةَ». قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لاَ، وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَلاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْرًا، وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ»[1].

**٥٦٧٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هیچ کەس کردەوەکانی نایباتە بەهەشتەوە))، عەرزیان کرد: تۆش (ناباتە بەهەشتەوە) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نەخێر منیش ناباتە بەهەشتەوە، مەگەر خوا بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی دامپۆشێت،کەوابوو ڕاستە ڕێ بگرن [2] نزیك ببنەوە لە (چڵە پۆپە) ئەوەندەی بۆتان دەکرێ، وە با هیچ کەسێکتان ئاوات بە مردن نەخوازێت، یان چاکە کارە ئەوە لەوانەیە چاکەی زیاتر بکات، یا خراپە کارە ئەوە لەوانەیە بگەڕێتەوە (لە خراپەکاری) )).**

(١) بڕوانە: ٣٩.

(٢) ئەگەر نەتان توانی بگەنە چڵە پۆپە لە چاکەکردندا.

٥٦٧٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ مُسْتَنِدٌ إِلَيَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأَعْلَى»[١].

**٥٦٧٤- عەببادی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە عائیشەم ﵂ بیست وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست لە كاتێكدا پشتی نابوو بەسنگمەوە و دەیفەرموو: ((خودایە لێم خۆش بەو و ڕەحمم پێبكە و بم گەیەنیت بەهاوڕێ هەرە بەرزەكانم[٢])).**

## ٢٠- بابُ دُعَاءِ الْعَائِدِ لِلْمَرِيضِ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ بِنْتُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهَا قال النبي ﷺ "اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا يعني: ابن أبي وقاص"[٣].

٥٦٧٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضًا -أَوْ أُتِيَ بِهِ- قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا». قَالَ عَمْرُو بْنُ أَبِي قَيْسٍ وَإِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ وَأَبِي الضُّحَى: إِذَا أُتِيَ بِالْمَرِيضِ. وَقَالَ جَرِيرٌ: عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي الضُّحَى وَحْدَهُ، وَقَالَ: إِذَا أَتَى مَرِيضًا[٤].

## ٢٠- باسی دوعاكردنی سەردانی كەر بۆ نەخۆشەكە (كە خوا شیفای بدات)

**-عائیشەی كچی سەعد لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (خوایە شیفای سەعد بدەیت).**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٤٠.

(٢) مەبەستی فریشتەكانە: بڕوانە:إرشاد الساري: ٤٠٥/١٢.

(٣) بڕوانە: ٥٦٥٩.

(٤) بڕوانە: ٥٧٤٣، ٥٧٤٤، ٥٧٥٠.

**٥٦٧٥- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بڕۆشتایه بۆ لای نەخۆشێك-یان نەخۆشێك بهێنرایه بۆ لای- دەیفەرموو: ((ئەم ئازاره لابەره پەروەردگاری خەڵکی، شیفای بده و خۆت شیفادەری، هیچ شیفایەك نییه جگه له شیفای تۆ، شیفایەك کە هیچ نەخۆشییەك جێناهێڵێ)).**

**-عەمری کوڕی ئەبی قەبیس و ئیبراهیمی کوڕی تەهمان له مەنصورەوە دەیگێڕنەوە له ئیبراهیم و ئەبو زوحاوە دەیگێڕێتەوە وتی: ئەگەر نەخۆشێك بهێنرایه بۆ لای.**

**-جەریر دەڵێ له مەنصورەوە دەگێڕێتەوە ئەویش له ئەبی زوحاوە به تەنها، وە دەڵێ: ئەگەر بڕۆشتایەتە لای نەخۆشییەك.**

## ٢١- بابُ وُضُوءِ الْعَائِدِ لِلْمَرِيضِ

٥٦٧٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا مَرِيضٌ، فَتَوَضَّأَ فَصَبَّ عَلَيَّ -أَوْ قَالَ: "صُبُّوا عَلَيْهِ"- فَعَقَلْتُ فَقُلْتُ: لاَ يَرِثُنِي إِلاَّ كَلاَلَةٌ، فَكَيْفَ الْمِيرَاثُ؟ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِضِ[1].

## ٢١- باسی دەست نوێژگرتنی سەردانی کەر بۆ نەخۆش

**٥٦٧٦-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێ: له کاتێکدا من نەخۆش بووم پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام و دەستنوێژی گرت و ئاوی دەست نوێژەکەی کرد بەسەرمدا-یان فەرمووی: ((ئەو ئاوە بڕژێنن بەسەریدا)) - منیش هۆشم کردەوە و وتم: من جگەله کەلالە کەس میرات گرم نییه، میرات چۆنە؟ ئیتر بەو هۆیەوە ئایەتی دابەشکردنی میرات دابەزی.**

(١) بڕوانه: ١٩٤.

## ٢٢- بَابُ مَنْ دَعَا بِرَفْعِ الْوَبَاءِ وَالْحُمَّى

٥٦٧٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، قَالَتْ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِمَا فَقُلْتُ: يَا أَبَتِ كَيْفَ تَجِدُكَ؟ وَيَا بِلاَلُ كَيْفَ تَجِدُكَ؟ قَالَتْ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ... وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ فَيَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً... بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مِجَنَّةٍ... وَهَلْ تَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ وَصَحِّحْهَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا فَاجْعَلْهَا بِالْجُحْفَةِ»[1].

## ٢٢- باسی ئەو كەسەی بپاڕێتەوە بۆ نەهێشتنی پەتا و درم و تا

**٥٦٧٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ (كۆچی كرد و) هات بۆ مەدینە، ئەبو بەكر و بیلال ﵄ تووشی تا و لەرز بوون، (عائیشە) دەڵێ: ڕۆشتم بۆ لای هەردووكیان وتم: بابە گیان تەندروستیت چۆنە؟ ئەی بیلال تەندروستیت چۆنە؟ ئەبو بەكر ﵁ كاتێ تایی لێ بهاتایە دەیوت: هەموو كەس با لە ناو كەسوكاری دا ڕۆژ بكاتەوە (بەساغی)، مردن نزیكترە لێوەی لە قەیتانی پێڵاوەكانی، بیلالیش كە تاكەی بەری دەدا بەگریانەوە دەنگی بەرز دەكردەوە و دەیوت: ئای خۆزگە بمزانیایە جارێكی تر لە شیوێكدا (لە شیوەكانی مەككە) شەو ڕۆژ دەكەمەوە، كە زوڕناتك و گیای جەلیل لە دەورم بێ؟! ئایا**

(١) بروانە: ١٨٨٩.

ڕۆژی دەبێ بچمە سەر ئاوی مەجەننە[١] و ئایا شاخی شامە و تەفیلم[٢] بۆ دەردەكەوێ؟!

عائیشە ﵂ وتی: منیش چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی (هەردووكیانم) پێ دا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە وەك خۆشویستنمان بۆ مەككە مەدینەشمان لای خۆشەویست بكە یان زیاتر، وە نەخۆشی لە مەدینەدا مەهێڵە و ساغی بكە، وە خوایە فەڕ و بەرەكەت بخەرە ساغ و مودیەوە بۆمان، وە تا و لەرزەكەی بگوازەرەوە و بیبە بۆ جوحفە[٣])).

---

(١) جێگایەكە چەند میلێك لە مەككە دوورە، لەسەردەمی نەفامیدا بازاڕێكی لێبووە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٨٦/١٢.

(٢) دوو شاخن لە نزیك مەكەوە.

(٣) جوحفە: شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵكی شامە كە دێن بۆ حەج و عومرە: بڕوانە: إرشاد الساري: ٣٨٦/١٢.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٧٦- كِتَابُ الطِّبِّ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٦- پەڕاوی پزیشکی

## ١- بَابٌ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً

٥٦٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً».

## ١- باسێک: خوا هەر نەخۆشییەکی ناردبێ دەرمان و چاکبوونەوەی بۆ ناردووە

**٥٦٧٨-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا هیچ نەخۆشییەکی نەناردووە، ئیللا (هۆی) چاکبوونەوەی بۆ ناردووە)).**

## ٢- بَابٌ: هَلْ يُدَاوِي الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ أَوِ الْمَرْأَةُ الرَّجُلَ؟

٥٦٧٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ ذَكْوَانَ، عَنْ رُبَيِّعَ بِنْتِ مُعَوِّذٍ ابْنِ عَفْرَاءَ قَالَتْ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَسْقِي الْقَوْمَ، وَنَخْدُمُهُمْ، وَنَرُدُّ الْقَتْلَى وَالْجَرْحَى إِلَى الْمَدِينَةِ[1].

---

(١) بروانە: ٢٨٨٢.

## ٢- ئەم باسێکە:ئایا پیاو ئافرەت چارەسەر بکات یان ئافرەت پیاو چارەسەر بکات؟

**٥٦٧٩- ڕوبەییعی کچی موعەوویزی کوڕی عەفرا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ غەزامان دەکرد و ئاومان دەدا بە خەڵکە (جەنگاوەرە)کە و خزمەتمان دەکردن و کوژراو و بریندارەکانمان دەبردەوە بۆ مەدینە.**

## ٣- بَابٌ: الشِّفَاءُ فِي ثَلاَثٍ

٥٦٨٠- حَدَّثَنِي الْحُسَيْنُ، حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ شُجَاعٍ، حَدَّثَنَا سَالِمٌ الأَفْطَسُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «الشِّفَاءُ فِي ثَلاَثَةٍ: شَرْبَةِ عَسَلٍ، وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ، وَكَيَّةِ نَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ». رَفَعَ الْحَدِيثَ. وَرَوَاهُ الْقُمِّيُّ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْعَسَلِ وَالْحَجْمِ[١].

## ٣- باسێک:چاکبوونەوە (لە نەخۆشی) لەسێ شت دایە

**٥٦٨٠-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ((لە سێ شتدا چارەسەر و چاکبوونەوە هەیە: لە شەربەتی هەنگویندا، لە کەڵەشاخ گرتندا[٢]، لە داغکردن بە ئاگر، وە من داغکردن لە ئوممەتم قەدەغە دەکەم))، (ئیبنو عەبباس) ئەم فەرموودەیە دەباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ[٣].**

**وە (یەعقوبی) قوممیی ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە لەیسەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((لە هەنگوین و کەڵەشاخدا)).**

---

(١) بروانە: ٥٦٨١.

(٢) (وشَرطَة مِحجَم) مەبەستی پێی:ئەو ئامێرە تیژەیە شوێنی خوێن گرتنی کەڵەشاخەکەی پێ بریندار دەکرێ.

(٣) واتە: بە فەرموودەی پێغەمبەر دەیگێڕێتەوە نەک بەوتەی خۆی بێت.

٥٦٨١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا سُرَيْجُ بْنُ يُونُسَ أَبُو الْحَارِثِ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ بْنُ شُجَاعٍ، عَنْ سَالِمٍ الأَفْطَسِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الشِّفَاءُ فِي ثَلاَثَةٍ: فِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ»[1].

**٥٦٨١- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چارەسەرو چاکبونەوە لە سێ شتدا هەیە، لە کەڵەشاخ گرتندا، یان لەشەربەتی هەنگویندا، یان لە داغکردندا بەئاگر، وەمن داغکردن لە ئومەتەکەم قەدەغە ئەکەم)).**

## ٤- بابُ الدَّوَاءِ بِالْعَسَلِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل

٥٦٨٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الْحَلْوَاءُ وَالْعَسَلُ[2].

## ٤- باسی چارەسەر و چاکبوونەوە بە هەنگوین

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ( (هەنگوین) شیفای تیایە بۆ خەڵکی).**

**٥٦٨٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە حەڵوا و هەنگوین بوو.**

٥٦٨٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْغَسِيلِ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ -أَوْ يَكُونُ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ- خَيْرٌ، فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ تُوَافِقُ الدَّاءَ، وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»[3].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٨٠.

(٢) بڕوانە: ٤٩١٢.

(٣) بڕوانە: ٥٦٩٧، ٥٧٠٢، ٥٧٠٤.

**٥٦٨٣-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر لە هەندێك لە چارەسەرەکانی ئێوەدا خێرێك بووە- یان لە هەندێك لە چارەسەرەکانی ئێوەدا خێرێك ببێ- ئەوا لە کەڵەشاخ گرتن دایە، یان لە شەربەتی هەنگوین دایە، یان لە ئاگر پیاچزاندن دایە، کە لەگەڵ نەخۆشیەکەدا بگونجێت، من حەزم لە داغکردن نییە)).**

٥٦٨٤- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ. فَقَالَ: «اسْقِهِ عَسَلاً». ثُمَّ أَتَى الثَّانِيَةَ فَقَالَ: «اسْقِهِ عَسَلاً». ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: فَعَلْتُ. فَقَالَ: «صَدَقَ اللَّهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً». فَسَقَاهُ، فَبَرَأَ[1].

**٥٦٨٤-ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کەپیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: براکەم سکی دێشێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەنگوینی بەرێ))، پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: ((هەنگوینی بەرێ))، پاشان هاتەوە بۆ خزمەتی وتی: ئەوەم کرد فەرمووت: (بەڵام چاك نەبوویەوە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوا ڕاستی فەرمووە [2]، سکی براکەت درۆ دەکات، هەنگوینی بەرێ))، ئەویش هەنگوینی پێدا و چاك بوویەوە.**

## ٥- بابُ الدَّوَاءِ بِأَلْبَانِ الإِبِلِ

٥٦٨٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا سَلاَّمُ بْنُ مِسْكِينٍ، حَدَّثَنَا ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ نَاسًا كَانَ بِهِمْ سَقَمٌ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، آوِنَا وَأَطْعِمْنَا: فَلَمَّا صَحُّوا قَالُوا: إِنَّ الْمَدِينَةَ وَخِمَةٌ.

---

(١) بڕوانە: ٥٧١٦.

(٢) کە هەنگوین شیفای تیایە.

فَأَنْزَلَهُمُ الْحَرَّةَ فِي ذَوْدٍ لَهُ فَقَالَ: «اشْرَبُوا أَلْبَانَهَا». فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ ﷺ وَاسْتَاقُوا ذَوْدَهُ، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ مِنْهُمْ يَكْدُمُ الأَرْضَ بِلِسَانِهِ حَتَّى يَمُوتَ. قَالَ سَلاَّمٌ: فَبَلَغَنِي أَنَّ الْحَجَّاجَ قَالَ لأَنَسٍ: حَدِّثْنِي بِأَشَدِّ عُقُوبَةٍ عَاقَبَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَحَدَّثَهُ بِهَذَا، فَبَلَغَ الْحَسَنَ، فَقَالَ: وَدِدْتُ أَنَّهُ لَمْ يُحَدِّثْهُ[1].

## ٥- باسی چارەسەر کردن بەشیری وشتر

**٥٦٨٥-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە خەڵکانێك نەخۆشییان هەبوو[2] وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێگامان بکەرەوە و خۆراکمان پێ بدە، جا کاتێ چاك بوونەوە وتیان: مەدینە ئاو و هەوای ناسازە[3]، بۆیە لە حەڕرە داینان و نیشتەجێی کردن لەگەڵ وشترەکانی خۆیدا، فەرمووی پێیان: ((شیری وشترەکان بخۆنەوە))، جاکە چاك بوونەوە شوانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کوشتبوو، وشترەکانیان دابویەبەر و بردبوونیان، (پێغەمبەریش ﷺ) چەکداری نارد بە شوێنیاندا (گرتنیان و هێنانیانەوە)، ئەنجا دەست و قاچیانی بڕی و بە بسماری سورۆکراو چاویانی ڕشت [4]، (ئەنەس دەڵێ): ئینجا پیاوێکم بینی لەوانە بەدەم و زمانی قەپی دەکرد بەزەویدا بۆئەوەی بمرێت. سەلام دەڵێ: پێم گەشتووە کە حەجاج بەئەنەسی وت: سەخترین سزا کە پێغەمبەر ﷺ سزای پێ دابێت بۆم بگێڕەوە، ئەنەسیش ئەم فەرموودەی بۆ گێڕایەوە، ئەنجا ئەم باسە بە حەسەن گەشتەوە ئەویش وتی: ئاواتە خوازبووم ئەنەس بۆی نەگێڕایەتەوە.**

---

(١) بروانە: ٢٣٣.

(٢) سکیان ئازاری هەبوو.

(٣) شوێن نەخۆشییە.

(٤) یان چاویانی هەڵکۆڵی.

## ٦- بَابُ الدَّوَاءِ بِأَبْوَالِ الإِبِلِ

٥٦٨٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ نَاسًا اجْتَوَوْا فِي الْمَدِينَةِ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَلْحَقُوا بِرَاعِيهِ -يَعْنِي: الإِبِلَ - فَيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَلَحِقُوا بِرَاعِيهِ فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا حَتَّى صَلَحَتْ أَبْدَانُهُمْ، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ وَسَاقُوا الإِبِلَ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَبَعَثَ فِي طَلَبِهِمْ، فَجِيءَ بِهِمْ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ. قَالَ قَتَادَةُ: فَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ أَنَّ ذَلِكَ كَانَ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الْحُدُودُ[١].

## ٦- باسی چارەسەر کردن بە میزی وشتر

**٥٦٨٦-ئەنەس ﷺ گێڕایەوە کە کەسانێك حەزیان لە ئاو و هەوای مەدینە نەبوو [٢]، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە بڕۆن و بگەنە لای شوانەکەی- واتە شوانی وشترەکانی- ئینجا لە شیر و میزیان بخۆنەوە، ئەوانیش ڕۆشتن و گەشتنە لای شوانەکەی پێغەمبەر ﷺ و ئینجا لەشیر و میزی وشترەکانیان خواردەوە، تا لاشەیان چاك بوویەوە، ئەوسا شوانەکەیان کوشت و وشترەکانیان دایەبەر و بردنیان، پاشان هەواڵەکە بە پێغەمبەر ﷺ گەشت، چەکداری نارد بەشوێنیاندا، پاشان هێنانیانەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەست و قاچیانی بڕی بەبزماری سورۆکراو و چاویانی ڕشت.**

**قەتادە دەڵێ: موحەممەدی کوڕی سیرین بۆی گێڕامەوە ئەم ڕووداوە پێش ئەوە بوو (سزای) سنوورەکان دابەزێت [٣].**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٣.

(٢) ناسازبوو بۆیان پێی نەخۆش کەوتن.

(٣) مەبەست لە سنوورەکان سزای پیاوکوشتن و زیناکردن و دزی کردنە........هتد.

## ٧- بابُ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ

٥٦٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللهِ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ خَالِدِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: خَرَجْنَا وَمَعَنَا غَالِبُ بْنُ أَبْجَرَ فَمَرِضَ فِي الطَّرِيقِ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَهْوَ مَرِيضٌ، فَعَادَهُ ابْنُ أَبِي عَتِيقٍ فَقَالَ لَنَا: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحُبَيْبَةِ السَّوْدَاءِ، فَخُذُوا مِنْهَا خَمْسًا أَوْ سَبْعًا فَاسْحَقُوهَا، ثُمَّ اقْطُرُوهَا فِي أَنْفِهِ بِقَطَرَاتِ زَيْتٍ فِي هَذَا الْجَانِبِ وَفِي هَذَا الْجَانِبِ، فَإِنَّ عَائِشَةَ حَدَّثَتْنِي أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هَذِهِ الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ مِنَ السَّامِ». قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ الْمَوْتُ.

## ٧- باسی ڕەشكە و سودەكانی

**٥٦٨٧-خالیدی كوڕی سەعد دەڵێ: دەرچووین و ڕۆشتین غالیبی كوڕی ئەبجەرمان لەگەڵ بوو لە ڕێگادا نەخۆش كەوت، ئینجا چووینە مەدینە و غالیب نەخۆش بوو، ئیبنو ئەبی عەتیق سەردانی كرد و وتی پێمان: ڕەشكەی بۆ بەكاربێنن، پێنج یان حەوت دەنك ڕەشكە بێنن و بیكوتن لەگەڵ زەیتدا تێكەڵی بكەن- بیتكێننە لووتی بیكەنە ئەملا و لای لووتی [١]، چونكە بەڕاستی عائیشە ﵂ بۆی گێڕامەوەكە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان ئەم ڕەشكەیە دەرمانی هەموو دەردێكە جگە لە سام))، عەرزم كرد: سام چییە؟ فەرمووی: (مردنە).**

٥٦٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ، وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُمَا أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَالسَّامُ: الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ: الشُّونِيزُ.

---

(١) واتە:ڕەشكەكە لەگەڵ زەیت تێكەڵ بكەن و بەشێوەی قەترە بیكەنە هەردوو كونە لووتی.

**٥٦٨٨-ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەبو سەلەمە و سەعیدی كوڕی موسەییەب دەگێڕنەوە كە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆ هەردووكیانی گێڕاوەتەوە كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((لە ڕەشكەدا شیفای هەموو نەخۆشییەك هەیە جگە لە سام))، ئیبنو شیهاب دەڵێ:** (السَّامُ) **مردنە** (الْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ) **ڕەشكەیە** [1]).

## ٨- بابُ التَّلْبِينَةِ لِلْمَرِيضِ

٥٦٨٩- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا كَانَتْ تَأْمُرُ بِالتَّلْبِينِ لِلْمَرِيضِ وَلِلْمَحْزُونِ عَلَى الْهَالِكِ، وَكَانَتْ تَقُولُ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ التَّلْبِينَةَ تُجِمُّ فُؤَادَ الْمَرِيضِ، وَتَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ»[2].

## ٨- باسی شۆربای تەلبینە [3] بۆ نەخۆش

**٥٦٨٩-عوروە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عائیشە ﷺ فەرمانی دەكرد شۆربای تەلبینە بۆ نەخۆش و خەفەتباری كەس مردوو دروست بكرێت، وە عائیشە دەیوت: من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان شۆربای تەلبینە سەبووری دەدات بە دڵی نەخۆش و هەندێ لە غەم و خەفەتیش لا دەبات)).**

٥٦٩٠- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا كَانَتْ تَأْمُرُ بِالتَّلْبِينَةِ وَتَقُولُ: هُوَ الْبَغِيضُ النَّافِعُ[4].

---

(١) الشونيز: ڕووەكێكی گیای ساڵانەیە هەیەتی بۆ تۆوەكەی دەچێنرێت یان بۆگوڵەكەی، هەشیەتی دەشتییە لە كێڵگەكاندا دەڕوێت بەرەكەی ڕەشە. (ئەلمونجید بەكوردی:٧٢٧\١٢).

(٢) بڕوانە: ٥٤١٧.

(٣) تەلبینە: دەگونجێ پێی بڵێین: شیربڕێش واتە شیر و بڕوێش یان شیرەوا. سەیری فەرموودە: (٥٤١٧) بكە لەوێدا مانامان كردوە.

(٤) بڕوانە: ٥٤١٧.

**٥٦٩٠-هیشام له باوکیەوه دەگێڕێتەوه ئەویش له عائیشەوه ﵂ که عائیشه فەرمانی دەکرد به دروست کردنی شۆربا تەلبینه و دەیوت: بوغزێنراوه بەسوودەکەیه (بۆ نەخۆش).**

## ٩- بابُ السَّعُوط

٥٦٩١- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ احْتَجَمَ وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ، وَاسْتَعَطَ[1].

## ٩- باسی دەرمان کردنه لووتەوه

**٥٦٩١-ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوه که پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی گرت و کرێیدا به کەڵەشاخ گرەکه و دەرمانیشی کرده لووتیەوه.**

## ١٠- بابُ السَّعُوطِ بِالْقُسْطِ الْهِنْدِيِّ وَالْبَحْرِيِّ

وَهْوَ الكُسْتُ مِثْلُ الكَافُورِ وَالْقَافُورِ، مِثْلُ ﴿كُشِطَتْ ﴿١١﴾﴾ التكوير. نُزِعَتْ، وَقَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: (قُشِطَتْ).

٥٦٩٢- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ»[2].

---

(١) بڕوانه: ١٨٣٥.

(٢) بڕوانه: ٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨.

## ١٠- باسی دەرمان کردنە لووت بە قوستی هیندی و قوستی دەریایی

**کە کوستیشی پێی دەوترێ، وەك (الكَافُورِ) و (الْقَافُورِ)، وە وەك (كُشِطَتْ) بەمانای داماڵینە،کە عەبدوڵلا (ی کوڕی مەسعوود) بە (قُشِطَتْ) خوێندوویەتیەوە[1].**

**٥٦٩٢-ئوممو لقەیسی کچی میحصەن ﵂ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەم داری هیندییە [2] بەکاربێنن، چونکە بێگومان دەرمانی حەوت نەخۆشی تێدایە دەکرێتە لووتەوە بۆ ئازاری گەر و (ی منداڵ)، وە دەکرێتە دەمەوە بۆ ئازاری کەلەکە و تەنیشت)).**

٥٦٩٣- وَدَخَلْتُ على النَّبِيِّ ﷺ بِابْنٍ لِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، فَبَالَ عَلَيْهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّ عَلَيْهِ[3].

**٥٦٩٣-وە ئوممی لقەیس ﵂ دەڵێ: کوڕێکی خۆم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ خواردنی نەدەخوارد (شیرەخۆر بوو)، میزی کرد بە پێغەمبەر ﷺ دا ئەویش داوای ئاوی کرد، پرژاندی بە شوێنی میزەکە.**

## ١١- بابٌ أيَّ سَاعَةٍ يَحْتَجِمُ؟

وَاحْتَجَمَ أَبُو مُوسَى لَيْلًا.

٥٦٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ صَائِمٌ[4].

---

(١) بەکورتی: (قُسط) بە ( کُست) دەخوێنرێتەوە و پیتی قاف بە کاف دەخوێنرێتەوە وەک (کافور) و (قافور)، هەروەها وەک خوێندنەوەی عەبدوڵلا کە (کُشطت)ـی بە (قُسطت) خوێندۆتەوە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٢١/١٢ - ٤٢٢.

(٢) لە کوردەواریدا پێی دەڵێن داری عود کە لە هیندستان زۆرە لەوێوە دەهێنرێ.

(٣) بڕوانە: ٢٢٣.

(٤) بڕوانە: ١٨٣٥.

## ١١- باسێک: (مسوڵمان) له چ کاتێکدا کهڵهشاخ بگرێت؟

**- ئهبو مووسا ﷺ له شهودا کهڵهشاخی گرت.**

**٥٦٩٤-ئیبنو عهبباس ﷺ دهڵێ: پێغهمبهر ﷺ کهڵهشاخی گرت و بهڕۆژوویش بوو.**

## ١٢- بَابُ الْحَجْمِ فِي السَّفَرِ وَالإِحْرَامِ

قَالَهُ ابن بُحَيْنَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

٥٦٩٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ طَاوُسٍ وَعَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ مُحْرِمٌ[٢].

## ١٢- باسی کهڵهشاخ گرتن له سهفهر و له (کاتی) ئیحرامدا

**ئیبنو بوحهینه ئهمهی له پێغهمبهرهوه ﷺ گێڕایهوه[٣].**

**٥٦٩٥-ئیبنو عهبباس ﷺ دهڵێ: پێغهمبهر ﷺ کهڵهشاخی گرت له کاتێکدا که له ئیحرامدا بوو.**

## ١٣- بَابُ الْحِجَامَةِ مِنَ الدَّاءِ

٥٦٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الْحَجَّامِ، فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ، وَقَالَ: «إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ». وَقَالَ: «لاَ تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ»[٤].

---

(١) بڕوانه: ١٨٣٦.

(٢) بڕوانه: ١٨٣٥.

(٣) واتة پێغهمبهر ﷺ له سهفهردا بوو، له ئیحرامیشدا بوو کهڵهشاخی گرت.

(٤) بڕوانه: ٢١٠٢.

# ١٣- باسی كەڵە شاخ گرتن لە نەخۆشی

**٥٦٩٦-حومەیدی درێژ لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە پرسیار لە ئەنەس كرا دەربارەی كرێی كەڵەشاخ گرتن، ئەنەسیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخی گرت، ئەبو تەیبە كەڵەشاخی بۆ گرت پێغەمبەر ﷺ دوو مەن خۆراكی پێدا، وە قسەی لەگەڵ خاوەنەكانیدا كرد ئەوانیش پارەدانەكەیان بۆ كەم كردەوە[١]، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان باشترین دەرمانێك چارەسەری پێ بكەن كەڵەشاخ گرتنە لەگەڵ قوستی دەریای))، وەفەرمووی: ((ئازاری منداڵەكانتان مەدەن بە پەنجە ئاڵوی[٢] مەڵاشویان بگوشن، بە قوست دەرمانیان بكەن)).**

٥٦٩٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ تَلِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو وَغَيْرُهُ: أَنَّ بُكَيْرًا حَدَّثَهُ، أَنَّ عَاصِمَ بْنَ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَادَ الْمُقَنَّعَ ثُمَّ قَالَ: لاَ أَبْرَحُ حَتَّى تَحْتَجِمَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ فِيهِ شِفَاءً»[٣].

**٥٦٩٧-عاصیمی كوڕی عومەری كوڕی قەتادە گێڕایەوە كە جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ سەردانی موقەننەعی كرد (كە نەخۆش بوو)، لە پاشان جابیر وتی: ئێرە بەجێ ناهێڵم هەتا كەڵەشاخ نەگریت، چونكە بێگومان لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((بێگومان كەڵەشاخ گرتن سوودی زۆری تێدایە)).**

(١) ئەبو تەیبە كۆیلە بوو لەگەڵ خاوەنەكەی بە ئەندازەیەك پارە ڕێك كەوتبوو بیدات و ئازاد ببێ، پێغەمبەر ﷺ داوای لێكرد لەو پارە دانە ئاسانكاری بۆ بكەن، ئەویش بۆی كرا.
(٢) العذرة:ئاڵوە، واتە: منداڵەكە قوڕگی هاتەوە یەك.
(٣) بڕوانە: ٥٦٨٣.

## ١٤- بابُ الْحِجَامَةِ عَلَى الرَّأْسِ

٥٦٩٨- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ عَلْقَمَةَ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجَ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ بُحَيْنَةَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ بِلَحْيِ جَمَلٍ مِنْ طَرِيقِ مَكَّةَ، وَهْوَ مُحْرِمٌ، فِي وَسَطِ رَأْسِهِ[١].

## ١٤- باسى كەڵەشاخ گرتن لە سەرى مرۆڤ

**٥٦٩٨- عەبدورەحمانى شەل دەگێڕێتەوە كە لە عەبدوڵلاى كوڕى بوحەينەى ﷺ بيست دەيگێڕايەوە لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ لە لەحى جەمەل[٢] لە ڕێگەى مەككە لە كاتێكدا لە ئيحرامدا بوو، كەڵەشاخى گرت لە ناوەڕاستى سەريدا.**

٥٦٩٩ - وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا عِكْرِمَةُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ فِي رَأْسِهِ[٣].

**٥٦٩٩-ئيبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ كەڵەشاخى گرت لە سەرى.**

## ١٥- بابُ الحجامة مِنَ الشَّقِيقَةِ وَالصُّدَاعِ

٥٧٠٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ فِي رَأْسِهِ وَهْوَ مُحْرِمٌ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِهِ بِمَاءٍ يُقَالُ لَهُ: لَحْيُ جَمَلٍ[٤].

---

(١) بروانە: ١٨٣٦.

(٢) لەحى جەمەل: شوێنێكە لە نێوان مەككەو مەدينەدا لە خواروى و خۆرئاواى مەدينەوەيە.

(٣) بروانە: ١٨٣٥.

(٤) بروانە: ١٨٣٥.

## ١٥- باسی كەڵەشاخ گرتن لە ژانی نیوە سەری و سەرئێشە

**٥٧٠٠-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێكدا ئاوێكی لێبوو پێیان دەوت لەحیو جەمەل كەڵەشاخی گرت لەسەری، لە كاتێكدا لە ئیحرامدا بوو لە ئازارێك كە (لە سەریدا) هەیبوو[1].**

٥٧٠١- وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ سَوَاءٍ: أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهْوَ مُحْرِمٌ فِي رَأْسِهِ مِنْ شَقِيقَةٍ كَانَتْ بِهِ[2].

**٥٧٠١-عیكریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخی سەری گرت لە ژانی نیوە سەرئێشەیەك كە هەیبوو، لە كاتێكدا لە ئیحرامدا بوو.**

٥٧٠٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْغَسِيلِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِي شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ لَذْعَةٍ مِنْ نَارٍ، وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»[3].

**٥٧٠٢- جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر لە شتێك لە چارەسەرەكانی ئێوەدا خێرێك ببێ، ئەوا لە شەربەتی هەنگوین دایە، یان لە كەڵەشاخ گرتن دایە، یان لە ئاگر پیا چزاندن دایە، من حەزم لە داغكردن نییە)).**

---

(١) ئازاری شەقیقە بوو، ژانی نیوە سەر ئێشە.
(٢) بڕوانە: ١٨٣٥.
(٣) بڕوانە: ٥٦٨٣.

## ١٦- بابُ الْحَلْقِ مِنَ الأَذَى

٥٧٠٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ كَعْبٍ -هُوَ ابْنُ عُجْرَةَ- قَالَ: أَتَى عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَأَنَا أُوقِدُ تَحْتَ بُرْمَةٍ، وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَنْ رَأْسِي، فَقَالَ: «أَيُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «فَاحْلِقْ وَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةً، أَوِ انْسُكْ نَسِيكَةً». قَالَ أَيُّوبُ: لاَ أَدْرِي بِأَيَّتِهِنَّ بَدَأَ[١].

## ١٦- باسی سەرتاشین بەهۆی ئێش و ئازارەوە

**٥٧٠٣-ئیبنوئەبی لەیلا دەگێڕێتەوە لە کەعبەوە -کە کوڕی عوجرەیە- ﷺ دەڵێ: لە کاتی (عومرەی) حودەیبیەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، من لەو کاتەدا ئاگری ژێر مەنجەڵێکم هەڵدەگیرساند، سەرم ئەسپێی لێ دەوەری و دەکەوتە خوارێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو جانەوەرانە (ی سەرت) ئازارت دەدەن؟)) وتم: بەڵێ.فەرمووی: ((کەواتە سەرت بتاشە و سێ ڕۆژ بەڕۆژوبە، یان خواردنی شەش (هەژار) بدە، یان مەڕێك سەربڕە)) ئەیوب دەڵێ: نازانم بە کامیان لەو (سیانە) دەستی پێکرد.**

## ١٧- بابُ مَنِ اكْتَوَى أَوْ كَوَى غَيْرَهُ، وَفَضْلِ مَنْ لَمْ يَكْتَوِ

٥٧٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سُلَيْمَانَ بْنِ الْغَسِيلِ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ شِفَاءٌ فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ، وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»[٢].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٨٣.

(٢) بڕوانە: ١٨١٤.

## ١٧- باسی کەسێک خۆی داغکردبێ یان کەسێکی تری داغکردبێ، وە فەزڵی ئەو کەسەی خۆی داغ ناکات

**٥٧٠٤- عاسیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە دەڵێ: لە جابیرم ﷺ بیست، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرموویەتی: ((ئەگەر لە شتێك لە چارەسەرەکانی ئێوەدا خێرێك ببێ، ئەوا لە کەڵەشاخ گرتن دایە، یان لە ئاگر پیا چزاندن دایە، وە من حەزم لە داغکردن نییە)).**

٥٧٠٥- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: لاَ رُقْيَةَ إِلاَّ مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ. فَذَكَرْتُهُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ وَالنَّبِيَّانِ يَمُرُّونَ مَعَهُمُ الرَّهْطُ، وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، حَتَّى رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ، قُلْتُ: مَا هَذَا؟ أُمَّتِي هَذِهِ؟ قِيلَ: هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ. قِيلَ انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ. فَإِذَا سَوَادٌ يَمْلأُ الأُفُقَ، ثُمَّ قِيلَ لِي: انْظُرْ هَا هُنَا وَهَا هُنَا -فِي آفَاقِ السَّمَاءِ- فَإِذَا سَوَادٌ قَدْ مَلأَ الأُفُقَ، قِيلَ: هَذِهِ أُمَّتُكَ وَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ هَؤُلاَءِ سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ". ثُمَّ دَخَلَ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَهُمْ، فَأَفَاضَ الْقَوْمُ وَقَالُوا: نَحْنُ الَّذِينَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاتَّبَعْنَا رَسُولَهُ، فَنَحْنُ هُمْ أَوْ أَوْلاَدُنَا الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الإِسْلاَمِ، فَإِنَّا وُلِدْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ. فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَخَرَجَ فَقَالَ: "هُمُ الَّذِينَ لاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَلاَ يَكْتَوُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ». فَقَالَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ: أَمِنْهُمْ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ». فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا؟ قَالَ: «سَبَقَكَ عُكَّاشَةُ»[1].

**٥٧٠٥-عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: نوشتە نییە (بۆ هیچ شتێك) مەگەر بۆ چاو پیسی و گەستن، (حوسەینی کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ:) منیش ئەمەم**

(١) بروانە: ٣٤١٠.

گێڕایەوە بۆ سەعیدی کوڕی جوبەیر، سەعیدیش وتی:ئیبنو عەبباس ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئوممەتەکانم نیشان درا، ئینجا پێغەمبەرێك و دوو پێغەمبەر ﷺ) دەڕۆیشتن و کۆمەڵێ خەڵکیان لەگەڵدا بوو، پێغەمبەریش ﷺ هەبوو یەك کەسی لەگەڵدا نەبوو، هەتا خەڵکێکی زۆرم نیشان درا، وتم: ئەم (خەڵکە زۆرە) کێن؟ ئەمانە ئوممەتی منن؟ وترا: ئەوە مووسا ﷺ و گەلەکەیەتی، وترا: سەیری ئەو ئاسۆیەکە، (سەیرم کرد) دەبینم خەڵکێکی زۆر ئاسۆکەی پڕ کردوە، لە پاشان پێم وترا: سەیری ئا ئەوێ بکە- لە ئاسۆکانی ئاسمان-، جا بینیم خەڵکێکی زۆر هەموو ئاسۆکەیان پڕکردوە، وترا: ئەوە ئوممەتەکەی تۆیە، وە لە ئائەوانە حەفتا هەزاریان دەڕۆنە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە))، پاشان پێغەمبەر ﷺ چوویە ژورەوە و ڕوونی نەکردەوە بۆیان [1] ئینجا خەڵکەکە کەوتنە باسکردنی (ئەوانەی بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە)، وتیان: ئێمە ئەوانە بووین باوەڕمان هێنا بەخوا و شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتین،کەواتە ئەو کەسانە ئێمەین، یان منداڵەکانی ئێمەن کە لە سەردەمی ئیسلامدا لە دایك بوون، چونکە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا لە دایك بووین، جا ئەو وتەیە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ و لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و فەرمووی: ((ئەوانە ئەو کەسانەن کە داوای نوشتە ناکەن، ڕەشبینی ناکەن [2]، خۆیان داغ ناکەن، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن))، ئینجا عوکاشەی کوڕی میحصەن ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا منیان تێدایە؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) ئینجا پیاوێکی تر هەستا و وتی: ئەی منییان تێدایە؟ فەرمووی: ((عوکاشە پێشت کەوت)).

---

(١) ئەو حەفتا هەزارە کێن؟.
(٢) بەهۆی فڕینی باڵندەوە.

## ١٨- بَابُ الإِثْمِدِ وَالْكُحْلِ مِنَ الرَّمَدِ

فِيهِ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ[١].

٥٧٠٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدُ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ أَنَّ امْرَأَةً تُوُفِّيَ زَوْجُهَا فَاشْتَكَتْ عَيْنَهَا، فَذَكَرُوهَا لِلنَّبِيِّ ﷺ وَذَكَرُوا لَهُ الْكُحْلَ، وَأَنَّهُ يُخَافُ عَلَى عَيْنِهَا، فَقَالَ: «لَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَمْكُثُ فِي بَيْتِهَا فِي شَرِّ أَحْلاَسِهَا -أَوْ فِي أَحْلاَسِهَا فِي شَرِّ بَيْتِهَا- فَإِذَا مَرَّ كَلْبٌ رَمَتْ بَعْرَةً، فَلاَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[٢].

## ١٨- باسی (چاو ڕشتن بە) سورمە و کل بۆ چاو ئێشە

**-لەم باسەدا فەرموودەیەك هەیە كە ئوممو عەتییە ﵂ گێڕاویەتیەوە.**

**٥٧٠٦-زەینەب لە ئوممو سەلەمەوە ﵂ دەگێڕێتەوە كە ژنێك مێردەكەی مرد، ئینجا چاوی كردێ ئێش و بۆ پێغەمبەریان ﷺ باس كرد و باسی كلیان كرد[٣] بۆی، وە بێگومان چاوی ژنەكە مەترسی لێ دەكرا[٤]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە جاران یەكێك لە ئێوەی ژنان لە ماڵی خۆی دەمایەوە خراپترین پۆشاكی لە بەردابوو- یان پۆشاكی خۆی لە بەردابوو لە خراپترین شوێنی ماڵەكەیا دەمایەوە- جا كە سەگێك (بەلایدا) بڕۆشتایە پشقلێكی فڕێ دەدا، كەواتە نابێ (چاو بڕژێ) هەتا چوار مانگ و دە ڕۆژ (تێپەڕێ جا بۆی دروستە) )).**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣.

(٢) بڕوانە: ٥٣٣٦.

(٣) كە ئەو ژنە بەكاری بێنێ.

(٤) كز ببێت یان كوێر ببێت.

## ١٩- بابُ الجُذَامِ

٥٧٠٧ - وَقَالَ عَفَّانُ: حَدَّثَنَا سَلِيمُ بْنُ حَيَّانَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مِينَاءَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ هَامَةَ وَلاَ صَفَرَ، وَفِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ»[1].

## ١٩- باسی گولی

**٥٧٠٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی نییە[2]، شومی باڵندە نییە[3]، (شومی) بایەقوش وکوندەبەبوو نییە[4]،(مانگی بێ قودوومی) سەفر نییە، بەڵام لە کەسی گول (گەڕ) ڕاکە و دوور کەوەرەوە وەك چۆن لە شێر ڕادەکەیت).**

## ٢٠- بابٌ: الْمَنُّ شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ

٥٧٠٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ حُرَيْثٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ». قَالَ شُعْبَةُ: وَأَخْبَرَنِي الْحَكَمُ بْنُ عُتَيْبَةَ، عَنِ الْحَسَنِ الْعُرَنِيِّ، عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ شُعْبَةُ: لَمَّا حَدَّثَنِي بِهِ الْحَكَمُ لَمْ أُنْكِرْهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْمَلِكِ[5].

---

(١) بڕوانە: ٥٧١٧، ٥٧٥٧، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣، ٥٧٧٥.

(٢) (لاعدوى) عەرەبەکان لایان وابووە کەنەخۆشی سرایەت دەکات لە نەخۆشێکەوە بۆ کەسێکی تر، پێغەمبەر ﷺ ئەو بۆچوونەی بە ڕەها هەڵوەشاندەوە.

(٣) ئەگەر باڵندە بەلای ڕاست دا بفڕیایە گەشبین دوبوون بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیایە ڕەشبین دەبوون.

(٤) بەچەند مانای تریش ماناکراوە.

(٥) بڕوانە: ٤٤٧٨.

## ٢٠- باسێک: دومەڵان [١] شیفایە بۆ چاو ئێشە

**٥٧٠٨- سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (( دوومەڵان[٢] وەکو گەزۆ وایە[٣] و ئاوەکەشی چارەسەر بۆ چاو)). شوعبە دەڵێ: حەکەمی کوڕی عوتیبە بۆی گێڕامەوە لە حەسەنی عورەنییەوە ئەویش لە عەمری کوڕی حودەیبییەوە لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، شوعبە دەڵێ: کاتێ حەکەم ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، لە گێڕانەوەی عەبدولمەلیك بۆ ئەم فەرموودەیە دڵنیابووم [٤].**

## ٢١- بابُ اللَّدُود

٥٧٠٩- ٥٧١٠- ٥٧١١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَائِشَةَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ قَبَّلَ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ مَيِّتٌ[٥].

## ٢١- باسی دەرمان کردنە لایەکی دەمی نەخۆشەوە

**٥٧٠٩- ٥٧١٠- ٥٧١١- ئیبنو عەبباس و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە کە ئەبو بەکر ﷺ پێغەمبەری ﷺ ماچ کرد لە کاتێکدا کە مردبوو.**

---

(١) المَن:واتە:گەزۆ یان شۆکە، بەڵام لێرەدا لەم باسەدا مەبەستی (كمأه)ـەکە بەمانای دۆمەڵانە.
(٢) دۆمبەڵانیشی پێ دەوترێت.
(٣) دۆمەڵان و گەزۆ لەوە دایە وەک یەک وان کە خواکردن و مرۆڤ ڕۆڵی نییە لە بەرهەم هێنان و چاندنیدا.
(٤) مەبەستی ئەوەیە عەبدولمەلیک کاتێ چووە تەمەنەوە لەبەر بوونی خراپ بوو شوعبە فەرموودەکەی لە ڕێگەی ئەوەوە نەدەگێڕایەوە، بەڵام کە حەکەم هەمان فەرموودەی گێڕایەوە ئیتر شوعبە دڵنیابوو لە گێڕانەوەکەی عەبدولمەلیک و دەیگێڕایەوە.
(٥) بڕوانە: ١٢٤١، ١٢٤٢، ٤٤٥٦.

٥٧١٢ - قَالَ: وَقَالَتْ عَائِشَةُ: لَدَدْنَاهُ فِي مَرَضِهِ، فَجَعَلَ يُشِيرُ إِلَيْنَا، أَنْ لاَ تَلُدُّونِي. فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةُ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ. فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: «أَلَمْ أَنْهَكُمْ أَنْ تَلُدُّونِي؟». قُلْنَا: كَرَاهِيَةَ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ. فَقَالَ: «لاَ يَبْقَى فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ إِلاَّ لُدَّ وَأَنَا أَنْظُرُ، إِلاَّ الْعَبَّاسَ فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ»[١].

**٥٧١٢- (عوبەیدوڵلا) دەڵێ: عائیشە وتی: لە نەخۆشییەکەیدا دەرمانمان کردە دەمی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە ئاماژە پێی وتین دەرمان مەکەنە دەمم، ئێمەش وتمان: لەبەر ئەوەی نەخۆش حەزی بە دەرمان خواردن نییە، جا کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: ((ئایا من ڕێگریم نەکرد لەوەی کە دەرمانم بدەنێ؟)) وتمان: (لەوانەیە لەبەر حەز نەکردنی نەخۆش بێت بۆ دەرمان خواردن، ئەنجا فەرمووی: ((کەس لەم ماڵە نەمێنێت ئیللا بە بەرچاومەوە دەرمان دەکرێتە دەمی جگە لە عەبباس، کە بێگومان ئەو لەگەڵتان ئامادە نەبوو)).**

٥٧١٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ أُمِّ قَيْسٍ قَالَتْ: دَخَلْتُ بِابْنٍ لِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ أَعْلَقْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ: «عَلَى مَا تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذَا الْعِلاَقِ؟ عَلَيْكُنَّ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ يُسْعَطُ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ».
فَسَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: بَيَّنَ لَنَا اثْنَيْنِ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا خَمْسَةً. قُلْتُ لِسُفْيَانَ: فَإِنَّ مَعْمَرًا يَقُولُ: أَعْلَقْتُ عَلَيْهِ. قَالَ: لَمْ يَحْفَظْ إِنَّمَا قَالَ: أَعْلَقْتُ عَنْهُ، حَفِظْتُهُ مِنْ فِي الزُّهْرِيِّ. وَوَصَفَ سُفْيَانُ الْغُلاَمَ يُحَنَّكُ بِالإِصْبَعِ، وَأَدْخَلَ سُفْيَانُ فِي حَنَكِهِ -إِنَّمَا يَعْنِي: رَفْعَ حَنَكِهِ بِإِصْبَعِهِ- وَلَمْ يَقُلْ: أَعْلِقُوا عَنْهُ شَيْئًا[٢].

**٥٧١٣-ئوممو قەیس ﵂ دەڵێ: کوڕێکم برد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پەنجە مەلاشویم گوشیبوو لەبەر ئاڵوومیە کە هەیبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٥٨.

(٢) بڕوانە: ٥٦٩٢.

((بۆچی منداڵەكانتان بەم پڵیتەیە كونە لووت و گەروویان بریندار دەكەن؟ بەم عوودی هیندییە چارەسەریان بكەن، چونكە بێگومان لەم عوودەدا حەوت شیفای تێدایە، یەكێ لەوانە ئازاری كەلەكە و تەنیشتە، دەكرێتە لووتەوە بۆ ئازاری گەروو (ی منداڵ)، وە دەكرێتە دەمەوە بۆ ئازاری كەلەكە و تەنیشت))، (سوفیان دەڵێ): لە زوهریم بیست دەیوت: دووانیان بۆ ڕوون كردینەوە پێنجیانی ڕوون نەكردەوە بۆمان[1]، (عەلی كوڕی مەدینی دەڵێ) وتم بە سوفیان: مەعمەر دەڵێ: (أعلقتُ علیه)، سوفیان وتی: لەبەری نەكردوە بەڵكو وتی: (أعلقتُ عنه) من خۆم بەم شێوەیە لە دەمی زوهرییەوە وەرم گرتووە. (عەلی كوڕی مەدینی دەڵێ): سوفیان شێوەی پەنجە خستنە دەمی مەلاشووی منداڵەكەی ڕوون كردەوە، پەنجەی خستە مەلاشووی خۆیەوە، بێگومان مەبەستی بەرزكردنەوەی مەلاشووی بوو بەپەنجەی، وە زوهری نەیوت: (أَعْلِقُوا عَنْهُ شَيْئًا).

## ٢٢- بابٌ

٥٧١٤- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ وَيُونُسُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ، اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ فِي أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلاَهُ فِي الأَرْضِ بَيْنَ عَبَّاسٍ وَآخَرَ. فَأَخْبَرْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، قَالَ: هَلْ تَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الآخَرُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّ عَائِشَةُ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ هُوَ عَلِيٌّ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ مَا دَخَلَ بَيْتَهَا وَاشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ: «هَرِيقُوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ، لَعَلِّي أَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ». قَالَتْ: فَأَجْلَسْنَاهُ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ طَفِقْنَا نَصُبُّ عَلَيْهِ مِنْ تِلْكَ الْقِرَبِ، حَتَّى جَعَلَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ. قَالَتْ: وَخَرَجَ إِلَى النَّاسِ فَصَلَّى لَهُمْ وَخَطَبَهُمْ[2].

---

(١) لەو حەوت چارەسەرە و نەخۆشیەكەش.

(٢) بڕوانە: ١٩٨.

## ٢٢- باسێک[1]

٥٧١٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ نەخۆشییەکەی پێغەمبەر ﷺ قورس بوو ئازارەکەی تینی بۆ هێنا، مۆڵەتی خواست لە خێزانەکانی کە لە ماڵی مندا چاودێری نەخۆشییەکەی بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیاندا و ڕازی بوون، جا دوو پیاو چوونە ژێر باڵی پێغەمبەر ﷺ و لە ماڵ هاتە دەرەوە قاچەکانی بە زەویدا دەخشان، لە نێوان عەبباس و پیاوێکی تردا بوو، عوبەیدوڵا وتی: ئەو هەواڵەمدا بە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ئەویش وتی: دەزانی پیاوەکەی تر کێ بووە کە عائیشە ناوی نەهێنا بوو؟ وتم: نەخێر وتی: عەلی بوو ﵁، عائیشە وتی: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ڕۆشتە ماڵەوە و ئازارەکەی تینی بۆ هێنا فەرمووی: ((لە ئاوی حەوت کوندەم پیاکەن کە دەمەکانیان نەکرابێتەوە، بەڵکو (چاك ببمەوەو) وەسیەت بکەم بۆ خەڵکی))، عائیشە وتی: جا لە تەشتێکی حەفصەی خێزانیدا دامان نیشاند، پاشان دەستمان کرد بەئاو پیاکردنی لە ئاوی ئەو حەوت کوندەیە، هەتا دەستی کرد بەئاماژە کردن بۆمان ((کەئەوەی پێویست بوو کردتان))، عائیشە وتی: (چاك بوویەوە و) ڕۆشتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی و نوێژی بۆ کردن و وتاری بۆ دان.

## ٢٣- بابُ الْعُذْرَة

٥٧١٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أُمَّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ الأَسَدِيَّةَ -أَسَدَ خُزَيْمَةَ، وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِي بَايَعْنَ النَّبِيَّ ﷺ وَهْيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ- أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِابْنٍ لَهَا، قَدْ أَعْلَقَتْ عَلَيْهِ

---

(١) هیچ ناونیشانێکی بۆ دانەناوە.

مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى مَا تَدْغَرْنَ أَوْلَادَكُنَّ بِهَذَا الْعِلَاقِ؟ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ». يُرِيدُ: الْكُسْتَ، وَهُوَ الْعُودُ الْهِنْدِيُّ. وَقَالَ يُونُسُ وَإِسْحَاقُ بْنُ رَاشِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: عَلَّقَتْ عَلَيْهِ[١].

## ٢٣- باسی ئازاری گەروو [٢]

**٥٧١٥-عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە ئوممو لقەیسی کچی میحصەنی ئەسەدی- مەبەستی ئەسەدی هۆزی خوزەیمەیە، ئوممو لقەیس لەو ئافرەتە کۆچەرە یەکەمینانە بوو کەبەیعەتیان بە پێغەمبەردا ﷺ، وە خوشکی عوکاشەیە- بۆ عوبەیدوڵڵای گێڕایەوە کە کوڕێکی خۆی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بۆچی منداڵەکانتان بەم پلێتەیە کونە لووت و ناو گەروویان بریندار دەکەن؟ بەم عوودی هیندییە چارەسەریان بکەن، چونکە بێگومان لەم عوودەدا حەوت دەرمان هەیە یەکێکیان ئازاری کەلەکەیە))، مەبەست لە عوودی هیندی کوستە.**

**-یونس و ئیسحاقی کوڕی ڕاشید لە زوهرییە بەم شێوە گێڕاویانەتەوە** (عَلَّقَتْ عَلَيْهِ).

## ٢٤- بَابُ دَوَاءِ الْمَبْطُونِ

٥٧١٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ. فَقَالَ: «اسْقِهِ عَسَلاً». فَسَقَاهُ، فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلَاقًا. فَقَالَ: «صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ». تَابَعَهُ النَّضْرُ، عَنْ شُعْبَةَ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٩٢.

(٢) بەزۆری تووشی منداڵان دەبێت، لە کوردەواریدا پێی دەڵێن مەڵاشوو کەوتن.

(٣) بڕوانە: ٥٦٨٤.

## ٢٤- باسی چارەسەری سک ئێشە [١]

**٥٧١٦-ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: براکەم سکی دەچێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەنگوینی بدەرێ))، ئەویش هەنگوینی دایە، جا (هاتەوە و) وتی: هەنگوینم پێدا بەڵام زیاتر سکی دەچێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوا ڕاستی فەرمووە و سکی براکەت درۆی کردوە)).**

**-نەزر لە شوعبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی جەعفەر دەکات.**

## ٢٥- بَابٌ: لاَ صَفَرَ، وَهُوَ دَاءٌ يَأْخُذُ البَطْنَ

٥٧١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَغَيْرُهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ». فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيَأْتِي الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ: «فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ؟». رَوَاهُ الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَسِنَانِ بْنِ أَبِي سِنَانٍ[٢].

## ٢٥- باسێک: صەفەر[٣] نییە کە نەخۆشیەکە تووشی سک دەبێ و (ڕەنگی خاوەنەکەی زەرد دەبێت)

**٥٧١٧-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی و سیرایەتی سك ئێشە [١] و شومی بایەقوش و کوندەپەپوو نییە)).**

---

(١) بەهۆی سکچوونی زۆرە، سکی ئازار و ئێشی هەیە.

(٢) بڕوانە: ٥٧٠٧.

(٣) صەفەر واتە: دەعبای ناوسک عەرەبەکان پێش ئیسلام لایان وابوو کەمێک یا گیاندارێک لە ناو سکی دایە، کاتێ کەسەکە برسی بوو کرمەکە دەکەوێتە جوڵە و لەوانەیە کەسەکە بکوژێت، وە عەرەبەکان پێیان وابوو لە گولی خراپتر و سیرایەت کەرترە.

جاعەرەبییەکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆچی وشترەکانم لە ناو تۆزولما وەك ئاسك وان [٢]، ئینجا کە وشترێکی گەڕۆڵ دێتە ناویان هەموویان گەڕۆڵ دەکات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی کێ ئەو گەرۆڵییەی بە وشتری یەکەم گەیاندووە؟)).

-هەروەها زوهری ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئەبی سەلەم و سینانی کوڕی ئەبی سینانەوە.

## ٢٦- بابُ ذَاتِ الْجَنْبِ

٥٧١٨- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَتَّابُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ إِسْحَاقَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ، بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ أُمَّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ -وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِي بَايَعْنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهْيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ- أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِابْنٍ لَهَا قَدْ عَلَّقَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ: «اتَّقُوا اللَّهَ، عَلَى مَا تَدْغَرُونَ أَوْلاَدَكُمْ بِهَذِهِ الأَعْلاَقِ؟ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ». يُرِيدُ الْكُسْتَ يَعْنِي: الْقُسْطَ، قَالَ: وَهْيَ لُغَةٌ[٣].

## ٢٦- باسی دومەڵی لا تەنیشت [٤]

٥٧١٨- عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە کە ئوممو لقەیسی کچی میحصەن- وە ئوممو لقەیس لەو ئافرەتە کۆچەرە یەکەمینانە بوو کەبەیعەتیان بە پێغەمبەردا ﷺ، وە خوشکی عوکاشەی کوڕی میحصەنە - بۆ عوبەیدوڵلای گێڕایەوە کە کوڕێکی خۆی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە مەلاشووی بە

(١) یان ماری ناو سکی سیرایەتەکە.
(٢) ساف و لوسن تۆز ناگرنە خۆیان.
(٣) بڕوانە: ٥٦٩٢، ٢٢١٤.
(٤) یان هەوکردنی پەردەی سی .

**پەنجە بۆ بەرز کردبویەوە فەرموی: ((لە خوا بترسن لەسەر ئەوەی منالەکانتان بەم پلیتەیە کونە لووت و ناو گەرویان بریندار دەکەن؟ بەم عوودی هیندییە چارەسەریان بکەن، چونکە بێگومان لەم عوودەدا حەوت دەرمان هەیە یەکێکیان ئازاری کەلەکەیە))، مەبەست لە عوودی هیندی کوستە، واتە قوست کە واشی پێ دەوترێت.**

٥٧١٩- ٥٧٢٠- ٥٧٢١- حَدَّثَنَا عَارِمٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ قَالَ: قُرِئَ عَلَى أَيُّوبَ مِنْ كُتُبِ أَبِي قِلاَبَةَ - مِنْهُ مَا حَدَّثَ بِهِ وَمِنْهُ مَا قُرِئَ عَلَيْهِ- وَكَانَ هَذَا فِي الْكِتَابِ عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ وَأَنَسَ بْنَ النَّضْرِ كَوَيَاهُ، وَكَوَاهُ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِهِ[1].

وَقَالَ عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ: عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَذِنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الأَنْصَارِ أَنْ يَرْقُوا مِنَ الحُمَةِ وَالأُذُنِ. قَالَ أَنَسٌ: كُوِيتُ مِنْ ذَاتِ الجَنْبِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيٌّ، وَشَهِدَنِي أَبُو طَلْحَةَ وَأَنَسُ بْنُ النَّضْرِ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو طَلْحَةَ كَوَانِي[2].

**٥٧١٩- ٥٧٢٠- ٥٧٢١- عاریم بۆی گێڕاینەوە وتی: حەمماد بۆی گێڕاینەوە وتی: لە نوسراوەکانی ئەبی قیلابە خوێندرایەوە بەسەر ئەیوبدا لەو نوسراوانەدا هەیانە ئەیوب گێڕاویەتیەوە بۆ ئەبی قیلابە، هەشیانە خوێندراوەتەوە بۆ ئەیوب، جا ئەمە لە نوسراوێکدا بوو (درابویە پاڵ ئەبی قیلابە) لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە ئەبو تەڵحە و ئەنەسی کوڕی نەزر هەردوکیان ﷺ ئەنەسیان داغ کردوە، ئەبو تەڵحەش بەدەستی خۆی داغی کرد.[3] عەببادی کوڕی مەنصور لە ئەیوبەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبی قیلابەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە**

---

(١) بڕوانە: ٥٧٢١.

(٢) بڕوانە: ٥٧١٩.

(٣) لە پێشدا دەڵێ هەردووکیان داغیان کرد، دواتر دەڵێ: ئەبو تەڵحە داغی کرد، هەردووکیان پێی ڕازی بوون بۆیە دەڵێ: هەردووکیان داغیان کرد، ئەبو تەڵحە داغی کرد چونکە ئەو بەکارەکە هەستاوە.

ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە خێزانێكی ئەنصاری نوشتە بكە لە (هەموو جانەوەرێكی) ژەهردار و لە ئازاری گوێ.

ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو بوو دومەڵێ تەنیشتم داغ كرا، ئەبو تەڵحە و ئەنەسی كوڕی نەزر و زەیدی كوڕی سابیت ﷺ ئامادەبوون و ئەبو تەڵحە داغی كردم.

## ٢٧- بابُ حَرْقِ الحَصِيرِ لِيُسَدَّ بِهِ الدَّمُ

٥٧٢٢- حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْقَارِيُّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: لَمَّا كُسِرَتْ عَلَى رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ البَيْضَةُ، وَأُدْمِيَ وَجْهُهُ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَكَانَ عَلِيٌّ يَخْتَلِفُ بِالْمَاءِ فِي الْمِجَنِّ، وَجَاءَتْ فَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْ وَجْهِهِ الدَّمَ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ ﷺ الدَّمَ يَزِيدُ على الْمَاءِ كَثْرَةً عَمَدَتْ إِلَى حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهَا وَأَلْصَقَتْهَا عَلَى جُرْحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرَقَأَ الدَّمُ[1].

## ٢٧- باسی سوتاندنی حەسیر تا (بە خۆڵەمێشەكەی) خوێنی پێ بوەستێنرێت

٥٧٢٢- سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: كاتێ ئەو كڵاوە ئاسنەی لەسەری پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو شكا و ڕووخساری خوێناوی بوو و ددانی پێشەوەی شكا، وە عەلی لە قەڵغانەكەدا دەهات و دەچوو ئاوی دەهێنا و فاتیمەش خوێنەكەی ڕووخساری دەشۆری، فاتیمە ﷺ كە بینی بەئاوەكە خوێنەكە زۆرتر دەبێت، ڕۆشت حەسیرێكی هێنا و سووتاندی و خستیە سەر برینەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا خوێنەكە وەستایەوە.

---

(١) بڕوانە: ٢٤٣.

## ٢٨- بَابٌ الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ

٥٧٢٣- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَأَطْفِئُوهَا بِالْمَاءِ». قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقُولُ: اكْشِفْ عَنَّا الرِّجْزَ[١].

## ٢٨- باسێك: تا له گەرما و هاڵاوی دۆزەخەوەیە

**٥٧٢٣- نافیع له ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((تا له هاڵاوی دۆزەخەوەیە، کەواتە بە ئاو بیکوژێننەوە و فێنکی کەنەوە)).**

**-نافیع دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ دەیوت: (خودایە) سزامان لەسەر لابە.**

٥٧٢٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ كَانَتْ إِذَا أُتِيَتْ بِالْمَرْأَةِ قَدْ حُمَّتْ تَدْعُو لَهَا، أَخَذَتِ الْمَاءَ فَصَبَّتْهُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ جَيْبِهَا، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا أَنْ نَبْرُدَهَا بِالْمَاءِ.

**٥٧٢٤-فاتیمەی کچی مونزیر دەگێڕێتەوە، ئەسمای کچی ئەبو بەکر ﷺ هەر کات ئافرەتێك بهێنرایە تای هەبوایە دوعای بۆ دەکرد، ئاوی بۆ دەهێنا و ئینجا لە یەخەیەوە دەیکرد بە لاشەی و باخەڵیدا و دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە کەسی تادار بە ئاو فێنك کەینەوە.**

٥٧٢٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»[٢].

**٥٧٢٥- عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((تا لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە، کەواتە بە ئاو فێنکی کەنەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٦٤.

(٢) بڕوانە: ٣٢٦٣.

٥٧٢٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ، عَنْ جَدِّهِ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْحُمَّى مِنْ فَوْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»[١].

**٥٧٢٦- ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((تا لە هاڵاوی دۆزەخە، کەواتە بە ئاو فێنکی بکەنەوە)).**

## ٢٩- بابُ مَنْ خَرَجَ مِنْ أَرْضٍ لاَ تُلاَيِمُهُ

٥٧٢٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ أَنَّ نَاسًا -أَوْ رِجَالاً- مِنْ عُكْلٍ وَعُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَكَلَّمُوا بِالإِسْلاَمِ وَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا أَهْلَ ضَرْعٍ، وَلَمْ نَكُنْ أَهْلَ رِيفٍ. وَاسْتَوْخَمُوا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَوْدٍ وَبِرَاعٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَخْرُجُوا فِيهِ فَيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَانْطَلَقُوا حَتَّى كَانُوا نَاحِيَةَ الْحَرَّةِ، كَفَرُوا بَعْدَ إِسْلاَمِهِمْ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَبَعَثَ الطَّلَبَ فِي آثَارِهِمْ، وَأَمَرَ بِهِمْ فَسَمَرُوا أَعْيُنَهُمْ، وَقَطَعُوا أَيْدِيَهُمْ، وَتُرِكُوا فِي نَاحِيَةِ الْحَرَّةِ حَتَّى مَاتُوا عَلَى حَالِهِمْ[٢].

## ٢٩- باسی کەسێک لە جێگا و زەوییەک دەرچێ کە ئاو و هەوای ناسازە بۆی

**٥٧٢٧-قەتادە دەگێڕێتەوە کەئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕانەوە کە کەسانێك-یان پیاوانێك-لە هۆزی عوکل و عورەینە هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزارەکی مسوڵمان بوون و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە پێشتر**

---

(١) بروانە: ٣٢٦٢.

(٢) بروانە: ٢٣٣.

ئاژەڵ و ماڵات دار بووین، خەڵکی خاوەن کشتوکاڵ نەبووین ئاو و هەوای مەدینەیان پێ نەدەکەوت [١]، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بە بردنی چەند وشترێك و شوانێك لەگەڵیاندا، وە فەرمانی کرد ئەوانیش لەگەڵ وشترەکان و شوانەکەدا لە مەدینە دەرچن، ئینجا لە شیر و میزی وشترەکان بخۆنەوە، ئەوانیش (لەگەڵ وشتر و شوانەکەدا) ڕۆشتن تاگەشتنە بەردەڵانە ڕەشەکە، دوای مسوڵمان بوونیان بێباوەڕ بوونەوە و شوانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کوشت، وشترەکانیشیان دایەبەر و بردنیان، هەواڵەکە بە پێغەمبەر ﷺ گەشت و چەکداری نارد بە شوێنیاندا (گرتنیان و هێنانیانەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەبزماری سورۆکراو چاویان بۆ ڕشتن دەستیان بڕین و لە شوێنێکی بەردەڵانە ڕەشەکە دانران و وازیان لێ هێنرا، هەتا بەو حاڵەتەوە مردن.

## ٣٠- بَابُ مَا يُذْكَرُ فِي الطَّاعُونِ

٥٧٢٨- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ بْنَ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ يُحَدِّثُ سَعْدًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَدْخُلُوهَا، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا». فَقُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ يُحَدِّثُ سَعْدًا وَلاَ يُنْكِرُهُ قَالَ: نَعَمْ؟[٢].

## ٣٠- باسی ئەوەی باس دەکرێ دەربارەی چاوە قوڵە

٥٧٢٨-ئیبراهیمی کوڕی سەعد دەڵێ: لە ئوسامەی کوڕی زەیدم رضي الله عنهما بیست ئەو فەرموودەی بۆ سەعد گێڕایەوە کە ئوسامە خۆی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە

---

(١) ناساز بوو بۆیان.
(٢) بڕوانە: ٣٤٧٣.

**فەرمووی: ((ئەگەر بیستتان چاوە قوڵە لە شوێنێکدا کەوتۆتەوە ئەوە مەچنە ئەو شوێنەوە، وە ئەگەر لە شوێنێکیشدا چاوە قوڵە کەوتبوویەوە و ئێوە لەو شوێنەدا بوون، ئەوە لێی دەرمەچن)).**

**(حەبیبی کوڕی سابیت دەڵێ:) وتم (بەئیبراهیمی کوڕی سەعد): تۆ خۆت لە ئوسامەت بیست بۆ سەعدی گێڕایەوە و سەعدیش نکۆڵی لێ نەکرد؟ وتی بەڵێ.**

٥٧٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الشَّأْمِ حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أُمَرَاءُ الأَجْنَادِ -أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ- فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِأَرْضِ الشَّأْمِ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِي الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ. فَدَعَاهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّأْمِ، فَاخْتَلَفُوا. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ، وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ. فَقَالَ ارْتَفِعُوا عَنِّي.

ثُمَّ قَالَ ادْعُوا لِي الأَنْصَارَ. فَدَعَوْتُهُمْ فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي. ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ. فَدَعَوْتُهُمْ، فَلَمْ يَخْتَلِفْ مِنْهُمْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ، وَلاَ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّي مُصَبِّحٌ على ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ. قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ إِلَى قَدَرِ اللهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ إِبِلٌ هَبَطَتْ وَادِيًا لَهُ عُدْوَتَانِ: إِحْدَاهُمَا خَصِبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ؟ وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ -وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ- فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي فِي هَذَا عِلْمًا،سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ

فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ». قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ عُمَرُ ثُمَّ انْصَرَفَ[1].

**٥٧٢٩- عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەل گێڕایەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ڕۆشت بۆ شام، کاتێ گەشتە سەرغ[2] سەرکردەکانی جەنگ- ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و هاوڕێکانی پێی گەیشتن-، ئینجا هەواڵیان پێدا کە دەردێکی کوشندە بڵاوبووەتەوە لە وڵاتی شامدا، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: عومەر پێی وتم: کۆچەرانی پێشینم بۆ بانگ بکە، ئەویش بانگی کردن و ڕاوێژی پێ کردن، هەواڵی دانێ کە دەردێکی گشتی لە شامدا کەوتۆتەوە، ئەوانیش ڕایان جیاواز بوو، هەندێکیان وتیان: بێگومان تۆ بەنیازی کارێك دەرچوویت وا نابینین لێی پەشیمان ببیتەوە، هەندێکی تریان وتیان: ئەوەی ماوە لە خەڵك و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تۆدان، پێمان چاك نییە بیانخەیتە ناو ئەو دەردە کوشندەیەوە، عومەر وتی: هەستن لە لام و بڕۆن، پاشان وتی: پشتیوانانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کردن و ڕاوێژی پێ کردن، ئەوانیش هەر ڕێگای کۆچەرانیان گرت وەك ئەوان جیاواز بوون، عومەر وتی: هەستن لام بڕۆن، لە پاشان وتی: کێ لێرەیە لە گەورە پیاوانی قوڕەیش ئەوانەی ساڵی ئازاد کردنی مەککە کۆچیان کردوە بانگیان کە بۆم، منیش بانگم کردن دوو کەسیان ڕایان جیاواز نەبوو هەموویان وتیان: لامان وایە ئەم خەڵکە بگێڕیتەوە نەیان بەیتە ناو ئەم دەردە کوشندەیەوە، عومەر بەناو خەڵکەکەدا جاڕی دا من سبەینێ بەسواری وڵاخەکەمەوەم، ئیتر بۆ سبەینێ هەموویان سواری وڵاخەکانیان بوون، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ وتی: لە چارەنووسێ خوا دیاری کردوە ڕادەکەیت؟ عومەر وتی: کاشکی کەسێکی تر**

---

(١) بڕوانە: ٥٧٣٠، ٦٩٧٣.

(٢) سەرغ: گوندێکە یان شارێکە ١٣ قۆناغ لە مەدینەوە دوورە نوساوە بە یەمەنەوە.

**ئەمەی بوتایه ئەی ئەبو عوبەیده [1]، بەڵێ ئێمه له چارەنووسی خوا ڕادەکەین بۆ لای چارەنووسی خوا، پێم بڵێ ئەگەر تۆ چەند وشترێکت هەبێ هەوار بخەیت، لەناو شیوێکدا دووبەری هەبێت له ناو بەرێکیان لەوەڕی باش بێت و بەرەکەی تر بێ لەوەڕ بێت، ئایا ئەگەر لەو بەرەیان بیلەوەڕێنی لەوەڕی باشی تیایه به چارەنووسی خوا نییه؟ وه ئەگەر لەو بەرەیان بیلەوەڕێنی لەوەڕی کەمه هەر بەچارەنوسی خوا نییه؟ ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئینجا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ هات- که پێشتر لەوێ نەبوو چوو بوو بەدەم پێویستی خۆیەوە- ئەوسا وتی: من لەم بارەیەوە زانیاریم لایه، له پێغەمبەری خوا ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر بیستان چاوه قوڵه له خاکێکدا پەیدا بووه مەچنه ئەو خاکەوە، وه ئەگەر له خاکێکدا پەیدابوو بوو ئێوەی تێدا بوو لێی ڕامەکەن))، ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئیتر عومەر ﷺ سوپاس خوای کرد و گەڕایەوە.**

٥٧٣٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرٍ، أَنَّ عُمَرَ خَرَجَ إِلَى الشَّأْمِ، فَلَمَّا كَانَ بِسَرْغَ بَلَغَهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّأْمِ، فَأَخْبَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ»[2].

**٥٧٣٠-عەبدڵڵای کوڕی عامیر دەگێڕێتەوە که عومەر ﷺ ڕۆشت بۆ شام، جا کاتێ گەشتە سەرغ پێی گەیشت که دەردێکی کوشندە له شام پەیدا بووە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیش بۆی گێڕایەوە که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر بیستان چاوه قوڵه له خاکێکدا پەیدا بووە، ئەوە مەچنه ئەو خاکەوە، وه ئەگەر له خاکێکدا پەیدا بوو بوو ئێوە تێیدا بوون لێی ڕامەکەن)).**

---

(١) چونکه عومەر حەزی نەدەکرد پێچەوانەی ڕای ئەبو عوبەیده بکات ﷺ.

(٢) بڕوانه: ٥٧٢٩.

٥٧٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ الْمَسِيحُ وَلاَ الطَّاعُونُ»[١].

**٥٧٣١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نە دەججال نە چاوەقوڵە ناڕۆنە ناو شاری مەدینەوە)).**

٥٧٣٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ بِنْتُ سِيرِينَ قَالَتْ: قَالَ لِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: يَحْيَى بِمَا مَاتَ؟ قُلْتُ: مِنَ الطَّاعُونِ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[٢].

**٥٧٣٢- حەفصەی کچی سیرین دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ پێی وتم یەحیا[٣] بەچی مرد؟ وتم: بە چاوە قوڵە، وتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( (مردوو) بە سك ئێشە شەهیدە، وە (مردوو) بە چاوە قوڵە شەهیدە)).**

٥٧٣٣- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ شَهِيدٌ»[٤].

**٥٧٣٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: (( (مردوو) بەسك ئێشە شەهیدە، وە (مردوو) بە چاوە قوڵە شەهیدە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٨٨٠.

(٢) بڕوانە: ٢٨٣٠.

(٣) یەحیا برای حەفصە بووە ﷺ. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٥٤/١٢.

(٤) بڕوانە: ٦٥٣.

## ٣١- بابُ أَجْرِ الصَّابِرِ فِي الطَّاعُونِ

٥٧٣٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي الْفُرَاتِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا أَخْبَرَتْنَا أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الطَّاعُونِ، فَأَخْبَرَهَا نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ:" أَنَّهُ كَانَ عَذَابًا يَبْعَثُهُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ، فَجَعَلَهُ اللَّهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، فَلَيْسَ مِنْ عَبْدٍ يَقَعُ الطَّاعُونُ فَيَمْكُثُ فِي بَلَدِهِ صَابِرًا، يَعْلَمُ أَنَّهُ لَنْ يُصِيبَهُ إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ الشَّهِيدِ". تَابَعَهُ النَّضْرُ، عَنْ دَاوُدَ[1].

## ٣١- باسی پاداشتی ئارامگر لە شوێنی بڵاوبونەوەی چاوە قوڵە

**٥٧٣٤- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی تاعوون، پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵی پێدا و فەرمووی: ((بێگومان تاعوون سزایەکی خوای گەورە دەینێرێت بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێ، بەڵام خوای گەورە تاعوونی گێڕاوە بە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ باوەڕداران، هیچ کەسێك نییە کە تاعوون لە شارێك یا وڵاتێکدا پەیدا ببێت تێدا بمێنێتەوە بە ئارام گرتن و چاوەڕوانی پاداشتی خوا و دڵنیا بێت هیچ زیانێکی تووش نابێت، جگە لەوەی خوای بۆی نووسیوە، ئیللا ئەوە ئەو کەسە وێنەی پاداشتی شەهیدی هەیە)).**

**نەزرِ لە داوودەوە ئەم فەرموودەی گێڕاویەتییەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی حەببانی کوڕی هیلالی کردوە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٧٤.

## ٣٢- بابُ الرُّقى بالْقُرْآنِ وَالْمُعَوِّذَاتِ

٥٧٣٥- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْفُثُ عَلَى نَفْسِهِ فِي الْمَرَضِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا ثَقُلَ كُنْتُ أَنْفِثُ عَلَيْهِ بِهِنَّ، وَأَمْسَحُ بِيَدِ نَفْسِهِ لِبَرَكَتِهَا. فَسَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ: كَيْفَ يَنْفِثُ؟ قَالَ: كَانَ يَنْفِثُ عَلَى يَدَيْهِ، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ[١].

## ٣٢- باسی دووعا و نزا به قورئان و پەنا پێگیراوەکان [٢]

**٥٧٣٥- عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەی تێیدا وەفاتی کرد، فووی دەکرد بەخۆیدا بە (خوێندنی سوڕەتە) پەناپێ گیراوەکان، ئینجا کاتێ کە نەخۆشییەکەی سەخت بوو من بە (خوێندنی سوڕەتە) پەناپێ گیراوانە فوم پێدا دەکرد، دەستی خۆیم دەهێنا بە لاشەیدا بەهیوای فەڕ و بەرەکەتی دەستەکانی خۆی.**

**(مەعمەر دەڵێ) جا پرسیارم لە زوهری کرد چۆن فوی پیا دەکرد؟ وتی: فوی دەکرد بەهەردوو دەستیدا و پاشان هەردوو دەستی دەهێنا بە دەم و چاویدا.**

## ٣٣- بابُ الرُّقى بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ

وُيذْكَرُ عَنِ ابن عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٧٣٦- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَتَوْا على حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَلَمْ يَقْرُوهُمْ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ لُدِغَ سَيِّدُ أُولَئِكَ فَقَالُوا: هَلْ مَعَكُمْ مِنْ

---

(١) بڕوانه: ٤٤٣٩.

(٢) پەناپێگیراوەکان ئەم سێ سورەتەن: سورەتی فەلەق و سورەتی ناس و سورەتی ئیخلاس.

دَوَاءٍ أَوْ رَاقٍ؟ فَقَالُوا: إِنَّكُمْ لَمْ تَقْرُونَا، وَلاَ نَفْعَلُ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً. فَجَعَلُوا لَهُمْ قَطِيعًا مِنَ الشَّاءِ، فَجَعَلَ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، وَيَجْمَعُ بُزَاقَهُ، وَيَتْفِلُ، فَبَرَأَ، فَأَتَوْا بِالشَّاءِ، فَقَالُوا: لاَ نَأْخُذُهُ حَتَّى نَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلُوهُ، فَضَحِكَ وَقَالَ: «وَمَا أَدْرَاكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ خُذُوهَا، وَاضْرِبُوا لِي بِسَهْمٍ»[1].

## ٣٣- باسى دوعاكردن بە سوڕەتى فاتيحە

**(ئەم فەرموودەيە) لە ئيبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**٥٧٣٦- ئەبو سەعيدى خودرى ﷺ دەگێڕێتەوە كەسانێك لە هاوەڵانى پێغەمبەر ﷺ چوون بۆ ناو خێڵێ لە خێڵەكانى عەرەب، بەڵام ئەوان ميوانداريان نەكردن، جا لە كاتێكدا ئەوان لەو حاڵەدا بوون لەوكاتەدا سەرۆكى ئەو (خێڵە) گەزرا[2]، ئينجا (هاتن و) وتيان: ئێوە دەرمانێ يان دووعا و نوشتەيەكتان لايە؟ ئەوانيش وتيان: لەڕاستيدا ئێوە ميوانداريتان لێ نەكردين ئێمەش ئەوكارە ناكەين هەتا كرێيەكمان بۆ بڕيار نەدەن، ئەوانيش ڕانە مەڕێكيان بۆ بڕياردان (پێيان بدەن)، ئيتر كەسێكيان دەستى كرد بەخوێندنى سوڕەتى فاتيحە، تفى (لە دەميدا) كۆدەكردەوە و تفى دەكردەوە (دەيدا لە نەخۆشەكە و) ئيتر چاك بوويەوە، جا مەڕەكانيان هێنا (بۆيان كە سى مەڕ بوون)، وتيان وەرى ناگرين هەتا پرسيار نەكەين لە پێغەمبەرى خوا ﷺ، ئينجا پرسياريان لێ كرد و ئەويش پێكەنى و فەرمووى: ((چۆنت زانى سوڕەتى فاتيحە دووعايە؟ وەرى گرن و (دابەشى كەن) لەگەڵ بەشەكانى خۆتاندا بەشێكيش بۆمن دابنێن)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٢٧٦.

(٢) مارێ يا دووپشكێك پێوەيدا و گەستى.

## ٣٤- بابُ الشَّرْطِ فِي الرُّقْيَةِ بِقَطِيعٍ مِنَ الْغَنَمِ

٥٧٣٧- حَدَّثَنِي سِيدَانُ بْنُ مُضَارِبٍ أَبُو مُحَمَّدٍ الْبَاهِلِيُّ، حَدَّثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ الْبَصْرِيُّ -هُوَ صَدُوقٌ - يُوسُفُ بْنُ يَزِيدَ الْبَرَّاءُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ الأَخْنَسِ أَبُو مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مَرُّوا بِمَاءٍ فِيهِمْ لَدِيغٌ -أَوْ سَلِيمٌ- فَعَرَضَ لَهُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْمَاءِ فَقَالَ: هَلْ فِيكُمْ مِنْ رَاقٍ؟ إِنَّ فِي الْمَاءِ رَجُلاً لَدِيغًا -أَوْ سَلِيمًا- فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ عَلَى شَاءٍ، فَبَرَأَ، فَجَاءَ بِالشَّاءِ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَكَرِهُوا ذَلِكَ وَقَالُوا: أَخَذْتَ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ أَجْرًا. حَتَّى قَدِمُوا الْمَدِينَةَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخَذَ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ أَجْرًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحَقَّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا كِتَابُ اللَّهِ».

## ٣٤- باسی دوعاکردن بەمەرجی چەند سەر مەڕێک[1]

**٥٧٣٧-ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەلای خێڵێکدا ڕۆشتن کە لای ئاوێکدا بارگە و بنەیان خستبوو، پیاوێکی گەزراو- یان لە جوڵە کەوتوویەك -یان تیا بوو، ئینجا پیاوێك لەوانەی لای ئاوەکە هاتە لایان وتی:کەسێکتان تێدایە دووعا خوێن بێت؟ بێگومان لە ناو خەڵکی لای ئاوەکەدا گەزراو-یا لە جوڵە کەوتوویەك-یان تێدایە، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵان ڕۆشت (بۆ لای نەخۆشەکە و)سوڕەتی فاتیحەی خوێند (پیایدا) لە بەرامبەر چەند سەر مەڕێکدا، نەخۆشەکە چاك بوویەوە ئەویش مەڕەکانی هێنا بۆ لای هاوڕێکانی، بەڵام ئەوان پێیان باش نەبوو، وە وتیان:لەسەر (خوێندنی) قورئان کرێت وەرگرتووە؟ تا هاتنەوە بۆ مەدینە و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هاوەڵە لەسەر قورئان خوێندن کرێی وەرگرتووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی شیاوترین شتێك کە کرێتان لەسەری وەرگرتووە قورئانەکەی خوایە)).**

---

(١) کەس و کاری نەخۆشەکە بیدەن بە دوعا خوێنەکە.

## ٣٥- بابُ رُقيَةِ العَينِ

٥٧٣٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْبَدُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: سَمِعتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ شَدَّادٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَوْ أَمَرَ أَنْ يُسْتَرْقَى مِنَ العَيْنِ.

## ٣٥- باسی دوعاکردن بۆ کەسێک بەچاوەوە بووە[1]

**٥٧٣٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردم- فەرمانی دەکرد-کە دوعا بکرێت لە چاو پیسی.**

٥٧٣٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ وَهْبِ بْنِ عَطِيَّةَ الدِّمَشْقِيُّ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْوَلِيدِ الزُّبَيْدِيُّ، أَخْبَرَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى فِي بَيْتِهَا جَارِيَةً فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ فَقَالَ: «اسْتَرْقُوا لَهَا، فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ». وَقَالَ عُقَيْلٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. تَابَعَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَالِمٍ، عَنِ الزُّبَيْدِيِّ.

**٥٧٣٩-ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئەودا کەنیزەکێکی بینی ڕووخساری زەرد هەڵگەڕابوو، فەرمووی: ((داوا بکەن کەسێك دوعای بۆ بکات، چونکە بەراستی ئەم کەنیزەکە بەچاوەوە بووە[2])).**
**عوقەیل لە زوهریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عوروە بۆی گێڕامەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ.**
**عەبدوڵڵای کوڕی سالیم ئەم فەرموودەی لە زوبەیدییەوە گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی موحەممەدی کوڕی حەرب دەکات.**

---

(١) دوعا لەچاو پیس بەم جۆرەش ڕاستە مانا بکرێت.
(٢) یان ڕەش بووە یان سورییەك کە ڕەشی بەسەرەوەیە، یان بەچاو جنۆکەوە بووە، یان بەچاو شەیتانەوە بووە.

## ٣٦- بابٌ: العَيْنُ حَقٌّ

٥٧٤٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ». وَنَهَى عَنِ الْوَشْمِ[1].

## ٣٦- باسێک: چاوپیسی ڕاسته

**٥٧٤٠-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووی: (( (توشبوونی) چاو هەقە و ڕاستە))، وە خاڵ کوتانی قەدەغە کرد.**

## ٣٧- بابُ رُقْيَةِ الحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ

٥٧٤١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ الشَّيْبَانِيُّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ، سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الرُّقْيَةِ مِنَ الْحُمَةِ، فَقَالَتْ: رَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ الرُّقْيَةَ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ.

## ٣٧- باسی (دروسته) نوشتەی مار و دووپشک بکرێت

**٥٧٤١-عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەد لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کەپرسیاری لە عائیشە ﷺ کرد دەربارەی نوشتە لە ژەهردا (دووپشك)، عائیشەش ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا دوعا و نوشتە لە هەموو جانەوەرێکی ژەهردار بکرێت.**

## ٣٨- بابُ رُقْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ

٥٧٤٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَثَابِتٌ على أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، اشْتَكَيْتُ. فَقَالَ أَنَسٌ: أَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ

(١) بڕوانه: ٥٩٤٤.

ﷺ؟ قَالَ: بَلَى. قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ مُذْهِبَ الْبَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا».

## ٣٨- باسی ئەو دوعای پێغەمبەر ﷺ (کە هەمیشە دوعای پێدەکرد)

**٥٧٤٢-عەبدولعەزیز دەڵێ: من و سابیت چووین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ ئینجا سابیت وتی:ئەی ئەبو حەمزە من نەخۆش کەوتووم، ئەنەسیش وتی: ئایا دوعات بۆ بکەم بە دوعاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((خودای پەروەردگاری خەڵکی لابەری ئێش و ئازار، شیفا بدە خۆت شیفا دەری، هیچ شیفایەك نییە جگە لە شیفای تۆ، شیفایەك (بدە) کە هیچ نەخۆشییەك جێ نەهێڵێ)).**

٥٧٤٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُعَوِّذُ بَعْضَ أَهْلِهِ، يَمْسَحُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى وَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أَذْهِبِ الْبَاسَ، اشْفِهِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا». قَالَ سُفْيَانُ: حَدَّثْتُ بِهِ مَنْصُورًا، فَحَدَّثَنِي عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ نَحْوَهُ[1].

**٥٧٤٣ عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە سەردانی نەخۆشێکی خێزانی خۆی دەکرد دەستی ڕاستی دەهێنا (بەشوێنی ئازارەکەیدا) و دەیفەرموو: ((خودای پەروەردگاری خەڵکی لابەری ئێش و ئازار، شیفا بدە خۆت شیفادەری، هیچ شیفایەك نییە جگە لەشیفای تۆ، شیفایەك کە هیچ نەخۆشییەك جێناهێڵێ)).**

(١) بڕوانە: ٥٦٧٥.

**-سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ مەنصور، مەنصوریش لە ئیبراهیمەوە لە مەسروقەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ وێنەی ئەم فەرموودەی گێڕایەوە.**

٥٧٤٤- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَرْقِي يَقُولُ: «امْسَحِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ أَنْتَ»[1].

**٥٧٤٤- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە کە دوعای دەکرد دەیفەرموو: ((ئەم ئازارە لابەرە ئەی پەروەردگاری خەڵکی، شیفا بەدەستی تۆیە، جگە لە تۆ کەس ئەم ئازارە لا نابات)).**

٥٧٤٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ رَبِّهِ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ لِلْمَرِيضِ: «بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا».

**٥٧٤٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە دوعاکردنیدا (بۆ نەخۆش) دەیفەرموو: ((بەناوی خواوە ئەمە خاکی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تفی مسوڵمانێ لە خۆمان نەخۆشەکەمان چاك دەکاتەوە بەفەرمانی پەروەردگارمان))** [2].

٥٧٤٦- حَدَّثَنِي صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ فِي الرُّقْيَةِ: «تُرْبَةُ أَرْضِنَا، وَرِيقَةُ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا»[1].

---

(١) بڕوانە: ٥٦٧٥.

(٢) ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیم دا دەڵێ:مانای فەرموودەکە بەم شێوەیە: تفی خۆی بکات بەسەر پەنجەی شایەتومانیەوە، پاشان بیخاتە سەر خاك و هەندێ خۆڵی پێوە بلکێت ئەنجا بیدات لە شوێنی برینەکە یان ئازارەکە و ئەم دوعایە بڵێت لە کاتی پیاهێنانیدا (١٨٤/١٤).

**٥٧٤٦- عائیشه ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشه له دوعاکردنیدا (بۆ نەخۆش) دەیفەرموو: ((ئەمه خاکی زەوی خۆمانه، لەگەڵ تفی مسوڵمانێ له خۆمان نەخۆشەکەمان چاك دەکاتەوه به فەرمانی پەروەردگارمان))** [٢].

## ٣٩- بابُ النَّفْثِ فِي الرُّقْيَةِ

٥٧٤٧- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفِثْ حِينَ يَسْتَيْقِظُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، وَيَتَعَوَّذْ مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ»[٣]. وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَإِنْ كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنَ الْجَبَلِ، فَمَا هُوَ إِلاَّ أَنْ سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ فَمَا أُبَالِيهَا.

## ٣٩- باسی تفکردن لەدوعادا

**٥٧٤٧-ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ:له پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو((خەو بینینی چاك له خواوەیه، وه خەوبینینی خراپ له شەیتانەوەیه، جا ئەگەر کەسێکتان له خەویدا شتێکی بینی بەلایەوه ناخۆش بوو، که له خەوهەستا با سێ جار تف بکاته (لای چەپی)، وه پەنا بگرێ بەخوا له زیانی ئەو خەوه، ئیتر بەدڵنیاییەوه زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

**-ئەبو سەلەمه دەڵێ: من هەندێ جار خەو دەبینم له شاخێك قورستر لەسەرم، جا هەر که ئەم فەرموودەیەم بیست ئیتر گوێی پێنادەم.**

---

(١) بڕوانه: ٥٧٤٥.

(٢) ئیمامی نەوەوی لەشەرحی صەحیحی موسلیم دا دەڵێ:مانای فەرموودەکه بەم شێوەیه: تفی خۆی بکات بەسەر پەنجەی شایەتومانیەوه، پاشان بیخاته سەر خاك و هەندێ خۆڵی پێوه بلکێت، ئەنجا بیدات له شوێنی برینەکه یان ئازارەکه و ئەم دوعایه بڵێت له کاتی پیاهێنانیدا. (١٨٤\١٤).

(٣) بڕوانه: ٣٢٩٢.

٥٧٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ نَفَثَ فِي كَفَّيْهِ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَبِالْمُعَوِّذَتَيْنِ جَمِيعًا، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ وَمَا بَلَغَتْ يَدَاهُ مِنْ جَسَدِهِ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا اشْتَكَى كَانَ يَأْمُرُنِي أَنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ بِهِ. قَالَ يُونُسُ: كُنْتُ أَرَى ابْنَ شِهَابٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ إِذَا أَتَى إِلَى فِرَاشِهِ[1].

**٥٧٤٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشه کە دەڕۆشته ناو نوێنی نوستنەکەی لەگەڵ خوێندنی سوڕەتەکانی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾﴾ فووی دەکرد بە هەردوو ناو لەپیدا، لە پاشان هەردووکیانی دەهێنا بەدەم و چاویدا و ئەو جێگای دەستەکانی پێی بگەشتایە لە لاشەی.**

**- عائیشه ﵂ دەڵێ: جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت فەرمانی پێدەکردم کە ئەو کارەی پێبکەم (لە جیاتی خۆی).**

**یونس دەڵێ: من ئیبنو شیهابم دی ئەو شێوەی دوعا خوێندن و فوکردنەی دەکرد کاتێ دەچوویە ناو نوێنی خەوتنەکەیەوە.**

٥٧٤٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ انْطَلَقُوا فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا، حَتَّى نَزَلُوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ، فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ، فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ، فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ، الَّذِينَ قَدْ نَزَلُوا بِكُمْ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ. فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا: يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ، فَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ، لاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ، فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ شَيْءٌ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ، وَاللَّهِ إِنِّي لَرَاقٍ، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدِ

(١) بروانه: ٥٠١٧.

اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا، فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً. فَصَالَحُوهُمْ على قَطِيعٍ مِنَ الْغَنَمِ، فَانْطَلَقَ فَجَعَلَ يَتْفُلُ وَيَقْرَأُ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ۝ ﴾ الفاتحة. حَتَّى لَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَانْطَلَقَ يَمْشِي مَا بِهِ قَلَبَةٌ. قَالَ: فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ، فَقَالَ بَعْضُهُمُ: اقْسِمُوا. فَقَالَ الَّذِي رَقَى: لاَ تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ، فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا. فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرُوا لَهُ، فَقَالَ: «وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ أَصَبْتُمْ، اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ»[1].

**٥٧٤٩-ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە چەند کەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا سەفەریان کرد، دەرچوون و ڕۆشتن تا لای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب لایاندا، داوای میوانداررییان لێکردن بەڵام ئەوان میوانداریيان نەکردن، جاسەرۆکی ئەو خێڵە گەزرا و (مارێ یان دووپشکێ پێومیدا)، بەهەموو شتێك هەوڵیاندا (چارەسەر بێ) هیچ شتێك سوودی پێ نەگەیاند، ئینجا کەسێکیان وتی: خۆزگە بڕۆشتنایە بۆ لای ئەو کۆمەڵەی لایانداوە لاتان بەڵکو کەسێکیان شتێکی لابێت (سوودی هەبێ)، بۆیە هاتن بۆ لایان وتیان: خەڵکینە گەورەکەمان گەزراوە، هەموو هەوڵێکمان دا بەهەموو شتێك بێ سوود بوو بۆی، دەی ئایا کەسێکتان چارەیەکی لایە؟ کەسێکیان وتی: بەڵێ سوێند بەخوا من دوعای بۆ دەکەم، بەڵام سوێند بەخوا ئێمە داوای میوانداریمان لە ئێوە کرد ئیوە میوانداریتان نەکردین، بۆیە منیش دووعاتان بۆ ناکەم تا کرێیەکمان بۆ دانەنێن، ئەنجا لەگەڵیان ڕێککەوتن کە چەند سەر مەڕێکیان پێ بدەن، ئەوسا ئەبو سەعید ڕۆشت (بۆ لای گەورەکەیان) کەمێ تفی لێ دەدات و سوڕەتی فاتیحە دەخوینێ بەسەریدا، ئیتر گەزراوەکە وا چاك بۆوە وەك وشتری لەپەت بەربووی لێهات، ئینجا دەستی بە ڕۆشتن کرد هیچ ئێش و ئازارێکی نەما، ئەو**

---

(١) بروانە: ٢٢٧٦.

بره مەڕەی لەسەری ڕێکەوتبوون پێیان دان، کەسێکیان وتی: دابەشی بکەن، بەلاّم ئەبو سەعید کە دوعاکەی کردبوو وتی: دابەشی مەکەن هەتا دەچینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کە بووە بۆی دەگێڕینەوە، ئەوسا بزانین چ فەرمانێکمان پێ دەکات، ئینجا هاتنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((چۆنت زانی سورەتی فاتیحە دوعایە؟ لەو کارەتاندا پێکاوتانە، دابەشی کەن و لەگەڵ بەشەکانی خۆتاندا بەشێکیش بۆ من دابنێن)).

## ٤٠- بابُ مَسْحِ الرَّاقِي الْوَجَعَ بِيَدِهِ الْيُمْنَى

٥٧٥٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَوِّذُ بَعْضَهُمْ يَمْسَحُهُ بِيَمِينِهِ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا». فَذَكَرْتُهُ لِمَنْصُورٍ، فَحَدَّثَنِي عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ بِنَحْوِهِ[١].

## ٤٠- باسی دوعا خوێن دەستی ڕاستی بێنێت بەشوێنی ئازار(ی نەخۆشە) کەدا

٥٧٥٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دووعای دەکرد بۆ کەسێکیان دەستی ڕاستی پیا دەهێنا[٢] و دەیفەرموو: ((پەروەردگاری خەڵکی ئێش و ئازارەکەی لابە و مەیهێڵە، شیفای بدە هەرخۆت شیفا دەری، هیچ شیفایەك نییە جگەلە شیفای تۆ، شیفایەك کە هیچ نەخۆشییەك جێنەهێڵێ)).

---

(١) بڕوانە: ٥٦٧٥.

(٢) واتە: دەستی ڕاستی دەهێنا بەشوێنی ئازەرەکەیدا و دوعاکەی پیا دەخوێند.

-سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ مەنصور، مەنصوریش لە ئیبراهیمەوە وە لە مەسروقەوە، ئەویش لە عائیشەوە ﵂ وێنەی ئەم فەرموودەی گێڕایەوە.

## ٤١- بابٌ: فِي الْمَرْأَةِ تَرْقِي الرَّجُلَ

٥٧٥١- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْجُعْفِيُّ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَنْفِثُ عَلَى نَفْسِهِ فِي مَرَضِهِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا ثَقُلَ كُنْتُ أَنَا أَنْفِثُ عَلَيْهِ بِهِنَّ، فَأَمْسَحُ بِيَدِ نَفْسِهِ لِبَرَكَتِهَا. فَسَأَلْتُ ابْنَ شِهَابٍ: كَيْفَ كَانَ يَنْفِثُ؟ قَالَ: يَنْفِثُ على يَدَيْهِ، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ[1].

## ٤١- باسێک: دەربارەی ژن دووعا بکا بۆ پیاو

٥٧٥١- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشیەی کە تێیدا گیانی کێشرا و وەفاتی کرد، بەخوێندنی سورەتە پەنا پێ گیراوەکان فووی دەکرد بە لاشەی خۆیدا، ئینجا کاتێ کە نەخۆشی یەکەی سەخت بوو من ئەو سورەتانەم دەخوێند فووم پیادەکرد و دەستی خۆیم دەهێنا بە لاشەیدا، بەهیوای فەڕ و بەرەکەتی دەستەکانی خۆی.

(مەعمەر دەڵێ:) جا پرسیارم لە ئیبنو شیهاب کرد چۆن فووی پیا دەکرد؟ وتی: فووی دەکرد بە هەردوو دەستیدا و پاشان هەردوو دەستی دەهێنا بە دەم و چاویدا.

---

(١) بڕوانە: ٤٤٣٩.

## ٤٢- بابُ مَنْ لمْ يَرْقِ

٥٧٥٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا فَقَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَجَعَلَ يَمُرُّ النَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلُ، وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلاَنِ، وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّهْطُ، وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، وَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ، فَرَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ أُمَّتِي، فَقِيلَ هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ. ثُمَّ قِيلَ لِي: انْظُرْ. فَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ، فَقِيلَ لِي: انْظُرْ هَكَذَا وَهَكَذَا. فَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ، فَقِيلَ: هَؤُلاَءِ أُمَّتُكَ، وَمَعَ هَؤُلاَءِ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ». فَتَفَرَّقَ النَّاسُ وَلَمْ يُبَيَّنْ لَهُمْ، فَتَذَاكَرَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: أَمَّا نَحْنُ فَوُلِدْنَا فِي الشِّرْكِ، وَلَكِنَّا آمَنَّا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَلَكِنْ هَؤُلاَءِ هُمْ أَبْنَاؤُنَا، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «هُمُ الَّذِينَ لاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَكْتَوُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ». فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «نَعَمْ». فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا؟ فَقَالَ: «سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ»[1].

## ٤٢- باسی ئەو کەسەی داوای دوعا ناکات (بۆ نەخۆشی)

**٥٧٥٢- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ وتی: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان و فەرمووی: ((ئوممەتەکانم نیشان درا، جا پێغەمبەر هەبوو دەرۆشت یەك کەسی لە گەڵدا بوو، پێغەمبەر هەبوو دوو کەسی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەریش هەبوو کۆمەڵێ کەسی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەریش هەبوو کەسی لەگەڵدا نەبوو، ئینجا (لە دوورەوە) خەڵکێکی زۆرم بینی ئاسۆکەیان پڕ کردبوو، چاوەڕوان بووم ئوممەتەکەی من بن، وترا: ئەوە مووسا ﷺ و گەلەکەیەتی، پاشان پێم وترا: سەیرکە، جا خەڵکێکی زۆرم بینی ئاسۆکەیان پڕ کردبوو، ئینجا پێم وترا: سەیری ئەوێ و ئەوێ کە، خەڵکێکی زۆرم بینی ئاسۆکەیان پڕ کردبوو، پێم وترا: ئا ئەوانە ئوممەتەکەی تۆن، وە لەگەڵ ئا ئەوانەدا حەفتا هەزار هەن بەبێ لێپرسینەوە دەڕۆنە بەهەشتەوە، خەڵکەکە**

---

(١) بروانە: ٣٤١٠.

**بڵاوەیان لێ کرد و پێغەمبەر ﷺ ڕوونی نەکردەوە بۆیان[1]، ئینجا خەڵکەکە کەوتنە باسکردنی (ئەوانەی بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە) وتیان: ئێمە لە بتپەرستیدا لە دایك بووین بەڵام باوەڕمان هێنا بەخوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ[2]، بەڵکو ئا ئەوانە منداڵەکانی ئێمەن، جا ئەو وتەیە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((ئەوانە ئەو کەسانەن کە ڕەشبینی ناکەن[3]، وە داوای نوشتە ناکەن، خۆیان داغ ناکەن، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن)) ئینجا عوکاشەی کوڕی میحصەن ﷺ هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا منیان تێدایە؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، ئینجا پیاوێکی تر هەستا و وتی: ئەی منیان تێدایە؟ فەرمووی: ((عوکاشە پێشت کەوت)).**

## ٤٣- بابُ الطِّيَرَةِ

٥٧٥٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَالشُّؤْمُ فِي ثَلاَثٍ: فِي الْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ، وَالدَّابَّةِ»[4].

## ٤٣- باسی ڕەشبینی و بەدقوومی[5]

**٥٧٥٣ -ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی نییە، بەدقومی نییە، شومی[1] لە سێ شت دایە: لە ژن و خانوو و وڵاخ)).**

---

(١) ئەو حەفتاهەزارە کێن؟.

(٢) کەواتە ئەو کەسانە ئێمە نین، بەڵام لە فەرموودەی ژمارە (٥٧٠٥)ـدا دەفەرمووی ئێمە ئەو کەسانەین یان منداڵەکانمان ئەو کەسانەن.

(٣) بەهۆی فڕینی باڵندەوە.

(٤) بڕوانە: ٢٠٩٩.

(٥) عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیدا ئەگەر کەسێکیان بیویستایە بڕوا بۆ سەفەر ئەگەر باڵندەی بدیایە بەلای ڕاستدا بفڕیایە، بەلایەوە چاک بوو دەڕۆشت بۆ سەفەرەکەی، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیایە، ڕەشبین بوو پێی و نەدەڕۆیشت بۆسەفەرەکەی. (إرشاد الساري:٤٧٢\١٢).

٥٧٥٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ طِيَرَةَ، وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ». قَالُوا: وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ»[٢].

**٥٧٥٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ:لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((شومی نییە، چاکترینی شوومی تەفائولە))، عەرزیان کرد: تەفائول چییە؟((وشەیەکی چاك و باشە یەکێکیان دەیبیستێ)).**

## ٤٤- بابُ الفَأْلِ

٥٧٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ طِيَرَةَ، وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ». قَالَ: وَمَا الْفَأْلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ»[٣].

## ٤٤- باسی گەشبینی [٤]

**٥٧٥٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شومی نییە، چاکترینی شوومی تەفائولە))، عەرزیان کرد: تەفائول چییە؟ ((وشەیەکی چاك و باشە یەکێکتان دەیبیستێ)).**

٥٧٥٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ الصَّالِحُ، الْكَلِمَةُ الْحَسَنَةُ»[١].

---

(١) هەندێ دەڵێن ئەگەر شومی هەبێت لەم سێ شتە دایە.

(٢) بڕوانە: ٥٧٥٥.

(٣) بڕوانە: ٥٧٥٤.

(٤) نوقڵانەی باش، پێچەوانەی ڕەشبینی، وەک بە نەخۆشێک بڵێیت چاکیت ئەویش وابزانێ بەرەو چاکی دەڕوات.

٥٧٥٦ -ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی نییە، بەدفومی نییە، وە حەزم لە گەشبینی چاکە: کە وتەیەکی چاك و جوانە)).

## ٤٥- بابٌ: لاَ هَامَةَ

٥٧٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَكَمِ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ، أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، أَخْبَرَنَا أَبُو حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ صَفَرَ»[٢].

## ٤٥- باسێک: بایەقوش و کونەپەپو نییە[٣]

٥٧٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سیرایەتی نەخۆشی نییە[٤]، شومی باڵندە نییە[٥]، بایەقوش و کوندەپەپوو نییە[٦]، (مانگی بێ قودوومی) سەفر نییە)).

## ٤٦- بابُ الكَهَانَةِ

٥٧٥٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ اقْتَتَلَتَا، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ، فَأَصَابَ بَطْنَهَا وَهْيَ حَامِلٌ، فَقَتَلَتْ وَلَدَهَا الَّذِي فِي بَطْنِهَا

---

(١) بڕوانە: ٥٧٧٦.

(٢) بڕوانە: ٥٧٠٧.

(٣) بایەقوش و کونەپەپوو هۆی ڕەشبینی نین.

(٤) (لاعدوی) عەرەبەکان لایان وابووە کەنەخۆشی سرایەت دەکات لە نەخۆشێکەوە بۆ کەسێکی تر، پێغەمبەر ﷺ ئەو بۆچوونەی بە ڕەها هەڵوەشاندەوە.

(٥) ئەگەر باڵندە بەلای ڕاستدا بفڕیایە گەشبین دەبوون، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیایە ڕەشبین دەبوون.

(٦) بەچەند مانای تریش ماناکراوە.

فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ مَا فِي بَطْنِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ، فَقَالَ وَلِيُّ الْمَرْأَةِ الَّتِي غَرِمَتْ: كَيْفَ أَغْرَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ لاَ شَرِبَ، وَلاَ أَكَلَ، وَلاَ نَطَقَ، وَلاَ اسْتَهَلَّ؟ فَمِثْلُ ذَلِكَ يَطَلّ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ»[1].

## ٤٦- باسی ڕمڵ لێدان و فاڵ گرتنەوە

**٥٧٥٨ -ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا لە بارەی دوو ژنی هۆزی هوزەیل لەگەڵ یەکتری شەڕیان کرد، ژنێکیان بەردی گرتە ژنێکی تریان سکی پڕ بوو بەردەکەی بەرکەوت، ئیتر ئەو منداڵەی لە سکیدا بوو کوشتی، بۆیە کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بڕیاری دا خوێنەکەی کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکە، ئینجا سەرپەرشتیاری ئەو ژنەیان کە بە پارە سزادرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن شتێکم پێدەبژێردرێت کەنەخواردنەوەی خواردۆتەوە، نەخواردنی خواردووە، و نەقسەی کردوە، نەدەنگی لێبەرز بۆتەوە؟ جاوێنەی ئەوە خوێنی نییە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەمە[2] لە ڕیزی فاڵچی و ڕمڵ لێدەرانە)).**

٥٧٥٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ رَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ فَطَرَحَتْ جَنِينَهَا، فَقَضَى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ[3].

**٥٧٥٩-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: دوو ژن یەکێکیان بەردی هاوێشت بۆ ئەوی کەیان و کۆرپەکەی لە بارچوو، پێغەمبەریش ﷺ بڕیاری دا دەربارەی خوێنەکەی کە[1] کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠.
(٢) ئەم پیاوە کەسەرپەرشتیاری ژنە تاوان بارەکەیە.
(٣) بڕوانە: ٥٧٥٨.

٥٧٦٠ - وَعَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي الْجَنِينِ يُقْتَلُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ وَلِيدَةٍ، فَقَالَ الَّذِي قُضِيَ عَلَيْهِ: كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لاَ أَكَلَ، وَلاَ شَرِبَ، وَلاَ نَطَقَ، وَلاَ اسْتَهَلَّ؟ وَمِثْلُ ذَلِكَ بَطَلْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ»[٢].

**٥٧٦٠-ئیبنو شیهاب لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا دەربارەی کۆرپەیەك لە سکی دایکیدا بکوژرێت خوێنەکەی: کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکە، ئینجا ئەو کەسەی بڕیارەکە لە دژی درابوو وتی: چۆن (خوێنی) شێکم پێ دەبژێردرێت کە خواردنی نەخواردووە، وە خواردنەوەی نەخواردۆتەوە، وە قسەی نەکردوە، وە دەنگی لێوە نەهاتووە؟ وێنەی ئەوە خوێنی نییە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەم کەسە لە ڕیزی برادەرانی فاڵچی و ڕملّ لێدەرانە)).**

٥٧٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ[٣].

**٥٦٧١-ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نرخی سەگ و کرێی ئافرەتی داوێن پیس و کرێی فاڵچی و کتێب گرەوی قەدەغە کرد.**

٥٧٦٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ يَحْيَى بْنِ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَاسٌ عَنِ

---

(١) خوێنی کۆرپەکە کە ژنەکە لە باری چوو، یەکەم جار ئەو برگەی بەمورسەلی گێڕاوەتەوە و ناوی عائیشە ﵂ نەهێناوە، بەڵام دواتر بە نەپچڕاوی هێناویەتی و ناوی عائیشەی هێناوە ﵂.

(٢) بڕوانە: ٥٧٥٨.

(٣) بڕوانە: ٢٢٣٧.

الكُهَّانِ، فَقَالَ: «لَيْسَ بِشَيْءٍ». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَا أَحْيَانًا بِشَيْءٍ فَيَكُونُ حَقًّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَالْحَقِّ، يَخْطَفُهَا مِنَ الْجِنِّيِّ، فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ، فَيَخْلِطُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ». قَالَ عَلِيٌّ: قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: مُرْسَلٌ "الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ". ثُمَّ بَلَغَنِي أَنَّهُ أَسْنَدَهُ بَعْدَهُ[1].

**٥٧٦٢- عائیشه ﵂ دەڵێ:کەسانێك پرسیاریان له پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی فاڵچیەکان، ئەویش فەرمووی: (( (وتەکانیان) هیچ نییه))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ جار ئەوان (فاڵچیەکان) باسی شتێکی (نهێنی) مان بۆ دەکەن ڕاست دەردەچێت و وادەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە وشەیەکی ڕاستە جنۆکە دەیفڕێنێ و دەیدات بەگوێی دۆستەکەیدا (فاڵچیەکەدا)، ئەوانیش هەزار درۆی لەگەڵدا تێکەڵ دەکەن))، عەلی دەڵێ: عەبدولرەزاق وتی: ئەم بڕگەی فەرموودەکە ((الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ)) مورسەلە، پاشان پێم گەشت کە عبدولڕەزاق ئەو بڕگەشی بە پەیوەستی و نەپچڕاوی گێڕاوەتەوە.**

## ٤٧- بابُ السِّحْرِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْۚ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا

(١) بڕوانه: ٣٢١٠.

لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿١٠٢﴾ ﴾ البقرة. وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ ﴾ طه. وَقَوْلِهِ: ﴿ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الأنبياء. وَقَوْلِهِ: ﴿ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ ﴿٦٦﴾ ﴾ طه. وَقَوْلِهِ: ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ ﴾ الفلق. وَالنَّفَّاثَاتُ: السَّوَاحِرُ. ﴿ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المؤمنون: تُعَمَّوْنَ.

## ٤٧- باسی جادوو

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەڵام شەیتانەکان بێ بڕوا بوون، خەڵکیان فێری جادوو دەکرد، هەروەها ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە لە بابل بۆسەر هاروت و مارەوت[1]، وە (ئەوان) کەسیان فێر نەدەکرد تا پێیان نەوتایە ئێمە هەر تاقیکەرەوە (ی ئادەمیزاد) ین کەواتە بێ بڕوا مەبە، ئینجا فێری جادووی وا دەبوون لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لە یەك بکەن، ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بە ویستی خوا، وە فێری شتێك دەبن کە زیانیان پێ دەگەیەنێ نەك قازانج، بێگومان زانیان هەر کەسێ جادوو بکڕێ (بە فەرموودەی تەورات) لە ڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێت).**

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جادووبازیش سەرکەوتوو نابێ لە هەر کوێوە هاتبێ (هەر چی بکات). وە ئەم فەرمایشتەش (دەی ئایا ئێوە دەڕۆن بەدوای جادوودا لە کاتێکدا ئێوە دەبینن)[2]. وە ئەم فەرمایشتەش ((کوریس و دار دەستەکانیان ) وا هاتە پێش چاو (ی مووسا ﷺ) بەهۆی جادووەکەیانەوە دەجوڵێن و دەڕۆن). وە ئەم فەرمایشتە (وە لە زیانی فوکەران (جادووکەران)**

---

(١) دووفریشتە بوون.

(٢) دەزانن ئەوەی محمد ﷺ دەیڵێ سیحرە؟.

**بەکرێیاندا)** (النَّفَّاثَاتُ) **واتە: جادوو گەرانی ژن.** ﴿ تُسْحَرُونَ ﴾**: چاوبەستان لێ دەکرێ و لادەدرێن**[1].

**٥٧٦٣-** حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ -أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ- وَهْوَ عِنْدِي، لَكِنَّهُ دَعَا وَدَعَا ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ أَتَانِي رَجُلاَنِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي، وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ فَقَالَ: مَطْبُوبٌ. قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ. قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ، وَجُفِّ طَلْعِ نَخْلَةٍ ذَكَرٍ. قَالَ: وَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ». فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَجَاءَ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، كَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ، أَوْ كَأَنَّ رُءُوسَ نَخْلِهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ أَسْتَخْرِجُهُ؟ قَالَ: «قَدْ عَافَانِي اللَّهُ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُثَوِّرَ عَلَى النَّاسِ فِيهِ شَرًّا». فَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ.

تَابَعَهُ أَبُو أُسَامَةَ وَأَبُو ضَمْرَةَ وَابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ هِشَامٍ. وَقَالَ اللَّيْثُ وَابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامٍ: "فِي مُشْطٍ وَمُشَاقَةٍ". يُقَالُ: الْمُشَاطَةُ مَا يَخْرُجُ مِنَ الشَّعَرِ إِذَا مُشِطَ، وَالْمُشَاقَةُ مِنْ مُشَاقَةِ الْكَتَّانِ[2].

**٥٧٦٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: پیاوێك لە بەنی زورەیق، کەپێی دەوترا: لەبیدی کوڕی ئەعصەم جادووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، هەتا (هەندێ جار) پێغەمبەری خوا ﷺ وای دەزانی شتێکی کردوە کە نەیکردبوو، هەتا ڕۆژێکیان- یان شەوێکیان- پێغەمبەر ﷺ لای من بوو، بەڵام پاڕایەوە و دوعای کرد، لە پاشان فەرمووی: (ئەی**

---

(١) جادووتان لێ دەکرێ کە ئاینی خوا بە ناهەق دەزانن لەگەڵ دان نانتان بەهەمموو ڕاستیەکانیدا.

(٢) بڕوانە: ٣١٧٥.

**عائیشه ئایا هەستت کرد [1] که خوای گەورە دەربارەی ئەو داوای لێم کردبوو وەڵامی دامەوە؟ دوو پیاو [2] هاتن بۆ لام، یەکێکیان لای سەرمدا دانیشت، ئەوی کەیان لای پێیەکانم دانیشت، یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت: نەخۆشی ئەم پیاوە چییە؟ ئەویش وتی: جادووی لێ کراوە، وتی کێ جادووی لێ کردوە؟ وتی: لەبیدی کوڕی عاصیم، وتی: جادووەکە لە چی دایە؟ وتی لە شانە و قژ و موودایە کە بەشانەوەیە، وە لە کیفی توێکڵی خورمای نێر دایە، وتی: لە کوێدایە؟ وتی: لە بیری زەروان دایە))، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت بۆ سەر ئەو بیرە لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانیدا، ئینجا هاتەوە فەرمووی: ((ئەی عائیشە ئاوی ئەو بیرە وەکو ئاوێك وابوو خەنەی تێکرابێ، یان دار خورماکان (دەوروبەری) ئەو بیرە وەکو سەری شەیتانەکان وابوون))، (عائیشە دەڵێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆ (جادووەکەت) دەرنەهێنا؟ فەرمووی: ((بێگومان خوا چاکی کردمەوە[3] و حەزم نەکرد باسێکی خراپ بەهۆیەوە لە ناو خەڵکدا بهەژێنم))، ئیتر فەرمانی کرد و بیرەکە پڕ کرایەوە و داپۆشرا.**

**-ئەبو ئوسامە و ئەبو زەمرە و ئیبنو ئەبی زەناد (ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و) پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عیسای کوڕی یونس دەکەن.**

**-لەیس و ئیبنو عوبەیدە لە هیشامەوە (ئەم بەشەی فەرموودەکەیان بەم شێوە) گێڕاوەتەوە:** (في مشط ومشاقة)) (المشاطة) **ئەو قژ و مووانەیە لە کاتی داهێنانی سەردا لەسەر دەبێتەوە و بەشانەکەوەیە.** (المشاقه) **ئەو ڕیشاڵی کەتانەیە لە کاتی داهێنانیدا لەگەڵ شانەکەدان و لە کەتانەکە دەبێتەوە.**

---

(١) ئایا زانیوتە.

(٢) واتە: دوو فریشتە کە جبریل و میکائیل بوون ﷺ وەک لەگێڕانەوەی تەبەرانیدا هاتووە (إرشاد الساري:١٢\٤٨٣).

(٣) ڕزگاری کردم لەو جادوو و حاڵەت و ئاسایی بوومەوە.

## ٤٨- بابٌ: الشِّرْكِ وَالسِّحْرِ مِنَ الْمُوبِقَاتِ

٥٧٦٤- حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اجْتَنِبُوا الْمُوبِقَاتِ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ»[1].

## ٤٨- باسێک:هاوبەش دانان بۆ خوا و جادووکردن لەتاوانە فەوتێنەرەکانن

**٥٧٦٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خۆتان بە دوور بگرن لە تاوانە لە ناو بەرەکان: هاوبەش دانان بۆ خوا، جادووکردن)).**

## ٤٩- بابٌ: هَلْ يَسْتَخْرِجُ السِّحْرَ؟

وَقَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: رَجُلٌ بِهِ طِبٌّ أَوْ يُؤَخَّذُ عَنِ امْرَأَتِهِ، أَيُحَلُّ عَنْهُ أَوْ يُنَشَّرُ؟. قَالَ: لَا بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا يُرِيدُونَ بِهِ الإِصْلَاحَ، فَأَمَّا مَا يَنْفَعُ فَلَمْ يُنْهَ عَنْهُ.

٥٧٦٥- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُيَيْنَةَ يَقُولُ: أَوَّلُ مَنْ حَدَّثَنَا بِهِ ابْنُ جُرَيْجٍ يَقُولُ: حَدَّثَنِي آلُ عُرْوَةَ، عَنْ عُرْوَةَ فَسَأَلْتُ هِشَامًا عَنْهُ، فَحَدَّثَنَا عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُحِرَ حَتَّى كَانَ يَرَى أَنَّهُ يَأْتِي النِّسَاءَ وَلاَ يَأْتِيهِنَّ. قَالَ سُفْيَانُ: وَهَذَا أَشَدُّ مَا يَكُونُ مِنَ السِّحْرِ إِذَا كَانَ كَذَا. فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، أَعَلِمْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ أَتَانِي رَجُلَانِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي، وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلآخَرِ: مَا بَالُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ. قَالَ: وَمَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ أَعْصَمَ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ حَلِيفٌ لِيَهُودَ، كَانَ مُنَافِقًا. قَالَ: وَفِيمَ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ

---

(١) بڕوانە: ٢٧٦٦.

وَمُشَاقَةٍ. قَالَ: وَأَيْنَ؟ قَالَ: فِي جُفِّ طَلْعَةٍ ذَكَرٍ، تَحْتَ رَعُوفَةٍ، فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ». قَالَتْ: فَأَتَى النَّبِيُّ ﷺ الْبِئْرَ حَتَّى اسْتَخْرَجَهُ فَقَالَ: «هَذِهِ الْبِئْرُ الَّتِي أُرِيتُهَا، وَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ، وَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ». قَالَ: فَاسْتُخْرِجَ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: أَفَلاَ؟ أَيْ تَنَشَّرْتَ. فَقَالَ: «أَمَا وَاللَّهِ فَقَدْ شَفَانِي، وَأَكْرَهُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ شَرًّا»[١].

## ٤٩- باسێک: ئایا جادوو دەردەهێنرێت (لەو جێگایەی تیایەتی)

**-قەتادە دەڵێ: بەسەعیدی کوڕی موسەییەبم وت: پیاوێك جادووی لێکراو- یان پیاوێك بەسترابێ ناتوانێت سەرجێی بکات لەگەڵ ژنەکەی- ئایا جادووەکەی هەڵوەشێنرێتەوە و بەستنەکە چارەسەر بکرێ[٢]؟ (سەعید) وتی: زیانی نییە، چونکە مەبەستیان چاکە کردن و چارەسەرە، جا ئەوەی سوودی ئەبێ قەدەغە نەکراوە.**

**٥٧٦٥- عائیشە ؓ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جادوی لێکرابوو هەتا وایدەزانی دەچووە لای ژنەکانی و نەشچوو بوویە لایان.**

**-سوفیان دەڵێ [٣]: ئەمە سەختترین جۆری جادووە ئەگەر وابێت - جا پێغەمبەر ﷺ: فەرمووی: (ئەی عائیشە زانیوتە کە خوا وەڵامی دامەوە دەربارەی ئەو داوایەی لێم داوا کردبوو؟ دوو پیاو[٤] هاتن بۆلام، جا یەکێکیان لای سەرمدا دانیشت، ئەوی کەشیان لای پێیەکانم دانیشت، ئینجا ئەوەی کە لای سەرم دابوو وتی بەوی کەیان، ئەم پیاوە چییەتی؟ وتی: جادووی لێکراوە، وتی: کێ جادووی لێ کردوە؟ وتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم - پیاوێکە لە بەنی زورەیق هاوپەیمانی**

---

(١) بڕوانە: ٣١٧٥.

(٢) النشر: جۆرە دوعا و نوشتەیەک چارەسەری ئەو کەسەی پێدەکرێ کە جنۆکە تووشی نەخۆشی و دەردێکی کردوە پێ دەوترێت (النشرة)، چونکە ئەو دەرد و نەخۆشییە لێ دەکاتەوە و لایدەبات. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٨٥/١٢.

(٣) بەرشتەکەی پێشوو.

(٤) دوو فریشتە هاتنە خزمەتی.

**جولەکەیە و پێشتر دووڕوو بووە- وتی: جادووەکە لە چی دایە؟ لە شانە و ڕیشاڵی کەتان دایە لە کاتی داهێنانیدا بەشانەکەوە هاتووە، وتی: لە کوێدایە؟ لە کیفی خورمای توێکڵی نێردایە لە ژێر بەردێکدایە، لە بیری زەرواندا))، عائیشە دەڵێ: ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ سەر بیرەکە و تا جادووەکە دەربێنێ، جا فەرمووی: ((ئەم بیرە بوو نیشانم درا، ئاوەکەی وەك ئاوێك وابوو خەنەی تێکرابێ دار خورماکانیش (کە بەدەوریدا بوون) وەکو سەری شەیتانەکان بوون)) دەڵێ: ئینجا جادووەکە (لە بیرەکە) دەرهێنرا، عائیشە دەڵێ وتم: ئەی بۆچی؟- واتە دووعات نەکرد بۆ چارەسەری جادووەکە- فەرمووی: ((سا بەخوا بەدڵنیاییەوە خوا شیفای دام، وە پێم ناخۆشە خراپەیەك دەربارەی هیچ کەسێك بوروژێنم)).**

## ٥٠- بابُ السِّحْرِ

٥٧٦٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُحِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِنَّهُ لَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ وَهْوَ عِنْدِي دَعَا اللَّهَ وَدَعَاهُ، ثُمَّ قَالَ: «أَشَعَرْتِ يَا عَائِشَةُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟». قُلْتُ: وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «جَاءَنِي رَجُلاَنِ، فَجَلَسَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ. قَالَ: وَمَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ، اليَهُودِيُّ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ. قَالَ: فِيمَا ذَا؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ، وَجُفِّ طَلْعَةٍ ذَكَرٍ. قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ». قَالَ: فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ إِلَى الْبِئْرِ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا وَعَلَيْهَا نَخْلٌ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَ: «وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ

نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَأَخْرَجْتَهُ؟ قَالَ: «لاَ، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِيَ اللَّهُ وَشَفَانِي، وَخَشِيتُ أَنْ أُثَوِّرَ عَلَى النَّاسِ مِنْهُ شَرًّا». وَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ[1].

## ٥٠- باسی جادوو

**٥٧٦٦- عائیشه ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جادووی لێ کرابوو هەتا (هەندێ جار) پێغەمبەری خوا ﷺ وای دەزانی شتێکی کردوە کە نەیکردبوو، هەتا ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لای من بوو زۆر لە خوا پاڕایەوە و دووعای کرد، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی عائیشە ئایا هەستت کرد[2] کە خوای گەورە دەربارەی ئەو داوای لێم کردبوو وەڵامی دامەوە؟) وتم: ئەوە چۆن بوو ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((دوو پیاو[3] هاتن بۆ لام، یەکێکیان لای سەرمدا دانیشت، ئەوی کەیان لای پێیەکانم دانیشت، پاشان یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت، نەخۆشی ئەم پیاوە چییە؟ ئەویش وتی: جادووی لێ کراوە، وتی: کێ جادووی لێ کردوە؟ وتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەمی جولەکە لە بەنی زورەیق، وتی: جادووەکە لە چی دایە؟ وتی: لە شانە و قژ و مووداییە کە بەشانەوەیە، لە بیر دایە، وە لە کیفی توێکڵی خورمای نێر دایە، وتی: لە کوێدایە؟ وتی: لە بیری زەمیئەروان دایە)) دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت بۆ سەر ئەو بیرە لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانیدا و سەیری ناو بیرەکەی کرد کە چەند دار خورمایەکی لە لابوو، پاشان گەڕایەوە بۆ لای عائیشە و فەرمووی: ((سوێند بەخوا ئاوی ئەو بیرە وەکو ئاوێك وابوو خەنەی تێکرابێ، وە دار خورماکان (دەوروبەری ئەو بیرە) وەکو سەری شەیتانەکان وابوون))، (عائیشە دەڵێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا (جادووەکەت) دەرنەهێنا؟ فەرمووی: ((نەخێر بێگومان خوا چاکی کردمەوە و**

---

(١) بڕوانە: ٣١٧٥.

(٢) ئایا زانیوتە.

(٣) واتە: دوو فریشتە کە جبریل و میکائیل بوون ﷺ، وەک لە گێڕانەوەی تەبەرانیدا هاتووە (إرشاد الساري:٤٨٣\١٢).

شیفای دام[١]، وە ترسام (ئەگەر دەرم بهێنایە) باسێکی خراپ بەهۆیەوە لە ناو خەڵکدا بهەژێنم))، ئیتر فەرمانی کرد و بیرەکە پڕکرایەوە و داپۆشرا.

## ٥١- بابٌ: مِنَ الْبَيَانِ سِحْر

٥٧٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلاَنِ مِنَ المَشْرِقِ، فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا" أَوْ: "إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ"[٢].

## ٥١- باسێک: هەندێ وتاری ڕەوان وەک جادوو وان[٣]

٥٧٦٧-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: دوو پیاو لە خۆرهەڵاتەوە هاتن[٤]، ئینجا هەردووکیان وتاریان خوێندەوە و خەڵکەکە بەڕەوانی و جوانی وتارەکەیان سەرسام بوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە ڕاستی هەندێك وتاری ڕەوان و جوان وەك جادوو وان))، یان فەرمووی: ((بێگومان بەشێك لە وتاری ڕەوان دەڵێی جادووە)).

## ٥٢- بابُ الدَّوَاءِ بِالْعَجْوَةِ لِلسِّحْرِ

٥٧٦٨- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا مَرْوَانُ، أَخْبَرَنَا هَاشِمٌ، أَخْبَرَنَا عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنِ اصْطَبَحَ كُلَّ يَوْمٍ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً، لَمْ يَضُرُّهُ سَمٌّ وَلاَ سِحْرٌ ذَلِكَ الْيَوْمَ إِلَى اللَّيْلِ». وَقَالَ غَيْرُهُ: «سَبْعَ تَمَرَاتٍ»[٥].

---

(١) ڕزگاری کردم لەو جادووە و حاڵەت و ئاسایی بوومەوە.

(٢) بڕوانە: ٥١٤٦.

(٣) لە جوانی فەساحەت و بەلاغەتدا مرۆڤ دەحەپەسێنن و سەرسامی دەکەن وەک سیحر و جادوو.

(٤) واتە: ڕۆژهەڵاتی مەدینە لە بەنو تەمیم بوون، لە سنوری ڕووبە عێراق دەژیان.

(٥) بڕوانە: ٥٤٤٥.

## ٥٢- باسی چارەسەرکردنی جادوو بە خورمای عەجوە

**٥٧٦٨- عامیری کوڕی سەعد لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((هەر کەسێك هەموو ڕۆژێك بەیانیان (بەسکی خاڵی) چەند دەنکە خورمایەکی عەجوە بخوات، لەو ڕۆژەدا تا شەو نەژەهر نەجادوو زیانی پێناگەیەنێت))، وە غەیر عەلی [١] لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێ: ((حەوت دەنك خورما (ی عەجووە) )).**

٥٧٦٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هَاشِمُ بْنُ هَاشِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَامِرَ بْنَ سَعْدٍ، سَمِعْتُ سَعْدًا ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَصَبَّحَ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلاَ سِحْرٌ»[٢].

**٥٧٦٩-عامیری کوڕی سەعد دەڵێ: لە سەعدم ﷺ بیست دەیوت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر کەسێك بەیانیان حەوت دەنك خورمای عەجووە بخوات، لەو ڕۆژەدا نەژەهر نەجادوو زیانی پێناگەیەنێت)).**

## ٥٣- بابٌ: لاَ هَامَةَ

٥٧٧٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ عَدْوَى، وَلاَ صَفَرَ، وَلاَ هَامَةَ». فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا بَالُ الإِبِلِ تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ، فَيُخَالِطُهَا الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ؟»[٣].

---

(١) عەلی مامۆستای بوخارییە، غەیر عەلەیش مەبەستی جومعەیە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٤٩٢/١٢.
(٢) بڕوانە: ٥٤٤٥.
(٣) بڕوانە: ٥٧٠٧.

## ٥٣- باسێک: بایەقوش و کونەپەپوو نییە[1]

**٥٧٧٠- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی وسیرایەتی سك ئێشە[2] و شوومی بایەقوش و کوندەپەپوو نییە)). جا عەرەبییەکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆچی وشترەکانم لەناو تۆز و لما وەك ئاسك وان[3]، ئینجا کە وشترێکی گەڕۆڵ دێتە ناویان و تێکەڵاویان دەبێ هەموویان گەڕۆڵ دەکات؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی کێ ئەو گەڕۆڵییەی بە وشتری یەکەم گەیاندووە؟)).**

٥٧٧١- وَعَنْ أَبِي سَلَمَةَ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ بَعْدُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ». وَأَنْكَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ حَدِيثَ الأَوَّلِ، قُلْنَا: أَلَمْ تُحَدِّثْ أَنَّهُ لاَ عَدْوَى؟ فَرَطَنَ بِالْحَبَشِيَّةِ. قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَمَا رَأَيْتُهُ نَسِيَ حَدِيثًا غَيْرَهُ[4].

**٥٧٧١-ئەبو سەلەمە لە ئەبو هوڕەیرەی ﷺ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((با (وشتری) نەخۆش نەکرێتە ناو (وشتری) ساغەوە))، ئەبو هوڕەیرە دانی نەنا بەفەرموودەی یەکەمدا، پێمان وت: ئەی تۆ ئەم فەرموودەیەت نەدەگێڕایەوە ((سیرایەتی نەخۆشی نییە؟))، بەزمانی حەبەشی قسەیەکی کرد، ئەبو سەلەمە وتی: نەمدیوە هیچ فەرموودەیەکی لە بیر چووبێتەوە جگە لەم فەرموودەیە.**

---

(١) (ولاهامة): دووماناى هەیە یەکەمیان:عەرەبەکان بایەقوشیان بە شوم دەزانی وە لایان وابوو لەسەر ماڵی هەرکەسێکدا نیشتەوە ئەوە خاوەن ماڵەکە یان کەسێکیان دەمرێت. دووەمیان: عەرەبەکان باوەڕیان وابوو کە ئێسکی مردووەکەیان بووەتە ئەو بایە قوشە دەفڕێ، ئەمەشیان لێکدانەوەی زۆربەی زانایانە. پێغەمبەر ﷺ ئەم بروا و بۆچوونانەی پوچەڵ کردەوە و فەرمووی شتی وانییە ڕاست نییە. لەبەر ئەم دوو مانایە بوخاری دوو جار ئەم بابەتەی هێناوە لە صەحیحەکەیدا. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٢/٤٩٤.

(٢) یان ماری ناو سکی سیرایەتەکەیە.

(٣) ساف و لوسن تۆز ناگرنە خۆیان.

(٤) بڕوانە: ٥٧٧٤.

## ٥٤- بابٌ: لاَ عَدْوَى

٥٧٧٢- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ وَحَمْزَةُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاَثٍ: فِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ»[1].

## ٥٤- باسێک: سیرایەتی نەخۆشی نییە

**٥٧٧٢-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سیرایەتی نەخۆشی نییە، بەدقومی نییە، بێگومان شوومی لە سێ شت دایە: لە ئەسپ و مایین و ژن و خانوو)).**

٥٧٧٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى»[2].

**٥٧٧٣- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی:کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((تەنینە و سیرایەتی نەخۆشی نییە)).**

٥٧٧٤- قَالَ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُورِدُوا الْمُمْرِضَ عَلَى الْمُصِحِّ»[3].

**٥٧٧٤-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (( (وشتری) نەخۆش مەبەنە ناو (وشتری) ساغەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٩٩.

(٢) بڕوانە: ٥٧٠٧.

(٣) بڕوانە: ٥٧٧١.

٥٧٧٥- وَعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سِنَانُ بْنُ أَبِي سِنَانٍ الدُّؤَلِيُّ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى». فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ الإِبِلَ تَكُونُ فِي الرِّمَالِ أَمْثَالَ الظِّبَاءِ فَيَأْتِيهِ الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَتَجْرَبُ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ؟»[1].

**٥٧٧٥-ئەبو هورەيرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((سيرايەتى نەخۆشى نييە))، جا عەرەبييەكى دەشتەكى هەستا و وتى: پێم بڵێ: وشترەكان لە ناوماندا وەك ئاسك وان، ئينجا وشترێكى گەڕۆڵ دێت (تێكەڵاويان دەبێ) ئەوانيش گەڕۆڵ دەبن؟ پێغەمبەريش ﷺ ((ئەى كێ گەڕۆڵى بە وشترى يەكەم گەياند؟)).**

٥٧٧٦- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ». قَالُوا: وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: «كَلِمَةٌ طَيِّبَةٌ»[2].

**٥٧٧٦-ئەنەسى كوڕى ماليك ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموويەتى: ((تەنينەوەى نەخۆشى نييە، ڕەشبينى باڵندە نييە، حەزم بە گەشبينييە))، عەرزيان كرد: گەشبينى چييە؟ فەرمووى: ((وتەيەكى جوان و چاكە)).**

## ٥٥- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي سَمِّ النَّبِيِّ ﷺ

رواه عروة عن عائشة ﷺ عن النبي ﷺ.

٥٧٧٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَاةٌ فِيهَا سَمٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْمَعُوا لِي مَنْ

---

(١) بڕوانە: ٥٧٠٧.

(٢) بڕوانە: ٥٧٥٦.

كَانَ هَا هُنَا مِنَ الْيَهُودِ». فَجُمِعُوا لَهُ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ؟». فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَبُوكُمْ؟». قَالُوا: أَبُونَا فُلَانٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَبْتُمْ بَلْ أَبُوكُمْ فُلَانٌ». فَقَالُوا: صَدَقْتَ وَبَرِرْتَ. فَقَالَ: «هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟». فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، وَإِنْ كَذَبْنَاكَ عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَهُ فِي أَبِينَا. قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَهْلُ النَّارِ؟». فَقَالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيرًا، ثُمَّ تَخْلُفُونَنَا فِيهَا. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اخْسَئُوا فِيهَا، وَاللَّهِ لاَ نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَدًا». ثُمَّ قَالَ لَهُمْ «فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟». قَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ: «هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا». فَقَالُوا نَعَمْ. فَقَالَ: «مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ». فَقَالُوا: أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَذَّابًا نَسْتَرِيحُ مِنْكَ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ[1].

## ٥٥- باسی ئەوەی باس دەکرێ لە ژەهر خواردکردنی پێغەمبەر ﷺ

**-ئەم فەرموودەیە عوروە گێڕاویەتیەوە لە عائیشەوە ﵂ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

**٥٧٧٧- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: کاتێ خەیبەر ئازاد کرا مەڕێك (ی برژاو) بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ژەهری پێوە بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرچی جوو ئا لێرەدایە بۆم کۆبکەنەوە))، ئەوانیش بۆیان کۆکردەوە و فەرمووی پێیان: ((من پرسیاری شتێکتان لێ دەکەم ئایا ئێوە ڕاستگۆدەبن لەگەڵم لە بارەیەوە؟)) وتیان: بەڵێ ئەی ئەبو لقاسیم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: ((باوکتان کێیە؟)) وتیان: باوکمان فلانە کەسە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((درۆتان کرد بەڵکو باوکتان فلانە کەسە))، وتیان: تۆ ڕاست دەکەیت و چاکت وت، پێغەمبەری خواش ﷺ**

(١) بڕوانە: ٣١٦٩.

فەرمووی: ((دەی ئایا ئێوە ڕاستیم پێ دەڵێن دەربارەی شتێك ئەگەر پرسیارتان لێ بکەم؟)) وتیان: بەڵێ ئەی ئەبو لقاسیم، خۆ ئەگەر درۆ بکەین بەدرۆکەمان دەزانیت وەك چۆن دەربارەی باوکمان زانیت درۆ دەکەین، ئەنجا پێیانی فەرموو: ((کێ دۆزەخییە؟)) وتیان: ئێمە ماوەیەکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە پاشان ئێوە لە شوێنی ئێمەدا دەمێننەوە لە دۆزەخدا (و ئێمە دێینە دەرەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جخەتان لێ بێ لە دۆزەخدا، سوێند بەخوا ئێمە هەرگیز لە شوێنی ئێوە لە دۆزەخدا نامێنینەوە))، پاشان فەرمووی پێیان: ((ئایا ڕاستیم پێ دەڵێن دەربارەی شتێك ئەگەر پرسیارتان لێ بکەم لە بارەیەوە؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئایا ژەهرتان کردوە بەم مەڕەوە؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((چی وای لێکردن ئەوکارە بکەن؟))، وتیان: بەوکارە ویستمان ئەگەر درۆزن بیت (بمریت) و ڕزگارمان بێت لێت، خۆ ئەگەر پێغەمبەر بیت زیانت پێ ناگەیەنێت.

## ٥٦- بابُ شُرْبِ السُّمِّ، وَالدَّوَاءِ بِهِ، وَبِمَا يُخَافُ مِنْهُ وَالخبث

٥٧٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ ذَكْوَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهْوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَحَسَّى سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسَمُّهُ فِي يَدِهِ، يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ، يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا»[1].

(١) بڕوانە: ١٣٦٥.

## ٥٦- باسی خواردنەوەی ژەهر و دەرمانکردن پێی، وە ترسان لە دەرمان کردن بە ژەهر و دەرمانی پیس (بەکارهێنان)

**٥٧٧٨-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((هەر کەس لە شاخێك خۆی بخاتە خوارەوە و خۆی بکوژێت، ئەوە لە ناو دۆزەخدا بەردەوام دەخرێتە خوارەوە بۆ هەتا هەتایی تێیدا دەمێنێتەوە، وە هەر کەس ژەهر بخواتەوە وخۆی پێ بکوژێت، ئەوە ژەهرەکەی لە دەستی دایە قوم لە دوای قوم دەیخواتەوە و بەهەتا هەتایی لە ناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە، وە هەر کەس خۆی بە پارچە ئاسنێك بکوژێت ئەو پارچە ئاسنەکە کە لە دەستی دایە ورگی خۆی پێ ڕادەدات، لە ناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە بەهەتا هەتای)).**

٥٧٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ بَشِيرٍ أَبُو بَكْرٍ، أَخْبَرَنَا هَاشِمُ بْنُ هَاشِمٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اصْطَبَحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةٍ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلاَ سِحْرٌ»[١].

**٥٧٧٩- عامیر کوڕی سەعد دەڵێ: لە باوکم ﷺ بیست دەیوت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر کەسێ هەموو ڕۆژێك بەیانیان (بەسکی خاڵی) حەوت دەنك خورمای عەجوە بخوات، لەو ڕۆژەدا نەژەهر نەجادوو و سیحر زیانی پێ ناگەیەنێت)).**

## ٥٧- بابُ أَلْبَانِ الأُتُنِ

٥٧٨٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيِّ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَلَمْ أَسْمَعْهُ حَتَّى أَتَيْتُ الشَّأْمَ[١].

---

(١) بڕوانە: ٥٤٤٥.

## ٥٧- باسی شیری ماكەر [٢]

**٥٧٨٠- ئەبو سەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خواردنی هەموو دڕندەیەكی كەڵبەداری قەدەغە كردوە. زوهری دەڵێ ئەم فەرموودەیەم نەبیستبوو هەتا ڕۆشتمە شام (لەوێ بیستم).**

٥٧٨١- وَزَادَ اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: وَسَأَلْتُهُ: هَلْ نَتَوَضَّأُ أَوْ نَشْرَبُ أَلْبَانَ الأُتُنِ أَوْ مَرَارَةَ السَّبُعِ أَوْ أَبْوَالَ الإِبِلِ؟ قَالَ: قَدْ كَانَ الْمُسْلِمُونَ يَتَدَاوَوْنَ بِهَا، فَلاَ يَرَوْنَ بِذَلِكَ بَأْسًا، فَأَمَّا أَلْبَانُ الأُتُنِ فَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُحُومِهَا، وَلَمْ يَبْلُغْنَا عَنْ أَلْبَانِهَا أَمْرٌ وَلاَ نَهْيٌ، وَأَمَّا مَرَارَةُ السَّبُعِ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيُّ، أَنَّ أَبَا ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيَّ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ[٣].

**٥٧٨١-لەیس (لە گێڕانەوەی فەرموودەكەی پێشوودا) ئەمەی زیاد كردوە: یونس بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو شیهابەوە وتی: پرسیارم لە (ئەبی ئیدریسی خەولانی) كرد: ئایا بەشیری ماكەر دەست نوێژ بگرین یان بیخۆینەوە، یان بە ئاوی زراوی دڕندە یان میزی وشتر؟ (ئەبو ئیدریس) وتی: بێگومان جاران مسوڵمانان (میزی وشتریان) بۆ چارەسەر بەكار دەهێنا، هیچ خراپەیەكیان لەو كارەدا نەدەبینی[٤]، بەڵام شیری ماكەر ئەوە بێگومان پێمان گەشتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی كەری قەدەغە كردوە، بەڵام دەربارەی شیری ماكەر نەفەرمان كردن و نە قەدەغەكردنمان پێنەگەشتووە. بەڵام بەئاوی زراو دڕندە، ئیبنو شیهاب دەڵێ:**

---

(١) بڕوانە: ٥٥٣٠.

(٢) أَلبانُ الأُتُن: هەردوو وشەكە كۆن بەڵام لە بەكوردی كردنیاندا جوان نابێت وەک خۆی وەری گێردرێ بۆ كوردی.

(٣) بڕوانە: ٥٥٣٠.

(٤) حەرام نەبوو بەلایانەوە.

ئەبو ئیدریسی خەولانی بۆی گێڕامەوە، کە ئەبو سەعلەبەی خوشەنی بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی هەموو دڕندەیەکی کەڵبەداری قەدەغە کردوە.

## ٥٨- بابٌ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي الإِنَاءِ

٥٧٨٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عُتْبَةَ بْنِ مُسْلِمٍ -مَوْلَى بَنِي تَيْمٍ- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ -مَوْلَى بَنِي زُرَيْقٍ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً وَفِي الآخَرِ دَاءً»[١].

## ٥٨- باسێک:ئەگەر مێش کەوتە دەفرێکەوە (شلەی تیا بێ)

٥٧٨٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر مێش کەوتە دەفری یەکێکتانەوە مێشەکە هەموی نوقم بکاتە (ناو شلەی دەفرەکە)، لە پاشان فڕێی بدات، چونکە بێگومان لە باڵێکیدا شیفا هەیە و لە باڵەکەی تریدا نەخۆشی هەیە)).

(١) بڕوانە: ٣٣٢٠.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٧٧- كِتَابُ اللِّبَاسِ

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٧- پەڕاوی جل و بەرگ و پۆشاك

### ١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ ﴿٣٢﴾﴾ الأعراف

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "كُلُوا وَاشْرَبُوا وَالْبَسُوا وَتَصَدَّقُوا فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ وَلَا مَخِيلَةٍ". وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ: كُلْ مَا شِئْتَ وَالْبَسْ مَا شِئْتَ، مَا أَخْطَأَتْكَ اثْنَتَانِ سَرَفٌ أَوْ مَخِيلَةٌ.

٥٧٨٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ وَزَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ يُخْبِرُونَهُ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ»[١].

## ١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (( ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ کێ ئارایش و جوانییە خواییەکانی حەرام کردوە کە خوا بۆ بەندەکانی دروست کردوە))

- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بخۆن و بخۆنەوە و بپۆشن و ببەخشن بەبێ زیادەڕەوی و خۆ بەزل زانین)).

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: چیت حەز لێیە بیخۆ و بیپۆشە، دوو شتی تیا نەبێت زیادەڕۆیی و فیز وخۆ بەزل زانین.

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٥.

**٥٧٨٣-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا سەیری کەسێك ناکات پۆشاکەکەی بخشێنێ بەزەویدا بۆ خۆ بەزل زانین بێت)).**

## ٢- بابُ مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ مِنْ غَيْرِ خُيَلَاءَ

٥٧٨٤- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ إِزَارِي يَسْتَرْخِي، إِلاَّ أَنْ أَتَعَاهَدَ ذَلِكَ مِنْهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُهُ خُيَلاَءَ»[1].

## ٢- باسی ئەو کەسەی پۆشاکەکەی بخشێنێ بەزەویدا بۆ خۆ بەزل زانین نەبێت

**٥٧٨٤- سالیمی کوڕی عەبدوڵلا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((هەرکەس بۆ فیز و خۆ بەگەورە زانین جل و بەرگەکەی بخشێنێ بەزەویدا و بەدوای خۆیدا ڕایکێشێت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا (بەچاوی بەزەیی) سەیری ناکات))، ئەبو بەکریش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لایەکی کراسەکەم بە زەویدا دەخشێت، بەڵام ئەوەندە هەیە من ئەوەم هەر بووە لە کراسەکەمدا. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((تۆ لەو کەسانە نیت بۆ فیز و دەعیە ئەوە بکەیت)).**

٥٧٨٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ وَنَحْنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ يَجُرُّ ثَوْبَهُ مُسْتَعْجِلاً حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ،

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٥.

وَثَابَ النَّاسُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَجُلِّيَ عَنْهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا وَقَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئًا فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّهَ حَتَّى يَكْشِفَهَا»(١).

**٥٧٨٥- ئەبو بەكر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین خۆر گیرا، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) هەستا و بەپەلە ڕۆشت عەباكەی بەدوای خۆیدا ڕادەكێشا هەتا چووە مزگەوت خەڵكەكە گەڕانەوە (بۆ مزگەوت)(٢)، جا دوو ڕكات نوێژی كرد (بە پێشنوێژ بۆمان)، ئینجا خۆر گیرانەكە بەردرا، لە پاشان ڕووی تێكردین و فەرمووی: ((بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوا، جا ئەگەر شتێك (ی نائاسایی) تان لەوان بینی، ئەوە نوێژ بكەن و لە خوا بپاڕێنەوە تا بەریدات و دەربكەوێت)) (٣).**

## ٣- بَابُ التَّشْمِيرِ فِي الثِّيَابِ

**٥٧٨٦-** حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شُمَيْلٍ، أَخْبَرَنَا عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، أَخْبَرَنَا عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: فَرَأَيْتُ بِلاَلاً جَاءَ بِعَنَزَةٍ فَرَكَزَهَا، ثُمَّ أَقَامَ الصَّلاَةَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ فِي حُلَّةٍ مُشَمِّرًا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ إِلَى العَنَزَةِ، وَرَأَيْتُ النَّاسَ وَالدَّوَابَّ يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ وَرَاءِ العَنَزَةِ(٤).

## ٣- باسی خۆ هەڵكردن دەربارەی پۆشاك (٥)

**٥٧٨٦- ئەبو جوحەیفە دەڵێ: بیلالم بینی ﷺ دار دەستێكی هێنا و دایچەقاند، پاشان قامەتی نوێژی كرد، ئینجا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی (لە خێوەتەكەی)**

---

(١) بڕوانە: ١٠٤٠.

(٢) دوای ئەوەی لە مزگەوت دەرچوو بووین.

(٣) واتە:ئەو نوێژو دوعا بكەن تا خۆر یان مانگ گیرانەكە بەر ببێت.

(٤) بڕوانە: ١٨٧.

(٥) واتە:كەسێک جل و بەرگێ كە لەبەری دایە بەشی خوارەوەی هەڵكات بۆ مەبەستی گرج و گۆڵی.

هاتە دەرەوە و پۆشاكێکی لە بەردابوو خۆی هەڵکردبوو، ئینجا دوو ڕکات نوێژی ڕوو بەدار دەستەکە کرد، وە خەڵك و ئاژەڵم دەبینی بەبەردەمیدا دەڕۆشتن لە پشت دار دەستەکەوە.

## ٤- بابٌ: مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ فَهْوَ فِي النَّارِ

٥٧٨٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفِي النَّارِ».

## ٤- باسێک: ئەوەی لە خوار قاپارەکانەوە بێت (لە پۆشاک) ئەوە لە ئاگر دایە

٥٧٨٧-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ئەوەی لە خوار هەردوو قاپارەوەیە لە پۆشاك ئەوە لە ئاگر دایە)).

## ٥- بابُ مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلاَءِ

٥٧٨٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا».

## ٥- باسی ئەو کەسەی پۆشاکەکەی بەزەویدا دەخشێنێ لەبەر خۆ بەزل زانین

٥٧٨٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا لە ڕۆژی دوایدا سەیری ئەو کەسە ناکات بۆ فیز و دەعیە پۆشاکەکەی دەخشێنێ بەدوای خۆیدا)).

٥٧٨٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ -أَوْ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِﷺ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ، تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ، إِذْ خَسَفَ اللَّهُ بِهِ، فَهْوَ يَتَجَلَّلُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

**٥٧٨٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر -یان ئەبولقاسم- ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا پیاوێك بەڕێگا دەڕۆشت پۆشاکێکی جوانی لەبەر دابوو بەخۆی سەرسام بوو، قژ (پەرچەمی) داهێنابوو لە پڕ بەزەویدا چووە خوار، گلۆر دەبێتەوە تا ڕۆژی قیامەت)).**

٥٧٩٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ، خُسِفَ بِهِ، فَهْوَ يَتَجَلَّلُ فِي الأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ». تَابَعَهُ يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَلَمْ يَرْفَعْهُ شُعَيْبٌ، عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ[2].

٥٧٩٠ /م- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، أَخْبَرَنَا أَبِي، عَنْ عَمِّهِ جَرِيرِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ عَلَى بَابِ دَارِهِ فَقَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ نَحْوَهُ[3].

**٥٧٩٠- سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە کە باوکی ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا پیاوێك پۆشاکەکەی بە زەویدا دەخشاند[4]، بەناخی زەویدا برایە خوارێ، جا ئەو لە ناخی زەویدا گلۆر دەبێتەوە تا ڕۆژی قیامەت)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٧٩٠.

(٢) بڕوانە: ٣٤٨٥.

(٣) بڕوانە: ٥٧٨٩.

(٤) لەبەر شۆڕی بۆ فیز و دەعیە.

**-یونس لە زوهریەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی خالید دەکات.**

**-شوعەیب لە زوهریەوە (ئەم فەرموودە گێڕاوەتەوە) لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بەرزی نەکردۆتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، (بەڵکو بەوتەی ئەبو هوڕەیرە ﷺ هێناویێتی).**

**٥٧٩٠- جەریری کوڕی زەید وتی: من لەگەڵ سالیمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر بووم ﷺ لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا، سالیم وتی: لە ئەبو هوڕەیرەم ﷺ بیست ئەبو هوڕەیرەش لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە: وێنە فەرموودەکەی پێشوی گێڕایەوە.**

٥٧٩١- حَدَّثَنَا مَطَرُ بْنُ الْفَضْلِ، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: لَقِيتُ مُحَارِبَ بْنَ دِثَارٍ عَلَى فَرَسٍ وَهْوَ يَأْتِي مَكَانَهُ الَّذِي يَقْضِى فِيهِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَحَدَّثَنِي فَقَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مَخِيلَةً لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». فَقُلْتُ لِمُحَارِبٍ: أَذَكَرَ إِزَارَهُ؟ قَالَ: مَا خَصَّ إِزَارًا وَلاَ قَمِيصًا.

تَابَعَهُ جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ، وَزَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، وَزَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابن عُمَرَ مِثْلَهُ. وَتَابَعَهُ مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ،وَعُمَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَقُدَامَةُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ»[١].

**٥٧٩١-شوعبە دەڵێ: بە موحاریبی کوڕی دیسار گەشتم، بەسوار ئەسپێکەوە بوو دەڕۆشت بۆ ئەو جێگای حوکم و قەزاوەتی تیا دەکرد [٢]، پرسیاری ئەم فەرموودەیەم لێ کرد، ئەویش بۆی گێڕامەوە و، وتی: لە عەبدوڵلای کوڕی**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٦٥.

(٢) موحاریب قازی کوفە بوو لەو کاتەدا.

عومەرم ﷺ بیست دەیوت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەسێ پۆشاكەكەی بخشێ بە زەویدا بۆ فیز و خۆ بەزل زانین خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری ناكات))، (شوعبە دەڵێ:) بە موحاریبم وت: ئەی باسی ئیزاری كرد؟ وتی: تایبەتی نەكرد نەبە ئیزارەوە و نەبە كراسەوە.

-پاڵپشتی گێڕانەوەكەی موحاریبی كوڕی دیساریان كردوە لە وتنی (إزار)دا هەریەك لە جەبەلەی كوڕی سوحەیم و زەیدی كوڕی ئەسلەم و زەیدی كوڕی عەبدوڵلا لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

-لەیس لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەكەی پێشوویان گێڕاوەتەوە.

-وە پاڵپشتی گێڕانەوەكەی نافیعی كردوە، هەریەك لە مووسای كوڕی عوقبە و عومەری كوڕی موحەمەد و قودامەی كوڕی مووسا هەموویان لە سالیمەوە لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، بەم شێوە: (مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ) واتە: هەر كەس پۆشاكەكەی بەدوای خۆیدا ڕاكێشێت.

## ٦- بابُ الإِزَارِ الْمُهَدَّبِ

وُيذْكَرُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، وَأَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَحَمْزَةَ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ، وَمُعَاوِيَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ أَنَّهُمْ لَبِسُوا ثِيَابًا مُهَدَّبَةً.

٥٧٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا جَالِسَةٌ وَعِنْدَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ تَحْتَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي، فَتَزَوَّجْتُ

بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا مَعَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ. وَأَخَذَتْ هُدْبَةً مِنْ جِلْبَابِهَا، فَسَمِعَ خَالِدُ بْنُ سَعِيدٍ قَوْلَهَا وَهْوَ بِالْبَابِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، قَالَتْ: فَقَالَ خَالِدٌ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلاَ تَنْهَى هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَلاَ وَاللَّهِ مَا يَزِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى التَّبَسُّمِ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ». فَصَارَ سُنَّةً بَعْدُ[1].

## ٦- باسی (حوکمی لەبەرکردنی) کەوای ڕیشوودار

**-لە زوهری و ئەبی بەکری کوڕی موحەممەد و حەمزەی کوڕی ئەبی ئوسەید و موعاویەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر گێڕدراوەتەوە لێیان، کە پۆشاکی ڕیشووداریان لەبەر کردوە.**

**٥٧٩٢-عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ژنەکەی ڕیفاعەی قورەزی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ منیش دانیشتبووم و ئەبو بەکریشی ﵁ لابوو، ژنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ژنی ڕیفاعە بووم تەڵاقی دام و بەیەکجاریش تەڵاقی دام، ئینجا لە پاش ئەو شووم کرد بەعەبدوڕەحمانی کوڕی زوبەیر، بەڕاستی زەکەری ئەو (عەبدوڕەحمان) وەك ڕیشوو وایە- ڕیشوویەکی گرت بەدەستی لە سەرپۆشەکەی- خالیدی کوڕی سەعید لە بەر دەرگابوو گوێی لە وتەکەی بوو، مۆڵەتی نەدرابوو بێتە ژوورەوە، عائیشە وتی: خالید وتی: ئەی ئەبو بەکر ئەوە ڕێگری لەو ژنە ناکەیت لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەی بەئاشکرا دەیڵێ؟ جا نەبەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە زەردەخەنە زیاتر هیچی نەفەرموو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بەژنەکە): ((وا دیارە دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕیفاعە، نابێ هەتا ئەو (عەبدوڕەحمان) شیرینی و لەزەتی تۆ نەچەژێ و تۆش شیرینی و لەزەتی ئەو نەچێژیت))، ئیتر ئەوە بوو بەباو و سوننەت دوای ئەو ڕووداوە.**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٣٩.

## ٧- بابُ الأَرْدِيَةِ

وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ: جَبَذَ أَعْرَابِيٌّ رِدَاءَ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٧٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ، أَنَّ حُسَيْنَ بْنَ عَلِيٍّ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيًّا ﷺ قَالَ: فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِرِدَائِهِ، ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي، وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، حَتَّى جَاءَ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُمْ[1].

## ٧- باسی سەر بەرگ (وەک عەبا و جبە)

**-ئەنەس دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی عەباکەی پێغەمبەری ﷺ ڕاکێشا[2].**

**-٥٧٩٣-زوهری دەڵێ: عەلی کوڕی حوسەین بۆی گێڕامەوە کە حوسەینی کوڕی عەلی بۆی گێڕاوەتەوە کە عەلی ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ داوای عاباکەی کرد (بۆیان هێنا)، پاشان بەپەلە ڕۆشت من و زەیدی کوڕی حاریسەش دوای کەوتین، هەتا چووە ئەوماڵەی کە حەمزەی تیایە، ئینجا مۆڵەتی خواست (بۆچوونە ژوورەوە)، ئەوانیش مۆڵەتیان دان.**

## ٨- بابُ لُبْسِ الْقَمِيصِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى حِكَايَةً عَنْ يُوسُفَ: ﴿ اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا ﴿٩٣﴾ ﴾ يوسف.

٥٧٩٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ الْقَمِيصَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ الْبُرْنُسَ، وَلاَ الْخُفَّيْنِ، إِلاَّ أَنْ لاَ يَجِدَ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ مَا هُوَ أَسْفَلُ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٠٨٩.

(٢) بەژمارە: ٣١٤٩ ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناوێتی.

# ٨- باسی لەبەر کردنی کراس

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند لە زمانی یوسفەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە: (ئەم کراسەی من ببەن و بیدەن بەسەر دەم و چاوی باوکمدا، (دەست بەجێ) چاوی چاك دەبێتەوە).

٥٧٩٤-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی لە ئیحرام دایە چ پۆشاکێك لەبەر بکات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی لە ئیحرام دایە کراس لەبەر نەکات و شەرواڵ لە پێ نەکات و مێزەر لەسەر نەکات و خوف لە پێ نەکات، مەگەر کەسێك نەعلی نەبێت، با خوفّ لە پێ بکات لە خواری قوله پێکانی بن)).

٥٧٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ بَعْدَ مَا أُدْخِلَ قَبْرَهُ، فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ، وَوُضِعَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَنَفَثَ عَلَيْهِ مِنْ رِيقِهِ، وَأَلْبَسَهُ قَمِيصَهُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ[٢].

٥٧٩٥-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ وتی: دوای ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی خرایە گۆڕەکەیەوە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای، وە فەرمانی کرد لە گۆڕەکەی دەرهێنرا و لەسەر ئەژنۆکانی دانرا، (پێغەمبەر ﷺ) لە تفی خۆی تفی تێکرد و پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی کردە بەری، وە خوا زاناترە (بۆچی کراسەکەی کردە بەری).

٥٧٩٦- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطِنِي

---

(١) بڕوانە: ١٣٤.

(٢) بڕوانە: ١٢٧٠.

قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ، وَصَلِّ عَلَيْهِ، وَاسْتَغْفِرْ لَهُ. فَأَعْطَاهُ قَمِيصَهُ، وَقَالَ: «إِذَا فَرَغْتَ فَآذِنَّا». فَلَمَّا فَرَغَ آذَنَهُ، فَجَاءَ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَجَذَبَهُ عُمَرُ فَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ؟ فَقَالَ: ﴿ ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٨٠﴾ ﴾ التوبة. فَنَزَلَتْ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة. فَتَرَكَ الصَّلَاةَ عَلَيْهِمْ[1].

**٥٧٩٦- نافیع دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ دەڵێ: کاتێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی مرد کوڕەکەی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی خۆتم بدەرێ با بیکەمە کفن بۆ باوکم و نوێژیشی لەسەر بکە و داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکە، پێغەمبەریش ﷺ کراسەکەی خۆی دایە و فەرمووی: ((کاتێ لێبوویتەوە (لە ئامادەکردنی) ئاگادارم بکە با نوێژی لەسەر بکەم))، جا کاتێ لێبوویەوە ئاگاداری کرد، ئینجا هات نوێژی لەسەر بکات، عومەریش ڕایکێشا ووتی: ئایا خوا ڕێگری نەکردووی لەوەی کە نوێژ بکەیت لەسەر دوو ڕووان؟ وە خوا فەرموویەتی: (داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەیت یا داوای لێ خۆش بوونیان بۆ نەکەیت، ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەیت، ئەوە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت))، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی (هەرگیز نوێژ مەکە لەسەر هیچ کام لەو دوو ڕووانە کە مرد). ئیتر نوێژکردنی لە سەریان واز لێ هێنا.**

## ٩- بابُ جَيْبِ الْقَمِيصِ مِنْ عِنْدِ الصَّدْرِ وَغَيْرِهِ

٥٧٩٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَثَلَ البَخِيلِ وَالمُتَصَدِّقِ، كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ

(١) بڕوانە: ١٢٦٩.

عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ، قَدِ اضْطُرَّتْ أَيْدِيهِمَا إِلَى ثُدِيِّهِمَا وَتَرَاقِيهِمَا، فَجَعَلَ الْمُتَصَدِّقُ كُلَّمَا تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ انْبَسَطَتْ عَنْهُ حَتَّى تَغْشَى أَنَامِلَهُ وَتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَجَعَلَ الْبَخِيلُ كُلَّمَا هَمَّ بِصَدَقَةٍ قَلَصَتْ، وَأَخَذَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ بِمَكَانِهَا. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا فِي جَيْبِهِ، فَلَوْ رَأَيْتَهُ يُوَسِّعُهَا وَلاَ تَتَوَسَّعُ.

تَابَعَهُ ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَأَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ فِي الْجُبَّتَيْنِ. وَقَالَ حَنْظَلَةُ: سَمِعْتُ طَاوُسًا، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: جُبَّتَانِ. وَقَالَ جَعْفَرٌ، عَنِ الأَعْرَجِ: جُبَّتَانِ[1].

## ٩- باسی گیرفانی کراس لای سنگ و یەخەوەیە، هەروەها پۆشاکی تر (جگە لە کراس)

**٥٧٩٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نموونەی هێنایەوە و فەرمووی: ((نموونەی ڕژدە و بەخشەر، وەك دووکەس وان هەریەکەیان زرێیەکی ئاسنینی لەبەردا بێت، هەردوو دەستیان بە ناچاری بردبێتە لای هەردوو مەمك و بەشی پێشەوەی نێوان مل و شانیانەوە، ئینجا بەخشەرەکە هەر کات ماڵێکی بەخشی زرێکە فراوان دەبێت لە بەریدا، هەتا (وای لێ دێت) پەنجەکانی پێی دادەپۆشێت و دەخشێ بەدوایدا و شوێن پێیەکانی دەسڕێتەوە، وە ڕەزیلەکەش هەر کات بەنیاز بێت ماڵێ ببەخشێت (ڕەزیلیەکەی ڕێگەی نادا)، زرێکە دێتەوە یەك و تەنك دەبێتەوە، هەموو هەڵقەیەکی زرێکە لە جێگای خۆی دەمێنێتەوە))، ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوەها پەنجەکەی دەخستە زرێکەیەوە، خۆزگە بتبینیایە دەیویست گەورەی بکات بەڵام گەورە نەدەبوو.**

**-ئیبنو تاووس لە باوکیەوە و ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی حەسەنی کوڕی موسلیم دەکەن: لەم وشەدا((فِي الجُبَّتَيْنِ)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٤٣.

-حەنزەلە دەڵێ: لە تاووسم بیست وتی: لە ئەبو هورەیرەم ﷺ بیست دەیوت: (جُبَّتَانِ) -وەجەعفەر لە ئەعرەجەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: (جُنَّتَانِ) واتە: دوو زرێیە کە مرۆڤ دەپارێزێ.

## ١٠- بابُ مَنْ لَبِسَ جُبَّةً ضَيِّقَةَ الْكُمَّيْنِ فِي السَّفَرِ

٥٧٩٨- حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الضُّحَى قَالَ: حَدَّثَنِي مَسْرُوقٌ قَالَ: حَدَّثَنِي الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَتِهِ ثُمَّ أَقْبَلَ، فَتَلَقَّيْتُهُ بِمَاءٍ، فَتَوَضَّأَ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ شَأْمِيَّةٌ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ، فَذَهَبَ يُخْرِجُ يَدَيْهِ مِنْ كُمَّيْهِ فَكَانَا ضَيِّقَيْنِ، فَأَخْرَجَ يَدَيْهِ مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَهُمَا وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَعَلَى خُفَّيْهِ[1].

## ١٠- باسی کەسێک جوبەی قۆڵ تەنگی لەبەر کردبێت لە سەفەردا

٥٧٩٨-موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت دەست بە ئاو بگەیەنێت، پاشان هاتەوە منیش چوومە خزمەتی بەهەندێ ئاوەوە، ئینجا دەستنوێژی گرت، وە جبەیەکی شامی لەبەردا بوو، جا ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا و دەم و چاوی شۆری، ئینجا ویستی دەستەکانی لە قۆڵەکانیەوە دەربێنێ، بەلام قۆڵەکانی تەسك بوون، بۆیە لە ژێری جبەکەیەوە دەستەکانی دەرهێنا و شۆردنی و دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا و بەسەر هەردوو خوفەکەیدا.

(١) بروانە: ١٨٢.

## ١١- بابُ جُبَّةِ الصُّوفِ فِي الغَزْوِ

٥٧٩٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ فَقَالَ: «أَمَعَكَ مَاءٌ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الإِدَاوَةَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ: «دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ" فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا[1].

## ١١- باسى (لەبەر كردنى) جوبەى خورى لە غەزادا

**٥٧٩٩عورو‌ەى كوڕى موغيرە لە باوكيەوە ﷺ گێڕاويەتيەوە وتى: من شەوێ لە سەفەرێكدا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم، فەرمووى: ((ئاوت پێيە؟)) وتم: بەڵێ، ئينجا لە وشترەكەى دابەزى ڕۆشت تا بەتاريكى شەودا لە من وون بوو، لە پاشان هاتەوە منيش لە مەسينەيەك ئاوم كرد بە دەستيدا، جا دەم و چاو و دەستەكانى شت، جوبەيەكى خورى لەبەردا بوو، نەيتوانى باڵەكانى دەربێنێ، تا دەستەكانى لە ژێرى جبەكەوە دەرهێنا و هەردوو باسكى شۆرد، پاشان دەستى تەڕى هێنا بەسەريدا، لە پاشان دانەويمەوە تا خوفەكانى داكەنم، فەرمووى: ((وازيان لێ بێنە چونكە بە پاكى پێيەكانم كردۆتە ناو خوفەكانەوە))، ئينجا دەستى تەڕى هێنا بەسەر خوفەكاندا.**

(١) بڕوانە: ١٨٢.

## ١٢- بابُ القَبَاءِ وَفَرُّوجِ حَرِيرٍوَهُوَ القَبَاءُ، وُيقَالُ: هُوَ الذي لَهُ شَقٌّ مِنْ خَلْفِهِ

٥٨٠٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَقْبِيَةً، وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَقَالَ ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي. قَالَ: فَدَعَوْتُهُ لَهُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا فَقَالَ: «خَبَأْتُ هَذَا لَكَ». قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: رَضِيَ مَخْرَمَةُ[1].

## ١٢- باسی کەوا و کەوای چاکداری ئاوریشم ئەوەیش هەر کەوایە،وە وترا ئەوەیە کە لە پشتەوە درزی تیایە

**٥٨٠٠- ئیبنو ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەوایەکی دابەش کرد، وە (لەو کەوایانە) هیچی نەدا بە مەخرەمە، مەخرەمەش وتی: کوڕم با بڕۆین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لەگەڵی ڕۆشتم، جا وتی: بڕۆ ژوورەوە و بانگی کە بۆم، پێغەمبەریش ﷺ هاتە دەرەوە و کەوایەکیانی لەبەردا بوو فەرمووی: ((ئەمەم بۆ هەڵگرتووی))، میسوەر دەڵێ: مەخرەمە سەیری کەواکەی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەخرەمە ڕازی بوو)).**

٥٨٠١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ، ثُمَّ صَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا -كَالْكَارِهِ لَهُ- ثُمَّ قَالَ: «لاَ يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ». تَابَعَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، عَنِ اللَّيْثِ، وَقَالَ غَيْرُهُ: فَرُّوجٌ حَرِيرٌ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٩.

(٢) بڕوانە: ٣٧٥.

**٥٨٠١-عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کەوایەکی چاکداری ئاوریشمیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لەبەری کرد پاشان نوێژی پێوەکرد، پاشان کە لە نوێژەکەی بوویەوە بەتوندی دایکەند لەبەری - وەك ئەوەی حەزی لێ نەبێ - پاشان فەرمووی: ((ئەمە بۆ پارێزکاران شیاو نییە)).**

**-عەبدوڵڵای کوڕی یوسف لە لەیسەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی قوتەیبەی کوڕی سەعیدی کردوە.**

**-گێڕەرەوەکانی تر جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی یوسف بەم شێوە گێڕاویانەتەوە:** (فَرُّوجٌ حَرِيرٌ).

## ١٣- بابُ البَرَانِسِ

٥٨٠٢ - وَقَالَ لِي مُسَدَّدٌ: حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى أَنَسٍ بُرْنُسًا أَصْفَرَ مِنْ خَزٍّ.

## ١٣- باسی کڵاوی قوچ یان بەرگێک کڵاوی پێوە بێت

**٥٨٠٢- (ئیمامی بوخاری دەڵێ) موسەدەد وتی پێم: موعتەمیر بۆی گێڕاینەوە وتی: لە باوکم بیست وتی: ئەنەسم ﷺ دی جلێکی کڵاوداری خوری تێکەڵ بە ئاوریشمی لەبەردا بوو.**

٥٨٠٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ البَرَانِسَ، وَلاَ الخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ الوَرْسُ»[1].

---

(١) بڕوانە: ١٣٤.

**٥٨٠٣- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کەپیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك لە ئیحرامدا بێت چ پۆشاکێك لەبەر بکات؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ کراس و میزەرە و شەرواڵ و کڵاو و خوف لەبەر بکات و بیپۆشێ، مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی نەبێت، با جووتێ خوف لە پێ بکات لە خواروی قاپارەکانیەوە خووفەکان ببڕێت (و لە پێیان بکات)، وە هیچ پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە بۆنی زەعفەران و وەرسی لێ درابێ)).**

## ١٤- بَابُ السَّرَاوِيلِ

٥٨٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ»[1].

## ١٤- باسی شەرواڵ

**٥٨٠٤-ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: ((هەر کەس ئیزاری [2] نەبوو با شەرواڵ لە پێ کات، هەر کەسیش جوتێ نەعلی نەبوو، با جوتێ خوف لەپێ کات)).**

٥٨٠٥- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا تَأْمُرُنَا أَنْ نَلْبَسَ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ قَالَ: «لاَ تَلْبَسُوا القَمِيصَ، وَالسَّرَاوِيلَ، وَالْعَمَائِمَ وَالْبَرَانِسَ، وَالْخِفَافَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ لَيْسَ لَهُ نَعْلاَنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا شَيْئًا مِنَ الثِّيَابِ مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ وَرْسٌ»[3].

---

(١) بڕوانە: ١٧٤٠.

(٢) ئیزار: بە پۆشاکێک دەوترێت لە ناوکەوە بۆ خوارەوەیە .

(٣) بڕوانە: ١٣٤.

٥٨٠٥- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ دەڵێ: پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کاتێ ئیحرامیمان دابەست فەرمانی چ پۆشاکێکمان پێ دەکەیت لە بەری بکەین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نابێ کراس و میزەرە و شەرواڵ کڵاو و خوف لەبەر بکەن و بپۆشن، مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی نەبێت، ئەوە با جووتێ خوف لە پێ بکات لە خوارووی قاپارەکانیەوە بێت، وە هیچ پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە بۆنی زەعفەران و وەرسی لێ درابێ)).

## ١٥- بابُ العَمَائم

٦٠٨٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَلْبَسُ المُحْرِمُ الْقَمِيصَ، وَلاَ العِمَامَةَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ الْبُرْنُسَ، وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ وَرْسٌ، وَلاَ الْخُفَّيْنِ، إِلاَّ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْهُمَا فَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[١].

## ١٥- باسی مێزەر و سەرپێچ

٦٠٨٠- سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئیحرامدار نابێ کراس و مێزەرە وکڵاو و پۆشاکێ زەعفەران و کراسێك لەبەر بکات زەعفەران و وەرسی لێ درابێ، وە نابێ خوفف لە پێ بکات مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی نەبێت، کەسێك جووتێ نەعلی نەبوو ئەوە با جووتە خوفەکەی لە خوارووی قاپارەکانیەوە بیان بڕێت (تا وەك نەعلی لێ بێت) )).

---

(١) بروانە: ١٣٤.

## ١٦- بابُ التَّقنُّعِ

قَالَ ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ دَسْمَاءُ[١]. وَقَالَ أَنَسٌ رضي الله عنه: عَصَبَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَأْسِهِ حَاشِيَةَ بُرْدٍ[٢].

٥٨٠٧- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: هَاجَرَ إِلَى الْحَبَشَةِ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَتَجَهَّزَ أَبُو بَكْرٍ مُهَاجِرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى رِسْلِكَ، فَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُؤْذَنَ لِي». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَوَ تَرْجُوهُ بِأَبِي أَنْتَ. قَالَ: «نَعَمْ». فَحَبَسَ أَبُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ لِصُحْبَتِهِ، وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كَانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ. قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَيْنَا نَحْنُ يَوْمًا جُلُوسٌ فِي بَيْتِنَا فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَقَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُقْبِلاً مُتَقَنِّعًا، فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِدًا لَهُ بِأَبِي وَأُمِّي، وَاللَّهِ إِنْ جَاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ لأَمْرٍ. فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنَ لَهُ فَدَخَلَ، فَقَالَ حِينَ دَخَلَ لأَبِي بَكْرٍ: «أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ». قَالَ: إِنَّمَا هُمْ أَهْلُكَ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَإِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ». قَالَ: فَالصُّحْبَةُ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟. قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: فَخُذْ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِحْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بِالثَّمَنِ». قَالَتْ: فَجَهَّزْنَاهُمَا أَحَثَّ الجِهَازِ، وَضَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ، فَقَطَعَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ قِطْعَةً مِنْ نِطَاقِهَا، فَأَوْكَتْ بِهِ الْجِرَابَ، -وَلِذَلِكَ كَانَتْ تُسَمَّى ذَاتَ النِّطَاقِ- ثُمَّ لَحِقَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ بِغَارٍ فِي جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ ثَوْرٌ، فَمَكُثَ فِيهِ ثَلاَثَ لَيَالٍ يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، وَهْوَ غُلاَمٌ شَابٌّ لَقِنٌ ثَقِفٌ، فَيَرْحَلُ مِنْ عِنْدِهِمَا سَحَرًا، فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبَائِتٍ، فَلاَ يَسْمَعُ أَمْرًا يُكَادَانِ بِهِ إِلاَّ وَعَاهُ، حَتَّى يَأْتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذَلِكَ حِينَ يَخْتَلِطُ الظَّلاَمُ، وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ، فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ تَذْهَبُ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ، فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلِهَا حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ، يَفْعَلُ ذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍمِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثَّلاَثِ[٣].

---

(١) بروانه: ٣٨٠٠.

(٢) بروانه: ٣٧٩٩.

(٣) بروانه: ٤٧٦ ٢٧٣.

## ١٦- باسی داپۆشینی سەر و بەشێک لەدەم و چاو بە جلەکانی

ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو (چووە سەر دوانگەکە)، مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو.

-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەچمکی جلەکانی سەری پێچابوو.

٥٨٠٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك لە مسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، ئەبو بەکریش ﷺ خۆی ئامادەکرد بۆ کۆچ کردن، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پەلە مەکە چونکە بەدڵنیایەوە من چاوەڕوانم مۆڵەت بدرێم (کۆچ بکەم) ))، بۆیە ئەبو بەکر خۆی هێشتەوە بە دیاری پێغەمبەرەوە ﷺ تا هاوسەفەری بێت، وە دوو وشتری کە هەیبوون دایبەستبوون و چوار مانگ گەڵای دار سەمورەی پێدابوون، (ڕۆژێکیان) لە گەرمای نیوەڕۆدا کەسێك بە ئەبو بەکری وت: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بەرەو ئێرە دێ سەر و دەم و چاوی داپۆشیوە، لە کاتێکدا بوو هات پێشتر لەو کاتەدا نەدەهات بۆ ماڵمان، ئەبو بەکر وتی: بە دایك و باوکمەوە بەقوربانی بم، سوێند بەخوا لەم کاتەدا نەهاتووە بۆکارێکی گرنگ نەبێ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست مۆڵەتیدا و هاتە ژوورەوە، جا کاتێ هاتە ژوورەوە بەئەبو بەکری فەرموو: ((هەر کەست لایە بیکەرە دەرەوە))، ئەبو بەکر وتی: بێگومان هەموویان خێزان وکەسی خۆتن باوکم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((جا بەڕاستی من ڕێگەی دەرچوون و کۆچم پێدراوە))، (ئەبو بەکر) وتی: هاوڕێت دەوێ خۆم و باوکم بەقوربانت بین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی ((بەڵێ)) وتی: دەی باوکم بەقوربانت بێ یەکێ لەم دوو وشترە بگرە[1]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی ((بەنرخەکەی))، عائیشە ﷺ دەڵێ: ئێمە

---

(١) سواری بە لە سەفەری کۆچدا.

پێویستی سەفەرمان بەپەلە بۆ ئامادەکردن، خواردنی سەفەرمان بۆ خستنە توورەکەیەکەوە، ئەسمای کچی ئەبو بەکر بەشێك لە پشتوێنەکەی لێ کردەوە و دەمی تورەکەکەی پێبەست، لەبەر ئەوەیە پێی دەڵێن خاوەنی دوو پشتوێن، پاشان پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ گەشتنە ئەشکەوتێ لە شاخێکدا پێی دەوترێ سەور، ئینجا سێ شەو (پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر) تێیدا مانەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر شەو لایان دەمایەوە -کە گەنجێکی زیرەکی وریا بوو- پێش نوێژی بەیانی دەردەچووە لایان، لە نوێژی بەیانیدا لەگەڵ قوڕەیش لە مەککە ڕۆژی دەکردەوە وەك کەسێك شەو لە مەککە بووبێت، ئینجا هەر کار و پلانێکی ببیستایە دژ بە پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر بکرایە وەریدەگرت، هەتا کاتێ شەو دادەهات دەڕۆشت بۆ لایان و ئەو هەواڵەی پێدەدان، عامیری کوڕی فوهەیرەش کە ئازادکراوی ئەبو بەکر بوو مەڕێکی شیرداری لە ڕانە مەڕەکە دادەنا بۆیان (هەموو شەوێ لەو شەوانەی کە مابوونەوە)، کە سەعاتێ لە شەو تێدەپەڕی مەڕەکەی بۆ دەبردن و دەیان دۆشی (و شیرەکەیان دەخواردەوە)، جا هەردووکیان شەویان ڕائەبوارد بەشیری تازە و بەردی گەرم تێنراوی چاککراو، تا کاتێ کۆتای شەو عامیر ﷺ دەنگی لە مەڕەکانی دەکردوو دەیبردنەوە لەوەڕ، هەموو شەوێ لەو سێ شەوە عامیر ئەو کارەی دەکرد.

## ١٧- بابُ المِغْفَرِ

٥٨٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ[1].

---

(١) بروانە: ١٨٤٦.

## ١٧- باسی کڵاو و زرێی ئاسن[١]

**٥٨٠٨- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی ئازادکردنی شاری مەککەدا چووە مەککە و کڵاو زرێیەکی لە سەردا بوو.**

## ١٨- بابُ الْبُرُودِ وَالْحِبَرَةِ وَالشَّمْلَةِ

وَقَالَ خَبَّابٌ: شَكَوْنَا إِلَى رسول الله ﷺ وَهْوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ[٢].

٥٨٠٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَدِيدَةً، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عَاتِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدْ أَثَّرَتْ بِهَا حَاشِيَةُ البُرْدِ مِنْ شِدَّةِ جَبْذَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الذِي عِنْدَكَ. فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ ضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ[٣].

## ١٨- باسی عابا و پۆشاکی حیبەرە[٤] و شاڵ[٥]

**-خەبباب دەڵێ: سکاڵامان لای پێغەمبەری خوا ﷺ کردلەکاتێکدا لەسەر عەباکەی شانی دادابوو.**

**٥٨٠٩- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆشتم بەڕێدا، شاڵێکی نەجرانی قەراغ ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، جا عەرەبیەکی دەشتەکی پێی گەیشت یەخەی پۆشاکەکەی گرت و بەتوندی ڕایکێشا، کە سەیری**

---

(١) کڵاوێکە لە ئاسن یان شتی تر دروست دەکرێ، دەکرێتە سەر لەکاتی جەنگدا بۆ پارستنی سەر. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٢٩/١٢.

(٢) بڕوانە: ٣٦١٢.

(٣) بڕوانە: ٣١٤٩.

(٤) پۆشاکێکی ڕەنگ سەوزی لۆکەیە لە یەمەن دروست کراوە، قەراغەکەی ڕەنگێکی ترە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٣٠/١٢.

(٥) الشَّمْلَةِ: بەرگێکی فراوانە لە خۆوە دەپێچرێ وەک عەبا و جوببە و شاڵ و پشتەماڵ. هەمان سەرچوەی پێشوو.

**لا ملی پێغەمبەرم ﷺ کرد لەبەر توندی ڕاکێشانی قەراغی پۆشاکەکەی لاملی دابڕی و سوور بوویەوە، پاشان وتی: ئەی موحەممەد لەو ماڵەی خوا کە لای تۆیە فەرمان بدە بەشم بدەن، پێغەمبەریش ﷺ لایکردەوە بەلایەوە پێکەنی و پاشان فەرمانی بۆدا بەشی بدەن.**

٥٨١٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ بِبُرْدَةٍ -قَالَ سَهْلٌ: هَلْ تَدْرِي مَا الْبُرْدَةُ؟ قَالَ: نَعَمْ، هِيَ الشَّمْلَةُ، مَنْسُوجٌ فِي حَاشِيَتِهَا- قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسَجْتُ هَذِهِ بِيَدِي أَكْسُوكَهَا. فَأَخَذَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا وَإِنَّهَا لإِزَارُهُ، فَجَسَّهَا رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اكْسُنِيهَا. قَالَ: «نَعَمْ». فَجَلَسَ مَا شَاءَ اللَّهُ فِي الْمَجْلِسِ، ثُمَّ رَجَعَ، فَطَوَاهَا، ثُمَّ أَرْسَلَ بِهَا إِلَيْهِ. فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: مَا أَحْسَنْتَ، سَأَلْتَهَا إِيَّاهُ وَقَدْ عَرَفْتَ أَنَّهُ لاَ يَرُدُّ سَائِلاً. فَقَالَ الرَّجُلُ: وَاللَّهِ مَا سَأَلْتُهَا إِلاَّ لِتَكُونَ كَفَنِي يَوْمَ أَمُوتُ. قَالَ سَهْلٌ: فَكَانَتْ كَفَنَهُ[1].

**٥٨١٠-ئەبو حازیم لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئافرەتێك بالاپۆشێکی شاڵی هێنا - سەهل وتی: دەزانی بالاپۆش چیە؟ ئەبو حازیم وتی: بەڵێ عابایەکە قەراغەکانی چنراوە- ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەم عابایەم بەدەستی خۆم چنیوە بیدەم بە تۆ لەبەری بکەیت، پێغەمبەریش ﷺ پێویستی پێی بوو لێی وەرگرت، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ناومان و ئەو عابایەی پۆشی بوو، پیاوێك لە ناو خەڵکەکەدا دەستیدا لە عاباکە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدە بەمن بیپۆشم، فەرمووی: ((بەڵێ باشە))، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی خوا ویستی لە مەجلیسەکەدا دانیشت و پاشان ڕۆشتەوە (بۆ ماڵەوە) پێچایەوە و ناردی بۆ کابراکە، خەڵکەکەش بەو پیاوەیان وت: کارێکی**

---

(١) بروانە: ١٢٧٧.

**باشت نەكرد داوای ئەو عابایەت لێكرد، دڵنیابوویت پێغەمبەر ﷺ داوای هیچ كەسێك ڕەدناكاتەوە، پیاوەكەش وتی: سوێند بەخوا تەنها بۆ ئەوە داوام كرد تا لەو ڕۆژەی دەمرم ببێتە كفنم، سەهل دەڵێ: هەر واش بوو، بوو بە كفنی.**

٥٨١١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هِيَ سَبْعُونَ أَلْفًا، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إِضَاءَةَ الْقَمَرِ». فَقَامَ عُكَاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ الأَسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عَلَيْهِ قَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ». ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ: «سَبَقَكَ عُكَاشَةُ»[١].

**٥٨١١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ئوممەتم كۆمەڵێك دەچنە بەهەشتەوە كە حەفتا هەزارن ڕووخساریان شەوق دەداتەوە وەك شەوق و ڕووناكی مانگ))، ئینجا عوكاشەی كوڕی میحصەنی ئەسەدی هەستا و ئەو شاڵ و عابایەی بەسەر سەریەوە بوو بەرزی كردەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووعام بۆ بكە لە خوا یەكێك بم لەوانە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خودایە یەكێك بێت لەوانە))، پاشان پیاوێكی تری ئەنصاری هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعاش بۆ من بكە لای خوا یەكێك بم لەوانە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عوكاشە پێشت كەوت)).**

٥٨١٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قُلْتُ لَهُ: أَيُّ الثِّيَابِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: الْحِبَرَةُ[٢].

---

(١) بڕوانە: ٦٥٤٢.

(٢) بڕوانە: ٥٨١٣.

**٥٨١٢- قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بە ئەنەسم وت: كام جل و پۆشاك بەلاى پێغەمبەرەوە ﷺ خۆشەویسترین بوو؟ ئەنەس وتى: پۆشاكى حیبەرە[1].**

٥٨١٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا مُعَاذٌ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَلْبَسَهَا الحِبَرَةَ[2].

**٥٨١٣-ئەنەسى كوڕى مالیك ﷺ دەڵێ: خۆشەویسترین پۆشاك لاى پێغەمبەرى خوا ﷺ كە لەبەرى كات حیبەرە بووە.**

٥٨١٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ سُجِّيَ بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ.

**٥٨١٤-ئەبو سەلەمەى كوڕى عەبدوڕەحمانى كوڕى عەوف دەگێڕێتەوە كە عائیشەى ﷺ خێزانى پێغەمبەر ﷺ بۆى گێڕایەوە، كە پێغەمبەرى خوا ﷺ كاتێ وەفاتى كرد بە عەبایەكى حیبەرە داپۆشرا.**

## ١٩- بابُ الأَكْسِيَةِ وَالْخَمَائِصِ

٥٨١٥- ٥٨١٦- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ - ﷺ - قَالاَ: لَمَّا

---

(١) (حیبەرە): پۆشاكێكى خەتخەتى لۆكەیە لە یەمەن دروست كراوە ڕەنگەكەى سەوز بووە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٣٢/١٢.

(٢) بڕوانە: ٥٨١٢.

نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ وَهْوَ كَذَلِكَ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ». يُحَذِّرُ مَا صَنَعُوا[١].

## ١٩- باسی پۆشاکی ئەستور و خەتخەتی چوارگۆشە [٢]

**٥٨١٥-٥٨١٦- عائیشە و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێن: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرە مەرگدابوو قوماشێکی خەت خەتی دابوو بەسەر ڕووخساریدا، کە تەنگە نەفەس دەبوو لای دەبرد بە ڕووخسارییەوە، ئا لەو حاڵەتەدا بوو دەیفەرموو: ((نەفرینی خوا لە جولەکە و گاورەکان گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت))، مسوڵمانانی بێدار دەکردەوە لەوەی ئەوان کردبوویان.**

٥٨١٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي خَمِيصَةٍ لَهُ لَهَا أَعْلَامٌ، فَنَظَرَ إِلَى أَعْلَامِهَا نَظْرَةً، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي، وَائْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمِ بْنِ حُذَيْفَةَ بْنِ غَانِمٍ مِنْ بَنِي عَدِيِّ بْنِ كَعْبٍ»[٣].

**٥٨١٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە بەرگێکی چوارگۆشەی خەتخەتەوە نوێژی کرد، جا یەکجار سەیری خەتەکانی کرد، ئەنجا کە نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: ((ئەم پۆشاکەم ببەن بۆ ئەبو جەهم، چونکە بەڕاستی کەمێ لەمەو پێش بێ ئاگای کردم لە نوێژەکەم، وە پۆشاکە ئەستورە سادەکەی ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەی کوڕی غانیمی بەنی عەدیی کوڕی کەعبم بۆ بێنن)).**

---

(١) بروانە: ٤٣٥، ٤٣٦.

(٢) (كساء): پۆشاکێکی ئەستورە لە یەمەن دروست دەکرێ. (خميصة): پۆشاکێکی لە خوری ڕەش دروست دەکرێ چوارگۆشەیە خەتی تیایە). بروانە: إرشاد الساري: ٥٣٣/١٢.

(٣) بروانە: ٣٧٣.

٥٨١٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلاَلٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ كِسَاءً وَإِزَارًا غَلِيظًا فَقَالَتْ: قُبِضَ رُوحُ النَّبِيِّ ﷺ فِي هَذَيْنِ[١].

**٥٨١٨-ئەبو بورده دەڵێ: عائیشه ﵂ پۆشاكێكی (پیناوی و) كراسێكی ئەستوری بۆ دەرهێناین و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دووانەدا گیانی كێشرا.**

## ٢٠- بابُ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ

٥٨١٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ خُبَيْبٍ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْمُلاَمَسَةِ، وَالْمُنَابَذَةِ، وَعَنْ صَلاَتَيْنِ: بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ بِالثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ، وَأَنْ يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ[٢].

## ٢٠- باسی خۆ مەلۆتە كردن[٣]

**٥٨١٩-ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردوە لە فرۆشتن بەدەست لێدان و فرۆشتن بەفڕێدان بۆ یەكتری، وە لە دوو نوێژ: لە (نوێژ كردن) لە پاش نوێژی بەیانی هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە، وە پاش نوێژی عەسریش هەتا خۆر ئاوا دەبێت، وە لە سەر سمتی دانیشێ و ئەژنۆكانی بەرزكاتەوە پارچە قوماشێك بپێچێ بەخۆیەوە عەورەتی دیاربێ، وە (ڕێگری كردوە) لە خۆ مەلۆتە كردن نەتوانێ دەستی دەربێنێ.**

---

(١) بڕوانە: ٣١٠٨.

(٢) بڕوانە: ٣٦٨.

(٣) خۆ پێچانەوەیە بە پۆشاكێک بەجۆرێک نەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ .

٥٨٢٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدٍ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ: نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ، وَالْمُلاَمَسَةُ لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يُقَلِّبُهُ إِلاَّ بِذَلِكَ، وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ ثَوْبَهُ، وَيَكُونَ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ، وَاللِّبْسَتَيْنِ: اشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ، وَالصَّمَّاءُ أَنْ يَجْعَلَ ثَوْبَهُ عَلَى أَحَدِ عَاتِقَيْهِ، فَيَبْدُو أَحَدُ شِقَّيْهِ لَيْسَ عَلَيْهِ ثَوْبٌ، وَاللِّبْسَةُ الأُخْرَى احْتِبَاؤُهُ بِثَوْبِهِ وَهْوَ جَالِسٌ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ[(١)].

**٥٨٢٠-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە دوو شێوە پۆشین و جل لەبەرکردن، وە لەدوو شێوە فرۆشتن: لە فرۆشتندا ڕێگری کرد لە (فرۆشتن) بەدەس لێدان و بەفڕێدان بۆیەکتری: وە (فرۆشتنی) دەست لێدان کەسێك بەشەو یا بە ڕۆژ دەست بدات لە پۆشاك و قوماشی کەسێکی تر قوماشەکە ئەم دیوە و ئەو دیو نەکات، بەڵکو هەر ئەو دەست لێدانەیە، وە (فرۆشتنی) فڕێدان بۆ یەکتری ئەوەیە کەسێك قوماشەکەی فڕێ بدات بۆ کەسێکی تر، ئەو کەسەش قوماشەکەی فڕێ بدات بۆی[(٢)]، ئەو فرۆشتنی هەردووکیانە بەبێ سەیر کردنی (قوماشەکە و) بەبێ ڕەزامەندی دەربڕین، دوو شێوە پۆشاك لەبەر کردنەش: خۆ مەلۆتە کردنە، ئەویش ئەوەیە پۆشاکەکەی بدات بەسەر شانێکیدا، لاکەی تری دەردەکەوێ پۆشاکی پێوە نییە، لەبەرکردنەکەی کەیان ئەوەیە پۆشاکەکەی لە خۆیەوە بپێچێت و بە دانیشتانەوە هیچ بەسەر عەورەتیەوە نەبێت.**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٧.

(٢) دووکەسن هەریەکەیان قوماشەکەی فڕێ دەدات بۆ ئەوی کەیان ئەمە بە فرۆشتن دادەنێت.

## ٢١- بابُ الِاحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ

٥٨٢١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ: أَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ على فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ، وَأَنْ يَشْتَمِلَ بِالثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ على أَحَدِ شِقَّيْهِ، وَعَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ[1].

## ٢١- باسی دانیشتن و یەک کراس لەبەردا بوون [2]

**٥٨٢١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە دوو جۆر جل پۆشین: کەسێك لەسەر سمتی دانیشێت یەك کراسی لەبەردا بێت، بەهیچی تر عەورەتی دانەپۆشی بێت. (دووەمیان) پۆشاکێ بپێچێ بەخۆیەوە لایەکی لاشەی هیچی پێوە نەبێت، وە ڕێگری کرد (لە فرۆشتن) بەدەست لێدان، وە بە فڕێدان بۆیەکتری.**

٥٨٢٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَخْلَدٌ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ على فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ[3].

**٥٨٢٢-ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە خۆمەلۆتە کردن، وە دانیشێ و پۆشاکێکی پێوە بێت و عەورەتی بەدەرەوە بێت و دانەپۆشرابێ.**

## ٢٢- بابُ الْخَمِيصَةِ السَّوْدَاءِ

٥٨٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ سَعِيدِ بْنِ فُلَانٍ -هُوَ عَمْرُو بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ- عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدٍ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِثِيَابٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ

---

(١) بڕوانە: ٣٦٨.

(٢) دانیشتن لەسەر سمت و بەرزکردنەوەی ئەژنۆکان، کراسێکی لەبەردا بێ عەورەتی دانەپۆشراوە.

(٣) بڕوانە: ٣٦٧.

صَغِيرَةٌ، فَقَالَ: «مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُو هَذِهِ؟». فَسَكَتَ الْقَوْمُ، قَالَ: «ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ». فَأُتِيَ بِهَا تُحْمَلُ، فَأَخَذَ الْخَمِيصَةَ بِيَدِهِ فَأَلْبَسَهَا وَقَالَ: «أَبْلِي وَأَخْلِقِي». وَكَانَ فِيهَا عَلَمٌ أَخْضَرُ أَوْ أَصْفَرُ، فَقَالَ: «يَا أُمَّ خَالِدٍ، هَذَا سَنَاهْ». وَسَنَاهْ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنٌ[1].

## ٢٢- باسی پۆشاکی ڕەشی خەتدار[2]

**٥٨٢٣-ئوممو خالیدی کچی خالید دەڵێ: هەندێ کراس هێنرابوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، کراسێکی ڕەشی خەتداری بچووکی تێدا بوو فەرمووی: ((دەزانن ئەمە لەبەری کێ دەکەین؟))، خەڵکەکە بێدەنگ بوون، فەرمووی: ((ئوممو خالیدم بۆ بێنن))، جا هێنایان هەڵیان گرتبوو[3]، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی کراسەکەی هێنا و کردییە بەری و فەرمووی: ((تەمەن درێژ بی و کراسەکەت بمێنێ))، وە کراسەکە خەتێکی سەوز یا زەردی تیا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئوممو خالید ئەمە جوانە)) (سَنَاهْ): بەزمانی حەبەشی: واتە: جوان.**

٥٨٢٤- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا وَلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَالَتْ لِي: يَا أَنَسُ، انْظُرْ هَذَا الْغُلاَمَ فَلاَ يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُحَنِّكُهُ. فَغَدَوْتُ بِهِ، فَإِذَا هُوَ فِي حَائِطٍ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ حُرَيْثِيَّةٌ، وَهْوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِي قَدِمَ عَلَيْهِ فِي الْفَتْحِ[4].

**٥٨٢٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ ئوممو سولەیم ﷺ منداڵی بوو پێی وتم: ئەی ئەنەس سەرنجی ئەم منداڵە بدە با هیچ شتێك نەخوات هەتا بەیانی زوو**

---

(١) بروانه: ٣٠٧١.

(٢) چونکه پێی ناوترێ (خمیصة) ئەگەر ڕەش و خەتدار نەبێت، بەجۆرێ تریش باسکراوە کە چوارگۆسە بێت و تەنک بێت لەهەر ڕەنگێک بێت، بەڵام شێوەی ئێمە نوسیومانە ڕاسترینە.

(٣) چونکە منداڵ بوو کردبوویان بە باوەشەوە.

(٤) بروانه: ١٥٠٢.

دەیبەیتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، شیرینی بێنێ بەدەم و مەلاشویدا، منیش بەیانی زوو بردم (بۆ خزمەتی) دەبینم لە ناو باخێکی خورما دایە، پۆشاکێکی ڕەشی خەتداری حورەسیی لەبەر دایە، ئەو وشترانە داغ دەکات لە کاتی ئازاد کردنی مەککە بۆی هاتووە (تا تێکەڵ نەبێ لەگەڵ وشتری تردا).

## ٢٣- بابُ ثِيَابِ الْخُضْرِ

٥٨٢٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، فَتَزَوَّجَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الزَّبِيرِ الْقُرَظِيُّ، قَالَتْ عَائِشَةُ وَعَلَيْهَا خِمَارٌ أَخْضَرُ. فَشَكَتْ إِلَيْهَا، وَأَرَتْهَا خُضْرَةً بِجِلْدِهَا، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺوَالنِّسَاءُ يَنْصُرُ بَعْضُهُنَّ بَعْضًا- قَالَتْ عَائِشَةُ: مَا رَأَيْتُ مِثْلَ مَا يَلْقَى الْمُؤْمِنَاتُ، لَجِلْدُهَا أَشَدُّ خُضْرَةً مِنْ ثَوْبِهَا. قَالَ: وَسَمِعَ أَنَّهَا قَدْ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَ وَمَعَهُ ابْنَانِ لَهُ مِنْ غَيْرِهَا. قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي إِلَيْهِ مِنْ ذَنْبٍ، إِلاَّ أَنَّ مَا مَعَهُ لَيْسَ بِأَغْنَى عَنِّي مِنْ هَذِهِ. وَأَخَذَتْ هُدْبَةً مِنْ ثَوْبِهَا، فَقَالَ: كَذَبَتْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لأَنْفُضُهَا نَفْضَ الأَدِيمِ، وَلَكِنَّهَا نَاشِزٌ تُرِيدُ رِفَاعَةَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ لَمْ تَحِلِّي لَهُ -أَوْ لَمْ تَصْلُحِي لَهُ- حَتَّى يَذُوقَ مِنْ عُسَيْلَتِكِ». قَالَ: وَأَبْصَرَ مَعَهُ ابْنَيْنِ فَقَالَ: «بَنُوكَ هَؤُلاَءِ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «هَذَا الَّذِي تَزْعُمِينَ مَا تَزْعُمِينَ، فَوَاللَّهِ لَهُمْ أَشْبَهُ بِهِ مِنَ الْغُرَابِ بِالْغُرَابِ»[1].

## ٢٣- باسی پۆشاکی سەوز

٥٨٢٥-ئەیوب لەعیکریمەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش گێڕاویەتیەوە کە ریفاعە ژنەکەی تەلاقدا، ئینجا عەبدوڕەحمانی کوڕی زوبەیری قورەزی مارەی کرد، عائیشە ﵂ دەڵێ: سەرپۆشێکی سەوزی بەسەرەوە بوو، سکاڵی خۆی لای عائیشە کرد و سەوزییەکی

(١) بڕوانە: ٢٦٣٩.

پیشانی عائیشەدا کەبە پێستیەوە بوو، ئینجا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتەوە- ژنانیش هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیان دەکەن- عائیشە وتی: وێنەی ئەوەم نەدیبوو کە تووشی ژنانی باوەڕدار دەبێت لە ناڕەحەتی و ئازاردا! پێستەکەی لە سەرپۆشەکەی سەوزتر بوو، (عیکریمە) وتی: (مێردەکەی) بیستبووی کە ژنەکەی هاتووە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش هات دوو کوڕی خۆی لەگەڵ دا بوو کە لە ژنێکی تری بوون، ژنەکە وتی: وەڵڵاهی من هیچ تاوانێکم نەبووە (کە لێی داوم)، تەنها ئەوە نەبێ ئەوەی هەیەتی (زەکەری) لەمە زیاتر سوود بەمن ناگەیەنێ- ڕیشوویەکی سەرپۆشەکەی گرتبوو-، پیاوەکەش وتی: سوێند بە خوا درۆ دەکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك تەکاندن و لێدانی پێستە لێی دەدەم[1]، بەڵام سەرپێچی کەرە و ڕیفاعەی دەوێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((جائەگەر ئەوکارە وابێ تۆ حەڵاڵ نابی بۆ ڕیفاعە- یان ناشێیت بۆی- هەتا ئەو (عەبدوڕەحمان) شیرینی و لەزەتی تۆ نەچێژێ)).
(عیکریمە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوو کوڕی لەگەڵ عەبدوڕەحمان بینی، فەرمووی: ((ئەوانە کوڕی تۆن؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی (بەژنەکە): ((ئەمە ئەو پیاوەیە کە تۆ وای پێ دەڵێیت، دەی سوێند بەخوا چەند قەلەڕەشێك لە قەلەڕەشێك دەچێت، ئەوان زۆرتر[2] لەو پیاوە دەچن)).

## ٢٤- بابُ ثِيَابِ الْبِيضِ

٥٨٢٦- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْحَنْظَلِيُّ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعْدٍ قَالَ: رَأَيْتُ بِشِمَالِ النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَمِينِهِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ يَوْمَ أُحُدٍ، مَا رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ[3].

---

(١) واتە:زۆر بەچاکی لەگەڵی جووت دەبم.
(٢) ئەو دوو کوڕەی پیاوەکە.
(٣) بروانە: ٤٠٥٤.

# ٢٤- باسی پۆشاكی سپی

**٥٨٢٦- سەعد ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا لای چەپ و لای ڕاستی پێغەمبەرەوە ﷺ دوو پیاوم بینی جل و بەرگی سپیان لەبەردا بوو، ئەو دوو پیاوەم پێشتر نەدیبوو پاشتریش نەم دین.**

٥٨٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنِ الحُسَيْنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا الأَسْوَدِ الدِّيلِيَّ حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَا ذَرٍّ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ وَهْوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَقَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ، إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ». قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ». قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ». قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ». وَكَانَ أَبُو ذَرٍّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا قَالَ: وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ.قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: هَذَا عِنْدَ الْمَوْتِ أَوْ قَبْلَهُ، إِذَا تَابَ وَنَدِمَ وَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. غُفِرَ لَهُ[1].

**٥٨٢٧- ئەبو ئەسوەدی دیلی دەڵێ: ئەبوزەڕ ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پۆشاكێكی سپی لەبەردابوو خەوتبوو، لە پاشان چوومەوە بۆ خزمەتی لەو كاتەدا لە خەو هەستابوو فەرمووی: ((هەر بەندەیەك بڵێ هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا پاشان لەسەر ئەو حاڵە بمرێ، دەڕواتە بەهەشتەوە))، عەرزم كرد: ئەگەر زیناش بكات و ئەگەر دزیش بكات؟ فەرمووی: ((ئەگەر زیناش بكات و ئەگەر دزیش بكات)) عەرزم كرد: ئەگەر زیناش بكات و ئەگەر دزیش بكات؟ فەرمووی: ((ئەگەر زیناش بكات و ئەگەر دزیش بكات)) عەرزم كرد ئەگەر زیناش بكات و ئەگەر دزیش بكات؟**

---

(١) بڕوانە: ١٢٣٧.

فەرمووی: ((ئەگەر زیناش بکات و ئەگەر دزیش بکات، با خۆڵاویش بێ لووتی ئەبی زەڕ[1]))، وە ئەبو زەڕیش هەر کاتێك ئەم فەرموودەی بگێڕایەتەوە دەیوت: با خۆڵاویش بێت لووتی ئەبی زەڕ.

ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەمە [2] لە کاتی مردندا (بڵێ) یان پێش مردن ئەگەر تەوبەی کرد و پەشیمان بویەوە وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) خوا لێی دەبوورێ.

## ٢٥- بَابُ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَافْتِرَاشِهِ لِلرِّجَالِ، وَقَدْرِ مَا يَجُوزُ مِنْهُ

٥٨٢٨- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُثْمَانَ النَّهْدِيَّ: أَتَانَا كِتَابُ عُمَرَ وَنَحْنُ مَعَ عُتْبَةَ بْنِ فَرْقَدٍ بِأَذْرَبِيجَانَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْحَرِيرِ إِلاَّ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِإِصْبَعَيْهِ اللَّتَيْنِ تَلِيَانِ الإِبْهَامَ، قَالَ: فِيمَا عَلِمْنَا أَنَّهُ يَعْنِي الأَعْلاَمَ[3].

## ٢٥- باسی (حوکمی) لەبەرکردنی ئاوریشم و ڕاخستنی[4] بۆ پیاوان، وە ئەو ئەندازەی لە ئاوریش دروستە (بۆ پیاوان)

٥٨٢٨-قەتادە دەڵێ: لە ئەبو عوسمانی نەهدییم ﷺ بیست وتی: نامەیەکی عومەرمان ﷺ بۆهات ئێمە لەو کاتەدا لەگەڵ عوتبەی کوڕی فەرقەد بووین لە ئەزربایەنجان، کە (نووسیبووی) کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوریشمی قەدەغە کردوە.

ئەوەندە نەبێت ئاماژەی بە دوو پەنجەکەی کرد کە بەدوای پەنجە گەورەدا دێن[1]، (ئەبو عوسمان) وتی: ئەوەی ئێمە بزانین عومەر ﷺ مەبەستی نەخشاندنی قەراغی پۆشاك بووە بە ئاوریشم.

---

(١) مەبەستی با ئەبو زەڕیش پێی ناخۆش بێت.

(٢) لا اله الا الله.

(٣) بڕوانە: ٥٨٢٩، ٥٨٣٠، ٥٨٣٤، ٥٨٣٥.

(٤) وەک فەرش و ڕاخەر پیاو لەسەری دابنیشێت.

٥٨٢٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ وَنَحْنُ بِأَذْرَبِيجَانَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ هَكَذَا، وَصَفَّ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ إِصْبَعَيْهِ. وَرَفَعَ زُهَيْرٌ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ[٢].

**٥٨٢٩-عاسیم لە ئەبی عوسمانەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەر ﷺ نامەی نووسی بۆ ئێمە لە کاتێکدا ئێمە لە ئەزربایجان بووین، کە پێغەمبەر ﷺ لەبەرکردنی ئاوریشمی قەدەغە کردوە مەگەر ئا ئەوەندە، پێغەمبەر ﷺ هەردوو پەنجەکەی بەرز کردەوە پێکەوە، (یونس دەڵێ): زوهەیر پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شایەتوومانی بەرز کردەوە.**

٥٨٣٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنِ التَّيْمِيِّ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كُنَّا مَعَ عُتْبَةَ فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُلْبَسُ الْحَرِيرُ فِي الدُّنْيَا إِلاَّ لَمْ يُلْبَسْ فِي الآخِرَةِ مِنْهُ». حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا أَبُو عُثْمَانَ، وَأَشَارَ أَبُو عُثْمَانَ بِإِصْبَعَيْهِ الْمُسَبِّحَةِ وَالْوُسْطَى[٣].

**٥٨٣٠-ئەبو عوسمان دەڵێ: ئێمە لەگەڵ عوتبەدا بووین، جا عومەر ﷺ نامەی بۆ عوتبە نووسی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی ئاوریشمی لەبەر کردبێ لە دونیادا، لە ڕۆژی دوایی دا لەبەری ناکرێ)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) حەسەنی کوڕی عومەر بۆی گێڕاینەوە و وتی: موعتەمیر بۆی گێڕاینەوە وتی: باوکم بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو عوسمان بۆی گێڕاینەوە، ئەبو عوسمان بە پەنجەی ناوەڕاست و بە پەنجەی شایەتوومان ئاماژەی کرد.**

---

(١) واتە: پەنجەی شایەتوومان و پەنجەکەی تەنیشتی.
(٢) بڕوانە: ٥٨٢٨.
(٣) بڕوانە: ٥٨٢٨.

٥٨٣١- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ حُذَيْفَةُ بِالْمَدَايِنِ فَاسْتَسْقَى، فَأَتَاهُ دِهْقَانٌ بِمَاءٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَرَمَاهُ بِهِ وَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَرْمِهِ إِلاَّ أَنِّي نَهَيْتُهُ فَلَمْ يَنْتَهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الذَّهَبُ وَالْفِضَّةُ وَالْحَرِيرُ وَالدِّيبَاجُ هِيَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ»[1].

**٥٨٣١-ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێ: حوزەیفە لە مەدائین بوو داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، کوێخایەکیش لە جامێکی زیودا ئاوی بۆهێنا[2]، حوزەیفەش جامەکەی تێگرت وتی: من بۆیە تێمگرت چونکە جاری تر ڕێگریم لێ کردوە هەر وازی نەهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کردین لە (پۆشینی) ئاوریشم و دیباج خواردنەوە لە دەفری ئاڵتون و زیودا و فەرموویەتی: ((ئەوانە بۆ ئەوانە (کافران) لە دونیا، وە لە دوارۆژدا بۆ ئێوەیە)).**

٥٨٣٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ -قَالَ شُعْبَةُ: فَقُلْتُ: أَعَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: شَدِيدًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الآخِرَةِ».

**٥٨٣٢-عەبدولعەزیزی کوڕی سوهەیب وتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بیست، شوعبە دەڵێ: وتم (بە عەبدولعەزیز) ئایا (ئەنەس) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە؟ (عەبدولعەزیزیش بەتوڕەبوونێکی) زۆرەوە وتی: بەڵێ: لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك لە دونیادا ئاوریشم لەبەر بکات، لە ڕۆژی دواییدا لەبەری ناکات)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٤٢٦.

(٢) یان گەورەی ئەو خەڵکە ئاگر پەرستەی لەوێدا بوون لە مەدائین.

٥٨٣٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَخْطُبُ يَقُولُ: قَالَ مُحَمَّدٌ ﷺ: «مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ».

**٥٨٣٣-سابيت دەڵێ: لە ئیبنو زوبەیرم ﷺ بیست وتارى دەدا دەیوت: موحەممەد ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك لە دونیادا ئاوریشم لەبەر بکات، لە ڕۆژى دوایيدا لەبەرى ناکات)).**

٥٨٣٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي ذُبْيَانَ خَلِيفَةَ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ».
وَقَالَ لَنَا أَبُو مَعْمَرٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ يَزِيدَ، قَالَتْ مُعَاذَةُ: أَخْبَرَتْنِي أُمُّ عَمْرٍو بِنْتُ عَبْدِ اللَّهِ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، سَمِعَ عُمَرَ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ[(١)].

**٥٨٣٤- ئیبنو زوبەیر ﷺ دەڵێ: لە عومەرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك لە دونیادا ئاوریشم لەبەر بکات، لە ڕۆژى دوایيدا لەبەرى ناکات)).**

**(ئیمامی بوخاری) دەڵێ: مەعمەر پێی وتین: عەبدولواریس بۆی گێڕاینەوە لە یەزیدەوە وتی: موعازە وتی: ئوممو عەمرى کچی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە وتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرم بیست کە لە عومەرى ﷺ بیستووە، عومەریش (ئەم فەرموودەی) لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە.**

٥٨٣٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حِطَّانَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْحَرِيرِ، فَقَالَتِ: ائْتِ ابْنَ عَبَّاسٍ فَسَلْهُ. قَالَ: فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: سَلِ ابْنَ عُمَرَ. قَالَ: فَسَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، فَقَالَ: أَخْبَرَنِي

---

(١) بڕوانە: ٥٨٢٨.

أَبُو حَفْصٍ -يَعْنِي: عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ». فَقُلْتُ صَدَقَ وَمَا كَذَبَ أَبُو حَفْصٍ على رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ: حَدَّثَنَا حَرْبٌ، عَنْ يَحْيَى، حَدَّثَنِي عِمْرَانُ. وَقَصَّ الْحَدِيثَ[1].

**٥٨٣٥-عیمرانی کوڕی حیتتان دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﷺ کرد دەربارەی ئاوریشم وتی: بڕو بۆ لای ئیبنو عەبباس ﷺ و پرسیاری لێ بکە، (عیمران) وتی: منیش چووم و پرسیارم لێکرد، ئەویش وتی: پرسیار لە ئیبنو عومەر ﷺ بکە، دەڵێ: منیش پرسیارم لە ئیبنو عومەر کرد، ئەویش وتی: ئەبوحەفص-واتە:عومەری کوڕی خەتتاب-بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان کەسێك لە دونیادا [2] ئەوریشم لەبەر دەکات، لە دواڕۆژدا بەشی نەبێت)). منیش وتم: ڕاست دەکات ئەبو حەفص بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ درۆ ناکات.**

**-عەبدوڵڵای کوڕی ڕەجا دەڵێ: جەریر بۆی گێڕاینەوە لە یەحیاوە وتی: عیمران بۆی گێڕامەوە ئەنجا فەرموودەکەی گێڕایەوە.**

## ٢٦- بابُ مَسِّ الْحَرِيرِ مِنْ غَيْرِ لُبْسٍ

وَيُرْوَى فِيهِ عَنِ الزُّبَيْدِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٨٣٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ ثَوْبُ حَرِيرٍ، فَجَعَلْنَا نَلْمُسُهُ وَنَتَعَجَّبُ مِنْهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟». قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: «مَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ هَذَا»[3].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٢٨.

(٢) مەبەستی لە پیاوانە نەک ئافرەتان.

(٣) بڕوانە: ٣٢٤٩.

## ٢٦- باسی دەست دان لە ئاوریشم بەبێ ئەوەی لەبەر بكرێت

-لەو بارەیەوە فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە لە زوبەیدیەوە لە زوهرییەوە لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ[١].

٥٨٣٦-بەرا ﷺ دەڵێ: پۆشاكێكی ئاوریشم بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئینجا ئێمەش دەستمان لێی دەدا و پێی سەرسام دەبووین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەئەمە سەرسامن؟)) عەرزمان كرد بەڵێ، فەرمووی: ((دەستە سڕەكانی سەعدی كوڕی موعاز لە بەهەشتدا لەمە چاكتر و باشترە)).

## ٢٧- بَابُ افْتِرَاشِ الحَرِيرِ

وَقَالَ عَبِيدَةُ: هُوَ كَلُبْسِهِ.

٥٨٣٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: نَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نَشْرَبَ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَأَنْ نَأْكُلَ فِيهَا، وَعَنْ لُبْسِ الحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ، وَأَنْ نَجْلِسَ عَلَيْهِ[٢].

## ٢٧- باسی (حوكمی) ڕاخستنی ئاوریشم (و دانیشتن لەسەری)

-عەبیدە دەڵێ: ڕاخستنی وەك لەبەركردنی وایە[٣].

٥٨٣٧-حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ كردین كە لە دەفری ئاڵتون و زیودا ئاو و خواردنەوە بخۆینەوە وە خواردنیان تیا بخۆین، وە ڕێگری لێ كردین ئاوریشم و دیباج لەبەر بكەین، وە لەسەر ئاوریشم دابنیشین.

---

(١) تەبەرانی لە موعجەمی كەبیردا بەژمارە: (٥٣٤٧) گێراویەتیەوە.

(٢) بڕوانە: ٥٤٢٦.

(٣) واتە:حەرامە.

# ٢٨- بابُ لُبْسِ القَسِّيِّ

وَقَالَ عَاصِمٌ: عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قُلْتُ لِعَلِيٍّ: مَا القَسِّيَّةُ؟ قَالَ: ثِيَابٌ أَتَتْنَا مِنَ الشَّامِ أَوْ مِنْ مِصْرَ، مُضَلَّعَةٌ فِيهَا حَرِيرٌ فِيهَا أَمْثَالُ الأُتْرُنْجِ، وَالْمِيثَرَةُ كَانَتِ النِّسَاءُ تصطنعه لِبُعُولَتِهِنَّ مِثْلَ القَطَائِفِ يُصَفِّرْنَهَا. وَقَالَ جَرِيرٌ، عَنْ يَزِيدَ فِي حَدِيثِهِ: القَسِّيَّةُ ثِيَابٌ مُضَلَّعَةٌ، يُجَاءُ بِهَا مِنْ مِصْرَ، فِيهَا الحَرِيرُ، وَالْمِيثَرَةُ جُلُودُ السِّبَاعِ. قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ: عَاصِمٌ أَكْثَرُ وَأَصَحُّ فِي المِيثَرَةِ.

## ٢٨- باسی پۆشینی قەسسیی[1]

**-عاصیم لە ئەبی بوردەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە عەلیم وت ﷺ پۆشاکی قەسسیی چییە؟ وتی: پۆشاکێك بوو لە شامەوە دەهات بۆمان- یان لە میصرەوە- خەتی پانی تیا بوو وەك پەراسوو، ئاوریشمی تێکەڵ بوو خەتی وەك پەراسووی ئەستوری تیابوو، وە نەرمە زین کە ئافرەتان بۆ مێردەکانیان دروست دەکرد وەك بەتانی یان دۆشەکە، دەخرێتە سەرزینی (ماین و ئەسپ).**

**-جەریر: لە یەزیدەوە دەیگێڕێتەوە دەربارەی فەرموودەکەی دەڵێ: قەسسیی پۆشاکێکە خەتی پانی تیایە وەك پەراسوو لە میصرەوە دەهێنرا و ئاوریشمی تێکەڵە. (الْمِيثَرَةُ) پێست و فەرووی دڕندەیە.**

**ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ:گێڕانەوەکەی عاصیم ڕشتەکەی زۆرترن و ڕاسترە دەربارەی مانای (الْمِيثَرَة) (لەو مانای جەریر کردوویەتی)[2].**

٥٨٣٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ ابْنِ عَازِبٍ قَالَ: نَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ عَنِ المَيَاثِرِ الْحُمْرِ وَالْقَسِّيِّ[1].

---

(١) قەسسیی: جۆرە پۆشاکێکی گوڵ گوڵ بوو، لە میصر و شامەوە ئەیان هێنا، بۆ ناوی قسسیی لێنراوە چونکە ئەو شارەی لێی دروست دەکرا ناوی قەسس بوو لە کەناری دەریا نزیك دمیات لە میصر. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٤٩/١٢.

(٢) کە دەڵێ: الْمِيثَرَة: واتە فەروی دڕندە.

٥٨٣٨-ئیبنو عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ کردن لە بەکارهێنانی نەرمە زینی ئاوریشمی ئەرخەوانی و پۆشاکی قەسسیی[٢].

## ٢٩- بابُ مَا يُرَخَّصُ لِلرِّجَالِ مِنَ الْحَرِيرِ لِلْحِكَّةِ

٥٨٣٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ ﷺ لِلزُّبَيْرِ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ لِحِكَّةٍ بِهِمَا[٣].

## ٢٩- باسی ئەوەی کە ڕێگە بەپیاوان دراوە لەبەر خوران ئاوریشم بپۆشن

٥٨٣٩-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگە بە زوبەیر و عەبدوڕحمان ﷺ دا ئاوریشم بپۆشن، لەبەر خورانێك کە هەردووکیان هەیان بوو.

## ٣٠- بابُ لبس الحَرِيرِ لِلنِّسَاءِ

٥٨٤٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ ح.

وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَسَانِي النَّبِيُّ ﷺ حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَخَرَجْتُ فِيهَا، فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَّقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي[٤].

---

(١) بروانە: ١٢٣٩.

(٢) پێشتر قسە لەسەر ماناکەی کرا.

(٣) بڕوانە: ٢٩١٩.

(٤) بڕوانە: ٢٦١٤.

# ٣٠- باسی (بەکارهێنانی) ئاوریشم بۆ ئافرەتان (دروستە)

**٥٨٤٠- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی سیيەرای[1] پێدام، منیش چوومە دەرەوە و لەبەرمدا بوو، بەوە توڕەیم لە ناو چاوی پێغەمبەردا ﷺ بەدی کرد، کە ئەوەم دی لەت لەتم کرد و دام بە ئافرەتەکانم[2].**

٥٨٤١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ تُبَاعُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ ابْتَعْتَهَا، تَلْبَسُهَا لِلْوَفْدِ إِذَا أَتَوْكَ وَالْجُمُعَةِ. قَالَ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ بَعْدَ ذَلِكَ إِلَى عُمَرَ حُلَّةَ سِيَرَاءَ حَرِيرٍ، كَسَاهَا إِيَّاهُ، فَقَالَ عُمَرُ: كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ سَمِعْتُكَ تَقُولُ فِيهَا مَا قُلْتَ! فَقَالَ: «إِنَّمَا بَعَثْتُ إِلَيْكَ لِتَبِيعَهَا أَوْ تَكْسُوَهَا»[3].

**٥٨٤١-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەر ﷺ پۆشاکێکی خەت خەتی ئاوریشمی بینی دەفرۆشرا، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە بتکڕیایە و لەبەرت بکردایە، کە وەفد و نوێنەر دەهاتن بۆ لات، بۆ ڕۆژی هەینیش، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی کەسێك ئەوە لەبەر دەکات کە (لە ڕۆژی دواییدا) بەشی نەبێت))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوە پۆشاکێکی خەت خەتی ئاوریشمی نارد بۆ عومەر و پێیدا، عومەریش وتی:پۆشاکێکت پێداوم پێشتریش لەبارەیەوە ئەوەت فەرمووکە فەرمووت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ناردوومە بۆت تا بیفرۆشیت یان بیدەیت بە ژنێ بیپۆشێت)).**

---

(١) سیيەرای: ئەصموعی دەڵێ: پۆشاکێکە خەتی ئاوریشمی تێدایە، جەوهەری دەڵێ: پۆشاکێکە خەتی زەردی تێدایە، خەلیلیش دەڵێ: پۆشاکێکە قەراغەکانی ئاوریشمە. بڕوانە:إرشاد الساري: ٥٥٢/١٢.

(٢) مەبەستی فاتیم و ئافرەتانی خزمی بوو.

(٣) بڕوانە: ٨٨٦.

٥٨٤٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّهُ رَأَى عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ ﷺ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بُرْدَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ.

**٥٨٤٢-زوهری دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو کراسێکی ئاوریشمی خەتخەتی بینی لەبەری ئوممو کەلسومی ﷺ کچی پێغەمبەری خوادا ﷺ.**

## ٣١- بابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَّخِذُ مِنَ اللِّبَاسِ وَالْبُسْطِ

٥٨٤٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَبِثْتُ سَنَةً وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ عَنِ الْمَرْأَتَيْنِ اللَّتَيْنِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَجَعَلْتُ أَهَابُهُ، فَنَزَلَ يَوْمًا مَنْزِلاً فَدَخَلَ الأَرَاكَ، فَلَمَّا خَرَجَ سَأَلْتُهُ، فَقَالَ: عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ، ثُمَّ قَالَ: كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ لاَ نَعُدُّ النِّسَاءَ شَيْئًا، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ وَذَكَرَهُنَّ اللَّهُ، رَأَيْنَا لَهُنَّ بِذَلِكَ عَلَيْنَا حَقًّا، مِنْ غَيْرِ أَنْ نُدْخِلَهُنَّ فِي شَيْءٍ مِنْ أُمُورِنَا، وَكَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ امْرَأَتِي كَلاَمٌ، فَأَغْلَظَتْ لِي، فَقُلْتُ لَهَا: وَإِنَّكِ لَهُنَاكِ؟. قَالَتْ: تَقُولُ هَذَا لِي وَابْنَتُكَ تُؤْذِي النَّبِيَّ ﷺ! فَأَتَيْتُ حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: إِنِّي أُحَذِّرُكِ أَنْ تَعْصِي اللَّهَ وَرَسُولَهُ. وَتَقَدَّمْتُ إِلَيْهَا فِي أَذَاهُ، فَأَتَيْتُ أُمَّ سَلَمَةَ فَقُلْتُ لَهَا. فَقَالَتْ أَعْجَبُ مِنْكَ يَا عُمَرُ، قَدْ دَخَلْتَ فِي أُمُورِنَا، فَلَمْ يَبْقَ إِلاَّ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَزْوَاجِهِ، فَرَدَّدَتْ، وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِذَا غَابَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدْتُهُ أَتَيْتُهُ بِمَا يَكُونُ، وَإِذَا غِبْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدَ أَتَانِي بِمَا يَكُونُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ مَنْ حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدِ اسْتَقَامَ لَهُ، فَلَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَلِكُ غَسَّانَ بِالشَّأْمِ، كُنَّا نَخَافُ أَنْ يَأْتِيَنَا، فَمَا شَعَرْتُ إِلاَّ بِالأَنْصَارِيِّ وَهْوَ يَقُولُ: إِنَّهُ قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ. قُلْتُ لَهُ: وَمَا هُوَ؟ أَجَاءَ الْغَسَّانِيُّ؟ قَالَ: أَعْظَمُ مِنْ ذَاكَ، طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ. فَجِئْتُ فَإِذَا الْبُكَاءُ مِنْ حُجَرِهَا كُلِّهَا، وَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ قَدْ صَعِدَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، وَعَلَى بَابِ الْمَشْرُبَةِ وَصِيفٌ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِي. فَدَخَلْتُ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ عَلَى حَصِيرٍ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ مِرْفَقَةٌ مِنْ أَدَمٍ، حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِذَا أُهُبٌ مُعَلَّقَةٌ وَقَرَظٌ،

فَذَكَرْتُ الذِي قُلْتُ لِحَفْصَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ، وَالَّذِي رَدَّتْ عَلَيَّ أُمُّ سَلَمَةَ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَلَبِثَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ نَزَلَ[1].

## ٣١- باسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێدەدا لە پۆشاك و ڕاخەر

**٥٨٤٣-عوبەیدی كوڕی حونەین لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ساڵێك مامەوە دەمویست پرسیار لە عومەر ﷺ بكەم دەربارەی ئەو دوو ژنەی پشتی یەكتریان گرت (هاوكاری یەكتربوون) لە بەرامبەر پێغەمبەردا ﷺ، جاحاڵم وابوو لێی دەترسام[2] ئینجا ڕۆژێكیان (لە مەڕزەهران) لە جێگایەك دابەزی و چوویە ناودار ئاراكەكانەوە (بۆ دەست بە ئاو گەیاندن)، جا كاتێ هاتە دەرەوە پرسیارم لێ كرد، عومەریش وتی: ئەو دوو ژنە عائیشە و حەفصە ﷺ بوون، پاشان وتی: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەتانمان بە هیچ دانەدەنا، ئینجا كاتێ ئیسلام هات و خوا باسی كردن،[3] بەوە زانیمان ژنان مافیان لەسەرمان هەیە، بەبێ ئەوەی لە هیچێك لە كاروبارماندا ئەوان بەشداری پێبكەین، وە لە نێوان من و هاوسەرم دەمەقاڵەیەك بوو، هاوسەرم قسەی زبری بەرامبەرم كرد، منیش پێم وت: تۆ ئاوات لێ هاتووە قسەی زبر بە من بڵێیت؟ (هاوسەرم) وتی: تۆ وا بەمن دەڵێی كچەكەی خۆت ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات[4]، (عومەر دەڵێ:) منیش ڕۆشتم بۆلای حەفصە و پێم وت: من ئاگادارت دەكەم كە سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەیت[5]، سەرەتا بۆ لای ئەو ڕۆشتم دەربارەی ئازاردانی (پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسە و وەستان لە ڕوویدا)، ئینجا ڕۆشتم بۆ لای ئوممو**

---

(١) بڕوانە: ٨٩.

(٢) نەمدەوێرا پرسیاری لێ بكەم.

(٣) كە بەچاكی هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكەین.

(٤) وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ دەداتەوە لە ڕوویدا قسە دەكات.

(٥) لە گێڕانەوەیەكدا كە خوا و پێغەمبەر ﷺ تووڕە بكەیت.

سەلەمە ﷺ و پێم وت[1]: ئەویش وتی: ئەی عومەر سەرم لەتۆ سوڕ دەمێنێ خۆت لە کاروباری ئێمەدا هەڵقورتاندووە، جا هیچ نەما ئەوە نەبێ بکەویتە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوسەرەکانیەوە؟ ئیتر وای لێکردم کشامەوە[2]، پیاوێکی ئەنصاری هەبوو[3] ئەگەر لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە نەبوایە، من ئامادە بوومایە لە خزمەتی دا، هەرچی ببوو بۆم دەبردەوە (لە هەواڵ و شتی تازە)، وە ئەگەر من ئامادە نەبوومایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئامادە بوایە، هەرشتێك لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ ببوایە بۆی دەهێنامەوە، وە ئەو (پادشایانەی) لە دەوروبەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوون ڕێك و ڕاست بوون لەگەڵیدا، جا هەر پادشای غەسسان مابوو لە شامدا، ئێمە دەترساین کە هێرشمان بۆ بێنێ، جا هەر ئەوەندەم زانی ئەنصارییەکە وتی: بێگومان کارێکی گەورە ڕوویداوە، پێم وت: چی بووە؟ ئایا پاشای غەسسانی هاتووە؟ وتی: لەوە گەورەترە، پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکانی تەڵاق داوە منیش ڕۆشتم دەبینم لە هەموو ژووری ژنەکانی دەنگی گریانە، وە پێغەمبەریش ﷺ چووەتە سەرەوە بۆ ژوورە بەرزەکەی خۆی، لە بەردەم دەرگای ژورەکەشدا خزمەتکارێکی مێرد منداڵی لێ بوو، منیش ڕۆشتمە لای مێرد منداڵەکە و وتم: داوای مۆڵەتم بۆ بکە (لە پێغەمبەر ﷺ) ئینجا چومە ژوورەوە، ئەبینم پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیرێك (ڕاکشاوە) شوێنی حەسیرەکە لە تەنیشتیدا دەرچووە، پشتیەکیشی لە ژێر سەر دایە چەرمە و ناوئاخنی ڕیشاڵی پەلی خورمایە، وە چەند پێستەیەك هەڵواسراون و هەندێ گەڵای دار شێلان، ئینجا ئەو وتەی بە حەفصە و ئوممو سەلەمەم وت بۆم باس کرد، ئەو وەڵامەش کە ئوممەسەلەمە وەڵامی دامەوە،

---

(١) ئەوەی بە حەفصەم وت.

(٢) لە بەشێک لە وتانەی ویستم بیکەم و پەشیمانی کردمەوە.

(٣) دراوسێم بوو.

**پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بیست و نۆ شەو مایەوە و (نەچووە لای هاوسەرەکانی)، لە پاشان (لە ژوورە بەرزەکەی) هاتە خوارەوە.**

٥٨٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَتْنِي هِنْدُ بِنْتُ الْحَارِثِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ وَهْوَيَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْفِتْنَةِ، مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الخَزَائِنِ، مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ، كَمْ مِنْ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَكَانَتْ هِنْدٌ لَهَا أَزْرَارٌ فِي كُمَّيْهَا بَيْنَ أَصَابِعِهَا[1].

**٥٨٤٤- ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا خەبەری بوویەوە و دەیفەرمووی: ((هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوا، ئەم شەو چ ئاشوب و فیتنە دابارین؟ چەند گەنج و خەزێنە دەست مسوڵمانان (دەکەوێ و دەگیرێ)، کێ ژنانی ئەم ماڵانە [2] خەبەردەکاتەوە [3]؟ چونکە زۆر کەس لە دونیادا پۆشتەیە بەڵام لە ڕۆژی دواییدا ڕووت و قووتە)). زوهری دەڵێ: هند هەردوو قۆڵی کراسەکەی لە نێوانی پەنجەکانی دا قۆپچەی هەبوو [4].**

## ٣٢- بابُ مَا يُدْعَى لِمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا

٥٨٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ خَالِدٍ بِنْتُ خَالِدٍ، قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِثِيَابٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ، قَالَ: «مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُوهَا هَذِهِ الخَمِيصَةَ» فَأُسْكِتَ القَوْمُ، قَالَ: «ائْتُونِي

---

(١) بڕوانە: ١١٥.

(٢) مەبەستی هاوسەرانی خۆیەتی.

(٣) شەو نوێژ بکەن و هەستن.

(٤) لە ترسی ئەوەی نەوەک قۆڵی دەرکەوێ لەبەر فراوانی قۆڵەکانی.

بِأُمِّ خَالِدٍ» فَأُتِيَ بِي النَّبِيُّ ﷺ فَأَلْبَسَنِيهَا بِيَدِهِ، وَقَالَ: «أَبْلِي وَأَخْلِقِي» مَرَّتَيْنِ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى عَلَمِ الخَمِيصَةِ وَيُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَيَّ وَيَقُولُ: «يَا أُمَّ خَالِدٍ هَذَا سَنَا وَيَا أُمَّ خَالِدٍ هَذَا سَنَا» وَالسَّنَا بِلِسَانِ الحَبَشِيَّةِ الحَسَنُ قَالَ إِسْحَاقُ: حَدَّثَتْنِي امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِي: أَنَّهَا رَأَتْهُ عَلَى أُمِّ خَالِدٍ[1].

## ٣٢- باسی ئەو دوعای دەكرێ بۆ كەسێك كە كراسێكی تازەی لەبەر كردوە

**٥٨٤٥- ئوممو خالیدی كچی خالید ﵄ دەڵێ: هەندێ پۆشاك هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ كراسێكی خەتداری ڕەشی تیا بوو، فەرمووی: ((دەزانن ئەمە لەبەری كێ دەكەین؟)) ئینجا خەڵكەكە بێدەنگ بوون، فەرمووی: ((ئوممو خالیدم بۆبێنن))، هێنایان بۆ پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی كردییە بەری و — دووجار- فەرمووی: ((تەمەن درێژبیت كراسەكەت بمێنێ))، جا پێغەمبەر ﷺ هەر سەیری خەتی كراسەكەی دەكرد و بەدەستیش ئاماژەی بۆ دەكرد و دەیفەرموو: ((ئەی ئوممو خالید ئەمە جوانە))، وشەی** (السَّنَا) **بەزمانی حەبەشی واتە جوان.**

**ئیسحاق دەڵێ: ژنێكی خزمی خۆمان بۆی گێڕامەوە كە خۆی ئەو كراسەی بینی لەبەری ئوممو خالیددا.**

## ٣٣- بابُ التَّزَعْفُرِ لِلرِّجَالِ

٥٨٤٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ.

---

(١) بروانە: ٣٠٧١.

## ٣٣- باسی ڕەنگی زەعفەرانی لە خۆدان بۆ پیاوان

**٥٨٤٧-ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی زەعفەران لە خۆدانی بۆپیاوان قەدەغە کرد.**

## ٣٤- بابُ الثَّوْبِ المُزَعْفَرِ

٥٨٤٧- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَلْبَسَ المُحْرِمُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا بِوَرْسٍ أَوْ بِزَعْفَرَانٍ[1].

## ٣٤- باسی (حوکمی) پۆشاکی بە زەعفەران ڕەنگ کراو

**٥٨٤٧-ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە پیاو لە ئیحرامدا بێت، پۆشاکێك لەبەر بکات بە وەرس یان زەعفەران ڕەنگ کرا بێت.**

## ٣٥- بابُ الثَّوْبِ الأَحْمَرِ

٥٨٤٨- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، سَمِعَ الْبَرَاءَ ﵁ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مَرْبُوعًا، وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْهُ[2].

## ٣٥- باسی (حوکمی لەبەرکردنی) پۆشاکی سوور

**٥٨٤٨- ئەبو ئیسحاق لە بەڕائی ﵁ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی مام ناوەند بوو، بێگومان بینیومە دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، هیچ شتێکی (پۆشاکێکی) لەوە جوانترم نەبینیوە.**

---

(١) بڕوانە: ١٣٤.

(٢) بڕوانە: ٣٥٥١.

## ٣٦- بابُ المِيثَرَةِ الحَمْرَاءِ

٥٨٤٩- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ: عِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَنَهَانَا عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالْقَسِّيِّ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَمَيَاثِرِ الْحُمْرِ[1].

## ٣٦- باسی (حوكمی بەكارهێنانی) نەرمەزینی سوور

**٥٨٤٩-بەڕا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردین بە حەوت شت: سەردانیكردنی نەخۆش و شوێن كەوتنی تەرم و دوعای خێر بۆ پژمیو، وە ڕێگری لێكردن لە لەبەركردنی ئاوریشم و دیباج [2] و قەسسیی[3] و ئیستەبرەق[4]،وە نەرمە زینی سوور.**

## ٣٧- بابُ النِّعَالِ السِّبْتِيَّةِ وَغَيْرِهَا

٥٨٥٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ سَعِيدٍ أَبِي مَسْلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ[5].

## ٣٧- باسی پێڵاو و كەوشی (دروستكراو) لە چەرمی خۆشەكراو [6] و چەرمی تر

**٥٨٥٠- سەعید كە ئەبو سەلەمە نازناوێتی دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەس ﷺ كرد ئایا پێغەمبەر ﷺ بە نەعلەكانیەوە نوێژی دەكرد؟ وتی: بەڵێ.**

---

(١) بڕوانە: ١٢٣٩.

(٢) دیباج: ئاوریشمی تەنكە.

(٣) قەسسیی:پۆشاكێكی گوڵ گوڵ بووە لە میصر و شامەوە دەهێنرا، ئاوریشمی تێكەڵە. (إرشاد الساري:٥٥٩\١٢).

(٤) جۆرێكە لە ئاوریشمی ئەستوور.

(٥) بڕوانە: ٣٨٦.

(٦) السِّبْتِيَّة: پێستە و چەرمێكە خۆشە كرابێت یان مووەكەی لێی كرابێتەوە بە تاشین.

٥٨٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ: رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: مَا هِيَ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلاَلَ، وَلَمْ تُهِلَّ أَنْتَ حَتَّى كَانَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ. فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَمَّا الأَرْكَانُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمَسُّ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا، وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلاَلُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ[١].

**٥٨٥١- عوبەیدی کوڕی جورەیج دەگێڕێتەوە کە بە عەبدوڵلای کوڕی عومەری ﭭ وت: دەتبینم چوار شت دەکەیت کەسم نەدیوە لە هاوەڵانت بیانکەن؟ عەبدوڵلاش وتی: ئەی ئیبنو جورەیج ئەو چوار شتە چین؟ وتی: تۆم دیوە لە چوار گۆشەکەی کەعبە تەنها دەست لە دوو گۆشە یەمانیەکە دەدەیت، وە تۆم دیوە نەعلی سیبتییە لەپێ دەکەیت، وە تۆم دیوە بەڕەنگی زەرد سەر و ڕیشت بۆیە دەکەی، وە تۆم دیوە ئەگەر لە مەککەدا بیت خەڵکی کە مانگی (زیلحیجە) یان بینی ئیحرام دەبەستن، بەڵام تۆ ئیحرام نابەستی تا ڕۆژی تەروییە[٢]، عەبدوڵلاش وتی: سەبارەت بە گۆشەکانی کەعبە چونکە پێغەمبەرم ﷺ دیوە تەنها دەستی لە دوو گۆشە یەمانیەکە دەدا، دەربارەی لەپێ کردنی نەعلی سیبتییەش چونکە پێغەمبەرم ﷺ دیوە ئەو نەعلەی لەپێ دەکرد، کە موو بە پێستەکەیەوە نیە و دەست نوێژی پێوە دەگرت، بۆیە منیش پێم خۆشە ئەو**

(١) بڕوانە: ١٦٦.

(٢) کە ڕۆژی هەشتی مانگی ذیلحجەیە.

**جۆره نەعله له پێ بکەم، ڕەنگی زەردیش، چونکه پێغەمبەرم ﷺ بینیوه بەڕەنگی زەرد سەر و ڕیشی ڕەنگ دەکرد، بۆیه پێم خۆشه بەڕەنگی زەرد سەر و ڕیشم ڕەنگ بکەم، ئیحرام بەستنیش لەو ڕۆژەدا چونکه من نەمبینیوه، پێغەمبەر ﷺ ئیحرام ببەستێ لەو کاتەدا نەبێ، که وشترەکەی هەڵدەستایەوه (و دەکەوته ڕێ بۆ مینا، که ڕۆژی هەشتەمی زیلحیجه یه).**

٥٨٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا بِزَعْفَرَانٍ أَوْ وَرْسٍ، وَقَالَ: «مَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[١].

**٥٨٥٢- ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد که ئەوەی له ئیحرامدایه پۆشاکێك لەبەر بکات که بەڕەنگی زەعفەران یان وەرس ڕەنگ کرابێت، وه فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك جوتێ نەعلی نەبوو، ئەوه با جوتێ خوف له پێ بکات و له خواری قوله پێیەوەی بییان بڕێت)).**

٥٨٥٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِزَارٌ فَلْيَلْبَسِ السَّرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ نَعْلَانِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ»[٢].

**٥٨٥٣- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس ئیزاری نەبوو ئەوه با شەرواڵ لەپێ کات، هەر کەسیش جوتێ نەعلی نەبوو، ئەوه با جوتێ خوف لەپێ کات))** [٣].

---

(١) بڕوانه: ١٣٤.

(٢) بڕوانه: ١٧٤٠.

(٣) بەڵام لەخوار قوله پێیەوه پێیان بگرێت.

## ٣٨- بابٌ: يَبْدَأُ بِالنَّعْلِ اليُمْنَ

٥٨٥٤- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ، سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَتَنَعُّلِهِ[1].

## ٣٨- باسێک: پێڵاوی ڕاست له پێشدا لەپێ دەکرێ

**٥٨٥٤- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە پێشخستنی لای ڕاستی پێخۆش بوو له دەست نوێژگرتنیدا و له قژ داهێنانیدا و له پێڵاو لەپێ کردنیدا.**

## ٣٩- بابٌ يَنْزِعُ نَعْلَ اليُسْرَى

٥٨٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ»[2].

## ٣٩- باسێک: پێڵاوی چەپی داکەنێت (له داکەنەدنیدا)

**٥٨٥٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان پێڵاوی لەپێ کرد با بەڕاست دەست پێبکات، وە ئەگەر پێڵاوی داکەند بابە چەپ دەست پێبکات، با پێڵاوی ڕاست له یەکەم جارەوە لەپێ بکرێت و له کۆتایشەوە داکەنرێت)).**

---

(١) بڕوانە: ١٦٨.

(٢) بڕوانە: ٥٨٥٥.

## ٤٠- بابٌ لاَ يَمْشِي فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ

٥٨٥٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، لِيُحْفِهِمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَنْعَلْهُمَا جَمِيعًا»[١].

## ٤٠- باسێک:بەتاکێ پێڵاوەوە نەڕوات بە ڕێگادا

**٥٨٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((با کەس لە ئێوە بەتاکێ پێڵاوەوە نەڕوات بەرێگادا، یان هەردووکیان داکەنێ، یان هەردووکیان لەپێ کات)).**

## ٤١- بابُ قِبَالاَنِ فِي نَعْلٍ، وَمَنْ رَأَى قِبَالاً وَاحِدًا وَاسِعًا

٥٨٥٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسٌ ﷺ أَنَّ نَعْلَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ لَهَا قِبَالاَنِ[٢].

## ٤١- باسی دوو ئاوزەنگ لە نەعلیەکدا،ئەوەی ڕای وایە یەک نەعل یەک ئاوزەنگی پانی هەیە

**٥٨٥٧-قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە نەعلی پێغەمبەر ﷺ دوو ئاوزەنگی هەبوو.**

٥٨٥٨- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عِيسَى بْنُ طَهْمَانَ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ بِنَعْلَيْنِ لَهُمَا قِبَالاَنِ، فَقَالَ ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ: هَذِهِ نَعْلُ النَّبِيِّ ﷺ[١].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٥٦.

(٢) بڕوانە: ٥٨٥٨.

**٥٨٥٨-عیسای كوڕی تەهمان دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ جوتێ نەعلی بۆ هێناین هەردووكیان دوو ئاوزەنگیان هەبوو، ئینجا سابتی بونانیی (دواتر لە ئەنەسەوە بۆی گێڕاینەوە) وتی: ئەمە نەعلەكانی پێغەمبەرە ﷺ.**

## ٤٢- بابُ القُبَّةِ الحَمْرَاءِ مِنْ أَدَمٍ

٥٨٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلاَلاً أَخَذَ وَضُوءَ النَّبِيِّ ﷺ وَالنَّاسُ يَبْتَدِرُونَ الْوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيْئًا أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ[٢].

## ٤٢- باسی چادرێكی وەك گومەزی لە چەرمی سوور[٣]

**٥٨٥٩-عەونی كوڕی ئەبی جوحەیفە لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە ناو خێوەتێكی سووری چەرمینی دابوو، وەك گومەز وابوو، بیلالیشم دی ئاوی دەستنوێژەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا و خەڵكەكەش پێشبڕكێیان دەكرد بۆ ئەو ئاوی دەست نوێژە (تەبەروكی پێ بكەن)، جا هەر كەسێ هەندێ لەو ئاوەی دەست بكەوتایە دەیهێنا بەدەم و چاوی خۆیدا، هەركەسیش هیچی دەست نەكەوتایە بە تەڕی دەستی هاوڕێكەی دەستی تەڕ دەكرد و (دەیهێنا بە دەم و چاویدا)**

٥٨٦٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ح. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الأَنْصَارِ، وَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ[١].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٥٧.

(٢) بڕوانە: ١٨٧.

(٣) چەرمی خۆشەكراوی ڕەنگ كراو بە سوور. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٦٤/١٢.

**٥٨٦٠-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای ئەنصارییەکان لە گومەزێکی چەرمدا کۆی کردنەوە.**

## ٤٣- بابُ الجُلُوسِ عَلَى الحَصِيرِ وَنَحْوِهِ

٥٨٦١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَحْتَجِرُ حَصِيرًا بِاللَّيْلِ فَيُصَلِّي، وَيَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ فَيَجْلِسُ عَلَيْهِ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَثُوبُونَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَيُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ حَتَّى كَثُرُوا، فَأَقْبَلَ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، خُذُوا مِنَ الأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ مَا دَامَ وَإِنْ قَلَّ»[٢].

## ٤٣- باسی دانیشتن لە سەر حەسیر و شتی لەو جۆرە

**٥٨٦١- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەشەودا حەسیرێکی گێڕابوویەوە[٣] (لە نێوان خۆی و خەڵکەکەدا) و نوێژی دەکرد، بەڕۆژیشدا حەسیرەکەی دادەخست و لەسەری دادەنیشت، ئینجا خەڵکی دەستیان بەهاتن کرد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ ئەودا نوێژیان دەکرد هەتا زۆر بوون، ئینجا پێغەمبەریش ﷺ ڕووی تێکردن و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە کار و بەندایەتیەك بکەن لە تواناتاندا بێت، چونکە دڵنیابن خوا بێزار نابێت تا ئێوە ماندوو دەبن، وە بەڕاستی خۆشەویسترین کردەوە بەلای خواوە ئەوەیە بەردەوام بێت با کەمیش بێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٣١٤٦.

(٢) بڕوانە: ٧٢٩، ١٩٧٠.

(٣) وەک پەردەیەک یان دیوارێک لە نێوان خۆی و خەڵکەکەدا گێڕابوویەوە.

## ٤٤- بابُ الْمُزَرَّرِ بِالذَّهَبِ

٥٨٦٢ - وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، أَنَّ أَبَاهُ مَخْرَمَةَ قَالَ لَهُ: يَا بُنَيِّ، إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدِمَتْ عَلَيْهِ أَقْبِيَةٌ فَهْوَ يَقْسِمُهَا، فَاذْهَبْ بِنَا إِلَيْهِ، فَذَهَبْنَا فَوَجَدْنَا النَّبِيَّ ﷺ فِي مَنْزِلِهِ، فَقَالَ لِي: يَا بُنَيِّ، ادْعُ لِي النَّبِيَّ ﷺ: فَأَعْظَمْتُ ذَلِكَ، فَقُلْتُ: أَدْعُو لَكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: يَا بُنَيَّ إِنَّهُ لَيْسَ بِجَبَّارٍ. فَدَعَوْتُهُ فَخَرَجَ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ مُزَرَّرٌ بِالذَّهَبِ، فَقَالَ: «يَا مَخْرَمَةُ، هَذَا خَبَأْنَاهُ لَكَ». فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ[1].

## ٤٤- باسی قۆپچەی ئاڵتونی[2] (بە پۆشاکەوە)

**٥٨٦٢- میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە کە مەخرەمەی باوکی پێی وت: ئەی کوڕی خۆم بێگومان پێم گەشتووە کە پێغەمبەر ﷺ چەند کەوایەکی بۆهاتووە و دابەشی دەکات، بابڕۆین بۆ لای ئێمەش ڕۆشتین و زانیمان پێغەمبەر ﷺ لەماڵی خۆیانە، باوکم پێی وتم: کوڕی خۆم پێغەمبەرم ﷺ بۆ بانگ بکە، منیش ئەوەم لا گران و قورس بوو وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کەم بۆ تۆ؟ باوکم وتی: کوڕی خۆم بڕوا بکە ئەو زۆردار و ستەم کار نییە، منیش بۆم بانگ کرد، پێغەمبەریش ﷺ هاتە دەرەوە و کەوایەکی دیباجی قۆپچە ئاڵتونی لەبەردابوو. فەرمووی: ((ئەی مەخرەمە ئەمەمان شاردبوویەوە بۆ تۆ))، ئیتر کەواکەی پێدا.**

## ٤٥- بابُ خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ

٥٨٦٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: نَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ عَنْ سَبْعٍ: نَهَى عَنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٥٩٩.

(٢) یان پەتێک بۆ بەستنی پۆشاک لە ئاڵتوون بێت لە بری قۆپچە پۆشاکەی ببەستێ بەیەکەوە.

خَاتَمِ الذَّهَبِ -أَوْ قَالَ: حَلْقَةِ الذَّهَبِ- وَعَنِ الْحَرِيرِ، وَالإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ، وَالْقَسِّيِّ، وَآنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَأَمَرَنَا بِسَبْعٍ: بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَرَدِّ السَّلاَمِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ[1].

## ٤٥- باسی (حوکمی پۆشینی) ئەنگوستیلەی ئاڵتون

**٥٨٦٣- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ کردین لە حەوت شت: وە ڕێگری کرد لە ئەموستیلەی ئاڵتوون- یان فەرمووی هەڵقەی ئاڵتون- ئاوریشم و ئاوریشمی ئەستوور و دیباج[2] و سەر زینی سوور و قەسسیی[3] و قاپ و قاچاغی زیو، وە فەرمانی پێ کردین بە حەوت شت: بە سەردانی کردنی نەخۆش و بەشوێن کەوتنی تەرم و، وتنی** (یرحمك الله) **بەکەسێ دەپژمێ و دەڵێ:** (الحمد لله) **و وەڵامدانەوەی سەلام وەڵامدانەوەی دەعوەتکەر و نەخستنی (سوێندی) سوێند خۆر، وە یارمەتی دانی ستەم لێکراو.**

٥٨٦٤- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ نَهِيكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ. وَقَالَ عَمْرٌو: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، سَمِعَ النَّضْرَ، سَمِعَ بَشِيرًا مِثْلَهُ.

**٥٨٦٤-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ڕێگری کرد لە ئەنگوستیلەی زێڕ.**

**-عەمر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە کە لە نەزری بیستووە ئەویش لە بەشیری بیستووە وێنەی فەرموودەکەی پێشوو.**

---

(١) بڕوانە: ١٢٣٩.
(٢) دیباج جۆرێکە لە ئاوریشم.
(٣) قەسی قوماشێکی کەتانە ئاوریشمی تێکەڵە.

٥٨٦٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ، فَاتَّخَذَهُ النَّاسُ، فَرَمَى بِهِ، وَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ أَوْ فِضَّةٍ[١].

**٥٨٦٥- عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی دروست کرد و نقێمەکەی کردە لای بەری دەستی، ئینجا خەڵکیش دروستیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فڕێی دا و ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروست کرد.**

## ٤٦- بابُ خَاتَمِ الفِضَّةِ

٥٨٦٦- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ -أَوْ فِضَّةٍ- وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَاتَّخَذَ النَّاسُ مِثْلَهُ، فَلَمَّا رَآهُمْ قَدِ اتَّخَذُوهَا رَمَى بِهِ، وَقَالَ: «لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا». ثُمَّ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ الْفِضَّةِ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَلَبِسَ الْخَاتَمَ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ ثُمَّ عُثْمَانُ، حَتَّى وَقَعَ مِنْ عُثْمَانَ فِي بِئْرِ أَرِيسَ[٢].

## ٤٦- باسی ئەنگوستیلەی زیو (دروستە بۆ پیاو)

**٥٨٦٦-ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیو یان زێڕی دروست کرد و نقێمەکەی کردە لای بەری دەستی، نەقشەکەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو، ئینجا خەڵکیش وێنەی ئەو ئەنگوستیلەیان دروست کرد، جا کە پێغەمبەر ﷺ بینی کە ئەوان دروستیان کرد فڕێی دا و فەرمووی: ((هەرگیز نای پۆشم)، لە پاشان ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروست کرد، خەڵکیش**

---

(١) بروانە: ٥٨٦٦، ٥٨٦٧، ٥٨٧٣، ٥٨٧٦، ٦٦٥١، ٧٢٩٨.

(٢) بروانە: ٥٨٦٥.

**ئەنگوستیلەی زیویان دروست کرد. ئیبنو عومەر دەڵێ: لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەبو بەکر لە پەنجەی کرد و پۆشی، پاشان عومەر پاشان عوسمان ﷺ هەتا ئەنگوستیلەکە لە دەستی عوسمان بەربوویەوە کەوتە بیری ئەرییسەوە[1].**

## ٤٧- بابٌ

٥٨٦٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ، دِينَارٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فَنَبَذَهُ فَقَالَ: «لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا». فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ[2].

## ٤٧- باسێک

**٥٨٦٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لە دەست کرد، پاشان فڕێی داو فەرمووی: ((هەرگیز لە دەستی ناکەم))، ئیتر خەڵکەکەش ئەنگوستیلەکانیان فڕێدا.**

٥٨٦٨- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ رَأَى فِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ يَوْمًا وَاحِدًا، ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اصْطَنَعُوا الْخَوَاتِيمَ مِنْ وَرِقٍ وَلَبِسُوهَا، فَطَرَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمَهُ، فَطَرَحَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ. تَابَعَهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ وَزِيَادٌ وَشُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ ابْنُ مُسَافِرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: أَرَى خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ.

**٥٨٦٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە تەنها یەك ڕۆژ ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ بینی، لە پاشان خەڵکیش ئەنگوستیلەی**

---

(١) زۆر بۆی گەڕان نەیان دۆزیەوە.

(٢) بڕوانە: ٥٨٦٥.

زیویان دروست کرد و له دەستیان کرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەکەی فڕێدا، خەڵکەکەش ئەنگوستیلەکانیان فڕێدا.

-هەریەك له ئیبراهیمی کوڕی سەعد و زیاد و شوعەیب له زوهریەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونس دەکەن.

-ئیبنو موسافیر له زوهریەوە بەم شێوەیە (أَرَى خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ)[1] گێڕاویەتیەوە.

## ٤٨- بابُ فَصِّ الخَاتَمِ

٥٨٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ: هَلِ اتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا؟ قَالَ: أَخَّرَ لَيْلَةً صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ خَاتَمِهِ. قَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَنَامُوا، وَإِنَّكُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلاَةٍ مَا انْتَظَرْتُمُوهَا»[2].

## ٤٨- باسی نقێمی ئەموستیله

٥٨٦٩-حومەید دەڵێ: پرسیار له ئەنەس ﷺ کرا ئایا پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەی دروست کردوە؟ ئەنەس وتی: شەوێکیان نوێژی عیشای دواخست بۆ نیوەی شەو، ئینجا ڕووی تێکردین، جا دەڵێی ئێستا سەیری بریقەی ئەموستیلەکەی دەکەم فەرمووی: ((بێگومان خەڵکی نوێژیان کرد و خەوتن، بەڵام ئێوە له نوێژدان تا چاوەڕوانی نوێژ بکەن)).

٥٨٧٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ حُمَيْدًا يُحَدِّثُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ خَاتَمُهُ مِنْ فِضَّةٍ وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ. وَقَالَ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ: حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ، سَمِعَ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

(١) تەنها جیاوازی لەگەڵ گێڕانەوەکەی پێشوودا وشەی (أرى) لەگەڵ (رأى).

(٢) بڕوانە: ٥٧٢.

**٥٨٧٠- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەکەی لە زیو دروست کرد بوو، وە نقێمەکەی لە خۆی بوو.**

**-یەحیای کوڕی ئەیوب دەڵێ: حومەید بۆی گێڕامەوە کە لە ئەنەسی بیستووە ئەنەسیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[٢].**

## ٤٩- بابُ خَاتَمِ الحَدِيدِ

٥٨٧١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلاً يَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: جِئْتُ أَهَبُ نَفْسِي. فَقَامَتْ طَوِيلاً، فَنَظَرَ وَصَوَّبَ، فَلَمَّا طَالَ مُقَامُهَا، فَقَالَ رَجُلٌ: زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ. قَالَ: «عِنْدَكَ شَيْءٌ تُصْدِقُهَا؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «انْظُرْ». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنْ وَجَدْتُ شَيْئًا. قَالَ: «اذْهَبْ فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ». فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ قَالَ: لاَ وَاللَّهِ وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ. وَعَلَيْهِ إِزَارٌ مَا عَلَيْهِ رِدَاءٌ، فَقَالَ: أُصْدِقُهَا إِزَارِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِزَارُكَ إِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسْتَهُ لَمَ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ». فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَلَسَ، فَرَآهُ النَّبِيُّ ﷺ مُوَلِّيًا فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ، فَقَالَ: «مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟». قَالَ سُورَةُ كَذَا وَكَذَا لِسُوَرٍ عَدَّدَهَا. قَالَ: «قَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[٣].

## ٤٩- باسی ئەموستیلەی ئاسن

**٥٨٧١-عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو حازیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە لە سەهلی ﷺ بیست دەیوت: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم، وە ئافرەتەکە ماوەیەکی زۆر وەستا، پێغەمبەریش ﷺ سەیری**

---

(١) بڕوانە: ٦٥.

(٢) ئەم ڕشتە موعلەقەی بۆیە هێناوە تا بیسەلمێنێ کە حومەید ئەم فەرموودەی لە ئەنەس بیستووە.

(٣) بڕوانە: ٢٣١٠.

**کرد و سەری داخست، جا کە ئافرەتەکە زۆر مایەوە، پیاوێك وتی: مارەی کە بۆ من ئەگەر تۆ پێویستت پێی نییە، فەرمووی: ((هیچت هەیە بە مارەیی پێی بدەیت؟))** [١] **وتی: نەخێر، فەرمووی: ((سەیرکە)) جا ڕۆشت و پاشان گەڕایەوە وتی: وەڵڵاهی هیچم دەست نەکەوت، فەرمووی: ((بڕۆ بگەڕێ با ئەموستیلەیەکی ئاسنیش بێت))، ئەویش ڕۆشت پاشان گەڕایەوە و وتی: نەبوو وەڵڵاهی ئەموستیلەیەکی ئاسنیش نەبوو، ئیزارێکی**[٢] **لەبەردا بوو، ڕیدای**[٣] **لەبەردا نەبوو، وتی ئەم ئیزارەم دەکەمە مارەیی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئیزارەکەت ئەگەر ئافرەتەکە بیپۆشیت تۆ هیچت لەبەردا نابێت، وە ئەگەر تۆ بیپۆشیت ئافرەتەکە هیچی لەبەردا نابێ))، ئیتر پیاوەکە ڕۆشتە دواوە جا پێغەمبەر ﷺ بینی پشتی هەڵکرد و ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد و بانگ کرا، ئینجا فەرمووی پێی: ((لە قورئان چیت لەبەرە؟)) وتی: ئەو سوڕەتە و ئەو سوڕەتە چەند سوڕەتێکی ژمارد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئافرەتەمان مارەکرد لێت بەو سوڕەتانەی قورئان کە لەبەرتن)).**

## ٥٠- بابُ نَقْشِ الخَاتَمِ

٥٨٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى رَهْطٍ -أَوْ أُنَاسٍ- مِنَ الأَعَاجِمِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلاَّ عَلَيْهِ خَاتَمٌ، فَاتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، فَكَأَنِّي بِوَبِيصِ -أَوْ بِبَصِيصِ- الْخَاتَمِ فِي إِصْبَعِ النَّبِيِّ ﷺأَوْ: فِي كَفِّهِ[٤].

(١) وەک مارەیی پێی بدەیت.

(٢) (ئیزار): پۆشاکێکە بۆ نێوان ناوک و ئەژنۆیە.

(٣) (رداء) پۆشاکێکە لە ناوکی مرۆڤ بۆ سەروە بەکاردێت پێشی دەڵێن پشتەماڵ.

(٤) بڕوانە: ٦٥.

## ٥٠- باسی نووسینی ئەموستیلەکە[١] (چۆن بوو)

**٥٨٧٢-قەتادە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی نامە بنوسێت بۆ کۆمەڵێ-یان بۆکەسانێك- لە عەجەمەکان، بۆیە عەرزی کرا، ئەوانە نامەیەك وەرناگرن (نایخوێننەوە) مۆر نەکرابێ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ ئەموستیلەیەکی زیوی دروست کرد نەخشەکەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو، دەڵێی بە بەرچاومەوەیە لەپەنجەی پێغەمبەردا ﷺ یان لە ناودەستیدا بوو.**

٥٨٧٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، وَكَانَ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ بَعْدُ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ، ثُمَّ كَانَ بَعْدُ فِي يَدِ عُمَرَ، ثُمَّ كَانَ بَعْدُ فِي يَدِ عُثْمَانَ، حَتَّى وَقَعَ بَعْدُ فِي بِئْرِ أَرِيسَ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ[٢].

**٥٨٧٣-ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەموستیلەیەکی لە زیو دروست کرد لە دەستیدا بوو، پاشان دواتر لە دەستی ئەبو بەکردا رضي الله عنه بوو، پاشان دواتر لە دەستی عومەردا رضي الله عنه بوو، پاشان دواتر لە دەستی عوسمان دا رضي الله عنه بوو هەتا دواتر کەوتە بیری ئەریسەوە. نەخشەکەی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو.**

## ٥١- بابُ الخَاتَمِ فِي الخِنْصَرِ

٥٨٧٤- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ خَاتَمًا قَالَ: «إِنَّا اتَّخَذْنَا خَاتَمًا، وَنَقَشْنَا فِيهِ نَقْشًا، فَلاَ يَنْقُشْ عَلَيْهِ أَحَدٌ». قَالَ: فَإِنِّي لأَرَى بَرِيقَهُ فِي خِنْصَرِهِ[١].

---

(١) مەبەست ئەو نووسینەیە کە لە نقێمەکەدا نووسرا بوو.

(٢) بڕوانە: ٥٨٦٥.

## ٥١- باسی ئەموستیله کردنه پەنجه توته

٥٨٧٤-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەکەی دروست کرد فەرمووی: ((ئێمە ئەموستیلەیەکمان دروست کردوه نووسینێکمان تێدا نووسیوه کەواتە کەس نووسینی وا لەسەر ئەموستیلەکەی نەنوسێت))، ئەنەس دەڵێ: جا من شەوقی ئەموستیلەکەیم دەبینی کە لە پەنجە توتەیدا بوو(دەڵێی بە پێش چاومەوەیە).

## ٥٢- بَابُ اتِّخَاذُ الْخَاتَمِ لِيُخْتَمَ بِهِ الشَّيْءُ، أَوْ لِيُكْتَبَ بِهِ إِلَى أَهْلِ الْكِتَابِ وَغَيْرِهِمْ

٥٨٧٥- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ قِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لَنْ يَقْرَءُوا كِتَابَكَ إِذَا لَمْ يَكُنْ مَخْتُومًا. فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَكَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ.

## ٥٢- باسی ئەموستیله دروست کردن تا مۆری شتی پێ بکرێ،یان بۆ ئەوەی نامەی پێ بنوسرێت بۆ نامە دارەکان و خەڵکانی تریش

٥٨٧٥-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی نامە بنوسێت بۆ ڕۆمەکان، عەرزی کرا، ئەوان هیچ نامەیەك ناخوێننەوە ئەگەر مۆرنەکرابێت، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ ئەوستیلەیەکی زیوی دروست کرد، نەخشەکەشی (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) بوو، جا دەڵێی ئێستا سەیری شەوقی ئەموستیلەکە دەکەم لەدەستیدا.

---

(١) بڕوانە: ٦٥.

## ٥٣- بابُ مَنْ جَعَلَ فَصَّ الخَاتَمِ فِي بَطْنِ كَفِّهِ

٥٨٧٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، جَعَلَ فَصَّهُ فِي بَطْنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَاصْطَنَعَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَرَقِيَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ فَقَالَ: «إِنِّي كُنْتُ اصْطَنَعْتُهُ، وَإِنِّي لاَ أَلْبَسُهُ». فَنَبَذَهُ، فَنَبَذَ النَّاسُ. قَالَ جُوَيْرِيَةُ: وَلاَ أَحْسِبُهُ إِلاَّ قَالَ: فِي يَدِهِ الْيُمْنَى[1].

## ٥٣- باسی ئەو کەسەی نقێمی ئەموستیلەکەی کردۆتە لای بەری دەستی

**٥٨٧٦-نافیع دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵا ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەموستیلەیەکی لە ئاڵتون دروست کرد، وە نقێمەکەی دەکردە لای بەری دەستی کاتێ لە دەستی کرد، ئیتر خەڵکیش ئەموستیلەی ئاڵتونیان دروست کرد، (پێغەمبەر ﷺ) چوویە سەر دوانگە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و جا وتی: ((بێگومان من خۆم دروستم کرد، وە هەر خۆم لەدەستی ناکەم)) ئینجا فڕێیدا، ئەوسا خەڵکەکەش فڕێیاندا.**

**جوەیرییە دەڵێ: گومان دەبەم کە وتی: لە دەستی ڕاستیدا بوو.**

## ٥٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَا يَنْقُشُ أحد عَلَى نَقْشِ خَاتَمِهِ»

٥٨٧٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. وَقَالَ: «إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، وَنَقَشْتُ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَلاَ يَنْقُشَنَّ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٦٥.

(٢) بڕوانە: ٦٥.

## ٥٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((کەس لە شێوەی نووسینی ئەموستیلەکەی ئەو (پێغەمبەر ﷺ) نەنوسێت (لە ئەموستیلەکەی) ))

**٥٨٧٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەموستیلەیەکی زیوی دروست کرد و لێی نووسی** (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)، **وە فەرمووی: من ئەموستیلەیەکی زیوم دروست کردوە لێم نووسیوە** (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)، **جا با کەس ئەو شێوە نوسینە لە موستیلەکەی نەنوسێت)).**

## ٥٥- بابٌ: هَلْ يُجْعَلُ نَقْشُ الخَاتَمِ ثَلاثَةَ أسْطُرٍ؟

٥٨٧٨- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ، وَكَانَ نَقْشُ الْخَاتَمِ ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ[١].

## ٥٥- باسێک:ئایا نووسینی موستیلە دەکرێتە سێ دێڕ؟

**٥٨٧٨-سومامە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ ئەبو بەکر ﷺ کرایە جێنشین (ڕێژەکانی زەکاتی) نووسی بۆ ئەنەس و نەقشی (نوسینی) مۆرەکەی سێ دێڕ بوو،** (مُحَمَّدٌ) **دێڕێك بوو** (رَسُولُ) **دێڕێك بوو** (اللَّهِ)**ش دێڕێك بوو.**

**٥٨٧٩** - قَالَ أَبو عبدالله وَزَادَنِي أَحْمَدُ: حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ فِي يَدِهِ، وَفِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَفِي يَدِ عُمَرَ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ،

---

(١) بڕوانە: ١٤٤٨.

فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسَ، قَالَ: فَأَخْرَجَ الْخَاتَمَ، فَجَعَلَ يَعْبَثُ بِهِ فَسَقَطَ. قَالَ: فَاخْتَلَفْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مَعَ عُثْمَانَ فَنَنْزَحُ الْبِئْرَ فَلَمْ نَجِدْهُ[1].

**٥٨٧٩-ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەحمەد ئەم زیادەی بۆ گێڕامەوە وتی: ئەنصاری بۆی گێڕامەوە وتی: (محمدی کوڕی عەبدوڵلای) باوکم بۆ گێڕامەوە لە سومامەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: ئەموستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە دەستیدا بوو، دوای ئەوە لە دەستی ئەبو بەکردا بوو ﷺ، پاش ئەبو بەکر لە دەستی عومەردا بوو ﷺ، ئینجا کاتێ عوسمان بوو بەجێنشین لەسەر بیری ئەرییس دانیشت، ئەنەس دەڵێ: جا ئەموستیلەکەی دەرهێنا یاری پێ دەکرد،کەوتە بیرەکە، (ئەنەس) دەڵێ: ئینجا سێ ڕۆژ لەگەڵ عوسماندا لەناو بیرەکەوە بۆی گەڕاین، ئاوی بیرەکەمان دەردا نەمان دۆزییەوە.**

## ٥٦- بَابُ الْخَاتَمِ لِلنِّسَاءِ

وَكَانَ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ خَوَاتِيمُ ذَهَبٍ.

٥٨٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَصَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ. وَزَادَ ابْنُ وَهْبٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ: فَأَتَى النِّسَاءَ فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِيمَ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ[2].

## ٥٦- باسی (حوکمی لە دەست کردنی) ئەموستیلە بۆ ئافرەتان

**- عائیشە ﵂ چەند ئەموستیلەیەکی ئاڵتونی لە دەستا بوو.**

**٥٨٨٠-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ، ئینجا پێش وتاردان نوێژی (جەژنی) کرد.**

---

(١) بڕوانە: ٦٥.

(٢) بڕوانە: ٩٨.

-ئیبنو وەهب لە ئیبنو جورەیجەوە ئەم زیادەی هێناوە[١]: ئینجا پێغەمبەر ﷺ چوویە لای ژنەکان، جا ژنەکان بازن و ئەموستیلەکانیان فڕێ دەدایە کراسەکەی بیلالەوە.

## ٥٧- بابُ الْقَلاَئِدِ وَالسِّخَابِ لِلنِّسَاءِ يَعْنِي: قِلاَدَةً مِنْ طِيبٍ وَسُكٍّ

٥٨٨١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ عِيدٍ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تَصَدَّقُ بِخُرْصِهَا وَسِخَابِهَا[٢].

## ٥٧- باسی (حوکمی لە مل کردنی) ملوانکە و ملوانکەی گوڵە مێخەک بۆ ئافرەتان. مەبەستی بە (السِّخاب) ملوانکەی گوڵە مێخەک وشتی تری بۆن خۆشە

٥٨٨١- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕۆشتە دەرەوە (بۆ نوێژگە) دوو ڕکات نوێژی کرد، نە لە پێشیەوە و نە لە پاشیەوە نوێژی (سوننەتی) نەکرد، لە پاشان چوو بۆ لای ئافرەتان و فەرمانی پێکردن بەماڵ بەخشین، ئیتر ئافرەتان دەستیان کرد بە بەخشینی گوارە و گوڵە مێخەکەکانیان.

## ٥٨- بابُ اسْتِعَارَةِ الْقَلاَئِدِ

٥٨٨٢- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ هَلَكَتْ قِلاَدَةٌ لأَسْمَاءَ، فَبَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَلَبِهَا رِجَالاً، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ وَلَيْسُوا عَلَى

---

(١) واتە:لە فەرموودەکەی پێشوو ئەمەی بۆ زیاد کراوە سەرەڕای ئەوەی پێشوو ئەمەشی لەگەڵ دایە.
(٢) بڕوانە: ٩٨.

وُضُوءٍ وَلَمْ يَجِدُوا مَاءً، فَصَلَّوْا وَهُمْ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ. زَادَ ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ: اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ[1].

## ٥٨- باسی خواستنی ملوانكه

**٥٨٨٢-هیشامی كوڕی عورووه له باوكیەوه دەگێڕێتەوه ئەویش له عائیشەوه ﵂ دەڵێ: ملوانكەیەكی ئەسما ون بوو، پێغەمبەریش ﷺ چەند پیاوێكی نارد بۆ دۆزینەوه و پەیداكردنی، ئینجا كاتی نوێژ بوو دەست نوێژیان نەبوو، ئاویشیان دەست نەكەوت، بۆیە بەبێ دەست نوێژ نوێژیان كرد، پاشان ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوه، ئیتر بەو هۆیەوه ئایەتی تەیەموم دابەزی.**
**-ئیبنو نومەیر له هیشامەوه ئەویش له باوكیەوه له عائیشەوه ﵂ ئەو بەشەی له فەرموودەكەی پێشو زیاد كردوە: ملوانكەیەكی له ئەسما خواست.**

## ٥٩- بابُ القُرْطِ لِلنِّسَاءِ

قَالَ ابن عَبَّاسٍ ﵄: أَمَرَهُنَّ النَّبِيُّ ﷺ بِالصَّدَقَةِ، فَرَأَيْتُهُنَّ يَهْوِينَ إِلَى آذَانِهِنَّ وَحُلُوقِهِنَّ.
٥٨٨٣- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَدِيٌّ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدًا، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ الْعِيدِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي قُرْطَهَا[2].

## ٥٩- باسی گواره بۆ ئافرەتان

**-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەئافرەتان كرد ماڵ ببەخشن، منیش ئافرەتانم بینی دەستیان دەبرد بۆگوێیان و گەردنیان[1].**

---

(١) بڕوانه: ٣٣٤.
(٢) بڕوانه: ٩٨.

**٥٨٨٣-ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا دوو ڕکات نوێژی (جەژنی) کرد، نە لە پێشیەوە نە لە پاشیەوە نوێژی (سوننەتی) نەکرد، لە پاشان چوو بۆ لای ژنان و بیلالیشی لەگەڵدا بوو، ئینجا فەرمانی پێکردن بەماڵ بەخشین، ئەوسا ژنان دەستیان کرد بەفڕێدانی گوارەکانیان (بۆ کۆشی بیلال).**

## ٦٠- بابُ السِّخَابِ لِلصِّبْيَانِ

٥٨٨٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الحَنْظَلِيُّ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ بْنُ عُمَرَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سُوقٍ مِنْ أَسْوَاقِ الْمَدِينَةِ، فَانْصَرَفَ فَانْصَرَفْتُ؛ فَقَالَ: «أَيْنَ لُكَعُ؟ -ثَلَاثًا- ادْعُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ». فَقَامَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ يَمْشِي وَفِي عُنُقِهِ السِّخَابُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ هَكَذَا، فَقَالَ الحَسَنُ بِيَدِهِ هَكَذَا، فَالْتَزَمَهُ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنَ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ بَعْدَ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا قَالَ[٢].

## ٦٠- باسی ملوانکەی گوڵە مێخەک بۆ منداڵان

**٥٨٨٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە بازاڕێك لە بازاڕەکانی مەدینەدا، پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە منیش گەڕامەوە، ئینجا سێ جار فەرمووی: ((کوڕە بچکۆل لە کوێیە؟)) حەسەنی کوڕی عەلیش هەستا و هات و ملوانکەیەکی گوڵەمێخەکی لە ملدا بوو، پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی ئاوەها دەکرد**

(١) بۆ لێکردنەوەی گوارە و ملوانکەکانیان و بەخشینی لە ڕێی خوادا.

(٢) بڕوانە: ٢١٢٢.

(وەك كەسێك بیەوێت دەست بكاتە ملی كەسێكی تر)، حەسەنیش دەستی ئاوەها لێ دەكرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ باوەشی پیا كرد و فەرمووی: ((خوایە من خۆشم دەوێ و تۆش خۆشت بوێ، ئەو كەسەشت خۆش بوێ كە خۆشی دەوێ))، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جا هیچ كەس بەقەدەر حەسەنی كوڕی عەلی لای من خۆشەویست نەبوو دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموودەی فەرموو.

## ٦١- بابٌ: المُتَشَبِّهُونَ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتُ بِالرِّجَالِ

٥٨٨٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ المُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ. تَابَعَهُ عَمْرٌو، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ[١].

## ٦١- باسێك: پیاوانی ژنانی،ژنانی كوڕانی[٢]

٥٨٨٥-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كرد لەو پیاوانەی خۆیان لە ئافرەتان دەچوێنن، وە لەو ژنانەی خۆیان لە پیاوان دەچوێنن.
-عەمر دەڵێ: شوعبە (ئەم فەرموودەی) بۆگێڕاینەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی غوندور دەكات.

## ٦٢- بابُ الأمر بإخراجهم

٥٨٨٦- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ المُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنَ النِّسَاءِ، وَقَالَ: «أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ». قَالَ: فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فُلَانًا، وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلَانًا.

---

(١) بڕوانە: ٥٨٨٦، ٦٨٣٤.

(٢) پیاوانی خۆیان لە ژن دەچوێنن لە جل و بەرگدا یان لە قسە و هەڵسوكەوتدا، ژنانیش بە پێچەوانەوە.

## ٦٢- باسی دەرکردنی (پیاوانی) سەرژنانی لە ماڵەکان

**٥٨٨٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کرد لە پیاوانی سەرژانی، وە لە ژنانی کوڕانی، وە فەرموویەتی: ((ئەو پیاوە سەرژنانیانە لە ماڵەکانتان دەریان کەن))، ئیبنو عەبباس دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ فلانە پیاوی دەکرد و عومەریش ﷺ فلانە پیاوی دەکرد.**

٥٨٨٧- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، أَنَّ عُرْوَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ زَيْنَبَ ابْنَةَ أَبِي سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ أَخْبَرَتْهَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا وَفِي الْبَيْتِ مُخَنَّثٌ، فَقَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ أَخِي أُمِّ سَلَمَةَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، إِنْ فُتِحَ لَكُمْ غَدًا الطَّائِفُ فَإِنِّي أَدُلُّكَ عَلَى بِنْتِ غَيْلاَنَ، فَإِنَّهَا تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَدْخُلَنَّ هَؤُلاَءِ عَلَيْكُنَّ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ يَعْنِي: أَرْبَعَ عُكَنِ بَطْنِهَا، فَهْيَ تُقْبِلُ بِهِنَّ، وَقَوْلُهُ: وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. يَعْنِي: أَطْرَافَ هَذِهِ الْعُكَنِ الأَرْبَعِ؛ لأَنَّهَا مُحِيطَةٌ بِالْجَنْبَيْنِ حَتَّى لَحِقَتْ، وَإِنَّمَا قَالَ: بِثَمَانٍ. وَلَمْ يَقُلْ: بِثَمَانِيَةٍ. وَوَاحِدُ الأَطْرَافِ وَهْوَ ذَكَرٌ؛ لأَنَّهُ لَمْ يَقُلْ: ثَمَانِيَةَ أَطْرَافٍ[1].

**٥٨٨٧-هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە کە عوروە بۆی گێڕاوەتەوە کە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئوممو سەلەمە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لای ئەو (ئوممو سەلەمە) بوو، پیاوێکی ژنانی لە ماڵدا بوو وتی بە عەبدوڵڵای برای ئوممو سەلەمە: ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر سبەی تائیفتان بۆ ئازادکرا، من کچی غەیلانت نیشان دەدەم، چونکە بەڕاستی کەبەرەو ڕووت دێت (نەرم ونۆڵ و) چوار لۆیەکە پشت هەڵدەکات و دەڕوات (نەرم و نۆڵ و) هەشت لۆیە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ڕێگە مەدەن ئا ئەمانە هاتوچۆتان بکات)).**

(١) بڕوانە: ٤٣٢٤.

**ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: (تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ) واتە چوار لۆی ورگی، چونکە لە پێشەوە کە دێت چوار لۆیە (وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ) واتە: قەراغی چوار لۆکەی پێشەوە چونکە لۆکان چواردەوری هەردوو تەنیشتیان داوە تادەگەنەوە بەیەك. وەوتویەتی: (بِثَمَانٍ) نەیوتووە (بِثَمَانِيَةٍ) لەگەڵ ئەوەشدا کە (الأَطْرَاف) کۆیە و تاکەکەی (طَرَفٌ) نێرە و تەمییزە، چونکە نەیوتووە: (ثَمَانِيَةَ أَطْرَافٍ) واتە: وشە (أَطْرَاف) نەوتووە**[1].

## ٦٣- بابُ قصِّ الشَّارِبِ

وَكَانَ ابن عُمَرَ ﷺ يُحْفِي شَارِبَهُ حَتَّى يُنْظَرَ إِلَى بَيَاضِ الجِلْدِ، وَيَأْخُذُ هَذَيْنِ، يَعْنِي: بَيْنَ الشَّارِبِ وَاللِّحْيَةِ.

٥٨٨٨- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ حَنْظَلَةَ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ أَصْحَابُنَا، عَنِ الْمَكِّيِّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِنَ الْفِطْرَةِ قَصُّ الشَّارِبِ»[2].

## ٦٣- باسی سمێڵ کورت کردنەوە(سوننەتە)

**-ئیبنو عومەر ﷺ هەمیشە سمێڵی زۆر کورت دەکردەوە، هەتا سپییای پێستەکەی (ژێر سمێڵەکە) دەبینرا، وە لەم دووانەی دەگرت و کورتی دەکردەوە، واتە: نێوانی سمێڵ و ڕیشی**[3].

**٥٨٨٨-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سمێڵ کورت کردنەوە لە سروشتە پاکەکانە)).**

---

(١) لەو کاتە کە تەمییزەکە نەوترابێت لە ڕستەکەدا کە وشەی: (أَطْرَاف) دروستە ژمارەکە (بِثَمَانٍ) یان (بِثَمَانِيَةٍ) بێت هەردووکی ڕاستە و دروستە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٥٨٥/١٢.

(٢) بڕوانە: ٥٨٩٠.

(٣) مەبەستی لەو شوێنەی ڕیش و سمێڵ دەگەن بەیەک، ئەو شوێنەی کورت دەکردەوە کە دەکاتە کورت کردنەوەی سمێڵ و ڕیشیش لەو جێگایەدا کە نێوانیانە.

٥٨٨٩- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: الزُّهْرِيُّ حَدَّثَنَا، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رِوَايَةً: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ -أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ- الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ»[1].

**٥٨٨٩-ئەبو هورەیرە ﷺ بەگێڕانەوە گێڕاویەتیەوە (لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی): ((سروشتە پاکەکان پێنجن- یان پێنج شت لە سروشتە پاکەکانن- خەتەنەکردن، بەرتاشین، هەڵکەندنی توکی بن باڵ، کردنی نینۆکەکان، کورت کردنەوەی سمێڵ )).**

## ٦٤- بابُ تَقْلِيمِ الأَظْفَارِ

٥٨٩٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ حَنْظَلَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِنَ الْفِطْرَةِ حَلْقُ الْعَانَةِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ»[2].

## ٦٤- باسی نینۆک کردن

**٥٨٩٠-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((لە سروشتە پاکەکانە: تاشینی بەر، کردنی نینۆکەکان، کورت کردنەوەی سمێڵ)).**

٥٨٩١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الآبَاطِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٩١، ٦٢٩٧.

(٢) بڕوانە: ٥٨٨٨.

**٥٨٩١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((پێنج شت لە سروشتی پاکە: خەتەنەکردن، بەر تاشین، کورت کردنەوەی سمێڵ، کردنی نینۆکەکان، هەڵکەندنی توکی بن باڵ)).**

٥٨٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَفِّرُوا اللِّحَى، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا حَجَّ أَوِ اعْتَمَرَ قَبَضَ على لِحْيَتِهِ، فَمَا فَضَلَ أَخَذَهُ[٢].

**٥٨٩٢- ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((پێچەوانەی هاوبەش دانەران بکەن ڕیش بەردەنەوە[٣] سمێڵ زۆر کورت کەنەوە))، ئیبنو عومەر ﷺ ئەگەر حەج یا عومرەی بکردایە بەدەستی ڕیشی دەگرت، جا هەرچی لە گرتنەکە زیاد بوایە دەیبڕی.**

## ٦٥- بابُ إِعْفَاءِ اللِّحَى. ﴿عَفَوا ﴿٩٥﴾﴾ الأعراف: كَثُرُوا وَكَثُرَتْ أَمْوَالُهُمْ

٥٨٩٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْهَكُوا الشَّوَارِبَ، وَأَعْفُوا اللِّحَى»[٤].

## ٦٥- باسی بەردانەوەی ڕیش[٥]. ﴿عَفَوا ﴿٩٥﴾﴾: زۆر بوون گەشەیان کرد لە ماڵ و ساماندا

**٥٨٩٣-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سمێڵ زۆر کورت کەنەوە، ڕیشیش وازی لێ بێنن بازۆر بێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٨٨٩.

(٢) بڕوانە: ٥٨٩٣.

(٣) وازی لێ بێنن با زۆر بێ کورتی مەکەنەوە.

(٤) بڕوانە: ٥٨٩٢.

(٥) واتە: دەستکاری نەکردنی بە کورت کردنەوە و تاشین و هەڵکەندن.

## ٦٦- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الشَّيْبِ

٥٨٩٤- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا: أَخَضَبَ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ إِلاَّ قَلِيلاً[1].

## ٦٦- باسی ئەوە دەوترێ دەربارەی مووی سپی (سەر و ڕیش)[2]

**٥٨٩٤-موحەمەد کوڕی سیرین وتی: پرسیارم لە ئەنەس ﷺ کرد ئایا پێغەمبەر ﷺ سەر و ڕیشی ڕەنگ کرد، ئەنەس وتی: پێغەمبەر ﷺ مووی سپی نەبوو چەند موویەکی کەم نەبێ.**

٥٨٩٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ عَنْ خِضَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَبْلُغْ مَا يَخْضِبُ، لَوْ شِئْتُ أَنْ أَعُدَّ شَمَطَاتِهِ فِي لِحْيَتِهِ[3].

**٥٨٩٥-سابیت دەڵێ: پرسیار لە ئەنەس ﷺ کرا دەربارەی بۆیەکردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەنەس وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە موی سپی نەبوو بۆیەی بکات، ئەگەر بمویستایە مووە سپیەکانی ڕیشی بژمێرم (دەمژمارد).**

٥٨٩٦- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ -وَقَبَضَ إِسْرَائِيلُ ثَلاَثَ أَصَابِعَ- مِنْ قُصَّةٍ فِيهِ شَعَرٌ مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ إِذَا أَصَابَ الإِنْسَانَ عَيْنٌ أَوْ شَيْءٌ بَعَثَ إِلَيْهَا مِخْضَبَهُ، فَاطَّلَعْتُ فِي الحُجُلِ فَرَأَيْتُ شَعَرَاتٍ حُمْرًا[4].

---

(١) بڕوانە: ٣٥٥٠.

(٢) ئایا ڕەنگ بکرێ یان دەسکاری نەکرێت.

(٣) بڕوانە: ٣٥٥٠.

(٤) بڕوانە: ٥٨٩٧، ٥٨٩٨.

**٥٨٩٦- ئیسرائیل دەگێڕێتەوە لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەبەوە ماڵەوەمان (هاوسەرم) بە جامێ ئاوەوە ناردمی بۆ لای ئوممو سەلەمە ﵂ - ئیسرائیل سێ پەنجەی قوچی[1] -لە زیو[2] بوو، موویەك لەمووەکانی پێغەمبەر ﷺ تیا بوو، جا ئەگەر کەسێك ببوایە بەچاوەوە یان شتێکی توش ببوایە دەفرێکی دەنارد بۆ ئوممو سەلەمە ﵂[3] (عوسمان دەڵێ) سەیرم کرد چەند موویەکی سورم بینی تێیدا.**

٥٨٩٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا سَلاَّمٌ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا شَعَرًا مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ ﷺ مَخْضُوبًا[4].

**٥٨٩٧-عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەب دەڵێ: ڕۆشتم بۆ ماڵی ئوممو سەلەمە ﵂ جا چەند موویەکی لە مووەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەرهێنایین ڕەنگ کرابوون بە خەنە.**

٥٨٩٨ - وَقَالَ لَنَا أَبُو نُعَيْمٍ: حَدَّثَنَا نُصَيْرُ بْنُ أَبِي الأَشْعَثِ، عَنِ ابْنِ مَوْهَبٍ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ أَرَتْهُ شَعَرَ النَّبِيِّ ﷺ أَحْمَرَ[5].

**٥٨٩٨-ئەبو نوعەیم پێی وتین: نوصەیری کوڕی ئەبولئەشعەس بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو مەوهەبەوە کە ئوممو سەلەمە ﵂ مووەکانی پێغەمبەری ﷺ پیشان داوە سوور بوون.**

---

(١) واتە جامەکە زۆر بچوک بوو بە ئەندازەی سێ پەنجە بوو، یان عوسمان هاوسەری سێ جار ناردویەتی بۆ لای ئوممو سەلەمە ﵂ ئیبنو لحەجەر مانای یەکەمی لا ڕاستە دووەمی لا هەڵەیە. بڕوانە: فتح الباري: ٤٣٢/١٣.

(٢) لە زیو: واتە جامەکە زیو بوو، ئەگەر (من فضة) بێت کە ئیبنولحەجەر دەڵێ ئەوە وتەی ڕاستە بەلای موحەقیقینەوە، بەڵام ئەگەر (من فصة) بێت واتە:هەندێ تاڵە موو پێکەوە بێت، یان بەمانای جامێک کە لەگەچ یان قصڵ بوو. بڕوانە: فتح الباري: ٤٣٢/١٣.

(٣) ئوممو سەلەمەش ﵂ مووەکانی دەخستە ناو دەفرەکەوە دەیشۆرد و مووەکانی دەردەهێنا ئاوی ناو دەفرەکەی دەدایەوە بە کەسەکە و دەیخواردەوە، یان خۆی پێ دەشۆرد بۆ شیفا و چاکبوونەوە.

(٤) بڕوانە: ٥٨٩٦.

(٥) بڕوانە: ٥٨٩٦.

## ٦٧- بَابُ الخِضَابِ

٥٨٩٩- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ»(١).

## ٦٧- باسی خەنە تێگرتن (٢)

**٥٨٩٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان جولەکە و گاورەکان (سەر و ڕیش) بۆیاخ ناکەن، دەی ئێوە پێچەوانەی ئەوان بن (بۆیاخ بکە) )).**

## ٦٨- بَابُ الجَعْدِ

٥٩٠٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ، وَلَيْسَ بِالأَبْيَضِ الأَمْهَقِ، وَلَيْسَ بِالآدَمِ، وَلَيْسَ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلاَ بِالسَّبْطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعَرَةً بَيْضَاءَ(٣).

## ٦٨- باسی قژی لوول

**٥٩٠٠- ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕەحمان لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە لێی بیستووە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نە زۆر درێژ نە زۆر کورت بوو، نە زۆر سپی نە گەنم ڕەنگ بوو، قژی لولێکی زۆر لوول نەبوو**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٦٢.

(٢) واتە:بۆیە کردنی سەر و ڕیش بە خەنە یان بۆیە.

(٣) بڕوانە: ٣٥٤٧.

**خاوێکی زۆر خاویش نەبوو، خوا لە چل ساڵیدا کردی بە پێغەمبەر، ئینجا لە مەککەدا دە ساڵ مایەوە، وە لە مەدینەش دە ساڵ مایەوە، ئینجا خوا لە شەست[١] ساڵیدا بردیەوە بۆ لای خۆی لە کاتێکدا لە سەر و ڕیشیدا بیست تاڵ مووی سپی تیا نەبوو.**

٥٩٠١- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، سَمِعْتُ الْبَرَاءَ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ بَعْضُ أَصْحَابِي، عَنْ مَالِكٍ: إِنَّ جُمَّتَهُ لَتَضْرِبُ قَرِيبًا مِنْ مَنْكِبَيْهِ. قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُهُ غَيْرَ مَرَّةٍ، مَا حَدَّثَ بِهِ قَطُّ إِلاَّ ضَحِكَ. تَابَعَهُ شُعْبَةُ: شَعَرُهُ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ[٢].

**٥٩٠١-ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە بەڕائم ﷺ بیست دەیوت: کەسم نەدیوە پۆشاکی سووری[٣] لەبەردابێ لە پێغەمبەر ﷺ جوانتر بێ.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) یەکێك لە هاوڕێکانم لە مالیکەوە[٤] دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بێگومان قژی سەری پێغەمبەر ﷺ (کە درێژ بووایە) دەیدا لە نزیك هەردوو شانی.**

**ئەبو ئیسحاق دەڵێ: گوێم لە بەڕائەوە بوو ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە زیاد لە جارێك هەر کاتێك بیگێڕایەتەوە پێدەکەنی.**

**شوعبە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەبو ئیسحاقی سوبەیعی کردوە لە:** (شَعَرُهُ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ) **واتە: قژی دەگەشتە نەرمەی گوێیەکانی.**

---

(١) مەبەستی لە شەستەکانی تەمەنیدا وەفاتی کردوە، چونکە لە شەست و سێ ساڵیدا وەفاتی کردوە.

(٢) بروانە: ٣٥٥١.

(٣) پۆشاکەکە تەنها سوور نەبوون بەڵکو پۆشاکێکی یەمەنی بووە خەتی سووری تیا بووە (إرشاد الساري:١٢\٥٩٥).

(٤) مالیک کوڕی ئیسماعیلە، ئیسماعیلیش مامۆستای بوخارییە.

٥٩٠٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُرَانِي اللَّيْلَةَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَرَأَيْتُ رَجُلاً آدَمَ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، لَهُ لِمَّةٌ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ اللِّمَمِ، قَدْ رَجَّلَهَا، فَهْيَ تَقْطُرُ مَاءً، مُتَّكِئًا عَلَى رَجُلَيْنِ -أَوْ على عَوَاتِقِ رَجُلَيْنِ- يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَسَأَلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ. وَإِذَا أَنَا بِرَجُلٍ جَعْدٍ قَطَطٍ أَعْوَرِ العَيْنِ الْيُمْنَى كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، فَسَأَلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ»[١].

**٥٩٠٢-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەم شەو لە خەودا خۆم بینی لای کەعبەدا بووم، ئنیجا پیاوێکی ئەسمەرم بینی وەك جوانترین پیاو بوو لە پیاوە ئەسمەرەکاندا مرۆڤ بینیبێتی، قژێکی هەبوو دەیدا لە شانەکانی جوانترین قژ بوو، لەو شێوە قژە مرۆڤ بینیبێتی، جوان قژی داهێنابوو، سەری ئاوی لێ دەتکا، خۆی دابوو بەسەر دوو پیاودا یان خۆی دابوو بەسەر شانی دوو پیاودا، تەواف دەکرد بەدەوری کەعبە دا، منیش پرسیارم کرد ئەمە کێیە؟ وترا: مەسیحی کوڕی مەریەمە، هەر لەو کاتەدا پیاوێکی ترم دی قژی زۆر لوول بوو چاوی ڕاستی کوێر بوو، وەك دەنکە ترێیەك وابوو دەرپۆقی بێت [٢] ئینجا پرسیارم کرد ئەمە کێیە؟ وترا: ئەمە مەسیحی دەججالە)).**

٥٩٠٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ أَخْبَرَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ[٣].

**٥٩٠٣- قەتادە دەڵێ: ئەنەس ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەر ﷺ قژی سەری هەمیشە دەیدا لە هەردوو شانی.**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٤٠.

(٢) واتە: چاوی ئاسای نەبوو لە قوڵای دابێت بەڵکو بەدەرەوە بوو.

(٣) بڕوانە: ٥٩٠٤.

٥٩٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُ النَّبِيِّ ﷺ مَنْكِبَيْهِ[1].

**٥٩٠٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قژی سەری هەمیشە دەیدا لە هەردوو شانی.**

٥٩٠٥- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَنْ شَعَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجِلاً، لَيْسَ بِالسَّبِطِ وَلاَ الْجَعْدِ، بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَعَاتِقِهِ[2].

**٥٩٠٥-قەتادە دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ كرد دەربارەی قژی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنەسیش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قژێكی هەبوو نەخاو بوو نەلوول، لە نێوان گوێیەكان و شانیدا بوو.**

٥٩٠٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ضَخْمَ الْيَدَيْنِ، لَمْ أَرَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَكَانَ شَعَرُ النَّبِيِّ ﷺ رَجِلاً لاَ جَعْدَ، وَلاَ سَبِطَ[3].

**٥٩٠٦-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستەكانی گەورە بوون، لە پاش ئەو وێنەی ئەوم نەدیوە، وە قژی پێغەمبەر ﷺ نەلوول بوو نەخاو و بوو.**

٥٩٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ضَخْمَ الْيَدَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، حَسَنَ الْوَجْهِ، لَمْ أَرَ بَعْدَهُ وَلاَ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَكَانَ بَسِطَ الْكَفَّيْنِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٥٩٠٣.

(٢) بڕوانە: ٥٩٠٦.

(٣) بڕوانە: ٥٩٠٥.

**٥٩٠٧-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (سەری و) دەستەکانی و پێیەکانی گەورە بوون، ڕووخساری جوان بوو، نە لە پاش ئەو نە لە پێش ئەو وێنەی ئەوم نەدیوە، وە دەستەکانی کراوە بوو [٢].**

٥٩٠٨- ٥٩٠٩- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هَانِئٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ -أَوْ عَنْ رَجُلٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ- قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ضَخْمَ الْقَدَمَيْنِ، حَسَنَ الْوَجْهِ، لَمْ أَرَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ[٣].

**٥٩٠٨-٥٩٠٩- قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ -یان لە پیاوێکەوە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ - وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێیەکانی گەورە بوون، ڕووخساری جوان بوو، لە پاش ئەوە وێنەی ئەوم نەدیوە.**

٥٩١٠ - وَقَالَ هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ شَثْنَ الْقَدَمَيْنِ وَالْكَفَّيْنِ[٤].

**٥٩١٠-هیشام لە مەعمەرەوە دەگێڕێتەوە لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە ﷺ دەڵێ: پێیەکانی و دەستەکانی ئەستوور[٥] و نەرم بوون.**

٥٩١١- ٥٩١٢- وَقَالَ أَبُو هِلَالٍ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ -أَوْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ- كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ضَخْمَ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، لَمْ أَرَ بَعْدَهُ شَبَهًا لَهُ[٦].

---

(١) بڕوانە: ٥٩٠٨، ٥٩١٠، ٥٩١١.
(٢) دەستەکانی کراوە بوون لە شێوە و لە بەخشیندا، دەگونجێ مەبەست بەکراوەی نەرم شلی بێت.
(٣) بڕوانە: ٥٩٠٧.
(٤) بڕوانە: ٥٩٠٧.
(٥) پێیەکانی و پەنجەکانی و دەستەکانی ناو لەپی ئەستوور بوون، لە هەمان کاتدا نەرم وشل بوون.
(٦) بڕوانە: ٥٩٠٧.

**٥٩١١- ٥٩١٢- ئەبو هیلال دەڵێ: قەتادە بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسەوە -یان لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەست و هەردوو پێیەکانی گەورە بوون، لە پاش ئەو هاوشێوەیم نەدیوە.**

٥٩١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فَذَكَرُوا الدَّجَّالَ، فَقَالَ: إِنَّهُ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَمْ أَسْمَعْهُ قَالَ ذَاكَ، وَلَكِنَّهُ قَالَ: «أَمَّا إِبْرَاهِيمُ فَانْظُرُوا إِلَى صَاحِبِكُمْ، وَأَمَّا مُوسَى فَرَجُلٌ آدَمُ جَعْدٌ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ مَخْطُومٍ بِخُلْبَةٍ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ إِذِ انْحَدَرَ فِي الْوَادِي يُلَبِّي»[1].

**٥٩١٣- موجاهید دەڵێ: ئێمە لە خزمەت عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دا بووین ﷺ، جا باسی دەججالیان دەکرد و کەسێکیان وتی: لە نێو چاوانی نووسراوە کافر عەبدوڵلای کوڕی عەبباسیش وتی: من ئەم ووتەیەم نەبیستووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سەبارەت بەئیبراهیم سەیری هاورێکەتان کەن (مەبەستی خۆی بوو)، وە سەبارەت بەمووسا ﷺ پیاوێکە گەنم ڕەنگی قژ لول بوو بە سواری وشترێکی سووری ڕەشۆ کراوبوو، بە ڕەشۆیەکی قایمی بادراو ئەڵێی بە پێش چاومەوەیە سەیری دەکەم کاتێ دادەبەزێ بۆ ناو شیوەکە دەنگی بەرز دەکردەوە بە تەلبیەکردن)).**

## ٦٩- بابُ التَّلْبِيدِ

٥٩١٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ ضَفَّرَ فَلْيَحْلِقْ، وَلاَ تَشَبَّهُوا بِالتَّلْبِيدِ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُلَبِّدًا[2].

---

(١) بڕوانە: ١٥٥٥.

(٢) بڕوانە: ١٥٤٠.

## ٦٩- باسی پێکەوە نوسانی قژ وەک لباد[1]

**سالیمی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێ: لە عومەرم ﷺ بیست دەیوت: هەر کەسێك قژی کردوە بەپەلکە با سەری بتاشێت، وە خۆتان مەچوێنن بەوانەی قژیان پێکەوە نووساند وەك لباد[2]، وە ئیبنو عومەر ﷺ دەیوت: سوێند بەخوا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی قژی پێکەوە نووساند بوو وەك لباد[3].**

٥٩١٥- حَدَّثَنِي حِبَّانُ بْنُ مُوسَى وَأَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالاَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ مُلَبِّدًا يَقُولُ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ». لاَ يَزِيدُ عَلَى هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ[4].

**٥٩١٥- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ئیحرامی دابەست قژی سەری بەستبوویەوە و لۆکی[5] کردبوو بەدەنگی بەرز** (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ)**ی دەوت و لەم وشانە زیاتر هیچی نەدەوت.**

٥٩١٦- حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا بِعُمْرَةٍ وَلَمْ تَحْلِلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: «إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلاَ أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ»[6].

---

(١) کۆکردنەوە و پێکەوە نووسانی قژی سەر بە سرێژ و هەنگوین و شتی وا، تا وەک لبادی لێ بێ، بۆ ئەوەی لە کاتی حەجدا لێی هەڵنەوەرێ و ئەسپێ هەڵنەهێنێ.

(٢) ئەو کارە لە غەیر ئیحرامدا ناپەسەندە، وە لە ئیحرامدا سوننەتە.

(٣) ئیبنو عومەر وای زانی باوکی قژ پێکەوە نوسانی پێ باش نیە بۆیە وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ دیوە قژی پێکەوە نوساندووە.

(٤) بڕوانە: ١٥٤٠.

(٥) واتە: قژی بەهەنگوین یا سرێژ پێکەوەوە نوساند، تا مووی لێ هەڵنەوەرێ و ڕشک و ئەسپێ هەڵنەهێنێ.

(٦) بڕوانە: ١٥٦٦.

٥٩١٦- حەفصەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆچی ئەو خەڵکەی تر عومرەیان کرد و ئیحرامیان شکاند، بەڵام تۆ بەکردنی عومرەکەت ئیحرامت نەشکاند، فەرمووی: ((من قژم پێکەوە نووساندووە و ئاژەڵی دیاریم هێناوە و نیشانەم کردوە، بۆیە ئیحرام ناشکێنم تا وشترەکەم سەرنەبڕم)).

## ٧٠- بابُ الْفَرْقِ

٥٩١٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ، وَكَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ، فَسَدَلَ النَّبِيُّ ﷺ نَاصِيَتَهُ، ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ[1].

## ٧٠- باسی داهێنانی قژ لە ناوەڕاستی سەردا بەملا و لادا [2]

٥٩١٧- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد وەك خاوەن نامەکان بکات لەو شتانەدا فەرمانی پێنەکرابوو دەربارەی، خاوەن نامەکانیش قژی سەریان بەدەوری سەریاندا بەردەدایەوە، بەڵام بتپەرستەکان قژیان لە ناوەڕاستی سەریاندا بەم لاولادا لا دەدا، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا قژی پێشە سەری شۆڕدە کردەوە و بەردەدایەوە (بەدەوری سەریدا)، پاشان لە ناوەڕاستدا بەم لاولادا لایدا.

---

(١) بڕوانە: ٣٥٥٨.

(٢) بەجۆرێ هەر نیوەی بەلایەکدا دابێنێ خەتی ناوەڕاستی سەر دیار بێ.

٥٩١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفَارِقِ النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ مُحْرِمٌ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٥٩١٨- عائیشه ﵂ دەڵێ: ئەڵێی بەدیار چاومەوەیە بریسکەی ئەو بۆن خۆشییەی لە خەتی سەری پێغەمبەردا ﷺ بوو لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو. عەبدوڵلا (ی کوڕی ڕەجا) وتی: (فی مَفرِقِ النَبِیَ ﷺ) لەجیاتی (فی مَفارِقِ النَبِیَ ﷺ)[2].**

## ٧١- بابُ الذَّوَائِبِ

٥٩١٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ عَنْبَسَةَ، أَخْبَرَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ ح. وَحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ خَالَتِي، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَهَا فِي لَيْلَتِهَا، قَالَ: فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، قَالَ: فَأَخَذَ بِذُؤَابَتِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ.

حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ بِهَذَا، وَقَالَ: بِذُؤَابَتِي أَوْ بِرَأْسِي[3].

## ٧١- باسی پرچ[4]

**٥٩١٩-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: شەوێك لەلای مەیمونەی کچی حاریسی پورم مامەوە، ئەو شەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ لای بوو، سەرەی بوو لای بێ، دەڵێ:**

---

(١) بڕوانە: ٢٧١.

(٢) ئیمامی بوخاری لە دووکەسەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە هەریەکەیان بەجۆرێ گێڕاویەتیەوە ئەبولوەلید بە (فِي مَفارِق النَبيّ ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی ڕەجاش بە (فِي مَفْرِقِ النَبيّ ﷺ) گێڕاویەتیەوە.

(٣) بڕوانە: ١١٧.

(٤) ذؤابة: پەلکەشی پێ دەوترێ.

**ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا شەونوێژی دەکرد، منیش لای چەپیەوە وەستام[1]، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) پرچی گرتم و خستمیە لای ڕاستیەوە.**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ) عەمری کوڕی موحەممەد بۆی گێڕامەوە وتی: هوشەیم بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەبو بیشر ئەم فەرموودەی بۆگێڕاینەوە وتی: پرچی گرتم یان سەری گرتم.**

## ٧٢- بابُ الْقَزَعِ

٥٩٢٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَخْلَدٌ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ حَفْصٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ نَافِعٍ أَخْبَرَهُ، عَنْ نَافِعٍ -مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ- أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: قُلْتُ: وَمَا الْقَزَعُ؟ فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ قَالَ: إِذَا حَلَقَ الصَّبِيَّ وَتَرَكَ هَا هُنَا شَعَرَةً، وَهَا هُنَا وَهَا هُنَا. فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَجَانِبَيْ رَأْسِهِ. قِيلَ لِعُبَيْدِ اللَّهِ: فَالْجَارِيَةُ وَالْغُلَامُ؟ قَالَ: لَا أَدْرِي، هَكَذَا قَالَ: الصَّبِيِّ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: وَعَاوَدْتُهُ فَقَالَ: أَمَّا الْقُصَّةُ وَالْقَفَا لِلْغُلَامِ فَلَا بَأْسَ بِهِمَا، وَلَكِنَّ الْقَزَعَ أَنْ يُتْرَكَ بِنَاصِيَتِهِ شَعَرٌ وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ غَيْرُهُ، وَكَذَلِكَ شَقُّ رَأْسِهِ هَذَا وَهَذَا[2].

## ٧٢- کاکۆڵ [3]

**ئیبنو جورەیج دەڵێ: عوبەیدوڵڵای کوڕی حەفص بۆی گێڕامەوە کە عومەری کوڕی نافیع بۆی گێڕایەوە-نافیعی ئازادکراوی عەبدوڵڵا- کە لە ئیبنو عومەری رضي الله عنهما بیست دەیوت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست ڕێگری دەکرد لە قەزەع،**

---

(١) پاش ئەوەی دەست نوێژی گرت.

(٢) بڕوانە: ٥٩٢١.

(٣) واتە: هەموو سەری منداڵ بتاشیت جگە لە پێشە سەر کە بەکوردی پێی دەڵێن کاکۆڵ (قزع)، بە جۆرێ تریش مانا کراوە کە پەڵە پەڵە سەری بتاشێ هەندێکی بتاشێ و هەندێکی نەتاشێت.

**عەبدوڵلاوە دەڵێ: وتم (بەعومەری کوڕی نافیع): قەزەع چییە؟ (ئیبنو جورەیج دەڵێ): عوبەیدوڵلا ئاماژەی کرد بۆمان (کە نافیع) دەڵێ: کە منداڵ سەری بتاشرێ لێرە و لەوێ و لەوێ هەندێ شوێن بهێڵرێتەوە، عوبەیدوڵلا ئاماژەی بۆ ناوچاوانی و هەردوو لاجانگی کرد، بە عوبەیدوڵلا وترا: کچ و کوڕ (وەك یەك وان)؟ وتی: نازانم نافیع هەر وتی منداڵ، عوبەیدوڵلا وتی: دووبارە گەڕامەوە بۆلای (عومەری کوڕی نافیع) وتی: مووی لاجانگ و مووی پشتی سەر زەرەری نییە، ئەوەی ناپەسەندە کاکۆڵە کە ناوچاوانی نەتاشرێ و ئەویتری سەری بتاشرێ، یا ئەملا و ئەولای سەری بێڵێتەوە (وەك زلفی جوولەکە).**

٥٩٢١- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُثَنَّى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْقَزَعِ[1].

**٥٩٢١-عەبدوڵلای کوڕی دینار لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە کاکۆڵ.**

## ٧٣- بابُ تَطْيِيبِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا بِيَدَيْهَا

٥٩٢٢- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: طَيَّبْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِيَدِي لِحُرْمِهِ، وَطَيَّبْتُهُ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ[2].

## ٧٣- باسی بۆنخۆش کردنی ژن بۆ مێردەکەی بە دەستی (ژنەکە) خۆی

**٥٩٢٢-عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: بەدەستەکانی خۆم بۆنی خۆشم لە پێغەمبەردا ﷺ لەبەر**

(١) بڕوانە: ٥٩٢٠.

(٢) بڕوانە: ١٥٣٩.

ئیحرام پۆشینی، هەروەها لە میناش بۆنی خۆشم لێدا پێش ئەوەی (بڕوات) تەوافی ئیفازە[١] بکات.

## ٧٤- بابُ الطِّيبِ فِي الرَّأْسِ وَاللِّحْيَةِ

٥٩٢٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ النَّبِيَّ ﷺ بِأَطْيَبِ مَا يَجِدُ، حَتَّى أَجِدَ وَبِيصَ الطِّيبِ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ[٢].

## ٧٤- باسی بۆن خۆش دان لەسەر و ڕیش (دروستە)

**٥٩٢٣- عائیشە ﵂ دەڵێ: من بە بۆن خۆشترین بۆن هەمان بوایە[٣] پێغەمبەرم ﷺ بۆن خۆش دەکرد، هەتا بریسکە و شەوقی بۆنە خۆشەکەم بەسەر و ڕیشیەوە دەبینی.**

## ٧٥- بابُ الامْتِشَاطِ

٥٩٢٤- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي دَارِ النَّبِيِّ ﷺ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَحُكُّ رَأْسَهُ بِالْمِدْرَى، فَقَالَ: «لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الإِذْنُ مِنْ قِبَلِ الأَبْصَارِ»[٤].

---

(١) کە لەڕۆژی یەکەمی چەژندایە پاش ڕەجمی شەیتان.

(٢) بڕوانە: ٢٧١.

(٣) لە گێڕانەوەیەکدا: پێغەمبەر ﷺ هەیبوایە.

(٤) بڕوانە: ٦٢٤١، ٦٩٠١.

## ٧٥- باسی قژ داهێنان به شانه (سوننەته)

٥٩٢٤-زوهری له سەهلی كوڕی سەعدەوه ﷺ دەگێڕێتەوه كه پیاوێك له كونێكەوه سەیری ماڵی پێغەمبەر ﷺ كرد- پێغەمبەریش ﷺ بەئاسنێ وەك دانی شانه[1] سەری دەخوراند- فەرمووی: ((ئەگەر بمزانیایه تۆ سەیر دەكەیت ئەم (ئاسن)ـەم دەكرد بەچاوتدا، بێگومان بۆیه مۆڵەت وەرگرتن دانراوه لەبەر بینینی ( ئەوەی ناشەرعییه ڕوونەدات) )).

## ٧٦- بَابُ تَرْجِيلِ الحَائِضِ زَوْجَهَا

٥٩٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ.

٥٩٢٥م- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ مِثْلَهُ[2].

## ٧٦- باسی قژداهێنانی ئافرەتی حەیزدار بۆ مێردی

٥٩٢٥- عائیشه ﷺ دەڵێ: من سەری پێغەمبەری خوام ﷺ دائەهێنا له كاتێكدا من له حەیزدا بووم.

٥٩٢٥م- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) عەبدوڵڵای كوڕی یوسف بۆی گێڕاینەوه وتی: مالیك بۆی گێڕاینەوه له هیشامەوه له باوكیەوه له عائیشەوه ﷺ وێنەی فەرموودەكەی پێشوو گێڕایەوه.

---

(١) یان تەختەیەک وەک دانی شانە.

(٢) بڕوانە: ٢٩٥.

## ٧٧- بابُ التَّرْجِيلِ

٥٩٢٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ مَا اسْتَطَاعَ فِي تَرَجُّلِهِ وَوُضُوئِهِ[1].

## ٧٧- قژ داهێنان (لە لای ڕاستەوە سوننەتە)

**٥٩٢٦- عائیشە ﵂ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەمیشە پێشخستنی لای ڕاستی پێخۆش بوو، ئەوەندەی بۆی بکرایە و لە توانایدا بووایە لە قژداهێنان و لەدەست نوێژگرتنیدا.**

## ٧٨- بابُ مَا يُذْكَرُ فِي الْمِسْكِ

٥٩٢٧- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ، إِلاَّ الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَلَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[2].

## ٧٨- باسی ئەوەی دەوترێت دەربارەی میسک

**٥٩٢٧-ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە (پێغەمبەریش لە خواوە دەگێڕێتەوە) فەرموویەتی: ((هەموو کردەوەیەکی بنیادەم بۆ خۆیەتی جگەلە ڕۆژوو،کە بێگومان ڕۆژوو بۆ منە و منیش پاداشتی دەدەمەوە، وە بەڕاستی بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٦٨.

(٢) بڕوانە: ١٨٩٤.

## ٧٩- بابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الطِّيبِ

٥٩٢٨- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ كُنْتُ أُطَيِّبُ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ إِحْرَامِهِ بِأَطْيَبِ مَا أَجِدُ[١].

## ٧٩- باسی ئەوەی سوننەتە لە بۆنی خۆش

**٥٩٢٨-عوسمانی کوڕی عوروە لە باوکیەوە و ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: من بۆنی خۆشم لە پێغەمبەر ﷺ دەدا لە کاتی ئیحرام پۆشیندا، بە بۆن خۆشترین بۆن کەدەستم کەوتایە.**

## ٨٠- بابُ مَنْ لَمْ يَرُدَّ الطِّيبَ

٥٩٢٩- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَزْرَةُ بْنُ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ أَنَّهُ كَانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ[٢].

## ٨٠- باسی ئەو کەسەی وەرگرتنی بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە

**٥٩٢٩- عەزرەی کوڕی سابیتی ئەنصاری دەڵێ: سومامەی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە لە ئەنەسەوە ﵁ کە ئەنەس ﵁ بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە و دەیوت: پێغەمبەر ﷺ بۆنی خۆشی نەدەگەڕاندەوە.**

---

(١) بڕوانە: ١٥٣٩.

(٢) بڕوانە: ٢٥٨٢.

## ٨١- بابُ الذَّرِيرَةِ

٥٩٣٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ -أَوْ مُحَمَّدٌ عَنْهُ- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُرْوَةَ، سَمِعَ عُرْوَةَ وَالْقَاسِمَ يُخْبِرَانِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِيَدَيَّ بِذَرِيرَةٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ لِلْحِلِّ وَالإِحْرَامِ[1].

## ٨١- باسی زەریرە[2]

**٥٩٣٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: بەدەستەکانی خۆم پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش کرد لە کاتی ئیحرام شکاندن و لە کاتی ئیحرام پۆشیندا.**

## ٨٢- بابُ الْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ

٥٩٣١- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ تَعَالَى، مَالِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر[3].

## ٨٢- باسی (نەفرین کردن لە) لەو ژنانەی ددانیان باریک و بچووک دەکەنەوە بۆ جوانی[4]

**٥٩٣١- عەلقەمە لە عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خوا نەفرینی کردوە لە ئافرەتانی خاڵ کوت و ئەو ئافرەتانی داوا دەکەن خاڵیان بۆ بکوترێت، وە (ئەو**

---

(١) بڕوانە: ١٥٣٩.

(٢) جۆرە بۆنێکی خۆشی تێکەڵاوە لە هیندەوە دەهێنرێت. بڕوانە: إرشاد الساري:٦٠٩/١٢.

(٣) بڕوانە: ٤٨٨٦.

(٤) دانیان بە بڕبەند و شتی وا باریک دەکەنەوە و بچووکی دەکەنەوە نێوان دانەکانیان زۆر دەکەن بۆ جوانی. بڕوانە: إرشاد الساري:٦١٠/١٢.

ئافرەتانەی موو هەڵدەگرن) ئەو ئافرەتانەی موویان بۆ هەڵدەگرن[١]، هەروەها ئەو ئافرەتانەی ددان شاش دەکەن بەمەبەستی جوان کردن، ئەو ئافرەتانە دروست کراوەکانی خوا دەگۆڕن، (عەبدوڵلا وت): چۆن نەفرین ناکەم لە یەکێ پێغەمبەری خوا نەفرینی لێ کردوە، ئەویش لە قورئانەکەی خوادایە: (ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەری بگرن).

## ٨٣- بابُ الْوَصْلِ فِي الشَّعَرِ

٥٩٣٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ عَامَ حَجَّ وَهْوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَهْوَ يَقُولُ- وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ بِيَدِ حَرَسِيٍّ: أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ وَيَقُولُ: «إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ»[٢].

## ٨٣- باسی (نەفرین کردن) لەلکاندنی قژی تر بەقژەوە

٥٩٣٢- حومەیدی کوڕی عبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەڵێ: لە ساڵی حەجکردندا لە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی بیست کاتێ لەسەر دوانگە بوو- هەندی قژی کاکۆڵ بەدەستی پاسەوانیەکەوە بوو لێی وەرگرت - دەیوت: زاناکانتان لە کوێن؟ لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە وێنەی ئەمەی قەدەغە کردوە و دەیفەرموو: ((بێگومان نەوەی ئیسرائیل لەناوچوون کاتێ ئافرەتەکانیان ئەم (کاکۆڵە[٣]) یان کرد (و بەستیان بەقژیانەوە) )).

---

(١) ئەو ئافرەتانەی موی دەموچاویان بۆ هەڵدەگرن و لای دەبەن.

(٢) بڕوانە: ٣٤٦٨.

(٣) یان پەرچەمەیان کرد.

٥٩٣٣ - وَقَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ».

**٥٩٣٣- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و لەو ئافرەتەش قژی بۆ دەلکێنن، هەروەها نەفرەتی کردوە لەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و لەو ئافرەتەش داوا دەکات خاڵی بۆ بکوتن)).**

٥٩٣٤- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ بْنَ مُسْلِمِ بْنِ يَنَّاقٍ يُحَدِّثُ، عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ جَارِيَةً مِنَ الأَنْصَارِ تَزَوَّجَتْ، وَأَنَّهَا مَرِضَتْ فَتَمَعَّطَ شَعَرُهَا، فَأَرَادُوا أَنْ يَصِلُوهَا فَسَأَلُوا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ». تَابَعَهُ ابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبَانَ بْنِ صَالِحٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ صَفِيَّةَ، عَنْ عَائِشَةَ[1].

**٥٩٣٤- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە کچێکی ئەنصاری شووی کرد، نەخۆش کەوت و قژی وەری، ئینجا ویستیان قژ بلکێنن بەسەریەوە، بۆیە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((خوا نەفرینی کردوە لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و لەو ئافرەتەش قژی بۆ دەلکێنن[2])).**

**-ئیبنو ئیسحاق لە ئەبانی کوڕی صالیحەوە گێڕاوێتیەوە لە حەسەنەوە لە صەفییەوە لە عائیشەوە ﷺ گێڕاوێتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی شوعبەی کردوە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٢٥.

(٢) ئەو ئافرەتەی داوا دەکات قژی بۆبلکێنن.

٥٩٣٥- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا مَنْصُورُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمِّي، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي أَنْكَحْتُ ابْنَتِي، ثُمَّ أَصَابَهَا شَكْوَى فَتَمَرَّقَ رَأْسُهَا، وَزَوْجُهَا يَسْتَحِثُّنِي بِهَا أَفَأَصِلُ رَأْسَهَا فَسَبَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ[1].

**٥٩٣٥- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من کچەکەم داوە بەشوو، پاشان تووشی نەخۆشی بوو قژی سەری وەری، وە مێردەکەی هانم دەدا (بیگوازێتەوە)، قژ بلکێنم بەسەریەوە؟ ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و لەو ئافرەتەش داوا دەکات قژی بۆ پێوە بلکێنن.**

٥٩٣٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنِ امْرَأَتِهِ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ[2].

**٥٩٣٦- ئەسمائی کچی ئەبو بەکر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و لەو ئافرەتەش داوا دەکات قژی بۆ پێوە بلکێنن.**

٥٩٣٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ». قَالَ نَافِعٌ: الوَشْمُ فِي اللِّثَةِ[3].

**٥٩٣٧-عوبەیدوڵڵا دەڵێ: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و**

---

(١) بڕوانە: ٥٩٣٦، ٥٩٤١.

(٢) بڕوانە: ٥٩٣٥.

(٣) بڕوانە: ٥٩٤٠، ٥٩٤٢، ٥٩٤٧.

لەو ئافرەتەش داوا دەكات قژی بۆ بلكێنن، وە ئەو ئافرەتەی خاڵ دەكوتێ وئەو ئافرەتەی داوا دەكات خاڵی بۆ بكوتن))، نافیع وتی: خاڵ كوتان لە پووكی ددان دایە.

٥٩٣٨- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ: قَدِمَ مُعَاوِيَةُ الْمَدِينَةَ آخِرَ قَدْمَةٍ قَدِمَهَا، فَخَطَبَنَا فَأَخْرَجَ كُبَّةً مِنْ شَعَرٍ قَالَ: مَا كُنْتُ أَرَى أَحَدًا يَفْعَلُ هَذَا غَيْرَ الْيَهُودِ، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمَّاهُ الزُّورَ. يَعْنِي: الْوَاصِلَةَ فِي الشَّعَرِ[1].

**٥٩٣٨- سەعیدی كوڕی موسەییەب دەڵێ: موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان هات بۆمەدینە كە كۆتا جاری بوو بێت بۆ مەدینە، جا ووتاری بۆ داین، ئینجا گوڵوڵەیەك مووی دەرهێنا و وتی: من وانازانم جگە لە جوولەكە كەس ئەمە بكات، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بەدرۆ ناو بردووە، مەبەستی موولكێنەرە بەقژی سەرەوە.**

## ٨٤- بابُ الْمُتَنَمِّصَاتِ

٥٩٣٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: لَعَنَ عَبْدُ اللهِ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ. فَقَالَتْ أُمُّ يَعْقُوبَ مَا هَذَا؟ قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَمَا لِيَ لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ، وَفِي كِتَابِ اللهِ. قَالَتْ: وَاللهِ لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ اللَّوْحَيْنِ فَمَا وَجَدْتُهُ. قَالَ: وَاللهِ لَئِنْ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر[2].

(١) بڕوانە: ٣٤٦٨.

(٢) بڕوانە: ٤٨٨٦.

## ٨٤- باسی (نەفرین کردن) لەو ئافرەتانەی مووی (ڕووخساریان) بۆ لادەبەن

٥٩٣٩- عەلقەمە دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ نەفرینی کردوە لە ئافرەتانی خاڵ کوت، (و ئافرەتانی خاڵ بۆ کوتراو) وە (ئافرەتانی دەم و چاو هەڵگر و)[1] ئافرەتانی دەموچاو بۆ هەڵگیراو[2]، هەروەها ئافرەتانی ددان شاشکەر بەمەبەستی جوانی گۆڕەرانی دروست کراوی خوان. ئوممویەعقوب وتی: ئەمە چییە؟ عەبدوڵلاش وتی: چۆن نەفرین ناکەم لە کەسێ پێغەمبەری خوا نەفرینی لێ کردوە؟ وە ئەو کەسە لە قورئانەکەی خواشدا (نەفرینی لێکراوە)، (ئوممو یەعقوب) وتی: سوێند بەخوا و بەڕاستی هەموو ئەوەم خوێندوەتەوە کە لە نێوان هەردوو بەرگی قورئانەکە دایە، بەڵام ئەوم نەدیوە تیایدا، عەبدوڵلا وتی: ئەگەر (بەوردی) بتخوێندایەتەوە بەدڵنیاییەوە دەتبینی: (وە ئەوەی پێغەمبەر پێی دان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێ بێنن).

## ٨٥- بَابُ المَوْصُولَةِ

٥٩٤٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ[3].

## ٨٥- باسی (نەفرین کردن) لەو ئافرەتەی قژی بۆ دەلکێنن

٥٩٤٠- عوبەیدوڵلا دەگێڕێتەوە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ: نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژدەلکێنێ و لەو ئافرەتەش داوا

---

(١) مووهەڵگر وەک ئەوەی لە ساڵۆنەکاندا دەکرێ.

(٢) موو بۆ هەڵگیراو.

(٣) بڕوانە: ٥٩٣٧.

**دەكات قژی بۆبلكێنن، وە ئەو ئافرەتەی خاڵ دەكوتێ و ئەو ئافرەتەی داوا دەكات خاڵی بۆ بكوتن.**

٥٩٤١- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ أَنَّهُ سَمِعَ فَاطِمَةَ بِنْتَ الْمُنْذِرِ تَقُولُ: سَمِعْتُ أَسْمَاءَ قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَتِي أَصَابَتْهَا الْحَصْبَةُ، فَامَّرَقَ شَعَرُهَا، وَإِنِّي زَوَّجْتُهَا، أَفَأَصِلُ فِيهِ؟ فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمَوْصُولَةَ»[1].

**٥٩٤١-ئەسما ﷺ دەڵێ: ژنێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان كچەكەم تووشی سورێژە بووە و قژی وەریوە، وە من داومە بەشوو، ئایا قژی تر بلكێنم بەسەریەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوا نەفرینی كردوە لەو ئافرەتەی قژ دەلكێنێ و لەو ئافرەتەش قژی بۆ پێوە دەلكێنن)).**

٥٩٤٢- حَدَّثَنِي يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا الْفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺأَوْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْوَاشِمَةُ وَالْمُوتَشِمَةُ، وَالْوَاصِلَةُ وَالْمُسْتَوْصِلَةُ». يَعْنِي: لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ[2].

**٥٩٤٢- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست یان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئافرەتەی خاڵ دەكوتێ و ئەو ئافرەتەی داوا دەكات خاڵی بۆ بكوتن، وە ئەو ئافرەتەی قژ دەلكێنێ و ئەو ئافرەتەی داوا دەكات قژی بۆ پێوە بلكێنن)). واتە: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لێ كردن.**

---

(١) بڕوانە: ٥٩٣٥.

(٢) بڕوانە: ٥٩٣٧.

٥٩٤٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ، مَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ[١].

**٥٩٤٣- عەلقەمە لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە وتویەتی: خوا نەفرینی كردوە لەو ئافرەتانەی خاڵ كوتن و ئەو ئافرەتانەش داوا دەكەن خاڵیان بۆ بكوترێت، وە ئەو ئافرەتانەی (موو هەڵدەگرن و) ئەو ئافرەتانەی موویان بۆ هەڵدەگرن[٢]، هەروەها ئەو ئافرەتانەی ددانیان شاش دەكەن بۆ جوانی، ئەو ئافرەتانە دروست كراوەكانی خوا دەگۆڕن. (عەبدوڵڵا وتی): چۆن نەفرین ناكەم لە یەكێ پێغەمبەری خوا نەفرینی لێ كردوە، ئەویش لە قورئانەكەی خوا دایە [٣].**

## ٨٦- بابُ الْوَاشِمَةِ

٥٩٤٤- حَدَّثَنِي يَحْيَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الْعَيْنُ حَقٌّ». وَنَهَى عَنِ الْوَشْمِ[٤].

## ٨٦- باسی (نەفرین كردن) لە ئافرەتی خاڵ كوت

**٥٩٤٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چاوپیسی ڕاستە)) وخاڵ كوتانیشی قەدەغە كرد.**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٨٦.
(٢) ئەو ئافرەتانەی مووی دەم و چاویان بۆ هەڵدەگرن و لای دەبەن.
(٣) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: (ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی هێناون و فەرمانی پێكردوون وەری بگرن).
(٤) بڕوانە: ٥٧٤٠.

٥٩٤٤ /م- حَدَّثَنِي ابْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: ذَكَرْتُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ حَدِيثَ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُهُ مِنْ أُمِّ يَعْقُوبَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مِثْلَ حَدِيثِ مَنْصُورٍ(١).

**٥٩٤٤-سوفیان دەڵێ: فەرموودەکەی مەنصورم گێڕایەوە بۆ عەبدوڕەحمانی کوڕی عابیس کە لە ئیبراهیمەوە گێڕاویەتیەوە لە عەلقەمەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ جا وتی: هاوشێوەی فەرموودەکەی مەنصورم لە ئوممی یەعقوب بیست لە عەبدوڵلاوە.**

٥٩٤٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: رَأَيْتُ أَبِي فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الدَّمِ، وَثَمَنِ الْكَلْبِ، وَآكِلِ الرِّبَا وَمُوكِلِهِ، وَالْوَاشِمَةِ وَالْمُسْتَوْشِمَةِ(٢).

**٥٩٤٥-عەونی کوڕی ئەبی جوحەیفە دەڵێ: باوکمم بینی وتی: بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کرد لە نرخی خوێن و نرخی سەگ، سوو خۆر و سوودەر، وە ئافرەتی خاڵ کوت و ئافرەتێ داوا دەکات خاڵی بۆ بکوترێت.**

## ٨٧- بَابُ الْمُسْتَوْشِمَةِ

٥٩٤٦- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُتِيَ عُمَرُ بِامْرَأَةٍ تَشِمُ، فَقَامَ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ مَنْ سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْوَشْمِ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَا سَمِعْتُ. قَالَ: مَا سَمِعْتَ؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَشِمْنَ وَلاَ تَسْتَوْشِمْنَ».

---

(١) بڕوانە: ٤٨٨٦.

(٢) بڕوانە: ٢٠٨٦.

## ٨٧- باسی (نەفرین کردن) لەو ئافرەتەی داوا دەکات خاڵی بۆ بکوتن

**٥٩٤٦-ئەبو زورعە گێڕایەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ژنێك هێنرا بۆ لای عومەر ﷺ خاڵی دەکوتا، عومەریش هەستا وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا کێ دەربارەی خاڵ کوتان لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی بیستووە؟ ئەبو هورەیرەش ﷺ وتی: منیش هەستام وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران من بیستوومە، وتی: چیت بیستووە؟ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئافرەتان نەخاڵ بکوتن و نەداوا بکەن خاڵتان بۆ بکوترێ)).**

٥٩٤٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ[1].

**٥٩٤٧- عوبەیدوڵڵا دەڵێ: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کرد لەو ئافرەتەی قژ دەلکێنێ و لەو ئافرەتەش داوا دەکات قژی بۆ بلکێنن، وە ئەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و ئەو ئافرەتەی داوا دەکات خاڵی بۆ بکوتن)).**

٥٩٤٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ، مَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٥٩٣٧.

(٢) بڕوانە: ٤٨٨٦.

**٥٩٤٨-عەلقەمە لە عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: خوا نەفرینی کردوە لە ئافرەتانی خاڵ کوت و لەو ئافرەتانەش داوا دەکەن خاڵیان بۆ بکوترێت، وە ئەو ئافرەتانەی (موو هەڵدەگرن و) ئەو ئافرەتانەی موویان بۆهەڵدەگرن [١]، هەروەها ئەو ئافرەتانەی ددانیان شاش دەکەن بۆ جوانی، ئەو ئافرەتانە دروست کراوەکانی خوا دەگۆڕن، (عەبدوڵلا وتی): چۆن نەفرین ناکەم لە یەکێ پێغەمبەری خوا نەفرینی لێ کردوە، ئەویش لە قورئانەکەی خوا دایە[٢].**

## ٨٨- بابُ التَّصَاوِيرِ

٥٩٤٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ تَصَاوِيرُ».
وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ، سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ: سَمِعْتُ أَبَا طَلْحَةَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ[٣].

## ٨٨- باسی (حوکمی) وێنەکێشان[٤]

**٥٩٤٩- ئیبنو عەبباس دەڵێ: لە ئەبو تەڵحەم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (فریشتە ناچێتە ماڵێکەوە کە سەگی تیابێ یان وێنەی پەیکەری تیابێت)).**
**-لەیس دەڵێ: یونس بۆی گێڕامەوە لە ئیبنو شیهابەوە وتی: عوبەیدوڵلا بۆی گێڕامەوە کە لە ئیبنو عەبباسی ﷺ بیستووە وتی: لە ئەبو تەڵحەم ﷺ بیستووە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە[١].**

---

(١) ئەو ئافرەتانەی مووی دەم و چاویان بۆ هەڵدەگرن و لای دەبەن.
(٢) مەبەستی ئەم ئایەتەیە: (ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەری بگرن).
(٣) بڕوانە: ٣٢٢٥.
(٤) دروست کردنی و بەکارهێنانی و هەڵواسین و دانانی.

## ٨٩- بابُ عَذَابِ الْمُصَوِّرِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

٥٩٥٠- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ مُسْلِمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ مَسْرُوقٍ فِي دَارِ يَسَارِ بْنِ نُمَيْرٍ، فَرَأَى فِي صُفَّتِهِ تَمَاثِيلَ فَقَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَذَابًا عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ».

## ٨٩- باسی سزای وێنە کێشان[٢] لە قیامەتدا

**٥٩٥٠-موسلیم دەڵێ: ئێمە لەگەڵ مەسروقدا لە ماڵی یەساری کوڕی نومەیر بووین لە هەیوانی[٣] ماڵەکەیدا چەند پەیکەرێکی بینی، جا (مەسروق) وتی: لە عەبدوڵلام ﷺ بیست وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بەڕاستی سەختڕین کەس لە سزادا لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا وێنەکێشانن)).**

٥٩٥١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هَذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[٤].

**٥٩٥١-نافیع دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەو کەسانەی ئەم وێنانە دروست دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا سزا دەدرێن، پێیان دەوترێ: ئەو وێنانەی دروستان کردوە گیانیان بکەن بە بەردا)).**

---

(١) بۆیە ئەو ڕستە موعەلەقی هێناوە چونکە بەڕاشکاوی ئیبنو شیهاب ومامۆستاکەی و تا دەڕواتە سەرەوە هەموویان وشەی بیستنیان بەکارهێناوە کە گومان ناهێڵێ کە لە یەکتریان بیستووە، کە بە پێچەوانەی ڕستەی فەرموودەکەی پێشوو کە بە وشە (عن) هێناویەتی کە ڕاشکاو نییە لە لێ بیستندا.

(٢) ئەوانەی وێنە دروست دەکەن.

(٣) صُفَّة: بەتاق و گەنجینە و هەیوان و حەوشە دەوترێ.

(٤) بڕوانە: ٧٥٥٨.

## ٩٠- بابُ نَقْضِ الصُّوَرِ

٥٩٥٢- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حِطَّانَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ حَدَّثَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا فِيهِ تَصَالِيبُ إِلاَّ نَقَضَهُ.

## ٩٠- باسی نەهێشتن و شێواندنی وێنە و پەیکەرەکان

**٥٩٥٢-عیمرانی کوڕی حیتتان دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ بۆی گێڕایەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی لە ماڵی خۆیدا نەدەهێڵا کە وێنەی تیا بوایە (یان پەیکەر بوایە)، ئیللا دەیشێواند[١].**

٥٩٥٣- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا عُمَارَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ دَارًا بِالْمَدِينَةِ، فَرَأَى فِي أَعْلاَهَا مُصَوِّرًا يُصَوِّرُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي، فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً، وَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً». ثُمَّ دَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَغَسَلَ يَدَيْهِ حَتَّى بَلَغَ إِبْطَهُ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَشَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: مُنْتَهَى الحِلْيَةِ[٢].

**٥٩٥٣- ئەبو زورعە دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﷺ چووینە ماڵێکەوە لە مەدینە[٣]، جا لای سەرەوەی ماڵەکەوە وێنەکێشێکی بینی وێنەی دەکێشا، (ئەبو هورەیرە) وتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((کێ لەوە ستەمکارترە نیازی بێ دروست کراوی وەك دروست کراو من دروست بکات، دەی با دەنکە گەنمێك دروست کەن، وە با مێروولەیەك دروست بکەن))، لە پاشان**

(١) ئەگەر قوماش بوایە دەیدڕاند تا بە وێنە نەمێنێ، ئەگەر پەیکەر بوایە دەیشکاند.

(٢) بڕوانە: ٧٥٥٩.

(٣) ماڵی مەڕوانی کوڕی حەکەم بوو وەک لە موسلیمدا هاتووە. بەژمارە (٢١١١).

داوای (تەشتێك [١]) ئاوی کرد (دەستنوێژی گرت)، وە هەردوو دەستی شۆرد تا گەشتە بن هەنگڵی، (ئەبو زورعە دەڵێ) منیش وتم: ئەی ئەبو هورەیرە ئایا ئەمە [٢] شتێك بوو لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە؟ ئەبو هورەیرە وتی: (گەشتنی ئاو تا بن هەنگڵ) تائەو جێگایە ئاڵتون دەکرێتە دەست (ی باوەڕدار لە بەهەشتدا).

## ٩١- بَابُ مَا وُطِئَ مِنَ التَّصَاوِيرِ

٥٩٥٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْقَاسِمِ -وَمَا بِالْمَدِينَةِ يَوْمَئِذٍ أَفْضَلُ مِنْهُ- قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِي عَلَى سَهْوَةٍ لِي فِيهَا تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَتَكَهُ وَقَالَ: «أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ». قَالَتْ: فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ[٣].

## ٩١- باسی ئەو وێنانەی ژێر پێ دەخرێت

٥٩٥٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێك هاتەوە، منیش تاقێ یا گەنجینەیەکم بەپەردەیەك کە هی خۆم بوو داپۆشیبوو، وێنەی تیا بوو، ئینجا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی لای برد و فەرمووی: ((سەخترین کەس لە سزادا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن لاسای (خوا) دەکەنەوە لە دروست کردندا))، عائیشە ﵂ دەڵێ: پەردەکەمان کرد بە پشتیەك یا دوو پشتی.

---

(١) تۆر: دەفرێکە وەک تەشت.
(٢) ئاوی دەست شۆردنی تا بن هەنگڵی گەیاندووە.
(٣) بڕوانە: ٢٤٧٩.

٥٩٥٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، وَعَلَّقْتُ دُرْنُوكًا فِيهِ تَمَاثِيلُ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَنْزِعَهُ، فَنَزَعْتُهُ[١].

**٥٩٥٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەفەر هاتەوە پەردەیەكی توكنم هەڵواسیبوو وێنەی تیا بوو، فەرمانی پێكردم كە لای بەم، منیش لام برد.**

٥٩٥٦ - وَكُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ[٢].

**٥٩٥٦- (عائیشە ﵂ دەڵێ:) وەمن خۆم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە ئاوی یەك تەشت خۆمان دەشۆری.**

## ٩٢- بَابُ مَنْ كَرِهَ الْقُعُودَ عَلَى الصُّورَةِ

٥٩٥٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْ. فَقُلْتُ: أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مِمَّا أَذْنَبْتُ؟. قَالَ: «مَا هَذِهِ النُّمْرُقَةُ؟». قُلْتُ: لِتَجْلِسَ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدَهَا. قَالَ: «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ. وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ الصُّورَةُ»[٣].

## ٩٢- باسی ئەوەی دانیشتن لەسەر وێنەی لانا پەسەندە

**٥٩٥٧-قاسیم لە عائیشەی دایكی باوەڕداران ﵂ دەگێڕێتەوە: كە ئەو (عائیشە) قاڵیچەیەكی[٤] كڕی كە وێنەی تێدابوو، جا كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قاڵیچەكەی بینی لە بەردەم دەرگاكەدا وەستا و نەهاتە ژوورەوە، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری**

(١) بڕوانە: ٢٤٧٩.
(٢) بڕوانە: ٢٥٠.
(٣) بڕوانە: ٢١٠٥.
(٤) قاڵیچە: واتە: قاڵیبەكی بچوك.

**خوا ﷺ پەشیمانم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا لەو گوناهەی کردوومە، فەرمووی: ((ئەم قاڵیچەیە چییە؟)) وتم: کڕیومە بۆ تۆ تا لەسەری دانیشیت و لەسەری بخەوی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن و پێیان دەوترێت: ئەوەی دروستان کردوە زیندووی کەنەوە، وە بەڕاستی فریشتە ناڕواتە ماڵێکەوە کە وێنەی تێدا بێت)).**

٥٩٥٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ بُكَيْرٍ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ -صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ الصُّورَةُ». قَالَ بُسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ فَعُدْنَاهُ، فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ، فَقُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ -رَبِيبِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّوَرِ يَوْمَ الأَوَّلِ؟. فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْهُ حِينَ قَالَ إِلاَّ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ؟

وَقَالَ ابْنُ وَهْبٍ: أَخْبَرَنَا عَمْرٌو -هُوَ ابْنُ الْحَارِثِ- حَدَّثَهُ بُكَيْرٌ، حَدَّثَهُ بُسْرٌ، حَدَّثَهُ زَيْدٌ، حَدَّثَهُ أَبُو طَلْحَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٥٩٥٨- بوکەیر لە بوسری کوڕی سەعیدەوە ئەویش لە زەیدی کوڕی خالیدەوە دەیگێڕێتەوە لە ئەبی تەڵحەی هاوەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی فریشتەکان ناڕۆنە ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت))، بوسر دەڵێ: لە پاشان زەید نەخۆش کەوت و سەردانمان کرد، جابینیمان پەردەیەك بەدەرگاکەیەوە بوو وێنەی تیا بوو، وتم بە عوبەیدوڵڵای کوڵەبەسی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئایا زەید دەربارەی وێنە ڕۆژی پێشوو هەواڵی نەداینێ؟ عوبەیدوڵڵاش وتی: ئەی گوێت لێ نەبوو کاتێ وتی: مەگەر نەخش بێ لە پۆشاکدا؟)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٢٥.

-ئیبنو وەهب وتی: عەمر -كە كوڕی حاریسەیە- بۆی گێڕاینەوە وتی: بوكەیر بۆی گێڕاوەتەوە ئەویش بوسر بۆی گێڕاوەتەوە ئەویش زەید بۆی گێڕاوەتەوە ئەبو تەڵحەش بۆئەوی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ[1].

## ٩٣- باب كَرَاهِيَةِ الصَّلاَةِ فِي التَّصَاوِيرِ

٥٩٥٩- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «أَمِيطِي عَنِّي، فَإِنَّهُ لاَ تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ لِي فِي صَلاَتِي»[2].

## ٩٣- باسی ناپەسەندی نوێژكردن بە پۆشاكێكەوە وێنەی تیا بێت

٥٩٥٩-ئەنەس ﷺ دەڵێ: عائیشە ﷺ پەردەیەكی ڕەگا و ڕەنگی نەخشداری هەبوو، بەشێكی ماڵەكەی پێ داپۆشیبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((ئەم پەردە لابە و دووری بخەرەوە لێم، چونكە بەڕاستی وێنەكانی دێتە بەرچاوم لە نوێژەكەمدا)).

## ٩٤- بابٌ: لاَ تَدْخُلُ المَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ

٥٩٦٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ -هُوَ ابْنُ مُحَمَّدٍ- عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: وَعَدَ النَّبِيَّ ﷺ جِبْرِيلُ فَرَاثَ عَلَيْهِ، حَتَّى اشْتَدَّ على النَّبِيِّ ﷺ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَلَقِيَهُ، فَشَكَا إِلَيْهِ مَا وَجَدَ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّا لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَلاَ كَلْبٌ[3].

---

(١) ئەم ڕستەی بۆ ئەوە هێناوە بڵێت ئەم ڕاویانە هەموو لە یەكتریان بیستووە بۆیەكتریان گێڕاوەتەوە دەما و دەم.

(٢) بڕوانە: ٣٧٤.

(٣) بڕوانە: ٣٢٢٧.

## ٩٤- باسێک: فریشتەکان ناڕۆنە ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت

**٥٩٦٠- سالیم لە باوکیەوە (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: جیبریل ﷺ بەڵێنی بە پێغەمبەر ﷺ دا (لە کاتێکدا سەردانی بکات[١])، بەڵام دووا کەوت هەتا بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ زۆر سەخت بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ چووە دەرەوە جیبریل ﷺ پێی گەیشت، پێغەمبەریش ﷺ سکاڵای ئەو دواکەوتنەی لای کرد، ئەویش[٢] فەرمووی: ((بێگومان ئێمە[٣] ناچینە ماڵێکەوە وێنە یا سەگی تێدا بێت)).**

## ٩٥- بابُ مَنْ لَمْ يَدْخُلْ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ

٥٩٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ القَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَامَ عَلَى الْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْ، فَعَرَفَتْ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، مَاذَا أَذْنَبْتُ؟ قَالَ: «مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرُقَةِ؟». فَقَالَتِ: اشْتَرَيْتُهَا لِتَقْعُدَ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدَهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ" وَقَالَ: "إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ لاَ تَدْخُلُهُ الْمَلاَئِكَةُ»[٤].

## ٩٥- باسی کەسێک نەچێتە ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت

**٥٩٦١- قاسیمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ دەگێڕێتەوە: کە عائیشە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو (عائیشە) قاڵیچەیەکی کڕی وێنەی تێدابوو،**

---

(١) ئەم زیادە لە موسلیمدا هاتووە (ارشاد الساري:٦٢٨/١٢).،

(٢) واتە: جیبریل ﷺ.

(٣) فریشتەکان.

(٤) بڕوانە: ٢١٠٥.

جا كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قاڵیچەكەی بینی لە بەردەم دەرگاكەدا وەستا و نەهاتە ژوورەوە، عائیشەش بەدەم و چاویدا زانی پێی ناخۆشە، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چ گوناهێكم كردوە پەشیمانم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی؟ فەرمووی: ((ئەم قاڵیچەیە چییە؟)) ووتی: كڕیومە بۆتۆ تا لەسەری دانیشیت و لەسەری بخەوی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن وپێیان دەوترێت: ئەوەی دروستان كردوە زیندووی كەنەوە))، وە فەرمووی: ((بەڕاستی فریشتە ناڕواتە ماڵێكەوە كە وێنەی تێدا بێت)).

## ٩٦- بابُ مَنْ لَعَنَ الْمُصَوِّرَ

٥٩٦٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنِي غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ اشْتَرَى غُلاَمًا حَجَّامًا فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الدَّمِ، وَثَمَنِ الْكَلْبِ، وَكَسْبِ الْبَغِيِّ، وَلَعَنَ آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ، وَالْمُصَوِّرَ[1].

## ٩٦- باسی ئەوەی نەفرینی كردوە لە وێنە كێش

٥٩٦٢- عەونی كوڕی ئەبی جوحەیفە لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە باوكی كۆیلەیەكی مێرد منداڵی كەڵەشاخ گری كڕی، ئینجا وتی: بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كرد لە نرخی، وە نرخی سەگ، وە پارە پەیداكردنی ئافرەتی داوێن پیس، وەنەفرینی كرد لە سووخۆر و سوودەر، وە ژنی خاڵ كوت و ژنی خاڵ بۆ كوتراو و وێنە كێش.

(١) بڕوانە: ٢٠٨٦.

## ٩٧- بابُ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ

٥٩٦٣- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ قَالَ: سَمِعْتُ النَّضْرَ بْنَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ يُحَدِّثُ قَتَادَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ وَهُمْ يَسْأَلُونَهُ وَلاَ يَذْكُرُ النَّبِيَّ ﷺ، حَتَّى سُئِلَ فَقَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدًا ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فِي الدُّنْيَا كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ»[1].

## ٩٧- باسێک: هەر کەسێ وێنەیەک دروست بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا داوای لێ دەکرێ کە گیان بکات بەبەریدا، ئەویش ناتوانێ گیان بکات بەبەریدا

**٥٩٦٣-سەعید دەڵێ: لە نەزری کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکم بیست بۆ قەتادەی دەگێڕایەوە وتی: من لای ئیبنو عەبباس بووم ﷺ خەڵکەکە پرسیاریان لێ دەکرد و ئەویش ناوی پێغەمبەری ﷺ نەدەهێنا، هەتا پرسیاری لێ کرا، ئینجا وتی: لە موحەممەدم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەرکەسێك وێنەیەك دروست بکات لە دونیادا، لە ڕۆژی قیامەتدا داوای لێ دەکرێ ڕۆح بکات بەبەریدا، ئەویش ناتوانێ ڕۆح بکات بەبەریدا)).**

## ٩٨- بابُ الارْتِدَافِ عَلَى الدَّابَّةِ

٥٩٦٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ، عَنْ يُونُسَ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَى إِكَافٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ وَرَاءَهُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٢٢٥.

(٢) بڕوانە: ٢٩٨٧.

## ٩٨- باسی (دروستە) سوارکردنی کەسێک لە پاشکۆدا لە سواری وڵاخدا

٥٩٦٤- ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو بەسەر کورتانێکەوە کە قەیفەیەکی فەدەکییەی بەسەرەوە بوو، ئوسامەشی خستبوویە پاشکۆی خۆیەوە.

## ٩٩- بَابُ الثَّلَاثَةِ عَلَى الدَّابَّةِ

٥٩٦٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ اسْتَقْبَلَهُ أُغَيْلِمَةُ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَحَمَلَ وَاحِدًا بَيْنَ يَدَيْهِ وَالآخَرَ خَلْفَهُ[١].

## ٩٩- باسی (دروستە) سێ کەس سواری وڵاخێک بن

(٥٩٦٥- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بهاتایە بۆ مەککە منداڵ و کوڕانی نەوەی عەبدولموتتەلیب پێشوازیان لێدەکرد و دەهاتن بە پیریەوە، پێغەمبەریش ﷺ یەکێکیانی لە بەردەمیدا سوار دەکرد و ئەوەی کەشیانی لە پاشکۆیدا سوار دەکرد.

## ١٠٠- بَابُ حَمْلِ صَاحِبِ الدَّابَّةِ غَيْرَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ

وَقَالَ بَعْضُهُمْ: صَاحِبُ الدَّابَّةِ أَحَقُّ بِصَدْرِ الدَّابَّةِ، إِلَّا أَنْ يَأْذَنَ لَهُ.

٥٩٦٦- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ: ذُكِرَ الأَشَرُّ الثَّلَاثَةُ عِنْدَ عِكْرِمَةَ، فَقَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ حَمَلَ قُثَمَ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالْفَضْلَ خَلْفَهُ -أَوْ قُثَمَ خَلْفَهُ، وَالْفَضْلَ بَيْنَ يَدَيْهِ- فَأَيُّهُمْ شَرٌّ أَوْ أَيُّهُمْ خَيْرٌ؟[٢].

---

(١) بڕوانە: ١٧٩٨.

(٢) بڕوانە: ١٧٩٨.

## ١٠٠- باسی خاوەنی وڵاخ كەسێكی تر لە بەردەمیدا سوار كات

**وە كەسێك[١] دەڵێ: خاوەنی وڵاغەكە لە پێشترە لە پێشەوە سوار بێ، مەگەر خۆی مۆڵەت بدات (كەسێكی تر لە پێشیەوە سوار ببێت).**

**٥٩٦٦-ئەیوب دەڵێ: لای عیكریمە باسی خراپترینی سێ كەسەكە [٢] كرا، ئەویش وتی: ئیبنو عەبباس ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات (بۆ مەككە بەسواری وشترێكەوە)، لە هەمان كاتدا قوسەمی لە بەردەم خۆیدا سوار كردبوو فەزڵیش لە پاشكۆیدا-، یان قوسەمی لە پاشكۆیدا سوار كردبوو فەزڵیش لە بەردەمیدا- جا كامیان خراپن؟ یان كامیان چاكن؟.**

## ١٠١- بابٌ

٥٩٦٧- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَا أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ ﷺ لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ أَخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ؟». قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «حَقُّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا». ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. فَقَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوهُ؟». قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»[٣].

---

(١) عامیر شەعبی وا دەڵێ.

(٢) كە پێكەوە سواری وڵاغێک دەبن.

(٣) بڕوانە: ٢٨٥٦.

## ١٠١- باسێك

٥٩٦٧- ئەنەسی كوڕی مالیك لە موعازی كوڕی جەبەلەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە كاتێكدا من لە پاشكۆی پێغەمبەردا ﷺ بووم لە نێوان من و ئەودا تەنها كۆتای كورتان (ی وشتر)ـەكە هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز)) وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نوودی تۆ بە دەست دێنم، پاشان ماوەیەك ڕۆشت ئینجا فەرمووی: ((ئەی موعاز)) وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نووری تۆ بەدەست دێنم، پاشان ماوەیەك ڕۆشت ئینجا فەرمووی: ((ئەی موعاز)) وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نووری تۆ بەدەست دێنم، فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی خوا چییە لەسەر بەندەكانی؟)) وتم: خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((مافی خوا لەسەر بەندەكانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی))، لە پاشان ماوەیەك ڕۆشت، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی موعازی كوڕی جەبەل))، وتم: فەرمان بەردارتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نودی تۆ بەدەست دێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی بەندەكان لەسەر خوا چییە؟ ئەگەر مافی خوایان ئەنجام دا؟)). وتم: خواوپێغەمبەرەكەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((مافی بەندەكان لەسەر خوا ئەوەیە كە سزایان نەدات)).

## ١٠٢- بابُ إِرْدَافِ المَرْأَةِ خَلْفَ الرَّجُلِ

٥٩٦٨- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ خَيْبَرَ، وَإِنِّي لَرَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، وَهْوَ يَسِيرُ وَبَعْضُ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رَدِيفُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ عَثَرَتِ النَّاقَةُ فَقُلْتُ: الْمَرْأَةَ. فَنَزَلْتُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهَا أُمُّكُمْ». فَشَدَدْتُ الرَّحْلَ وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا دَنَا -أَوْ رَأَى الْمَدِينَةَ- قَالَ: «آيِبُونَ تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ»[1].

(١) بڕوانە: ٣٧١.

## ١٠٢- باسی (دروستە) ئافرەت لە پاشكۆی پیاوەوە [1] سواری وڵاخ بكرێت

٥٩٦٨-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە خەیبەر گەڕاینەوە، من لە پاشكۆی وڵاغەكەی ئەبی تەڵحەدا بووم، دەڕۆشت یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەری خواش ﷺ لە پاشكۆی پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ، لە پڕ مێ حوشترەكە سەر سمیدا وتم: ئاگاداری ژنەكە بە، جا من دابەزیم پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە صەفیەی دایكتانە)) ئینجا كورتانەكەم توندكردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ سوار بوو، جا كاتێ نزیك بوویەوە لە مەدینە- یان مەدینەی بینی-فەرمووی: ((گەڕاوانی، تەوبەكارانی، پەرستكاران، بۆ پەروەردگارمان سوپاس گوزارین)).

## ١٠٣- بابُ الاِسْتِلْقَاءِ، وَوَضْعِ الرِّجْلِ عَلَى الأُخْرَى

٥٩٦٩- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ أَبْصَرَ النَّبِيَّ ﷺ يَضْطَجِعُ فِي الْمَسْجِدِ، رَافِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى[2].

## ١٠٣- باسی لەسەر گازەرەی پشت ڕاكشان، وە دانانی لاقێك لەسەر لاقەكەی تر

٥٩٦٩- عەببادی كوڕی تەمیم لە مامەیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: كە ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی لە مزگەوتدا بەپشتا پاڵكەوتبوو، لاقێكی نابوویە سەر لاقەكەی تری.

---

(١) لەپاشكۆی پیاوی مەحرەمدا.

(٢) بڕوانە: ٤٧٥.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٧٨- كِتَابُ الأَدَبِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٧٨- پەڕاوی ئادابەکان

## ١- بابُ البرِّ والصِّلة قوْل الله ﷻ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴿٨﴾ ﴾ العنكبوت

٥٩٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: الْوَلِيدُ بْنُ عَيْزَارٍ أَخْبَرَنِي قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عَمْرٍو الشَّيْبَانِيَّ يَقُولُ: أَخْبَرَنَا صَاحِبُ هَذِهِ الدَّارِ -وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى دَارِ عَبْدِ اللَّهِ- قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: «الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ». قَالَ ثُمَّ أَيٍ؟ قَالَ: «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». قَالَ: حَدَّثَنِي بِهِنَّ، وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي[1].

## ١- باسی چاکەکردن (لەگەڵ دایک و باوک) پەیوەندی خزمایەتی و ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ((وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی کە چاکە لەگەڵ دایک و باوکیدا بکات))

**٥٩٧٠- وەلیدی کوڕی عیزار وتی: لە ئەبوعەمری شەیبانیم بیست دەیوت خاوەنی ئەم خانووە- بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ خانووەکەی عەبدوڵڵا ؓ - بۆی گێڕاینەوە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد ﷺ کام کردەوە لای خوا خۆشەویستترە؟ فەرمووی: ((نوێژکردن لەسەرەتای کاتەکەیەوە))، وتی: پاشان چ کردەوەیەکی تر؟ فەرمووی: ((پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا))، ووتی:**

(١) بڕوانە: ٥٢٧.

پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((خەبات و تێكۆشان لەپێناو ئایینی خوادا))، عەبدوڵڵا وتی: ئەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم و بۆی باس كردم، وە ئەگەر پرسیاری زیاترم بكردایە وەڵامی زیاتری دەدامەوە.

## ٢- بابٌ: مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟

٥٩٧١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ الْقَعْقَاعِ بْنِ شُبْرُمَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَحَقُّ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: «أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَبُوكَ».

وَقَالَ: ابْنُ شُبْرُمَةَ وَيَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ مِثْلَهُ.

## ٢- باسێک:کێ شیاوترینە بەجوانی هاوڕێیەتی کردن؟

٥٩٧١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كێ شیاوترین كەسە بەجوانی هاوڕێیەتی بكەم؟ فەرمووی: ((دایكت)) وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: ((دایكت)) وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: ((دایكت)) وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: ((باوكت)).

-ئیبنو شوبومە و یەحیای كوڕی ئەیوب دەڵێن: ئەبو زورعە وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕایەوە.

## ٣- بابٌ: لاَ يُجَاهِدُ إِلاَّ بِإِذْنِ الوالدين

٥٩٧٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ وَشُعْبَةَ قَالاَ: حَدَّثَنَا حَبِيبٌ ح.

قَالَ: وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْعَبَّاسِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أُجَاهِدُ؟ قَالَ: «لَكَ أَبَوَانِ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ»[1].

## ٣- باسێک: (باوەڕدار) خەبات ناكات بەرەزامەندی باوک و دایکی نەبێت

**٥٩٧٢-عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ كرد ئایا جیهاد بكەم؟ فەرمووی: ((باوك و دایكت هەیە)) وتی:بەڵێ. فەرمووی: (( (بگەڕێرەوە) لە چاكەكردن لەگەڵ ئەوان تێبكۆشە و خۆت ماندوو بكە)).**

## ٤- بابٌ: لاَ يَسُبُّ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ

٥٩٧٣- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: «يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ، فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ».

## ٤- باسێک: باوەڕدار جنێو بە باوک و دایکی نەدات

**٥٩٧٣- عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی لە تاوانە هەرە گەورەكان ئەوەیە كە مرۆڤ جنێو بە باوك و دایكی بدات))، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤ چۆن جنێو بە باوك و دایكی دەدات؟ فەرمووی: ((كەسێك جنێو بە باوكی كەسێك دەدات، بەو هۆیەوە كەسەكە جنێو بە باوكی دەدات، وە جنێو بە دایكی دەدات (ئەویش جنێو بە دایكی دەدات ) )).**

(١) بروانە: ٣٠٠٤.

## ٥- بابُ إِجَابَةِ دُعَاءِ مَنْ بَرَّ وَالِدَيْهِ

٥٩٧٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ يَتَمَاشَوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَمَالُوا إِلَى غَارٍ فِي الْجَبَلِ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا لِلَّهِ صَالِحَةً، فَادْعُوا اللَّهَ بِهَا لَعَلَّهُ يَفْرُجُهَا. فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ كُنْتُ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رُحْتُ عَلَيْهِمْ فَحَلَبْتُ بَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ أَسْقِيهِمَا قَبْلَ وَلَدِي، وَإِنَّهُ نَاءَ بِيَ الشَّجَرُ فَمَا أَتَيْتُ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلاَبِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَبْدَأَ بِالصِّبْيَةِ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ لَنَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ، فَفَرَجَ اللَّهُ لَهُمْ فُرْجَةً حَتَّى يَرَوْنَ مِنْهَا السَّمَاءَ. وَقَالَ الثَّانِي: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَتْ لِي ابْنَةُ عَمٍّ، أُحِبُّهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، فَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَسَعَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَلَقِيتُهَا بِهَا، فَلَمَّا قَعَدْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ، وَلاَ تَفْتَحِ الْخَاتَمَ. فَقُمْتُ عَنْهَا، اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي قَدْ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا. فَفَرَجَ لَهُمْ فُرْجَةً، وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي. فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَقَّهُ، فَتَرَكَهُ وَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرَاعِيَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَظْلِمْنِي، وَأَعْطِنِي حَقِّي. فَقُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ الْبَقَرِ وَرَاعِيهَا. فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَهْزَأْ بِي. فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَهْزَأُ بِكَ، فَخُذْ ذَلِكَ الْبَقَرَ وَرَاعِيَهَا. فَأَخَذَهُ فَانْطَلَقَ بِهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ مَا بَقِيَ، فَفَرَجَ اللَّهُ عَنْهُمْ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٢١٥.

# ٥- باسی گیرابوونی دووعای ئەو كەسەی چاكەی لەگەڵ دایک و باوكیدا كردوە

٥٩٧٤- عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((لە كاتێكدا سێ كەس بە ڕێگادا دەڕۆشتن باران لێ داكردن و ڕۆشتنە ئەشكەوتێكەوە لە شاخێكدا، ئەنجا بەردێكی گەورە لە شاخەكەوە بەربوویەوە دەرگای ئەشكەوتەكەی لێ گرتن، جا لە ناو خۆیاندا بەیەكتریان وت: ورد ببنەوە و سەیربكەن ئەو كردە و چاكانەی كە لەبەر خوا كردووتانە[1] پێیان بپاڕێنەوە لە خوا، بەڵكو خوا ڕزگارتان كات لەم بەڵایە، ئینجا یەكێكیان وتی: ئەی خوایە من دایك و باوكێكی پیری بەتەمەنم هەبوو، وە چەند منداڵێكی ورد و بچووكیشم هەبوو، وە ئاژەڵم دەلەوەڕاند بۆ بژێویان، كە ئێواران دەهاتمەوە (بۆ ماڵەوە) شیری ئاژەڵەكانم دەدۆشی و سەرەتا پێش منداڵەكانم دەمدا بە دایك و باوكم بیخۆنەوە، جا (ڕۆژێكیان) داركردنەوە دووری خستمەوە نەهاتمەوە تا شەو بەسەردا هات، (كە هاتمەوە) بینیم دایك و باوكم خەوتوون، جا جاران چۆن ئاژەڵەكانم دەدۆشی هەروا دۆشیمن، ئینجا شیرەكەم هێناو بە ڕاسەریانەوە ڕاوەستام دڵم نەهات خەبەریان كەمەوە، پێشم خۆش نەبوو بیدەم بە منداڵەكان پێش ئەوان بیخۆنەوە، منداڵەكانیش هەر زاق زوقیان بوو لەبەر پێمدا، هەر بە جۆرە من و ئەوانماینەوە هەتا دونیا ڕووناك بوویەوە. ئەی خوایە ئەگەر خۆت لات وایە ئەمەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ ئەنجام داوە دەروویەكمان لێ بكەرەوە ئاسمانی لێوە ببینین، دەڵێ: جا كەلێنێكیان لێ كرایەوە و ئاسمانیان دەبینی، یەكێكی كەیان وتی: ئەی خوایە گیان تۆ دەزانی كە من كچێكی ئامۆزام هەبوو خۆشمدەویست وەكو ئەوپەڕی خۆشەویستی پیاو كە ئافرەتی خۆشبوێ، جا داوای كاری ناشەرعیم لێكرد، بەڵام كچەكە ڕازی نەبوو هەتا سەد دینارم بۆ

---

(١) بەڵكو خوا بەهۆیەوە لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بكات.

هێنا، منیش هەوڵمدا تا سەد دینارم کۆکردەوە (پێمدا)، بە هۆی ئەو پارەیەوە پێی گەشتم، جا کاتێ لە نێوان هەردوو ڕانیدا دانیشتم[1] کچەکە وتی: ئەی بەندەی خوا لەخوا بترسە و مۆری کچێنیم مەدڕێنە، منیش هەستام وازم لێ هێنا، ئەی خوایە گیان دەی ئەگەر ئەزانی من ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردوە ئەوە کەلینێکمان لێ بکەرەوە و ڕزگارمان بکە لەم بەردە، جا کەلێنێکی تریان لێ کرایەوە. وە سێیەمیان وتی: خوایە گیان من کرێکارێکم گرتبوو بە سێ مەن چەڵتوك، جا کاتێ کارەکەی تەواو کرد وتی: هەقەکەم بەرێ منیش خستمە بەردەمی بەڵام ئەو نەیویست و ڕۆشت منیش بەردەوام (کرێکەیم بۆ) دەکردە کشتوکاڵ، هەتا بە بەرهەمەکەی چەند سەر مانگا و شوانێکم کڕی، پاشان کرێکارەکە هاتەوە بۆلام و وتی: لە خوا بترسە و ستەمم لێ مەکە و کرێکەم بەرەوە، منیش وتم: بڕۆ ئەو هەموو مانگایانە و گاوانەکەشی (هی تۆیە ببیانبە)، وتی: لە خوا بترسە و گاڵتەم پێ مەکە، منیش وتم: دڵنیابە گاڵتەت پێ ناکەم ئەو مانگایانە و گاوانەکەشی ببە، ئەویش وەری گرت و بردنی. (خوایە گیان) ئەگەر دەزانی من ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردوە، ئەوەندەی ماویەتی لایبە بۆمان، جا خواش دەرووی لێ کردنەوە.

## ٦- بابٌ: عُقُوقُ الوَالِدَيْنِ مِنَ الكَبَائِرِ

قَالَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْن عَمْرٍو ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

٥٩٧٥- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ وَرَّادٍ، عَنِ الْمُغِيرَةِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ، وَمَنْعَ وَهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ»[2].

(١) بۆ ئەوەی زینای لەگەڵ بکەم.
(٢) بڕوانە: ٨٤٤.

## ٦- باسێک: سەرپێچی باوک و دایک لە گوناهە گەورەکانە

**ئەم فەرموودەیە عبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە**

**٥٩٧٥- موغیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خوای گەورە سەرپێچی دایکان و ڕێگری لێکردوون لە داواکردنی ئەوەی هی ئێوە نیە، و زیندەبەچاڵ کردنی کیژۆڵەکان و وتی وتی و پرسیاری زۆرکردن و بەفیڕۆدانی ماڵی بۆ ئێوە لا ناپەسەندە)).**

٥٩٧٦- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ الوَاسِطِيُّ، عَنِ الجُرَيْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟». قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فَقَالَ: «أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ، أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ». فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْتُ: لاَ يَسْكُتُ[1].

**٥٩٧٦- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کەدەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا هەواڵتان پێ بدەم گوناهە هەرە گەورەکان چین؟)) ئێمەش وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((هاوبەش دانانە بۆ خوا و سەرپێچی کردنی دایك و باوك))، پێغەمبەر ﷺ پاڵیدابوویەوە ڕاست بوویەوە و دانیشت و فەرمووی: ((ئاگاداربن ووتەی درۆ و شایەتی دانی درۆش، ئاگاداربن ووتەی درۆ و شایەتی دانی درۆش))، ئەنەس دەڵێ: جا بەبەردەوامی ئەم وتەی دووبارە دەکردەوە هەتا وتم: بێدەنگ نابێت.**

٥٩٧٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكَبَائِرَ -أَوْ

---

(١) بڕوانە: ٢٦٥٤.

سُئِلَ عَنِ الْكَبَائِرِ- فَقَالَ: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». فَقَالَ: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ - قَالَ: "قَوْلُ الزُّورِ" أَوْ قَالَ: "شَهَادَةُ الزُّورِ". قَالَ شُعْبَةُ: وَأَكْثَرُ ظَنِّي أَنَّهُ قَالَ: «شَهَادَةُ الزُّورِ»[1].

**٥٩٧٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی گوناهە گەورەکانی کرد-یان پرسیاری گوناهە گەورەکانی لێ کرا- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هاوبەش دانان بۆخوا، وە کوشتنی مرۆڤ[2] و سەرپێچی کردنی دایك و باوك))، ئینجا فەرمووی: ((ئایا گوناهە گەورەکانتان پێ بڵێم؟)) فەرمووی: ((وتەی درۆ)) یان فەرمووی: ((شایەتی دانی درۆ)). شوعبە دەڵێ: زۆرتر گومان وایە کە فەرمووی: ((شایەتی دانی درۆ)).**

## ٧- بابُ صلة الوالد المُشْرِك

٥٩٧٨- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، أَخْبَرَنِي أَبِي، أَخْبَرَتْنِي أَسْمَاءُ ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَتْ: أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: آصِلُهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهَا: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة[3].

## ٧- باسی بەجێهێنانی پەیوەندی لەگەڵ باوکی هاوبەش دانەر بۆ خوا (دروستە)

**٥٩٧٨-هیشامی کوڕی عوروە وتی: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: دایکم هات بۆ لام حەزی دەکرد (بەچاکە و پەیوەندی من لەگەڵی[1]) لە کاتی جەنگ ڕاگرتنی پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٥٣.

(٢) بەناڕەوا و بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ بە ناهەق.

(٣) بڕوانە: ٢٦٢٠.

(لەگەڵ قورەیشدا)، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد چاكە و پەیوەندی بكەم لەگەڵیدا؟ فەرمووی: ((بەڵێ)). ئیبنو عویەینە دەڵێ، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند دەربارەی ئەم ئایەتەی دابەزاند: (خوا ڕێتان لێ ناگرێ لەگەڵ ئەوانەی كە جەنگیان لەگەڵ نەكردوون لەسەر ئەم دینە)(كە چاكەیان لەگەڵدا بكەن).

## ٨- بابُ صِلَةِ الْمَرْأَةِ أُمَّهَا وَلَهَا زَوْجٌ

٥٩٧٩ - وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي هِشَامٌ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: قَدِمَتْ أُمِّي وَهْيَ مُشْرِكَةٌ -فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ وَمُدَّتِهِمْ، إِذْ عَاهَدُوا النَّبِيَّ ﷺ مَعَ أَبِيهَا، فَاسْتَفْتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهْيَ رَاغِبَةٌ [أَفَأَصِلُهَا؟] قَالَ: «نَعَمْ، صِلِي أُمَّكِ»[٢].

## ٨- باسی ئافرەت مێردی هەبێ لەگەڵ دایكیدا چاكە بكات

٥٩٧٩-عوروە لە ئەسمائەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: دایكم لەو ماوەی جەنگ ڕاگرتنەی قورەیش كەپەیمانی (جەنگ ڕاگرتنیان) لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ كردبوو، لەگەڵ باوكیدا[٣] هاتبوو (بۆ لام)، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد وتم: دیارە دایكم هاتووە پێی خۆشە و حەز دەكات بەچاكە و پەیوەندی من، (ئایا پێشوازی لێ بكەم؟) فەرمووی: ((بەڵێ چاكەی لەگەڵدا بكە)).

٥٩٨٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَقَالَ -يَعْنِي: النَّبِيَّ ﷺ: يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ وَالْعَفَافِ وَالصِّلَةِ[٤].

---

(١) یان حەزی بە ئیسلام نەدەكرد و ڕقی لێی بوو.
(٢) بڕوانە: ٢٦٢٠.
(٣) لەكەڵ كوڕێكیدا.
(٤) بڕوانە: ٧.

**٥٩٨٠-عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیان بۆی گێڕایەوە کەهیرەقل ناردی بەشوێنیدا، جا (ئەبو سوفیان) وتی- واتە: پێغەمبەر ﷺ -: فەرمانمان پێدەکات بە نوێژکردن و ماڵ بەخشین و داوێن پاکی و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی.**

## ٩- بابُ صِلَةِ الأَخِ الْمُشْرِكِ

٥٩٨١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: رَأَى عُمَرُ حُلَّةَ سِيَرَاءَ تُبَاعُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْتَعْ هَذِهِ، وَالْبَسْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَإِذَا جَاءَكَ الْوُفُودُ. قَالَ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْهَا بِحُلَلٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ فَقَالَ: كَيْفَ أَلْبَسُهَا وَقَدْ قُلْتَ فِيهَا مَا قُلْتَ؟ قَالَ: «إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهَا لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنْ تَبِيعُهَا أَوْ تَكْسُوهَا». فَأَرْسَلَ بِهَا عُمَرُ إِلَى أَخٍ لَهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ(١).

## ٩- باسی چاکەکردنی (مسوڵمان) لەگەڵ برای هاوبەش دانەریدا بۆ خوا

**٥٩٨١-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: عومەر پۆشاکێکی خەت خەتی ئاوریشمی بینی دەفرۆشرا، وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەم پۆشاکە بکڕە و لەبەری کە لە ڕۆژانی هەینی و کاتێ وەفد و نوێنەر دێت بۆ لات، (پێغەمبەریش خوا ﷺ) فەرمووی: ((بێگومان کەسێك ئەم پۆشاکە (ئاوریشمە) لەبەر دەکات، لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەشێکی نەبێت))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چەند**

(١) بروانە: ٨٨٦.

**پۆشاکێکی ئاوریشمی بۆ هات جا پۆشاکێکیانی نارد بە عومەر، عومەریش وتی: چۆن لەبەری بکەم لە کاتێکدا جەنابت دەربارەی ئەوەت فەرمووکە فەرمووت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من بۆ ئەوە ئەم پۆشاکەم پێ نەداوی کە لەبەری بکەیت، بەڵکو بیفرۆشیت یان بیدەیت بەکەسێك بیپۆشێت))، بۆیە عومەر ناردی بۆ برایەکی کە لە مەککە بوو پێش ئەوەی مسوڵمان ببێت.**

## ١٠- بابُ فَضْلِ صِلَةِ الرَّحِمِ

٥٩٨٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ عُثْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ مُوسَى بْنَ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ[1].

## ١٠- باسی فەزڵ و گەورەیی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی

**٥٩٨٢-مووسای کوڕی تەڵحە لە ئەبی ئەیوبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەیەکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشتەوە.**

٥٩٨٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا بَهْزٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ وَأَبُوهُ عُثْمَانُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُمَا سَمِعَا مُوسَى بْنَ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ. فَقَالَ الْقَوْمُ: مَالَهُ؟ مَالَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرَبٌ مَالَهُ». فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَعْبُدُ اللَّهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ، ذَرْهَا». قَالَ: كَأَنَّهُ كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ[2].

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٦.

(٢) بڕوانە: ١٣٩٦.

**٥٩٨٣-ئەبو ئەیووبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە:کەپیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەیەکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشتەوە، خەڵکەکەش وتیان: ئەو کابرایە چی ئەوێ؟ ئەو کابرایە چی ئەوێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((پێویستیەکی گرنگی هەیە))، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا بپەرستە و هیچ شتێك مەکە بە هاوبەشی، وە بەجوانی نوێژەکانت بکە، وە زەکات بدە، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنە (وڵاخەکەت) واز لێ بێنە))، وتی: دەڵێی (پیاوەکە یان پێغەمبەر ﷺ) بەسواری وڵاخەکەیەوە بوو.**

## ١١- بابُ إِثْمِ الْقَاطِعِ

٥٩٨٤- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: إِنَّ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ».

## ١١- باسی گوناهی پچڕێنەری پەیوەندی خزمایەتی

**٥٩٨٤-موحەمەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم وتی: جوبیری کوڕی موتعیم ﷺ بۆی گێڕایەوەکە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت ناچێتە بەهەشتەوە)).**

## ١٢- بابُ مَنْ بُسِطَ لَهُ فِي الرِّزْقِ بِصِلَةِ الرَّحِمِ

٥٩٨٥- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَعْنٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ».

## ١٢- باسی ئەوەی ڕسق و ڕۆزی بۆ فراوان کراوە بەهۆی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی

**٥٩٨٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەرکەس پێی خۆشە ڕسق و ڕۆزی بۆ فراوان بکرێت، وە مردنی دوا بخرێت، ئەوە با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ)).**

٥٩٨٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَيُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»[1].

**٥٩٨٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس پێی خۆشە کە ڕسق و ڕۆزی بۆ فراوان بکرێت، وە مردنی دوا بخرێت، ئەوە با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ)).**

## ١٣- بابٌ: مَنْ وَصَلَ وَصَلَهُ اللهُ

٥٩٨٧- حَدَّثَنِي بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي مُزَرِّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمِّي سَعِيدَ بْنَ يَسَارٍ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ خَلْقِهِ، قَالَتِ الرَّحِمُ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ. قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ: فَهُوَ لَكِ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾ محمد.

---

(١) بڕوانە: ٢٠٦٧.

## ١٣- باسێک: هەر کەس پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ، خواش فەزڵی خۆی بەسەردا دەڕژێنێت

**٥٩٨٧- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خوا دروستکراوەکانی دروست کرد، کاتێ لەدروست کردنی بویەوە خزمایەتی (ڕەحم) وتی: ئەمە شوێنی پەناگرە بە تۆ لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، خوا فەرمووی: ئایا ڕازی نابیت ئەوەی تۆ بگەیەنێت منیش پەیوەندی لەگەڵ ببەستم، وە ئەوەی تۆی پچڕاند منیش پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنم؟ وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم. خوا فەرمووی دەی ئەوە بۆ تۆ)). پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە: (جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ئەگەر پشت هەڵکەن (لە ئیسلام و جیهاد) لە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپابکەن، وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتییە بیپچڕێنن) بخوێننەوە.**

٥٩٨٨- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الرَّحِمَ شِجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ اللَّهُ: مَنْ وَصَلَكِ وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَكِ قَطَعْتُهُ».

**٥٩٨٨- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بێگومان خزمایەتی شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی خوای بەبەزەیی[1]، بۆیە خوا فەرمووی: هەر کەسێك تۆ پەیوەست کات منیش چاکەی لەگەڵ دەکەم، هەر کەسێکیش بتپچڕێنێ منیش چاکەی خۆمی لێ دەبڕم)).**

(١) پەیوەست پێوەی بە قایمی.

٥٩٨٩- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي مُزَرِّدٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الرَّحِمُ شِجْنَةٌ، فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعْتُهُ».

**٥٩٨٩- عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((بێگومان خزمایەتی شوێنەوارێکە (لە خوای بەبەزەییەوە[1]) خوا فەرمووی: هەر کەسێك تۆ پەیوەست کات منیش چاکەی لەگەڵ دەکەم، هەر کەسێکیش بتپچڕێنێ منیش چاکەی خۆمی لێ دەبڕم)).**

## ١٤- بابٌ: يَبُلُّ الرَّحِمَ بِبَلاَلِهَا

٥٩٩٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ جِهَارًا غَيْرَ سِرٍّ يَقُولُ: «إِنَّ آلَ أَبِي -قَالَ عَمْرٌو: فِي كِتَابِ مُحَمَّدِ بْنِ جَعْفَرٍ بَيَاضٌ -لَيْسُوا بِأَوْلِيَائِي، إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللَّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ". زَادَ عَنْبَسَةُ بْنُ عَبْدِ الْوَاحِدِ، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ: «وَلَكِنْ لَهُمْ رَحِمٌ أَبُلُّهَا بِبَلاَلِهَا». يَعْنِي: أَصِلُهَا بِصِلَتِهَا.

## ١٤- باسێک: بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی[2]

**٥٩٩٠-عەمری کوڕی عاص ﵁ دەڵێ: بە ئاشکرا و پەنهان نەبوو لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان بنەماڵەی ئەبی -عەمر[3] دەڵێ: لە کتێبەکەی موحەممەدی کوڕی جەعفەردا ئەو شوێنە سپییە[4]- دۆست و خۆشەویستی من نین، بەڕاستی دۆست و خۆشەویستی من خوا و باوەڕدارانی چاکە)).**

---

(١) پەیوەست پێوەی بە قایمی.

(٢) يَبُلُّ: لە بنەڕەتدا بەمانای تەڕ کردن دێ، بەڵام مەبەست پێی پەیوەندی خزمایەتیە هەرچۆنێک، (البلس) بۆ پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی بەکاردێت).

(٣) عەمری کوڕی عەبباس کە مامۆستا بوخارییە.

(٤) واتە: هیچی تیا نەنوسراوە لە دوای وشەی (ئەبی)یەوە سپییە.

-عەنبەسەی کوڕی عەبدولواحید لە بەیانەوە گێڕاویەتیەوە لە قەیسەوە ئەویش لە عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست ((بەڵکو ئەوان خزمایەتیەکیان هەیە پەیوەندی ئەو خزمایەتیە بەجێ دێنم))، واتە سیلەی ڕەحمی خزمایەتی بەجێ دێنم.

## ١٥- بابٌ: لَيْسَ الوَاصِلُ بِالْمُكَافِي

٥٩٩١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ وَالْحَسَنِ بْنِ عَمْرٍو وَفِطْرٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو -قَالَ سُفْيَانُ: لَمْ يَرْفَعْهُ الأَعْمَشُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَرَفَعَهُ حَسَنٌ وَفِطْرٌ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلَكِنِ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قَطَعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا».

## ١٥- باسێک: بەجێهێنەری خزمایەتی ئەوە نییە سەر بەسەر بێت[١]

٥٩٩١- موحەمەدی کوڕی کەسیر بۆی گێڕاینەوە وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە ئەعمەش و حەسەنی کوڕی عەمر و فیترەوە، لە موجاهیدەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ﷺ - سوفیان دەڵێ: ئەعمەش ئەم فەرموودەی نەبردۆتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ -بەلام حەسەن و فیتر بردویانەتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ- لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەوە فەرموویەتی: ((گەیەنەری پەیوەندی خزمایەتی ئەوە نییە سەر بەسەر بێت، بەڵکو گەیەنەر پەیوەندی خزمایەتی ئەو کەسەیە ئەگەر پەیوەندییە خزمایەتیەکە پچرا (یاپچڕێنرا)[٢]، ئەو پەیوەستی کاتەوە)).

---

(١) ئەوان سەردانیان کرد تۆش بیکەیت.

(٢) لە گێڕانەوەیەکی ئیمام بوخاری دا ئەم زیادەی هەیە (یان پچڕێنرا).

## ١٦- بابُ مَنْ وَصَلَ رَحِمَهُ فِي الشِّرْكِ ثُمَّ أَسْلَمَ

٥٩٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صِلَةٍ وَعَتَاقَةٍ وَصَدَقَةٍ، هَلْ لِي فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ قَالَ حَكِيمٌ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ». وَيُقَالُ أَيْضًا عَنْ أَبِي الْيَمَانِ: أَتَحَنَّتُ. وَقَالَ مَعْمَرٌ وَصَالِحٌ وَابْنُ الْمُسَافِرِ: أَتَحَنَّثُ. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: التَّحَنُّثُ: التَّبَرُّرُ، وَتَابَعَهُمْ هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ[1].

## ١٦- باسی ئەو کەسەی لە کاتی هاوبەش دانانیدا پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ پاشان مسوڵمان ببێت

**٥٩٩٢- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ بۆی گێڕایەوە کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی شتانێك کە من لە سەردەمی نەفامیدا لەبەر خوا دەمکرد لە بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی و کۆیلە ئازادکردن و ماڵ بەخشین، ئایا هیچ پاداشتێکم هەیە لەو کارانەدا؟ حەکیم دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((تۆ لەگەڵ ئەو چاکانەدا مسوڵمان بوویت کە پێشتر کردووتە)).**

**-هەروەها لە ئەبی سولەیمانەوە ئەم فەرموودەی گێڕدراوەتەوە بەم جۆرە وتراوە:** (أَتَحَنَّتُ)[2].

**-هەریەك لە مەعمەر و صالح و ئیبنو لموسافیر (بەم جۆرە گێڕاویانەتەوە):** (أَتَحَنَّثُ).

**-ئیبنو ئیسحاق دەڵێ:** (التَّحَنُّثُ) **واتە: چاکە کردن و خێرکردن.**

**-هیشامیش لە باوکیەوە گێڕاوێتیەوە و پاڵپشتی وتەکەی ئیبنو ئیسحاق دەکات.**

---

(١) بروانە: ١٤٣٦.

(٢) واتە: لە ڕێگەی ئەبو لیەمانە ئەم وشە: (أتحنتُ) گێڕدراوەتەوە لەجێگای: (أتحنث) کە ئەمەی دووەم بەهێزتر و ڕاسترە، بۆیە بوخاری بە دەربڕینی لاواز وتوویەتی: (يُقال) وتراوە، هێناویەتی.

## ١٧- بابُ مَنْ تَرَكَ صَبِيَّةَ غَيْرِهِ حَتَّى تَلْعَبَ بِهِ، أَوْ قَبَّلَهَا أَوْ مَازَحَهَا

٥٩٩٣- حَدَّثَنَا حِبَّانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ أَبِي وَعَلَيَّ قَمِيصٌ أَصْفَرُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَنَهْ سَنَهْ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَهْيَ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنَةٌ. قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَلْعَبُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ، فَزَبَرَنِي أَبِي. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْهَا». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَبَقِيَتْ حَتَّى ذَكَرَ. يَعْنِي مِنْ بَقَائِهَا[1].

## ١٧- باسی کەسێک کچۆڵەی کەسێکی وازی لێ بێنێ یاری (بەشتێکی) لاشەی بکات، یان کچۆڵەکە ماچ کات و یاری گاڵتەی لەگەڵدا بکات

**٥٩٩٣- ئوممو خالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعید وتی: لەگەڵ باوکمدا کراسێکی زەردم لەبەردا بوو ڕۆشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەنە سەنە)) عەبدوڵلا (ی کوڕی موبارەك) دەڵێ: وتەکەی پێغەمبەر ﷺ بەزمانی حەبەشی واتە: جوانە، (ئوممو خالید) وتی: جا منیش ڕۆشتم و دەمویست یاری بەمۆر و نیشانەی پێغەمبەرایەتیەکەی[2] بکەم، بەڵام باوکم تێیخوڕیم و نەیهێشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە))، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((تەمەن درێژبیت جلەکەت بمێنێ، پاشان تەمەن درێژ بیت جلەکەت بمێنێ، پاشان تەمەن درێژ بیت جلەکەت بمێنێ و کۆنی بکەیت))، عەبدوڵلا دەڵێ: جا جلەکەی (یان ئوممو خالید) ئەوەندە مایەوە تا باسی کرد[3]. واتە: زۆر مانەوەی.**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٧١.

(٢) کە لەنێو شانی پیرۆزیدا بوو.

(٣) واتە: تا ڕاوی فەرموودەکە باسی کاتێکی دوورو درێژی کرد.

## ١٨- بابُ رَحْمَةِ الْوَلَدِ وَتَقْبِيلِهِ وشمه وَمُعَانَقَتِهِ

وَقَالَ ثَابِتٌ، عَنْ أَنَسٍ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ إِبْرَاهِيمَ، فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ.

٥٩٩٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا مَهْدِيٌّ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي يَعْقُوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ قَالَ: كُنْتُ شَاهِدًا لابْنِ عُمَرَ وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ. قَالَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا، يَسْأَلُنِي عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ النَّبِيِّ ﷺ! وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا»[١].

## ١٨- باسی بەزەیی هاتنەوە (ی باوک بە) منداڵدا، وە باسی ماچ کردن و دەست کردنە ملی منداڵ

**سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی هەڵگرت و ماچی کرد و بۆنی پێوە کرد.**

**٥٩٩٤-ئیبنو ئەبی نوعم دەڵێ: من لای ئیبنو عومەردا ﷺ ئامادە بووم پیاوێك پرسیاری لێ کرد دەربارەی خوێنی مێشووله[٢]، (ئیبنو عومەر) وتی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ ئەویش وتی: خەڵکی عێراقم، وتی: سەیری ئەم کابرایە بکەن، پرسیاری خوێنی مێشولەم لێ دەکات، لەکاتێکدا کوڕی (کچی) پێغەمبەریان ﷺ کوشت، کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەو دووانە (حەسەن و حوسەین) ڕێحانەی منن لە دونیادا )).**

٥٩٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَتْهُ قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ مَعَهَا

---

(١) بڕوانە: ٣٧٥٣.

(٢) کەسێک بیکوژێ لە ئیحرامدا بێت.

ابْنَتَانِ تَسْأَلُنِي، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ: «مَنْ يَلِي مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ شَيْئًا فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ، كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ»[١].

**٥٩٩٥- عەبدوڵڵای كوڕِ ئەبو بەكر دەڵێ: عوروەی كوڕی زوبەیر بۆی گێڕایەوە كە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: ئافرەتێك هات بۆ لام دوو كچۆڵەی لەگەڵدا بوو داوای هاوكاری كرد لێم، هیچی لام دەست نەكەوت یەك دەنكە خورما نەبێت، منیش پێمدا، ئافرەتەكە بەشی كرد لە نێوان دوو كچەكەیدا (یەكی لەتێكی پێدان) پاشان هەستا و ڕۆشت، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ هات بۆماڵەوەمان منیش هەواڵەكەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك خوا تاقی كاتەوە بەم جۆرە ئافرەت و هەتیوانە (و خزمەتیان بكات)، ئەوە دەبنە پەرژین بۆی لە ئاگری دۆزەخ)).**

٥٩٩٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ سُلَيْمٍ، حَدَّثَنَا أَبُو قَتَادَةَ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ وَأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِي الْعَاصِ عَلَى عَاتِقِهِ، فَصَلَّى فَإِذَا رَكَعَ وَضَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَفَعَهَا[٢].

**٥٩٩٦-ئەبو قەتادە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناومان لە (مزگەوتدا) ئومامەی كچی ئەبی لعاص بەسەر شانیەوە بوو، ئینجا نوێژی كرد، جا كە كوڕنووشی دەبرد دایدەنا و كاتێ ڕاست دەبوویەوە هەڵیدەگرتەوە.**

٥٩٩٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ

---

(١) بڕوانە: ١٤١٨.

(٢) بڕوانە: ٥١٦.

التَّمِيمِيُّ جَالِسًا. فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَدًا. فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ».

**٥٩٩٧-ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ ماچ کرد و ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لە لایدا دانیشتبوو، ئەقرەعیش وتی: بەڕاستی من دە منداڵم هەیە یەکێکیانم ماچ نەکردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد و پاشان فەرمووی: ((هەر کەس ڕەحم نەکات ڕەحمی پێ ناکرێت)).**

٥٩٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: تُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللَّهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ؟!».

**٥٩٩٨-عوروە لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا من دەتوانم (بەزەی بخەمە دڵتەوە) دوای ئەوەی خوای گەورە بەزەیی لە دڵی تۆدا دەرهێناوە؟)).**

٥٩٩٩- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ سَبْيٌ، فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ قَدْ تَحْلُبُ ثَدْيَهَا تَسْقِي، إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَرَوْنَ هَذِهِ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟». قُلْنَا: لاَ وَهْيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لاَ تَطْرَحَهُ. فَقَالَ: «اللَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا».

٥٩٩٩-عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: هەندێ ئافرەتی بەدیل گیراو (لە غەزای هەوازندا) هێنران بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا ژنێك لە ئافرەتەکاندا هەردوو شیری مەمکی دەدۆشی ڕای دەکرد و دەگەڕا، ئەگەر منداڵێکی لە ناو ئافرەتە دیلەکان دەست کەوتایە هەڵی دەگرت و دەینوساند بەسکیەوە و شیری دەدایە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا بەرای ئێوە ئەم ژنە منداڵەکەی خۆی فڕێ دەداتە ئاگرەوە؟)) وتمان: نەخێر، لە کاتێکدا بتوانێ فڕێی نەداتە (ئاگرەوە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوا بەبەزەی ترە بەبەندەکانی لەو ژنەی بەمنداڵە شیرە خۆرەکەی)).

## ١٩- بابٌ: جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ

٦٠٠٠- حَدَّثَنَا الحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءًا، وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ»[1].

## ١٩- باسێک:خوا بەزەیی کردوە بەسەد بەشەوە

٦٠٠٠-سەعیدی کوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((خوا بەزەیی کردوە بە سەد بەشەوە، ئینجا نەوەد و نۆ بەشی لای خۆی هێشتۆتەوە، یەك بەشیشی دابەزاندووە بۆسەر زەوی، جا هەر لەو بەشەیە دروستکراوان بەزەییان بەیەکتردا دێتەوە، هەتا مایین سمی بەرز دەکاتەوە لە ئاستی بەچکەکەی لە ترسی ئەوەی نەوەك لێی بدات و ئازاری پێ بگات)).

(١) بڕوانە: ٦٤٦٩.

# پێڕستی بەرگی هەشتەم

## ٦٨- پەڕاوی تەڵاق ١١٣

## ٦٩- پەڕاوى خەرجيەكان ٢٠٦

## ٧٠- پەڕاوی خواردەمەنیەکان ٢٢٨

## ٧١- پەڕاوی حەوتەم ٢٩٤

## ٧٢- پەڕاوی سەربڕاوەکان و ڕاوکردن ٣٠٠

## ٧٣- پهڕاوی قوربانی ٣٥٧

## ٧٥- پەڕاوی نەخۆشەکان ٤١٩

## ٧٦- پەڕاوی پزیشکی ٤٤٩

## 

## ٧٨- پەڕاوی ئادابەکان ٦٣٧